# کاروان

148

٢٠٠٠

گۆڤارێکی مانگانەی ڕۆشنبیری گشتییە وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان دەریدەکات





## گۆڕانکاری لە زمان لە هەموو پرۆسەیەک دیموکراسیترە

د. ئەحمەد فەرهادی

## شێوەکارە پێشەنگەکان لە لاوەکان نوێخوازترن

ڕۆستەم ئاغالە

کتێبی ژمارە: گوزارشتی مۆسیقا

# کاروان

**گۆڤارێکی رۆشنبیریی مانگانەیە**
**وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان دەریدەکات**

**148** ئابی ساڵی ٢٠٠٠

**خاوەنی ئیمتیاز**
بارزانی مەلا خالید

**سەرنووسەر**
سیروان بەکر سامی

**سکرتێری نووسین**
سەلاح عومەر

**دەرهێنانی هونەری**
عوسمان پیرداود

**هێلکاری**
دارا محەممەد عەلی

**سەرپەرشتی چاپ**
نەوزاد سلێمان

**ناونیشان**
هەولێر
شەقامی شەستی
تەنیشت وەزارەتی
رۆشنبیری

## لەم ژمارەیەدا



تابلۆی بەرگ هونەرمەند رۆستەم ئاغالە

پیتچنین : نووسینگەی رواندز بۆ کۆمپیوتەری ماکینتۆش

# هاوپرانسیپی و مەحاڵ بوونی کۆتاییەکان لای (شیرزاد و فرۆید)

• سابیر حوسێن



**.لوتکەی کامڵبوونی ئایدیای شێرزاد سەبارەت بە موعاناتەکانی کۆمەڵگاکەی، خۆی لە تخوبی (حەسار)دا حەشاردراوە.**

**بەرایی:-**

هەر لە دەستپێکەوە پێویستە راشکاوانە دان بەوەدابنێین، کە بەلامانەوە شیاو نییە بەرهەمێکی وەک نۆڤلێتی (حەسارو سەگەکانی باوکم..) بکرێت بەسەنگی مەحەک بەمەبەستی کەشف کردنی دنیابینی(شێرزاد حەسەن) سەبارەت بە کاییەکی هەستەوەری وەک (سایکۆلۆژیایی کورد)، چونکە بۆ هەنگاونانی پرۆسەیەکی لەم بابەتە پێویستە هەموو بەرهەمەکانی لەبەر چاو بگیرێن.

بەو جۆرەش سەرەڕای لۆژیکیەتی تۆژینەوەکە رووی ئەکادیمیش دەبەخشێتە بابەتەکە. بەڵام فاکتەری پاڵنەر بۆ دیاری کردنی تاکە بەرهەمێکی وەک (حەسار) بۆ ئەوەی لە رێیەوە سایکۆلۆژیای کوردی تیادا بخوێنینەوە، زیاتر خۆی لە قەناعەتێکی - زاتی- دەبینێتەوە، کە وادەزانم (شێرزاد) هەرچی لە ئەرشیفی بیرەوەریەکانیدا کۆمەکی کردوون سەبارەت بە سایکۆلۆژیای زێدەکەیەوە لە پانتایی ئەم حەساردا هەمووی هەڵرشتووە، بە جۆرێک لوتکەی کامڵبوونی ئایدیای شێرزاد سەبارەت بە ئازارەکانی کۆمەڵگاکەی، خۆی لە تخوبی(حەسار)دا حەشارداوە.

(حەسار) لە قەلەمڕەوی( شێرزاد)دا، ئەو دالدەیەیە کە سەرجەم خەم و تلانەوەو دەردە دڵی لاوان- کچان و کوڕان... تاد لە باوەش دەگرێت، لە رووێکی دیکەوە سەرجەم چیرۆکەکانی( شێرزاد حەسەن) لەکەش وهەوایەکدا دەخولێتنەوە، کە بە گشتی دەسەڵات و باوکسالاری کوردییە هەر سەبارەت بەم خاڵە دەکرێ بڵێین کەوا سەرجەم ئەو توێژینەوانەی لەبارەی (حەسار)ەوە دنووسرێن نووسین، درێژەدانە بەهەمان هەناسەی(فرۆید) واتە هەمان پرەنسیپی تیۆرەکەی فرۆیدە سەر لەنوێ دادەرێژرێتەوە دیارە ئەمەش زیاتر بەلای خزمەتی تیۆرەکەدا دەشکێتەوە: ئەگەر چی (کوشتنی باوک) لە کایەکانی مەعریفیەوە بە تایبەت لە (رۆشنبیری کوردی) فەزایەک رەهەند و تەئویلاتی جۆراوجۆر لە خۆ دەگرێت، کە دیارە ئەمە سروشتی مەعریفە خۆیەتی بوار بەو تەفسیراتە فرە لایەنانە بدات، بەڵام لەتێڕوانینی سایکۆلۆژیستانەوە بوار بەو تەفسیراتە جۆراوجۆرانە نادرێت بەو چەمکە ئەو کۆمەڵە ئەگەرانەی لەرووی مەعریفیەوە بۆ کوشتنی باوک ریزبەند دەکرێن، لەگەڵ ئەوەی بە تەنها (ئەگەری، ئیحتمالیە) بەڵام لە دیدی مەعریفەوە لەنگ.نییە و ئاسایی عەقڵ لە تای خۆی دەنێت و لاری لێ نابێت.

هەرچی لە رووی سایکولۆژیاوەیە، ئەم هاوکێشەیە وەرناگیرێت و، لە هەمان ئانوساتیشدا رەفزی یەکجارەکی ناکرێت، بەڵکو خوێندنەوەی سایکۆلۆژیستانە پتر حەتمیەتی زانستی ئەبستراکتانەی لێ رەوا دەنبینرێ، لەوەی کە گەمەی نووسین و خەیاڵ و زمانێکی رەمزی و فانتازیانەی مەعریفی بێت. روونتر دەڵێین هەردوو (سایکۆلۆژیاو مەعریفە) لەگەڵ ئەوەی دوو تەوەری سەربەخۆن، لەهەمان کاتدا لە هەندێ رووەوە لە دوالیزمیەت بەدەرنین، رووی ئەم پەیوەندیەش زیاتر خۆی لە پرۆسەی نووسیندا بەدیار دەخات، لێرەدا بە چاکی دەزانین بە هێلکاریەک پرۆسەی نووسین و






چۆنیەتی چوونە ناو یەکیان روون بکەینەوە:
لەم هێلکارییەدا لقی(أ-دەق) کە زیاتر ئینسانەکان بە چەمکە (هیومانیزمەکەی) رۆڵی تیادا دەبینین، بەڵام لقی (ب- بابەت) زیاتر مادده بە چەمکە(ماتریالیەکەی) رۆڵی تیادا دەگێڕن، زیاتریش عەقڵ زاڵە بەسەر لایەنە هەستییەکانی دیکە، بەڵام لە هەردوو باردا ناکرێ رەهایی (مطلق)یەت بدەینە وتەکانمان لەبەر هەمان فاکتەری پێشوو.

ئەوەی بەلامانەوە بایەخدارە، زیاتر لقی(ب)ە چونکە پرسیارەکەمان ئاراستەی بابەتەکانی ئەو تەوەرە کراوە، کە سایکۆلۆژیا تەوەرەیەکییانە. وەکو چۆن بۆ دیارکردنی پرەنسیپی هەر بابەتێک دەکەوینە ناو تەقسێکی فەلسەفییانەوە بە نیازی کەشفکردنی، بە شێوەیەکی دیکە ئەگەر چی فەلسەفە خۆی لە ریزبەندی لقی(ب) دەبینێتەوە، بەڵام هەردەم بۆ دۆزینەوەی پرەنسیپەکانی هەر تەوەرێک لە تەوەرەکان گوتارێکی ئامادەیە. هەر لەم رووەوە بەهەمان شێوە سایکۆلۆژیا لە زۆرباردا رۆڵی فەلسەفە دەبینێ، بەوەی لە شیکردنەوەو شەن و کەوکردنی زۆربەی تەوەرەکانی (أ-ب) ناکرێ لایەنی سایکۆلۆژیا لەبەرچاو نەگیرێت، هەمان شت سەبارەت بە (سیاسەت و ئابووری ، کۆمەڵاتی ..تاد) سەرەرای ئەو خزمایەتییە و تێکەڵییەی ناو تەوەرە هەمەلایەنەکان لە هەمان کات هەر یەک لەو تەوەرانە مەوداو چوار چێوەی سەربەخۆ و پارێزراوی خۆی هەیە.

ئەمە زۆر بە کورتی روونکردنەوەیەک بوو لەسەر پرۆسەی نووسین و چۆنیەتی تێکەڵ بوون و تاوتۆکردنیان لە نێو یەکتریدا.

ئێستا ئەگەر بگەرێینەوە سەر تەوەری سەردکی بابەتەکەمان و بڵێین ئەگەر لە پانتایی مەعریفیدا بەو جۆرە تەفسیر و خوێندنەوە بۆ (کوشتنی باوک) بکرێت وەکو لە ئەفراندنی یەکەم ئەفسانەی خورافی بەرجەستە بوو، کەوا فرۆید لە کتێبی(الطوطم و الحرام) گوزارشتی لێ کردووە. کەلە کورتەی راڤەکردنەکەیدا هاتووە دەڵێ (سەرەتای دروست بوونی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە شانۆی میتۆلۆژیای خێڵێکەوە دامەزراوە، کە تێیدا باوکێک خاوەن شکۆ وفەرمان و دەسەڵاتە رەهاکانی خۆی بەسەر نەوەکاندا سەپاند بوو، واتە سەرچاوەی هەموو هێزەکان هەر خودی خۆی بوو، بەجۆرێک چەندی ئافرەتی ناو ئەو خێڵە هەبوون بۆ خزمەتی مەرام و مەیلە سێکییەکانی خۆی مۆنۆپۆل کردبوون، لە خۆی بەولاوە بۆ هیچ نێرینەیەکی ناو خێڵەکە نەبوو

نزیکی ئەو ئافرەتانە بکەوێتەوە، ئەم یاساغکردن و حەرامکردنەی باوک.. بووە مایەی جۆشدانی کورەکان و پتر قەبە بوونی غەریزە سێکسییەکانیان، تا ئەو رادەی لە ساتەوەختێ رق و کینەیان بە گورزێکی فیعلی گۆری، کە بە سزای کوشتنی باوک و پەل پەل کردنی کۆتایی هات بەڵام لە پاشاندا لە بری ئەوەی لەززەت لەو کردارەیان وەرگرن. کەچی دووچاری گرێی هەستکردن بە تاوان و سزادانی ویژدان بوونەوە.

تا ئەو رادەی مەیلە سێکسییەکانیان لە خۆیان تاڵ کرد و بەمەبەستی پاراستنی قودسییەتی باوک، کوک بوون لەسەر دروستکردنی ئەوتەمێک وەکو بەدیل بۆ باوکی پیرۆزی حەقیقی) ) لە نۆڤلێتی حەسار، هەمان مەنەلۆگ و کەش و هەوای تراژیدی خۆی دووبارە دەکاتەوە، بەوەی لە مەیانیشدا باوکێکی سەختگیر گشت حەسارییەکانی مۆنۆپۆل کردووە لە رووی رەهەندە فرۆیدزیەکەیەوە، کە دواتر بەهەمان سەرەنجام، باوک بە سزای کوشتن دەگەیێنێت ئەم دراما تراژیدیە بەهەمان شێوە لە رووی چەمکەوە لای رۆماننووسی ناداری میسری (نەجیب مەحفووز) دووبارە بۆتەوە کاتێک لە رۆمانە درێژە سێ بەشییەکەیدا (ثلاثیة نجیب محفوظ) باس لە خێزانێک دەکات کە باوک هەموو ئازادی لێ زەوت کردوون، هەر ئەو باڵادەستە و بەسەر هەموو حەزەکانیاندا، کەچی دوای مردنی باوکەکەیان لە بری ئیستعابی ئەو هەڵە زێرینە بکەن. بە پێچەوانەوە شیرازەی خێزانەکە تێک دەشکێت. بەهەموو چەشنێک حەسرەت و ئاخ بۆ مێژووی بەر لە مردنی باوک هەڵدەکێشن، بەگشتی لەگەڵ کەش و هەوای ئازادی رانەهاتبوون، بەڵکو کەوتبوونە ژێر ئیدمانی حوکم و سەرداریەتی کردنی باوکەوە. ئەگەر چی رووداوەکانی(حەسار) زیاتر لە هی فرۆیدەوە نزیکە لەوەی (نەجیب مەحفوز) بەڵام لە رووی چەمکەوە هەردوولا (شێرزاد و نەجیب مەحفووز) لە زادەی فرۆیدەوە سەرچاوە دەگرن.

تاکە جیاکارییەک لەوەدایە، کەوا (نەجیب مەحفووز)لە (سێینە) زیاتر واقیعیترە لە (شێرزاد حەسەن) بەوەی (شێرزاد) لەسەر هەمان رەوتی (فرۆید) زیاتر بەلایەنی خورافەدا شکاوەتەوە، ئەمەش ئەوە ناگەیێنی کە(حەسار) تەواو یۆتۆپی کراوە، بەڵکو لەگەڵ ئەوەکەی (فرۆید)دا، هەندێ جیاکاری شکلی لە رووی گریانەوە لە خۆ دەگرێت، کە دیارترینیان ئەزموونی ئەو فەزایەی کە لەدوای پرۆسەی کوشتنی باوک دێتە ئاراوە. کە بە بۆچوونی خۆم هەر یەک چ (فرۆید) یاخود (شێرزاد)

**. فرۆید جێ نشینێکی لە دوای کوشتنی باوک دۆزیوەتەوە، بەڵام لای شێرزاد هەروا بێ بەدیل ماوەتەوە.**





**. دکتاتۆر زەمانی کەسەکان کۆت و بەند دەکات، بەڵام ئیرادەی ناشکێتە سەر کۆت و بەند کردنی بیرکردنەوەیان.**

بەسەرنجدانێکی وردبینانە دەبینین کەوا گەورەترین فەلسەفە لە بابەتی هەردوو لادا خۆی لەسەرەنجامیاندا مەڵاس داوە. فەلسەفەکەش لەوەدایە لای (فرۆید) ئەلتەرناتیڤێک (بەدیل) بۆ کوشتنی باوک دۆزراوەتەوە، بەڵام لای (شێرزاد) هەروا بێ بەدیل ماوەتەوە، ئەمەش دەقاودەق تۆمارکردنی واقیعی دوو شارستانییەتە، کە مەبەستمان لە هەردوو شارستانییەتی (رۆژهەلات و رۆژئاوا)دێت.

تەنانەت لەم گۆشەنیگایەوە دەکرێ ئاماژە بە تێروانین و خوێندنەوەی عەقلیەتی رۆژئاوا و عەقڵیەتی رۆژهەڵات بە گشتی و عەقڵی کورد بە تایبەتی بدەین لێرەدا عەقڵیەتی رۆژئاوا لە دوای کوشتنی باوک پرنسیپی بۆ فەلسەفەیەکی هەنووکەیی دارشت، فەلسەفەیەک تەواو پێچەوانەی ئەو رەوتە خوارو خێچەی مێژوویێکی درێژ پێوە موسەیەر بوون. کە غەیری بێ ئیرادەیی هیچی دیکەی لێ وەدی نەدەهات، ئیدی لە پاش ئەو کودەتایەی لەسەر باوک ئەنجام درا. خۆیان خستە بەردەم ئەمری واقیع و کەوتنە رەخنە لە خۆگرتن، بەڵام لەسەر بنەمایەکی بنیادنەرانە. لەوەشدا عەقلیەتی رۆژئاوا رووپەرێکی سپی بۆ تۆمارکردنی داهاتوو هەڵدایەوە، بە چەمکێکی دیکە لە دوای پرۆسەی کوشتنی باوک سەر لە نوێ مێژوویێکی دیکە لە خاڵی (هیچ)دوە، خۆی خزاندە رۆژمێرێ رۆژئاوا، ئەمەش کاتێک بوو کە بکوژان بەدەستە جەمعی دەنگیان بۆ ئەوەدا، کە (بەدیل)ێک بۆ باوکی کوژراو لە شێوەێ(تەوتەم) دامەزرێننەوە، باوکێ کە بە هەموو رەهەندەکانیەوە شەرە چەقەێ مێژوویێکی دیالێکتی هێنابوویە وجود ئەم دووبارە زیندوکردنەوەیەی باوک وەنەبێ هەر لە بری ترسان بێ لە ئازادی (بەمانا کلاسیکییەکەی)، بەڵکو پرۆسەیەک بوو پتر دەمامکە سیاسی و ئاینیەکانی بەخۆیەوە گرتبوو، دیارترین دەلالەت بۆ ئەو مەبەستە، پرۆژەیەک بوو بە نیازی هەڵتەکاندنی دەسەڵاتی کلێسە، روونتر بڵێین کۆتایی هێنان بە جیهانی ئایدیا، کە زاڵ بوو بەسەر رەوتی بیرکردنەوەی رۆژئاوا. پتر رووکردنە جیهانی هەستپێکراو (العالم الملموس) بەمەش فیکری رۆژئاوا بە (رۆیا) و ئاراستەیەکی ئایندە خوازی (مستقبل) بۆ مەسەلەکان رۆیشت، واتە لە پاڵ کوشتنی باوکدا بیر لە پرۆژەی گۆرینێکی رادیکالانە کراوە، تا ئەو رادەی خۆیان لە دەرەوەی دەسەڵاتی کەناڵە سروشتییەکان بینەوە، روودو کەناڵە تەکنیکیەکان رێچکەیان دامەزراند.

ئیدی لە دوای دروستبوونی کۆمەڵگایەکی دەستەجەمعی دەروازەیەکی نوێ ئاوەڵا بووەوە، کە دواتر بووە مایەی هاتنەکایەی ئەو کۆمەڵگا مەدەنی و شارستانیەی ئەمڕۆی رۆژئاوا.

بە گشتی دووبارە زیندووکردنەوەو سەر لەنوێ دارشتنەوەی (باوکێکی رۆبۆت) بێ حیکمەت نەبوو، بەڵکو دەلالەتی ئەو ئیمراتۆریەتەی ئەمڕۆی رۆژئاوا نیشان دەدات، لێرەدا شیاوە گەر وترا کەوا کەناڵە دەستکردەکان بەردەوامی هەمان پرۆسەی باوکی دەستکردن. ئەگەر چی ئەمە لە خۆیدا مەیدانە بۆ تەوەرێکی دیکەی توێژینەوە، بەڵام ئێمە لێرەدا دەگیرسێینەوە، بۆ ئەوەی چریەیەکیش سەبارەت بە عەقلیەتی کوردی لەو بارەیەوە بدرکێنین.

بە لێورد وونەوە لە عەقلیەتی کوردی، یان راستر بڵێین دنیابینی کوردی، کە ئەویش بەشێکە لە پاشینەی عەقلیەتی خۆرهەلات، دەبینن ئاراستەکان تەواو پێچەوانە هەڵگەراونەتەوە لە چاو عەقلیەتی رۆژئاوا، لە بری ئەوەی لە دوای پرۆسەی کوشتنی باوک مەرکەزیەتێک بەیەکەوە کۆیان کاتەوە بۆ ئەوەی لە پاڵیدا چەشنی رۆژئاوا بە دوای ئەلتەرناتیڤێکدا بگەرێن کەچی هەریەک لە نەوەکان رووەو لایەک ملی رێگای گرتە بەر، بەمەش ئاڵۆزییەکی بۆ بەرنامەیان بۆ خودی خۆیان خوڵقاند هەڵبەتە ئەمە دەگەرێتەوە سەر نەبوونی وەعی)ێکی هۆشیار لە پشت ئەو گۆرانە، بەمەبەستی هەڵقوزتنەوەی ئەو دەرفەتە هەر ئەو فاکتەرەش وادەکات لە دوای تراژیدیای مەرگەساتەکەی (باوک) هەموو شتەکان زوو بە زوویی بشێوێن، هیچ یەک لە نەوەکانیش ئیستعابی ئەو ئەزموونە تازەی دوای باوک نەکەن کە بۆیان هاتبووە ئاراوە، ئەگەر چی سەرەتا پێشوازی لێ کراو هەریەک لە نەوەکان لە نێو شەهوەت و لەزتە سێکسییەکان خەریک بوو دەخنکان، بەڵام دەکارین بڵێین، کە سەرجەمی ئەو کردارانە بە (ئازادی و شەهوەتەکانەوە) بێ بەرنامەو خۆئامادەکردن بوون، بەو مانایەی زیاتر کردارێک بوون لە (نا هۆشیارییەوە)وە سەرچاوەیان گرتبوو، هەر بۆیەشە زەمەنێکی کورت و پایەنداری خایاند، کە تەنانەت نەوەکان ئاواتە خوازی ئەو چارەیەی بەر لە کوشتنی باوکیان دەکرد، وکو بڵێی ئیدمانی مۆنۆپۆلی سەردەمیەتی باوک بوو بن و ئیرادەی دەست بەر داریان نەبێت وەک لە پێشتر ئاماژەمان پێیدا گەورەترین ئاستەنگ بگرە شاکارترین قەیرانی فەلسەفەی ئەم نۆڤلێتە خۆی لە نەگەران بە دوای

(بەدیل) بۆ کوشتنی باوکدا دەبینێتەوە، بە ئامانەتەوەش دەیڵێم ئەو سەرەنجامە چەندە تاڵە، ئەوەندەش پتر واقیع و زمانحالی عەقلیەتی کوردی تیادا نەخشکراوە.

(شێرزاد) بەسەلیقەیەکی تێگەیشتووانە هێلی بۆ هاوکێشەکان کێشاوە و حەکیمانە لە پاش خوێندنەوەی ·الطواطم و الحرام)ی فرۆید ئاراستەی سەرەنجامەکەی هەڵگەڕاندۆتەوە، بە جۆرێک ئەگەر لەلای (فرۆید)(تیدار)(+) بووبێت، ئەوە لای(شێرزاد) بۆتە (ناتیدار)(-)ە.

عەقلیەتی رۆژئاوا ــ باوکی پاتر یارک ــ کوشتنی باوک ــ پرۆسەی دوای کوشتنی باوک ــ کۆمەڵگایەکی دەستەجەمعی ــ بەدیل ــ ئایندە (مەدەنی و شارستانی)·

عەقلیەتی کوردی ــ باوکی پاتریاک ــ کوشتنی باوک ــ پرۆسەی دوای کوشتنی باوک ــ کۆمەڵگایەکی پەرتەوازە ــ بێ ئیرادە ــ دووبارە گەڕانەوە بۆ رابردوو.

لە بەرەنجامی ئەو هێلکارییەدا، دەبینین کەوا کارەکتەرەکان لە (حەسار)دا زیاتر نەفەسی کەش و هەوایەکی رۆحی بەسەر زەین و تێفکرینیاندا زاڵ بووە، هەر بەو هۆکارەش لە دوای پرۆسەی کوشتنی باوک لە گرێی سزادانی ویژدان رزگاربان نەبووە، لە کاتێکدا هەموو هیواو خەونیان ئەوەبوو،کە لە ئیمراتۆریەتی حەسارەکەی باوک رزگاربان بێت.

گومانی تێدانیە کەوا قەیران و نەویرانی ئەمرۆی رۆشنبیری کوردی لە نێوان خۆ دەربازکردن لە سیستەمی نووسین و بیرکردنەوەی کلاسیکی و کەش و هەوای مۆدێرنیتە و نووسین جیدی، درێژەی هەمان رەوتی بیرکردنەوەی (شێررزاد)ە، لە نوقڵێتی حەسار.

## چەمکی دەسەلات لای کەسی کوردی و کاریگەری بەسەر سایکۆلۆژیامان

چەمکی دەسەلات، یاخود سیستەمی جیهانی بۆ دەسەلاتی مرۆڤ لەسەر مرۆڤ، وەنەبێ چەرخێکی مێژوویی تایبەتی هەبێ، بەڵکو ئەو دیاردەیە پانتایی هەردوو رەهەندی ئاسۆیی و ستونییەکەی مێژووی مرۆڤایەتی گرتۆتەوە، واتە دەسەلاتەکە دەسەلاتێکی مێژووی جیهانی بەردەوامە، بەلام ئەوەی شایەنی گوتن بێت کە چەمکی دەسەلات لە رووی تاوتۆکردنەوە - تعامل- رێژەییو لە کۆمەلێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆرێت، فاکتەری ئەو رێژەیی و گۆڕانە- پەیوەستراو بوونیەتی بە چەند رەهەندێکی مێژوویی و کۆمەلایەتی ژینگەی تایبەتەوە. بۆ نموونە:

(نیشانەی ئازایەتی و جەنگاوەری لای مرۆڤێکی کورد بە نیشانەیەکی بالا دادەنرێت، ئەو پلە بالایەی نادرێتی لە ولاتەکانی ئەوروپادا هەیە یان بلێین شێوەو جۆری رێگەی ئازایی دەربڕینێکە کە دەگوترێت، هەروەها نیشانەی (بەخشندەیی) بە نیشانەیەکی بەرز دادەنرێت لە کۆمەڵگەی کوردیدا، بەلام لە زۆر ولاتی دیکەدا ئەو پلەیەی نادرێتی(١)

لەم دەروازەیەوە بەرەو کەشی دیارە کە داب و نەریت هەمیشە پەیوەستە بە گواستنەوەی لە زەمەن وشوێن و بارەکانی مرۆڤ و ئەو پەیوەستە ناخەکییەش وەستانی بۆ نییە و وەک سوڕانەوەیەکی نەپساوە وایە لە بازنەیەکی خڕدا. گوزارشت کردن لەو واقیعەی باسی دەکەین تەنانەت تا رۆژی ئەمڕۆشمان بوونێکی راستەقینەی لە ژیاندا هەیە بە شێوەیەک بۆتە سیمایەکی گشتی لە فیکری کۆمەڵگای کوردیدا. زار هەڵێنان بەم گوتەیە بە بەڵگەی چەند توێژینەوەیەکی سایکۆلۆژی کۆمەڵگەی کوردی سەڵمێنراوە (تا لەوەرچەرخانی ئەمڕۆشماندا بەشێکی زۆری کۆمەڵگەی کوردی پابەندن لەسەر کارکردن بە سیستەمی بیری تیرەکانیان جا ئەوانەی گوندنشین یاخود شارنشینین)(٢)(. بەلام ئەگەر کۆمەڵگا چەمەرەی لەسەر بنیادی سیستەمێکی مێژوویی دارێژرا بێت و کۆمەڵ هێنابێتیە ئاراوە ئەو پێویستە ئاورێ لە فاکتەرو پەیوەندییە هەمە جۆرەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی پێش ئێستای ئەم سیستەمکبدەینەوەو لە روانگەی مێژووی کۆنی ئەو پێکهاتە کۆمەلایەتییە ئابورییانەی پێش ئێستایەوە بتوانین پەیبەرین بەرەگ و ریشەی هەل و مەرجی بەشداری لە ئامادەکردنی ژینگە سایکۆلۆژییەکان.

ئێستا ئەگەر لە روانگەی (شەریعەتییەوە) لەو چەمکە قالبینەوە، کە شەریعەتی خۆی بڕوای بە (دیالێکتیکی مێژوویی هەیە و پێی وایە کە مێژوو خاوەن بزوتنەوەیەکی دیالیکتیکییە، دژایەتی لەو کاتەوە دەست پێ دەکات کە دەسەلات رووەکی شاراوەی ئەم چەمکەیە) کە قابیل بەلای شەریعەتی نوێنەری رژێمی کشتوکاڵی و مولکداری تایبەتە- هابیلی برای- کە نوێنەری سەردەمی دوا و ئاژەڵداری و قۆناغی کۆمەنەی سەرەتای پێش مولکدارییە- دەکوژێت دواتر شەڕی بەردەوامی مێژوو دەست پێ دەکات)(٣).

دەشتوانرێ ناو لەو دووربەرەکییە بنرێت (شەڕی ململانێ لەسەر دەسەلات) بەلام شەریعەت بە

**سایکۆلۆژیەتی کوردی لە رووی مامەلەکردنیدا لە نێوان نێرومێ رەوتێکی نامەنتیقی و نایەکسان پەیڕەو دەکات.**



**• ڕۆسۆ لە ژیانیدا زۆر ڕقی لە پۆلیس بۆتەوە، کەچی بەدیلی پۆلیس پێ نەبووە.**

مەبەستی بوژاندنەوەی تیۆرەکەی لە گشت ئان و ساتێکدا پەنا دەباتە بەر دەقە ئاینییەکان، دیسانەوە شەریعەتی یەکێکە لەوانەی جەخت (تأکید) دەکەنە سەر(سیمبولیکی) زمانی ئایینی، لەو روانگەیەوە کە زمانی (وەحی) زمانێکی رەمزییە. هەر ئەمەشە بۆتە هۆی ئەوەی کە زانایان و توژەران سەرنجێکی هاوچەرانەی بدەنێ، راڤە و تەئویلی سەردەمانەیان بۆ وەحی هەبێ. کەواتە دەسەلات لە دیدی (شەریعەتی)دا لەو دوالیزمە مێژووییەوە تەوەرە دەگرێت کە(قابیل، هابیل) دەکوژێت. بەڵام سەپاندنی دەسەڵاتداریەتییە بە شکل و چەمکە تازەکەی و هەنگاوە پراکتیکییەکانی رەنگە خۆی لە ناو دەمامکەکانی (شۆرشی پیشەسازی) مەلاس دابێت بە تایبەتی لە ولاتانی رۆژئاوا، کە بە جەرگەی ململانێی ئەو بزوتنەوە پیشەسازییە دادەنرێت، دیارە سیستەمی حوکمی ئەو ئیمپراتۆریانە سیستەمێکی ملهوری بووە. چونکە پانتایی بەرفراوانی ژێر دەسەلاتی ئەم سیستەمە و سروشتی جوگرافیای رۆژهەلات، پێداویستی هێنانە ئاراوەی دەسەڵاتێکی رەهای زۆردارانەی دەخولقاند بۆ کۆنترۆل کردنی سەرجەم ویلایەت و هەرێم بەو واتایەی (ولاتانی رۆژئاوا کەوتنە خۆخرکردنەوە بە مەبەستی ئیستغلال کردنی گەلانی دیکە و ژێر دەستە کردنیان بەمەبەستی دەرهانین زەوت کردنی کەرەسە خاوەکانیان و برەو پێدان و بەگرخستنی سەرخانەکانیان و لە روویەکی دیکەوە سەپاندنی دەسەلاتیان بەسەر پانتاییەکی بەرفراوان لە رووبەری خاکەکانیان)(٤)

چونکە خاسیەتی ئەو رژێمانە و تێکرای رژێمە سیاسییەکانی دیکە، هەر لە رۆژی داسەپاندنی دەسەلاتیانەوە، لە رێگای سیستەمی ئایدۆلۆژیەتی خۆیانەوە هەوڵ دەدەن مۆرکێکی یاسایی و سیاسی بەدەست بهێنن. (چونکە یەکەم خەسڵەتی ئیستبدادیەت لە هەر شێوەو پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی - ئابووری دابێت ئەوەیە کە بایەخ بۆ ئادەمیزاد دا نانێت

پرێنسیپی سەرەکی لە حوکمی ملهور وەکو مۆنتسکیۆ لەسەری پێدا دەگرێ بریتییە لە ترسی شێوەی بەپەرچدانەوەی جەماوەری مەحکومە بەرامبەر بە (سروشت)ی حوکم لە سیستەمی ئیستبدادیەتدا)(٥)

هەر ئەمەشە مایەی جێگیربوونی سەرجەم یاسا زۆرە ملێیەکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی پاتر یارکی لە ناوەندە جۆربەجۆرەکانی رێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی (خێزان و حزب و دەوڵەت و...هتد)



بەم شێوەیە و لە ژێر رۆشنایی ئەو چەند دێرەی پێشوو دەکرێ بگوترێت کە دەسەلات لە تیۆرێکی گریمانە مێژوویی و هەولێکی سروشتییەوە دەگوازرێتەوە دەسەلاتێکی کردەی ناسروشتی و یاخود بە چەمکێکی دیکە، دەسەلات حەزەرەمەکییەتێکە کە دواتر بریاری راڤەیەکی سایکۆلۆژیانەی بۆ دەکرێت.

ئەڵبەت کە ئەمانە دەڵێن بە تەنها لەو چەمکەوە سەرچاوە دەگرن کە لە خزمەتی دەروازەی چوونە نێواخنی تەوەرەی سەرەکی باسەکەمانە، هەر بەو مەبەستەش بە سەردێکی خێرا تاوتۆمان لە دەسەلات کرد، کەرەسە ماددیەکان دەکەونە ژێرباری کۆنترۆلەوە، یاخود زاڵبوون بەسەریانەوە لە حەتمیەت بەدەرنییە بەلام شتە ئەبستراکتە و بەرجەستەنەکراوەکان- مانەوەی- لە تایبەتییەتی زاڵ بوون بەدەرن، بەهەمان شێوە مرۆڤەکان ئەگەر چی دەتوانرێت دەست بەسەر زمانیاندا بگیرێت، بەڵام ناتوانرێت بە چەشنێکی هەمووەکی دەست بەسەر هۆشییاندا بگیرێت و بخرێتە ژێر ویست و زاڵگەی-سیطرة- کەسانی دیکەوە. ئەو گوتەی پێشوو ئەگەر چی راستییەکی زۆری تێدایە، بەڵام ناتوانرێت رەهایی(مطلق)یەت لە خۆیدا کۆبکاتەوە.

دکتاتۆر زمانی کەسەکان کۆت وبەند دەکات. بەڵام ئیرادەی ناشکێتە سەر کۆت و بەند کردنی هۆشی کەسەکان هەر ئەمەیە وا دەکات ئەو حەسارانەی کە دکتاتۆرو سەرکردە کاریزمیەکان دروستی دەکەن حوکمیان هەتاهەتایی(الابدیە) نەبێت و کودەتا بەسەر حوکمیاندا نەکەوێتە قالبی دۆگماوە، یان وەکو (بەختیار عەلی) لە خوێندنەوەی- کۆماری ترسدا ئاماژە بۆ ئەو چەمکە ددکات و دەڵێ(توندوتیژی فاکتەری ئێجگار زۆرە کە هەندێ جار لە سادیەتی دکتاتۆرەوە دەست پێ ددکات و هەر لەویاشدا دوایی دێت وەکو لای (کالیگۆلا)(٦) خۆ لەگەڵ ئەو سروشتە سەمەرییە و ئەو جلەوی دەسەلاتەی کە دیکتاتۆرەکان فیزی پێوە لێدەدەن بتوانرایە بەهۆی کلیل دانی زمانەوە، زەینیش کلیل بدرایە، ئەو کات حەتمیەت لەبەر قەرار بوون و چەسپاندنی (دەسەلاتی دۆگمایانەی دیکتاتۆر) بەمانا گشت گیریەکەی-الکلیە- لەسەر بونیادی سۆسیۆلۆژی و دەروونی تاک و دەروونی کۆدا دەچەسپا. دواتر حوکمە توتالیتارەکان کەسەکانیان (کۆمەڵ) دەکردە کۆیلەیەک نەبێتەوە، هەمیشە حوکمەکانی (ئاغا و کۆیلە بەزمانی هیگالیانە) دەسەلات داروبێ دەسەلات پیادە دەکران. کۆمەلگەی کوردەواری کلیلدانی زمانی

بەردەوام تیایدا گوتارێکی باڵا بووە وەک جان جاک روسۆ دەڵێت:

(کەسەکان پەیوەندییەکی ژێرەکی کە لە نێوانیاندا بەیەکیەوەی بەستونەتەوە) (٧) بۆ نموونە رۆسۆ- بەم جۆرە پیادەی دەربڕینەکەی دەکات:

**خەڵکی رەشۆکیهەیە،**
**ئیتر باسی هەرەمێک دەکات**
**کە بە وردی یادە دەکرێ**
**بەم شێوەیە**

لە دەوڵەتدا سیستەمی حوکم وەکو رۆسۆ ئاماژەی بۆ دەکات، لەسەر چەشنە هەرەمەکیەتێک بنیاد نراوە، هەرگیز ئەو پەیوەندییەی سەرکردە. بە کۆمەڵی خەڵک دەبەستێتەوە لە مامەڵە و تاوتۆکردنێکی کۆیلاتیانە تێپەڕ ناکات. (ئەو هەیبەتەی سەرۆک بۆ خۆی دروست دەکات، ئەوپەڕی رۆحی بچووکی و لاوازی لە هاولا تیاندا دەخولقێنێ بۆ ئەوەی ئەو هەیبەتە خورافیە نەشکێت، دەبێت سەرۆک هەمیشە لەسەر حەق بێت و وەک پیاوێکی نەشکەست بێتە بەرچاو) (٨).

ئەم پەیوەندییە کە لە (سەرەوە بۆ خوارەوەیە) کەسەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە، باوک دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی حەسار بە دەوری ژێر دەستەکانی خۆیدا (ژن و کچ و کورەکان) دروست بکات، بە ئارەزووی خۆی دەست بەسەر ویست و ئیرادەو زمانیاندا بگرێت، بەڵام هەرگیز مەرگی ناوەختی نەدەچێژت گەر بهاتایە و وەک چۆن کۆنترۆڵی زمانەکانی کرد ئاواش هۆشەکانی سەرکوت کردبان. لە حەساردا سەربەستی کەسەکان لە خێزاندا باوک دەستی بەسەردا دەگرێت، ئیتر کەسەکان دەبنە کۆیلەیەک لە ژێر سەردەمیەتی باوکدا. لە دەوڵەتدا بە هەمان شێوە (زۆربەی قەیرانەکانی شەرعیەت رەنگدانەوەی گۆڕانکارییەکی قووڵی پەیوەندییەکانی هێزن لە ناوەوەی سیستەمی کۆمەڵایەتی. هەموو شەرعییەتێک بە هەر میقدارێک بوو بێت گوزارشت لە پەیوەندییەکی دیار کراوی هێز دەکات و تەعبیریش لە جۆریی دەسەڵاتێکی دەکات (٩).

رۆسۆ دەیگوت، دەبێ کەسەکان لەو پەیوەندییە کۆیلایەتییە رزگاریان بێت، بۆ ئەوەی بەسەربەستی وەک مرۆڤێکی خاوەن ماف لە ژیاندا بگوزەرێنن دەسەڵات ئەگەر بە چەمکە هەرەمیەکەی رۆسۆ لێکی بدەینەوە. وەک لە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد واتە (فەرمان لە سەرەوە بۆ خوارەوە) یەک دەگرنەوە لەگەڵ فرۆید و چەسپاندن لەلای فرۆید، هەروەها چەمکی (ئاغا و کۆیلە) لەلای هیگل. بە پێی بۆچوونەکانی فرۆید کۆمەڵگە لە (بەرزەمن)دا خۆی ببینێتەوە، واتە لە (خێزاندا بەرزە من باوک بێت و لە خێڵدا سەرۆک خێڵ بێت و لە پارتدا سکرتێری پارت و لە کۆماردا سەرۆک کۆماربێ.. تاد ئەوە ئەمانە هەموویان، ئەگەر لبیدۆکان(غرائز)ی تاک داوای کۆمەڵێک شت بکات، کە لە بابەت (موضوع)دا بۆ تێربوونیان و بۆ دامرکاندنەوەیان. ئەوە هەمیشە (بەرزەمن) رێگە لەو ویستانە دەگرێت، کۆمەڵێک حەسار بە دەوری ئەو لبیدۆیانەدا دەگرێت، ئیتر ئەو حەسارانە

لەلایەک دەوری بوونی دەسەڵاتی (بەرزەمن) دەگرێت، لەلایەکی دیکەوە سەرهەڵدانی- خەفاندنی- غەریزەکان کە ویستی (من)ن بەدیار دەخات.

(گوێ بگرن.. ئەوەی دەیەوێ لەم حەسارەی من نانێکی چەور بخوات نابێ لە قسەم دەربچێ.. ئەوەی حەرامزادە نییە خزمەتی ئەم حەسارە دەکا.) (١٠) لە راستیدا بەهاو نرخی مرۆڤ لە دیدی سایکۆلۆژیەتی حەساردا تەنها ماهیەتە مرۆڤایەتییەکەیەوە باقی پێوەرەکانی دیکە هێندە بایەخیان هەیە کە لە خزمەتی مرۆڤایەتی مرۆڤدا بن. لە نۆڤلێتی حەسارو هەروەها لای فرۆید کە باسی (گرێ ئۆدیب) دەکات. (کاتێک شێرزاد حەسەن. تاوانی کوشتنی باوک کە خۆی گریمانەیەکی فرۆیدە دەکات بە کەرەسەیەکی چیرۆک هەموو ئەو تایبەتمەندییە ژیارو فەرهەنگییانەی پێ دەبەخشێ کە رۆشنبیری کوردی لە تاوانی کوشتنی باوکدا دەیبینێ) (١١)

باوک رەمزی ئەو(بەرزە من) یە، نزمەمن)یش نەوەکانەیان (خێزان، کوڕ، کچ...)ەکانە، کە لەلایەنک ئەو حەسارەی بە دەوری رۆڵەکانیدا کێشاویەتی دەلالەت لە دەسەڵاتی (بەرزەمن- باوک) لەلایەکی دیکەوە لە رێگرتنی(باوک) لە (نزمەمن-نەوەکان) بە شێوەیەکی دیکە بەردەوام (باوک-بەرزەمن) دەیەوێت. هەیبەتی باوکایەتی- الهیمنه الأبویه- بەسەر منداڵەکانی (نزمەمن) بسەپێنێ، لەو دەمەی باوک ناهێڵێ نەوەکان بە کاری تێکردنی غەریزەکانیان هەستن، ئیتر خەفەکردن- کبت- سەرهەڵدەدات سایکۆلۆژیای نەوەکان(خەفە کردن و ترس) لەیەک کاتدا دەست بەسەریاندا دەگرێت، خەفەکردن بە مەبەستی نەهێشتنی- باوک- بۆ ترۆکردنی حەزە کپکراوەکانی نەوەکان، ترس بەمەبەستی - ترسی نەوەکان لە باوک یان وەکو هیگل دەڵێ(ترسی کۆیلەو ئاغا).

(لێرەوە ترسنۆکی دەبێتە یەکەم میکانیزمی خەفەکردنی ئیرادەیی بەرەنگاری جەماوەرو یەکەم دیاردەی سەرهەڵدانی ئیفلیجی عەقلی تەحەداکەر پەتایی ئەم ئیفلیجەش دەبێتە سیمای سەرجەمی ئەو نەخۆشانەی هەموو ئیرادەیەکی تاک مەوداو هەموو تاکێکی کۆمەڵگە) (١٢).

بە دەربڕینێکی سایکۆلۆژی (نەوەکان) کەسایەتییەکی سست و بێ رەوتن پرۆسەی عەقلی ئیرادەییەکانیان لە شێوەی خەفاندنێکی سەرتاسەریدایە لەحەساردا کە راڤەو گوزارشتێکی تەواو لە کۆمەڵگەی کوردی دەکات- باوک- دەوری (بەرزەمن) دەبینێ-.منداڵەکان دەوری (نزمەمن) دەبینن، هەیبەت و شکۆمەندی-باوک دنیایەک وەهمی لەنێو دڵی منداڵەکانیدا دروستکرد و خەفەکردنیش ئالە و دەسەڵات و شکۆمەندییەی سەرهەڵدەدات. بوونی حەساری مادی و قۆرخ کردنی- احتکار- کوڕوکچەکان لەناو ئەو حەسارەدا، بوونی دەسەڵاتێکی رەهایی باوک دەگەیێنی، نەک هەر حەسار بە دەوری کوڕوکچان بەڵکو بەدەوری (بزن و بلبل و ئەسپ وسەگ و کۆتر و..تاد).(حەساری باوک زیندانی کوڕوکچەکانی، تەوێلەی ئەسپ و هێسترەکانی، قەفەزی بولبولەکانی، کۆڵێت و کوڵانەی سەگ و پشیلە

کەروێشک و کۆترەکانی. یەکەم دوامەنزلگەی ژنەکانی)(١٣).
باوک لەو حەساردا خۆی نوێنەرو حوکم دەرە، هەمیشە هەول دەدات نەوەکانی لە ژێرسنووی دەسەڵاتی خۆی دەرنەچن، هەرگیز نابێ لە باوک تێپەڕێت و لەباوک پیرۆزتر بێت، بەڵکو لە حەساردا بڕیارو کردەوەکانیشی وەک خۆی پیرۆزن، لای باوک باشترین منداڵ ئەو منداڵەیەکە لاسایی تەواوی باوک دەکاتەوە، فۆتۆکۆپی دووەمی باوک بێت، بەڵام نەک لە رووی دەسەڵاتەوە، بەڵکو لە رەفتاردا هەتاکەسایەتییەکانی ناو حەسار لە ناو کەسایەتی باوکدا دەتوێنەوەو کەسایەتی خۆیان لە دەست دەدەن باوک دەڵێ(دەزانن بۆ بچووکەکانم خۆشتر دەوێت دەیان بینم هەتا لەنان خواردن و جل لەبەرکردن و کۆکیندا رێک لاسایی من دەکەنەوە من وام و سێبەری خۆم دەوێ...)(١٤) کۆمەڵگەی کوردی بەردەوام باوکەکانی هەر لە باوکی خێزانۆچکەوە بگرە تا سەرۆک حزب (باوکی باڵا)بەردەوام فەرمانیان ئاوەها فەرمانێکی بڕاوە بووە. بەردەوام تاک لە دەسەڵاتیان دەبێت هەموو بیرکردنەوەو کەسایەتی خۆیان لەدەست بدەن و بە فەرمانە شاهانەییەکانی(سەرکردە، ئاغا) بجولێنەوە، چۆن لە حەساردا کەسەکان دەبوا ببوونایە بە نوسخەیەکی باوک و کەسایەتی خۆیان لەدەست بدەن. بەهەمان شێوە کۆمەڵگەی کوردیش هەمیشەتاکەکانی دەبوا ببوونایە بە رۆبۆتێک بە دەستی باوکەوە، (وەک ئێستاش هەمان تارمایی هەیە ئەو کەسانە دڵسۆز و بە ئەمەک بوون، کە بەبێ پرسیار فەرمانەکانی(باوک- سەرکردە...) جێبەجێ دەکەن بەردەوام لە کۆمەڵگەی کوردیدا ماهیەتی کەسەکان بەدەست سەرخێل و دەست رۆیشتوو سەرکردەکانەوەیە، ئەوە سەرکردەیە ماهیەتی حزب و کەسەکان دیار دەکات، نەک گەل ماهیەتی حیزب دیاری بکات، ئەوە باوک بوو لە حەساردا گەوهەری منداڵەکانی دیار دەکرد(یەکێک لە تایبەتمەندیەتی سایکۆلۆژیەتی کەسەکانی تیرەی کوردی پابەندی بوونیانە بە حوکمی دەسەڵاتی رێبەری سەریان بە جۆرێک هەموو سامانی تەنانەت خودی خۆیشی.
پێشکەشی دەکات لە کاتی پێویستدا))(١٥)!

سایکۆلۆژیای پێکهاتەی سۆسیۆلۆژیەتی کۆمەڵگەی کوردی بە شێوەیەکی گشتی(پابەند و پەیوەستروان بە بیرو روحیەتی تیرەکانیان چ ئەوانەی گوندنیشینن، یا ئەوانەی شارنشینن- بەڵام پێشتر لە ژێرباری تیرە دابوون بەمەش چەمکە عەشیرەتگەرییەکەی بووتەتە رێبەرێک و رێنماییەک لە راپەڕاندنی ئەرکەکانیدا، بۆیە هەموو هزرو ویژدانی لە پێناو خزمەت کردنی ئەودا دەخاتە کار)(١٦).

ئەگەر لە حەساردا بڕوانیتە نێو سایکۆلۆژیای کوردی ئەوا، قەیرە کچ و کوڕە بە ساڵا چووەکانیان لە رووی بوعدە فرۆیدییکەیەوە تەواو خەفەکراون و خەفە دەکرێن، دەسەڵاتی باوکە نایەلێت لای شێرزاد حەسەن کچ و کوڕەکانی پێویستیە بایەلۆجیەکانیان، باوک نایەوێت کچ و کوڕەکانی زمانیان بەرامبەری لە گۆکردن دابێت، دەشێ شەرم سەرتاپای تاکەکانی کۆمەڵ دەست بەسەردا بگرێت. ئەم شەرمەش وا بکات تاکەکانی خێزان. جگە لە باوک. کەس فەرماندا و نەبێت کەس خاوەن ویست و ئیرادەی نەبێت، باوکە دەڵێت:

(خوام لەو خوایە ژنان لەبەر چاوی من بنێشت بخوون یان ئاو بخۆنەوە یان ئەوەتا ببینم کچان بێ شەرمانە کەزی و پیسێنکان بەردەدەنەوە، قژ دابنێن)(١٧).

سایکۆلۆژیەتی کوردی لە رووی مامەڵە کردنیدا لە نێوان (نێرومێ، باوک و دایک، کوڕ وکچ) رەوتێکی نامەنتیقی و نایەکسانیخوازی پەیڕەودەکات. بەردەوام بۆ کاروهەڵوێستی (شایەن، چاکە) جەخت دەکرێتە سەر (نێر) بوونی (مێ)ش تەنها لە پێناو بەرەوپێشەوەبردنی ئەو کارە (شایەن و چاکە)ی (نێرە)کەیە.

(پێویستە لەسەر (کچ-مێ)ی کوردی بیر لە خۆی نەکاتەوە، بەردەوام دەبێ لە ژێر ویستی لە خۆی لە پێشتر و پێشکەوتووتر بێت. لە هەموو روویەکەوە کە مەبەست لەوانیش (پیاو-نێرە)، بە جۆرێک بکەوێتە ژێر گوێڕایەڵی کردنیان، ئەندێشەی پڕ بکات لەوتەی پەروەردەیی ئەوان، تارادەیەکی زۆر بە مەبەستی بوونی بە کچێکی نموونەیی بەرز، بۆیە هەر کە ئەو کچانە تەمەنیان دەگاتە دەساڵان کچی شەرمنیان لێدەردەچێت و هەست بەکەم و کورپیەکی زۆر دەکەن ئەمەش کاتێک بە دیار دەکەوێت کە کچەکان ئامادەی کۆڕ و مەجلیسی پیاوەکان دەبن، لەو کاتەدا ئەوەندەی دیکە حەساسیەت و ترس و لەروویان دەنیشێت، بە جۆرێک چاوەکانیان لە رووی دیدنی پیاوەکاندا دادەنێن، شۆڕ دەکەن.((١٨)

لە کۆمەڵگەی کوردیدا باوک مەرکەز و سەنتەری دەسەڵاتە، بەوەی لەخێزانەکاندا بە شێوەیەکی گشتی سیستەمێکی (باوکایەتی- باوک سالاری) پەیڕەو دەکرێت. باوک- بەرپرسی یەکەم و کۆتایی بەرێوەبردنی ئەرکەکانی خێزانە، باوک زاڵگە و پاسەوانی کەرامەت و شەرەفیانە.. تاد.

هەر لەم بارەیەوە (بارت) دەڵێت (باوک وەکو دابونەریتێک لە خێزاندا سەریەلە دواتر منداڵەکان، کوڕ بە پلەی یەکەم ئینجا کچ ژنیش جێگایەکی سانەوەی هەیە)(١٩)

دەسەڵاتی-نێر- لە خێزانی کوردیدا بە کۆمەڵێک بیانووی باوک سالاری حوکمی رەها-مطلق- بەسەر (مێینە)دا دەکا، کچ هەتا نەگاتە قۆناغی شووکردن لە قەفەسێکدایە کە نەک هەر نازانێ بوونی خۆی چییە، بەڵکو زۆریش باوەڕدارە بەو کۆیلەیەتییەی کە دەیباتە سەر.

-کوڕ-ئەگەر بچوکتریش بێ لە-کچ- بە تەمەن، بە پێی خاڵێک لە پەیڕەو وپرۆگرامی سیستەمی باوک حەقی پێ دراوە لاساریی بەرامبەر بەم کچە بکا و، ئەویش دەبێ نۆکەر و لە خزمەتیابێ.

ژیانی کچ یاخود ئافرەت لە کۆمەڵی کوردەواری هەموو ژیانی مامەڵە کردنە لەگەڵ تەوتەمی کەرەسەکانی ناو ماڵ و مەتبەخ و، شەوو رۆژ بە درێژایی تەمەنی لە نێو چوار دیواری ترسناکدا گوزەران دەکا، هاو کات بۆشی نییە رەئی هەبێ چونکە ئافرەتە، هەر ئەم ئافرەتەش بەیانی کاتێک جیادەبێتەوە و شوودەکات کۆمەڵێک منداڵ دەخاتەوە ئەویش سیستەمێکی نوێی دایک

سالاری کە تووتی سیستەمی باوکە پێک دەهێنێ و بوونی نەوەیەکی دیکە لە مێینە لە ناو چێشتخانەکان دەپەستێ)(٢٠)

بۆیە هەر لە سەرەتاوە ئەم سەپاندن و داگیرکردن و توندوتیژییە دەبێتە دێوەزمەیەک بەسەریەوە هەر ئەوەیش وای لێ دەکات کە سایکۆلۆژیەتێکی تایبەتمەندی بۆ دروست بێت هەر ئەم ڕێچکەیەشە پاشەڕۆژ وا لە کورد دەکات ببێتە قەیسەرێک و عەقڵیەتی نەوەیەکی نوێتر لە خوێن هەڵدەکێشێ.

هەر لەم بارەوە لە سەر پێکهاتەی ئەو سیستەمی ڕیزکردنی پلەو پایەی خێزانی کوردی کە لە(باوک، کوڕ،کچ،دایک) دەچێت(د. عزەددین مستەفا ڕەسول) لە کتێبی (الواقعیة في الادب الکردي)دا دەڵێ (بەشێوەیەکی گشتی (ژن) لە کۆمەڵگەی کوریدا لە ژێر بارو ویستی پیاو دایە، سەرەڕای بەشداری کردنی(ژن) لە ڕاپەڕاندنی کارەکان، کەچی مافی مولکداریەتی کردنی وەکو پیاو نییە)(٢١)

بۆیە لە سیستەمی خێزان، باوک دەمڕاست و بڕیارمەندی هەموو تاکێکی خێزانە بە کوڕ و کچەوە.

(ئیمپراتۆرە مەزنەکەی باوک لەخێزاندا بە خۆی و شمشێرە سەرتاپا ژەنگ گرتودکەیەوە ئامادە باشە کە هەر لەو ڕۆژی منداڵەکە لە دایک دەبێ کۆمەڵێک تێز و دەقی خودو دوێنێی خۆی بەسەر دەسەپێنێ و دەیکا بە سۆفی تەکیەی عەقڵیەتی خۆی و هەر خۆی پاسەوانی لێ دەکا، دەبێ کوڕەکە پیاو بێ، پیاوەتی لەلای وایە کە ئەم چی گوت ئەویش وەکو تووتی بیلێتەوە پراکتیکی بکا. بۆیە فەردی کورد بە عەقڵیەتێکی نەزۆک و ئیفلیجیەوە دێتە ژیانەوەو بەبێ هیچ ئاگایەکی خودی ئازادی لێ زەوت دەکرێ، واتە لە دایک بوون+بۆشایی+مەرگ)(٢٢)

لێرەدا دەکرێ بوترێ سیستەمی باوک سالاری لە ڕێگای چاودێری و کۆنترۆل و هەوڵدانی نەمر کردنی ناوی باوکە بە هۆی گواستنەوەی ناوی باوک بۆ کوڕەکان. قەیرانەکانی حەساریش لێرەوەن کەکوشتنی باوک تەنیا کوشتنی جەستە مادییەکەیەتی، ئەگینا ئەو بونیادی (دەسەڵاتی پیرۆزەی) هەر ماوەو نەکوژراوە؟!

لەم بارەیەوە (بۆدلێر) دەڵێت:

(مرۆڤایەتی لە نەفرەتی باوک رزگاری نەبووە، هەوڵێکی زۆر کوشندەی هەیە بۆ ئەوەی لە نەفرەتی باوک رزگاری بێت)(٢٣)

(شێرازاد حەسەن) بەم شێوەیە ئامادەیی باوک دەناسێنێت:

(باوک ئەو دەسەڵاتە پڕ زەبرو زەنگەیە کە مرۆڤ تیادا دەخەسێنێ و دەترسێنێ و لەوانەیە بگاتە هێزە باڵاکانیشی کە ئیش کردنە لەسەر خەساندنی(تاک)، تاکی کوردیش لە کۆمەڵگەی باوک سالاری یان پەتر یارکی- کەسێک نییە گیرۆدەی ئە حاڵەتە نەبوو بێت..)(٢٤).

وەک لە پێشتر ناڕاستەوخۆ گوتمان، دەسەڵاتی حەسار تەنها دەسەڵاتێک نییە لە نێو یەکەیەکی گرنگی سۆسیۆلۆژی وەک (خێزان)دا رابوەستێ، بەڵکو یەکەیەکە دادەبەزێتە نێو سیاسەت و بەڕێوەبردنە جۆراوجۆرەکانەوە، واتە هەر لە خێزانەوە هەتا دەوڵەت- ئەگەر بشێت- باوکەکان (باوکی بایولۆجي و باوکی حیزب. باوکی خێل.. تاد) لە نێو نێمەدا پەیوندیان لەگەڵ خوارەوەدا پەیوەندی ترسە نەک سۆز، بەردەوام لە نێو حەسەرەکانی ئێمەدا ترس و تۆقین جێگەی سۆز و بەزەیی گرتۆتەوە. تا ئێرە باس لەبەرجەستەیی بوونی تیۆری فرۆید (گرێی ئۆدیب) کرا لە حەساردا.

ئێستا ئەگەر بە چەمکە (هیگل)یەکەی (ئاغا وکۆیلە/سەید و عەبد) بڕوانینە نێو حەسار (باوک و نەوەکان)ئەوە لە هەمان تەودرەدا یەک دەگرنەوە لەگەڵ چەمکە فرۆیدییەکەی «بەرزەمن و نزمەمن» کە بەر لەئێستاش شتێکمان خستە سەر. لەلای هیگل کاتێ سەیری کۆمەڵگەی بورژوازی دەکرد هەستی دەکرد کەچینی سەردوە(ئاغا-سەید) بەکاریەری ڕەنج و کۆششەکانی چینی خوارەوەیە(کۆیلە- عەبد) ئەو ڕەخنەی لەوە دەگرت کەزۆرینەی هەرە زۆری خەڵک سەربەستیان لەدەست داوەو چەمکی سەربەستی لە(کۆیلە)سەندراوەو(ئاغا) هەموو ئەو چەمکەی لەخۆیدا کۆکردۆتەوەو هیگل پێ وابوو هەندێکی زۆر کەم لەگەڵ سەربەستن. بەردەوام هەوڵی دەدا لەبۆچوونەکانیدا ئەو سەربەستییە زەوت کراوە بۆ کەسەکان بێگێڕێتەوە. ئەگەر لەبۆچوونەکانی «هیگل»ەوە بڕوانینە حەسار، ئەوە چەمکی (ئاغاو کۆیلە) بەروونی بەدیار دەکەوێت، لەحەسار (باوک) ڕەمزی(ئاغا)یە ئەو باوکەی کەسەتیە نیە خۆی لەدەسەڵاتێکی ڕەهادا دەبینێتەوە کاتێک کە(کۆیلە) (کوڕو کچەکان خۆی) بەحوکمی دەسەڵاتی خۆی دەچەوسێنێتەوە پەیوەندی (ئاغاو کۆیلە) لای هیگل تەنها پەیوەندی سودی (ئاغا) پێکەوەی بەستونەتەوە، شتێک کە بگوترێت «سۆز» لەنێوان ئەو دوانەدا نییە.

ئا لێرەدا کۆمەڵگەی کوردی (لەحەساردا) قەیرانەکەی سەرهەڵدەدات، پەیوەندی نێوان باوک و نەوەکان پەیوەندییەکی باوکانە نییە، واتە پەیوەندییەک نییە لەسەر بنەمای «سۆز» دامەزرابێت، بەڵکو پەیوەندییەکە لەسەر بنەمای دەسەڵات دامەزراوە، ئیتر(باوک) چەمکی باوکایەتی خۆی لەدەست دەدات و دەبێتە سەرکردەیەکی خاوەن بازو، نەوەکانیش دەبنە سەربازێک کەهەمیشە ترسی باوک لەدڵیاندایە.

ڕاڤەی ئەم دیدەیە، لەو ڕووەوەیە کە (سۆز) لەسەر بنەمای خۆشەویستی دامەزراوە، خۆشەویستیش واتە خەمخۆری وەفاداریی...تاد.

«لەو ناوەندە کۆمەڵایەتیانەدا کە لەسەر بناخەی(سۆز) دامەزاون.دەوری بەرژەوەندی ماددی تێیاندا هیچە یاخود کزە... چونکە سۆز واتە خۆشەویستی خۆشەویستیش حاڵەتێکی رۆحییەو، جۆرە پڕکێشی و وابەستەیەکە لەنێوان رۆحەکاندا ملکەچی بەرژەوەندی ماددی نییە، بگرە زۆرجار بەرژەوەندی ماددی دەکرێتە قوربانی پاراستنی بوون و کەرامەتی خۆشەویست)(٢٥). بوون ئەو فاکتەرە مانەوییە ئەلتەر ناتیڤە بۆ ئەو«باوکە دیکتاتۆرەیە» کەقەیرانی ون بوونی «باوکی بایە لۆجی و سۆسیۆلۆژی کوردی» لە(حەسار)دا هێناویەتە کایەوە!!. کەواتە ئەمانەیە وا لەسەرکردەی خێزان دەکات«باوک» بێت. نەک«ئاغا». گەورەترین مەترسی ئەوەیە کەباوکەکان (باوکی بایەلۆجی) باوکی

حیزب، باوکی خێڵ، باوکی دەوڵەت.... تاد) وابزانن کەئەوانەی لەژێر دەستیانن کۆیلەی ئەوانن.

باوکی کوردی راستە زۆرێک لەوئاکارە باوکایەتی پێوە ماوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سروشتی باوکایەتی تێکچووە ، بەزۆری باوکەکانمان دیکتاتۆرێکن کەسانی ژێردەستیان لەژێردەستیان لەنێو حزب و خێڵ... کوردیدا وەک کۆیلەیەک دەبینن، بەڵام پێویستە دان بەوەشدا بنرێ کەباوک- ئا بەم شێوەیە لەخێزاندا بەرجەستە نابێت(واتە باوک لە خێزاندا کۆیەیەو باوکە نییە کە سەرکردەی حزبێکمانە، بەڵام لە هەمان کاتدا لە سیفەتەکانی ئەو خۆی بێبەش نەکردووە، بەم جۆرە باوک لەخێزانی ئێمەدا تێکەڵەلە دیکتاتۆرێک و دڵسۆزێک. بەڵام لەو قەناعەتە دانییە کەباوکی خێزانمان دیکتاتۆرییەکەی زیاترە لەدڵسۆزییەکەی «هەرمنداڵێکم قامچی منی بەرنەکەوێ نەقەڵەو دەبێ و نەتەمەنیشی درێژ دەبێ.. خۆ بەخۆڕایی نەبووە(سمایل) گەردەنی خۆی خستۆتە بەرکێردی(برایم) پێغەمبەری باوکی...ها؟» (٢٦)

ئیتر گرفتی ئێمە ئالێرەدا سەرهەڵدەدات. باوکەکان زیاتر لەوەی دڵسۆزێک بن بۆ نەوەکانیان دیکتاتۆرێکن بۆ نەوەکانیان، ئەو عەقڵەی لەپێکهاتەی- تشکیلە-ی سەرکردەکانی حیزب و خێڵماندا هەیە. دەگوازرێنەوە بۆ سەرکردە، خێزان کەباوکە-کاتێ باوکمان لەژێر دەسەڵاتی سەرکردە- کاریزمە تاک رەوەکانمان دابوون. کاتێ باوکمان وەک کۆیلەیەک لەژێر دەسەڵاتی ئاغادابووە مامەڵەی ئاغا- لەگەڵ- باوکماندا- مامەڵەکردنێکی- ئاغاو کۆیلایەتیانە- بوو، باوکیشمان هەمان رەفتاری لەگەڵ منداڵەکانیدا دەکرد لە(سنوری خێزاندا) کاتێک هەستی دەکرد لەژێر دەسەڵاتی ئاغادا سەروەری و سەرکردەی لەدەست چووە، ئەوا لەماڵەوە ئەو (سەرکردەییە بزر) دەدۆزێتەوە، ئەویش لەناو خێزاندا دەبووە ئاغایەکی دیکە بەسەر منداڵەکانییەوە، واتە باوکی ئێمە لەجێی ئەوەی دڵسۆزێک بێت بۆتە دیکتاتۆرێک. وەک چۆن سەرۆک خێڵ و حیزب و... حەسار بەدەوری سەربەستی کەسانی ژێردەستیاندا دەکێشێن، بەهەمان شێوە باوک حەسار بە دەوری منداڵەکانیدا دەکێشێت ئیتر باوک زۆرێک لە(خۆشەویستی و دڵسۆزی و هیوری...تاد) بەرامبەر بەمنداڵەکانی لەدەست دەدات و لەناو

دەچێت لەجێی ئەوانە (غەزەب و قەهرو....تاد) باوک لەحەساری ماڵەوەدا سەرهەڵدەداتە لەلایەکی دیکەوە سروشتی کۆمەڵگەی کوردەواری، کۆمەڵگەیەکی لەناو ژیاریکی-حضارە- پاشکۆدا دەژی، «لەناو کوردەکاندا جاهیلی(نەزانی) زۆر بڵاوە» (٢٧).

بۆیە گۆڕان لەعەقڵی مرۆڤی کوردیدا زۆر بەگرانی دەکرێت، بەتایبەتی هەتابەرەو دواوە بگەڕێنەوە ئەو گۆڕانە هەست دەکەیت زۆرتری کات ویستوە لەئێستا.

بۆیە گۆڕان لەعەقڵی نەوەدا ئاسانترە هەتا باوک، ئیتر کاتێک گۆڕانێک لەعەقڵی نەوەکاندا روودەدات، باوک عەقڵی بەنەگۆڕی دەمێنێتەوە- (ئەمە بەراوردکردنی لەگەڵ نەوەکانیدا) بۆیە کاتێک عەقڵی نەوەکان دەگۆڕێت، باوک هەست دەکات نەوەکان دەیانەوێت لەژێر دەسەڵاتێکدا یاخی بن، چونکە باوک بۆی دەردەکەوێ کەرۆڵەکانی نەبوونەتە نووسخەی دووهەمی ئەو-طبق الاصل-، ئیتر قەهری باوک و غەزەبەکەی دەیگرێتەوە، وادەزانێت کۆیلەکانی دەیانەوێت«فەرمانە پیرۆزەکانی تێک بشکێنن». وادەزانێت رۆڵەکانی لەحەسارەکانەوە خەریکن هەڵدێن. بۆیە زۆرترین کات دەیەوێت کۆنترۆڵیان کاتەوە- لەرێگەی سروشتە دیکتاتۆرییەکەی نەک بەکایەیەکی مەعریفیانەوە-.

(رۆسۆ) لەژیانیدا (زۆر رقی لەپۆلیس بۆتەوە، کەچی بەدیلی پۆلیسی پێ نەبووە، واتا کاتێک دەڵێت«رەوابۆ نەهێشتنی پۆلیس کەسێکی شک نەدەبرد لەجێگەی پۆلیس دابنێت».

ئێستا وەکو چۆن(رۆسۆ) رقی لەپۆلیس دەبووەوە چونکە پۆلیس سەربەستی کەسەکان زەوت دەکات ئاوەها«شێرزاد حەسەن» لەم نۆڤلێتەدا-(حەسارو سەگەکانی باوکم) رقی لەباوکەکانەو دەیەوێت پلان- تخطیط بۆلەناوبردنیان دابنێت، هەروەها وەک چۆن«رۆسۆ» کاتێ رقی لەپۆلیس بوو و جێنشینی-بدیل- پۆلیسی پێنەبوو تاوەکو لەجێگەی دابنێت، بەهەمان شێوە (شێرزاد حەسەن) رقی لەباوکەکانە و، کاتێ باوک لە(حەسارو سەگەکانی باوکمدا)دەکوژرێت، ئیتر دوای کوشتنی کەسەکان(کوڕ،کچ،ژن) دڵخۆش نابن، بۆیە زۆرجار منداڵەکان پەشیمان دەبنەوە لەکارەکەیان زۆرجار پێیان خۆشە، واتە نەوەکان لەحاڵەتێکدان لەنێوان (پەشیمان بونەوەو دەست خۆشیکردن)، چونکە کاتێک(باوک) دەکوژرێت و نەوەکان سەربەستیان - -پەرتەوازەو پەراگەندەدەبێت دنیایەکی بێ یاساو پەرتەوازە لەدایک دەبێت. «هەرخۆم تەنیا مامەوە کاروانەکە وەک تەزبیحێکی هەزارو یەک قل پچڕاو دەنکەکانی هەڵوەرین.... ئاواهی خوشک و براکانم لەدەست چوون چاووڕام لێ کردنی بێ هودەبوو... یەکەیەکە بەدەم رێوە خۆیان دزییەوە.... زۆریان رەویان کرد، رەدوکەوتن.... هەرزوو تازە بالغ بووەکانیش لەترسی خوێنی-باوکە سەری خۆیان بەکەرتە شاخەکاندا دەدا.....تاد» (٢٨).

ئیتر(شێرزاد) وەکو (رۆسۆ) پاش کوشتنی باوک هیچ بەدیلێکی ئەوتۆی پێ نییە، بۆیە هاوار بۆ باوکە کوژرراوەکەی دەبات و دەڵێت (هاوارم وەبەرتۆ.. لەسەگەکانت قورتارم کەوبمکەوە بەکوڕی خۆت... جارێکی وابکە هەوای پاکی هەڵمژم... ئازادم کەو تاحەسارەکەت ئتوەدان کەمەوە.. موعجیزەی خۆتم پێشان بدەو لەگوناهم خۆش بە.. ئێستا هەموو دونیا زانی تۆ بەمردوویش لەهەمووماندا زیندووتری، رووخسەتم بەرێ بچمەوە حەسار» (٢٩).

نۆڤلێتی (حەسار) بەرهەمێکە زادەی نووسەرێکی کوردە بە پێی توانای پەی بردنی بە گرفتانەکانی کۆمەڵگەی کوردی، لە چەند خاڵێکدا دەستنیشانی ئەو گرفتانە دەکات و خودی دەست نیشانی کردنەکانیش ئەگەر چارەسەر کردن نەبێ ئەوا جۆرێکە لە هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتانەی تێدایە. بۆیە ئەم خاڵانە دەشێ ئێمە بە ئەنجامێکی کۆک و شیاو و دیارییان بکەین:

یەکەم: لای شێرزاد حەسەن. کۆمەڵگەی کوردی کۆمەڵگەیەکی تەواو (باوک ساڵاریە) باوک بڕیاری سەرەتا و کۆتایی لە دەست دایە، ئیتر باوک دەشێ چەمکێکی فراوانتری بدەینێ (باوکی خێزان، باوکی حزب، باوکی خێڵ...تاد)

دووەم/ نۆڤلێت کۆمەڵگەی کوردی مادامەکی کۆمەڵگەیەکی باوک سالارییە ،راستەوخۆ دەچێتە ژێر حەقیقەتێکە وە ئەویش حەتیمەتی(خەفاندن)ە، بۆیە لای (شێرزاد حەسەن) هەموو تاکێکی کوردی لەو پەڕی بێ دەسەلاتیدان لەبەردەم داواکردنی ویستەکانی خۆیان.

سێیەم/ لە (حەسار)دا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە پەیوەندی (باوک و نەوە) لە نێو کۆمەڵگەی کوردیدا دووچاری ئیفلیجی هاتووە، بەواتای پەیوەندی(باوک و نەوە) پەیوەندییە کە لەسەر بنەمای ماسولکە و هێزە، لە جێگای ئەوەی پەیوەندییەکی (عەقلانی- سۆزدار) بێت.

چوارەم/ لای (شێرزاد) مردنی باوک یەکسان نییە بە مردنی دەسەلات، چونکە دامەزراوێک لە پشت باوکەوە هەیە کە دامەزراوی باوک ساڵاریە، هەردەم توانایی بەردەوامی پێدانی دەسەلاتی هەیە لەگەڵ کۆتایی سیستەمی باوک سالاری دەتوانین باس لە کۆتایی دەسەلاتی باوک بکەین ئەگینا وێنەکانی باوک، ئاکارەکانی، لە یادەوەری کۆمەڵایەتیدا دەبنە دەسەلاتێکی بەردەوام بەسەر رۆحیەت و بیرکردنەوەیدا، واتا ئەگەر گریمانەی ئەوەش هەبێ جەستەی ئینسان لە زەبرەکانی رزگاری بێت، ئەو دەسەلاتە دەگوازرێتەوە بۆ سەر رۆحیەت و وێرانی دەکات.

**سەرچاوەکان:**

١- جەلال خەلەف ژاژلەیی، کەسێتی سەرکەوتوو، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٧، ل ٤٠ .
٢- هاشم طه عقراوي، الاسس النفسية و الاجتماعية للقبائل الكردية، مطبعة بلدية كركوك، ١٩٧١، ل٤١ .
٣- موسلیح عەبدولقەهار نیروانی، ملسلانێ لەبیری کۆمەڵایەتی د.عەلی شەریعەتیدا، گۆڤاری کاروان، ژمارە(١١٧)، ١٩٩٧، ل٧٧ .
٤- عبدالله عبدالرحمن البكير، مفهوم جون اردن للغضب و الاجتماع، دار الحريه للطباعه، بغداد، ١٩٨٥ ل٩٧ .
٥- محەمەد کاکەیی، تیۆری گشتی دیکتاتۆریەت، گۆڤاری پەیامی وەرگێر، ژمارە (١-٢)، ١٩٩٢، ل١٥٧
٦- بەختیار عەلی، کۆماری ترس، گۆڤاری گەلاوێژی نوێ، ژمارە (٢)، ١٩٩٧، ل ٢٠
٧- جان جاك روسو، في العقد الاجتماعي، ترجمه ذوقان قرقوط، دار القلم، لبنان- بيروت، ل ٣٥
٨- بەختیار عەلی، کۆماری ترس، گۆڤاری گەلاوێژی نوێ، ژمارە (٢)، ١٩٩٧، ل ٢٠
٩- محەمەد کاکەیی، تیۆری گشتی دیکتاتۆریەت، گۆڤاری پەیامی وەرگێر، ژمارە (١-٢)، ١٩٩٢، ل١٤٧
١٠- شێرزاد حەسەن، حەسارو سەگەکانی باوکم، چاپی یەکەم، چاپخانەی پەروەردە، هەولێر ، ١٩٩٦ ، ل ١٩
١١- ڕێبین ئەحمەد هەردی، باوکی کوردی لە نێوان کوشتن و زیندوو بوونەوەدا، گۆڤاری گەلاوێژی نوێ، ژمارە (١)، ١٩٩٧، ل ٦٥
١٢- حەسەن هەمزە، تاک و پەیوەندییە زۆرە ملێیەکانی رۆژهەڵات، گۆڤاری رامان، ژمارە (٥)، ١٩٩٧، ل ٥٠
١٣- شێرزاد حەسەن، حەسارو سەگەکانی باوکم، چاپی یەکەم، چاپخانەی پەروەردە. هەولێر ، ١٩٩٦ ، ل ١٠
١٤- هەمان سەرچاوە ل٢٤
١٥- هاشم طه عقراوي، الاسس النفسيه و الجتماعيه للقبائل الكرديه، مطبعه بلديه كركوك، ١٩٧١، ل ٧٧ .
١٦- هەمان سەرچاوە، ل ٦٩
١٧- شێرزاد حەسەن، حەسارو سەگەکانی باوکم، چاپی یەکەم، چاپخانەی پەروەردە، هەولێر ، ١٩٩٦ ، ل ١٨
١٨- هاشم طه عقراوي، الاسس النفسيه و الاجتماعيه للقبائل الكرديه، مطبعه كركوك، ١٩٧١، ل ١١٩ .
١٩- هەمان سەرچاوە پێشوو. ل ١١٨
٢٠- ئاسۆ بابان، سەرەتایەک لە سایکۆلۆژیا و سیسۆیۆلۆتیکی کوردی، گۆڤاری پێشکەوتن، ژمارە(٥٨)، ١٩٩٥، ل ١٢
٢١- د. عزالدين مصطفى رسول، الواقعيه في الادب الكردي، صيدا بيروت، ١٩٦٦، ل ٨٧.
٢٢- ئاسۆ بابان، سەرەتایەک لە سایکۆلۆژیا و سیسۆیۆلۆتیکی کوردی، گۆڤاری پێشکەوتن، ژمارە(٥٨)، ١٩٩٥، ل ١٢
٢٣-توانا ئەحمەد، رەخنەگرتن لە دەسەلات، گۆڤاری گوتار، ژمارە(٣-٤)، ١٩٩٧، ل ١٧
٢٤- ئازاد عەبدولواحید چاوپێکەوتن لەگەڵ شێرزاد حەسەن. گۆڤاری رامان، ژمارە (٨)، ١٩٩٧،ل ٥٦
٢٥- عومەر علی غفور، مافی ئافرەت لە نێوان رەگەز ساڵاری و مرۆڤ ساڵاریدا، چاپخانەی بازاری.راپەڕین، سلێمانی،١٩٩٧ل ٦٠
٢٦- شێرزاد حەسەن، حەسارو سەگەکانی باوکم، چاپی یەکەم، چاپخانەی پەروەردە. هەولێر ، ١٩٩٦ ، ل ٢٣
٢٧- مەلا محمودی بایەزیدی و داب ونەریتی کوردەکان، وەرگێڕانی دکتۆر شوکریە رەسول، چاپخانەی ئەلعەدالە، بەغدا، ١٩٨٢، ل ٤١
٢٨- شێرزاد حەسەن، حەسارو سەگەکانی باوکم، چاپی یەکەم، چاپخانەی پەروەردە. هەولێر ، ١٩٩٦ ، ل ٥٨
٢٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧٦ .

**ئەم توێژینەوە ، لە ساڵی (١٩٩٧-١٩٩٨) پێشکەش بە سەرۆکایەتی بەشی کوردی، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین کراوە. بە پلەی (ئیمتیاز) قبوول کراوە. بەسەرپەرشتی :( د. شوکریەرەسول، د. پەرێز سابیر، د. کەمال معروف)**

# فینۆلۆژیای ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوە

ستاری پیرداودی

١-٢

## پێشگەشت

له تەک خۆلێکراکشانی جەستەی ئەدەب و لەرینەوەی ژێیەکانی نوێکردنەوەو پاکژکردنەوەی هەیکەلی رەخنەی ئەدەبیدا چەندین رایەڵ و میتۆدی مۆدێرنیستی رەخنەیی بۆ لەراندنەوەی ژێیە تەمگرتووەکان و راڤە کردن و خوێندنەوەی تێکستی ئەدەبی هاتنە خولقان و دەستیان کرد بەنەشوغاکردن هەر دانەیەکیش لەو میتۆد و تیۆریزە ئەدەبی و رەخنەییانە توانیویانە زاراوەو چەمکێکی مۆدێرنیستی ئەدەبی و رەخنەییانە لە تەک خۆیاندا بخولقێنن و بیهێننە هەناسەدان، کە لە پێشودا نەیانتوانیوە ئەو جۆرە چەمک و ئەرکە ئەدەبیانە بە خۆیاندا هەڵبگرن کە بیرمەندێکی ئەدەبی یان وردبینێکی رەخنەیی بە فۆرم و جەستە و شێوازێکی دیکە دەینەخشێنێ و لەناو چەمک و زاراوە ئەدەبییەکانی دیکە. وەک (سیمیۆلۆژیا.. تەفکیکییەت.. هیرمینۆتیکا.. میتازمان..

دال و مەدلوولی.. کۆد... گوتار.. دەسپێک.. تاد) بێگومان ئەم چەمک و زاراوانەش بە رەنگ و فۆرمێکی دیکە جیا لە فۆرمە کۆنەکە بەکار دەبرێن، سەرجەم ئەم میتۆدانە دەبنە فۆرم و کەرەسەیەکی دی و خوێندنەوە و راڤەکردنێکی قووڵ و وردتری تێکستی ئەدەبی دێنەکایەوە-

لە نێو بازنە و سکێچی هەر پێکهاتەیەکی ژیاریدا؛ چەمکەکان ئەگەر چی لە رووی قەوارەی فۆرمەوە بچووک و سادە و شەفافن، بەڵام گەنجینەی کۆمەڵێک رایەڵی دەلالی و هانا و چەمکی فرەن، کە زۆرجار تەوق و بازنەی پێکهاتە زمانییەکان دەبڕن و تێکیی دەشکێنن و تێیدا نهێنییە دانە فەلسەفی و ئەبستیمییەکانی سەردەم و کۆمەڵگاکانی خۆیان نمایش دەکەن. ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەبێتە ماهیەت و دەلالەتێک لە کەڵەکەبوونی هەنگاوە هزرییەکان و بەرجەستە کردنی لایەنە پەنهان و نادیارەکانی سەرجەم دانە زمانیە حەشاردراوەکانی نێو بونیادی دەق لە ئاراستەیەک و لایەکی دیکە بۆ رووتکاری و دەرخستنی لایەنی ئێستاتیکی و هونەری و سیمۆلۆژی و میتازمانی..

• **پرۆسەی نووسین و کەشفکردنی جەستەی بەرامبەر کردەیەکی جەوهەری و پڕ بەهایە بۆ سکێچی بە خود بوون.**

نیگاگرتن لەو پرۆسەی مێژووییانەی کە فۆرم و جەستەی (ئەو)ی بەرامبەریان خولقاندووە هێناویانەتە بوون، یاخود نیگاگرتن و تێرامان لەوەتەرو رەهەندە پێکهاتووەکانی جەستەکە.. ئەمەش سروشتی پرۆسەیەکە بە گوتاربیوونمان فۆرمەلە دەکات ، کاتێکیش تیشکە نیگایەک ئاراستەی جەستەو هەیکەلی بەرامبەر دەکەین، ئەوە ئەوکات تەقسێکی کریستاڵی بە رووی جەستەی خودی خۆماندا واڵا دەکەین، بەهانا واڵاکردنی دەرگا کلۆمدراوەکان بۆ دۆزینە و بەرجەستەکردنی بنچە و ماهیەتی جەستەی (ئەو)ی بەرامبەر، ئەمەش هەنگاو و رەهەند و سەهەمێکی پڕبایەخە بۆ شکاندنی ئەوتەوقە و بازنە و زیندانییەی کە جەستەی ئێمە تێدا نیشتەجێکراوە.

پرۆسەی نووسین و کەشفکردنی جەستەی بەرامبەر کردەیەکی جەوهەری و پڕ بەهایە بۆ سکێچی بەخودبوون. یا بە جەمسەر بوونی (منی خود) لە بەرامبەر (ئەوی خود)، بۆیە دەشێت بێژین: کە ڕوانین و کەشفکردنی (خود) بەبۆ بوونی کردەی کەشفکردن و دۆزینەوەی جەستەی (ئەوای بەرامبەر ناگاتە پڕ بوون و پلەی کاملی).

لەم لێتوژینەوەیەدا کە باسی تیۆرەکانی هەڵوەشاندنەوە و راڤەکردن دەکەین، واتە باسی راڤەکردنی بونیادی دەق. لەنێو پانتایی و فەزای میتۆدە رەخنەییە مۆدێرنیستییەکاندا. هەروەک دەزانین (رەخنەی ئەدەبی) لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و بیستدا، بە گەڵێ رایەڵ و ئاراستەی میتۆدە جۆراوجۆرەکانی تێپەڕیوە و گەلێک گۆڕان و وەرچەرخانی گەورەی تێکەوتووە. سەرجەم ئەم میتۆدو تیۆریزە رەخنەییە جیاوازانەش لە دەوری بازنەی چۆنییەتی خوێندنەوەو راڤەکردنی (دەق) دەخولانەوە. هەر بەهۆی ئەم سۆنگەیەوە راڤەکردن و خوێندنەوەی تێکستی ئەدەبی تەوژم و رێچکە و میتۆدی جیاواز و فۆرمی نوێ خولقاندووە.

میتۆدە رەخنەییەکانی دوای بونیادگەری وەک خۆیان دەبێژن: بۆ ئەوە هاتوونەتە بوون و خولقان،

تا هەڵە کەموکوڕییەکانی بونیادگەرییەکانی بەر لە خۆیان راستبکەنەوە بە تایبەتی کردنەوەی فەزای دەق و مەرگی نووسەر و فەرامۆشکردنی زانستەکانی دی. میتۆدی لە باریەک هەڵوەشانەوەو گەلێک میتۆدی دیکەی وەک: (هیرمینۆتیکا و سیمولۆژیا.. تاد) هاتنە خولقان تا سنوورێک بۆ بە کۆنکریت کردنی دەق و هەناسە تەنگکردنی دەق دابنێن و چیتر نەهێڵن فەزای دەق تەمی سەلەفیەت بیگرێ. لە میانەی ئەمەشدا بایەخ و گرنگی دان بە (خوێنەر و خوێندنەوەو راڤەکردن و...تاد) ئەم میتۆد و تیۆریزە مۆدێرنیستانە توانیویانە بینادی دەق لە نێو ئەو چوارچێوە کۆنکریت و فەزا تەسک و ئالۆزە ئازاد بکەن.

### گوتاری سەنتەریزم و سەنتەریزمی گوتار

بێگومان ئەگەر بێت و بە باگراوندێکی مێژوویی نیگا و تێرامانی خودی خۆمان بگەڕێنینەوە بۆ ئەو سەردەمەی کە مۆدێرنیزمییەت لەکاتێکدا دەیویست لەو دیو دەمامکە سیستەمگوتارەکانی خۆیەوە تاکگوتارییەتی خودی، بۆ خۆی دابمەزرێنێ و بە کورترین ماوە و خاڵ تیرە مەبەست گەراییەکانی خودی خۆی بپێکێت و هانا بە تاکگەراییەتی خۆی بدات، چونکە خودی گوتار دەربڕینی ڕوانین و نیگاگرتنە.. دۆخ و کردەیەکی زانینەبێ هیچ ئەنگێزەیەکی دەرەکی، بەڵام مەبەستگەرایی گوتار لەلایەنی خاوەن گوتارەوە دیسان خۆ ئامادەکردن و ئاراستەکردنە بۆ هەمان پنت و هەمان رایەڵی مانا.. ئەو کاتیش سیستەمگوتار دەشێ ببێتە زەمینەیەک رووەو تێزەکانی مەبەستگرایی بێگومان ئەمەش ئەنگێزەیەکی ئایدیۆلۆژی لە پشتەوە حەشاردراوە لە نێو ئەو سیستەمەیەدا ئەنگێزەیەک وێنادەکات بۆ جەخت کردن و کۆنترۆڵکردنی هزر وەک بوونێکی رەها و فرە رەهەند، جا ئەو کات (مۆدێرنیزم) خانەکانی هزری فراوانترکرد و کردیە نێو فەزایەکی والا و رەها. توانی لەو دیوە رەهایی و والایی سکێچی ئاوازەوە مەبەستگەرایی و سەنتەریزمی گوتارییەتی خۆی بپێکی و پیادەی بکات. جا هەر لەو ماوە مێژووییەشدا لە نێو زەمینەی دایەلۆگ و دواندنی فەلسەفیانەی خۆرئاوایە، بەڵام بە شێوە و ئەزموونێکی تازەتر کە دوور لە نمایش کردنی تەنها سێبەری جەستەو خودی ئەزموونی خۆرئاوا بێت ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەهاو کاکڵەی گوتاری سەنتەرگەراییە.

گوتاری سەنتەریزم بەردەوام و هەمیشە بە دوای خولقاندنی ئەو جەستە و کایە دوالیزمییە دژەکارانەدا دەگەڕێت، تا لەوێوە بتوانێ نمایشی سیما خود سێنتەرییەکانی خۆی بکات و تەنها مانا بە تاکگوتارییەتی خۆی بدات. و دەلالەتی بە سفرکردنیش بە جەستەی بەرامبەر بدات(١) هەروەها خودی جەستەیی خۆی بکات بە سەنتەر و جەستەی ئەوانی دی بکات بە پەراوێز و سێبەری ئەم سەنتەرە. کەیە و جەستە دوالیزمییەکانیش وەک:(من/ ئەو)، (خۆرئاوا/ خۆرهەلات) (سەنتەر/ پەراوێز)، (پێشکەوتوو/ دواکەتوو/دواکەتوو) دەیەوێت سکێچ و بازنەیەکی جیاکەرەوە بە دەوری جەستەی خۆی وێنە بکات و خودی خۆی جیا بکاتەوە لە جەستەو خودی (ئەو)ی بەرامبەر و پەراوێزدا..

پەیکەر و جەستەی خۆی بە جەستە و کایەیێکی بچووکراوەی گەردوون دەزانێ و دەرەوەش بەسێبەر و ئەنتی ئەم جەستە راستەقینە و بچووککراوەیە دادەنێت. ئەمەش لەلایەک زۆرێک لە ئەنترۆپۆلۆژیستە کۆلۆنیالیەکانی خۆرئاوا ئەنجامدرا، هەروەها هەوڵی ئەوەشیاندا، کە سەرجەم تێزەکانیان وەک کردەیەکی ئەبستمی و زانستی لە خزمەتی تێزە کۆلۆنیاکانیاندا بەکاربهێنن و پراکتیزەی ئەم هەوڵە پڕ بەهایانە بکەن و خودی جەستەی خۆیان بە سەنتەر و گەلانی دی بە پەراوێز و کەنار دابنێن. ئینجا بەم هەوڵەش ناوەستن، بەڵکو دەیانەوێ خودی جەستەی خۆرئاوا لە نێو زەینی میللەتانی کۆلۆنیالکراودا وێنە بکەن بە سیمایەکی هومانیستیانە. رەنگرێژی کەن. خودی ئەم کردەو پرۆسەیەش وادەکات خودی خۆرئاوا بگاتە دوا پلەی نەرجسییەت و پۆیەگەرایی، جا خودی جەستەی خۆرئاوا بە دوای ئەو رایەڵە کۆلۆنیالییەدا دەگەڕاو دەیویست بونیادی جەستەو هەیکەلی خۆی لە نێو پانتایی و فەزا و مەراسیمێکی پیرۆزدا پانتایی و زەمینەی هەموو بونیاد و سیستەمی جۆراوجۆرەکاندا نمایش بکات بۆیە سەنتەریزمی خۆرئاوا لە گەران و پشکنینی ئاوەزەو سیستەمی مێژووی نەتەوەو گەلانی کەنار و پەراوێز لە هەوڵی بەسێنترالیزمکردنی گوتاری خۆرئاوا و بەربەریکردنی دیکەیان دابێت.

گوتاری سەنتەریزمی خۆرئاوا هەر زوو کەوتە بەر سەهەمە رەخنەییەکانی هزرمەندان، تووشی رایەڵە چنراوە چڕەکانی هزرمەند و بیریاران بووە، چونکە خودی ئەو گوتارە لە نێو منداڵدانی خۆیدا دەلالەتی سفرکردنی خودی جەستەیی رۆژئاوای

**. میتۆدە رەخنەییەکانی دوای بونیادگەری وەک خۆیان دەبێژن: بۆ ئەوەی هاتوونەتە بوون و خولقان، تا هەڵە و کەموکوڕییەکانی بونیاد گەرییەکانی بەر لە خۆیان راستبکەنەوە**





خستە بەرنەشتەرگەریی و رەخنەکاران، لە کاتێکدا کە خودی خۆرئاوا بانگەشەی سێنترلیزمیەتی خۆی دەرکرد و پێی وابوو گەیشتۆتە پلەی پڕبوون لە هەموو رووەکانی فەرهەنگی و زانستیدا، پێی وابوو تەنها خودی خۆیەتی کە بریتی بێت لەو نەزعە قووڵ و ریشەدارەی کە سەرجەم زەمینەی گوتاری فەلسەفی و ئەبستمۆلۆژی بگرێتە باوەش و جەستەی سەنتەریزمی گوتاری خۆرئاوا بەیان بکات و دیسپلینی هەموو رایەڵەکان بکات. خودی ئەم دیسپلینکردنەش دووبارە و فۆتۆکۆپی کردنی هەمان ئەو شکستە بۆوە، کە کۆمەڵگای کلاسیکی لە پێشوودا بە رایەڵ و نەزعە ئایینییە رەهاییەکانی خۆی سەپاندبووە سەر میللەتەکان و کۆنترۆڵی سەرجەم تاکەکانی نێو کۆمەڵگاکانی کردبوو، وەکو ئامرازێ بۆ مەرامەکانی خۆی بەکاری دەبردن. کۆمەڵگای کلاسیکی خۆی بەوە هەڵدەدایەوە کە گوایە گەیشتۆتە دوا پلەی رەهابوونی رۆح و حەقیقەتەکان و مۆدێرنیزمیش بە حوکمی ئەو پێشکەوتنی تەکنیک و تەکنەلۆژیا و سیاسی خودیەی کە بەرهەمی هێنا بوو. هەر بۆیە سیمای بە بەرد بوون و تەوتەمییەت بوونی گەلانی خستە سکێچی کۆمەڵگای بەربەری و رایگەیاند. دواتر دوای مۆدێرنیزم، پۆست مۆدێرنیزمییەت هاتە خولقان و دستی کرد بە نەشونماکردن لە نێو هەناوی ئەو کەلتوور و بونیادی میتازمانی دەقەکان ئینجا ئەنترۆپۆلۆژیستەکانی ئەم قۆناغە هاتن و توانیان سەرجەم ستوونەکانی بونیادی مۆدێرنیزم بتەقێننەوە و بوومەلەرزە بخەنە گەڕ لە نێو رایەڵە هزریەکانی بونیادی مۆدێرنیستیەت بە تایبەتی (کلۆد لیڤی شتراوس)ی ئەنترۆپۆلۆژیست(٢).

روانین و دیدگاکانی (شتراوس) بۆ بونیادە بەهادارەکانی مۆدێرنیزم وەک دوا وێستگە و کەمالییەتی ژیاری و فەرهەنگی و سەنتەرگەرایی شارستانیەتەکان هیچ پاسا و بەڵگەدارییەتێکی ئەبستیمی وای بۆ نیە. بگرە زیاتر دەکەوێتە بەردەم نهێنی سیستەمی عەقلی خۆرئاوایی، کە پتر نەزعەیەکە لەسەر رایەڵ و سیستەمێکی مۆنۆپۆلی بونیادنراوە.

ساتێک تەکوینبوونی عەقلی خۆرئاوا بەرەو جۆرێک لە خولانەوە بە دەوری بازنەی خودی خۆی دەچێت. بەنێو زەمینە و گەردووندا ئەزموونگەری گریمانەکان لە ژێر رونیا و جیهانبینی رۆژئاواییدا هەناسە و بوونی نیەو تەنیا نێو هەناو و منداڵدانی خێدا نەبێت، ئەمە وا دەکات زیاتر خودی جەستە و روانینی خۆرئاوا بەرەو چەقبەستن بە دەوری بازنە و جەستەی خودی خۆیدا بچێت، کە لە چەقبەستووی خۆرئاوا ناوزەد کراوە، ئەمەش وامان لێدەکات دیسان بەرەو رایەڵی نەزعە مۆنۆپۆلەکە بچینەوە، بەوەی کە عەقلی خۆرئاوایی بۆ روانین و بیرکردنەوە پێویستی بە هیچ عەقل و دیدێکی دیکە نییە کە لەگەڵیدا کارلێک بکات. جیهانی کردۆتە پانتایەک بۆ خۆی هەموو بونیادە کەلتوریی و فەرهەنگیەکانی دیکەیشی پشت گوێ خستووە.

ماوەیەک بوو تێزە سەنتەریزمییەکانی خۆرئاوا لەکاردابوون بۆ بەسێنترالیزمکردنی گوتاری خۆرئاوا، جگە لەمەش لە هەوڵی بە زانستکردن و عەقلانیکردنی درا، بەلام دواتر جەستەی پۆست مۆدێرنیزم خولقا و لە دایک بوو هەر لەنێو منداڵدانی مۆدێرنیزم کە بەبوومەلەرزەیەکی توند دەستیکرد

کەوا سەرجەم رایەلە هزری و ئەبستیمی و فەلسەفیەکانی ئیفلیج و خاپوور کرد، ئەمەش خۆی لە خۆیدا سەهمێک بوو دژ بە گوتاری سەنتەریزم بەرانبەر بە هزری مەدەنیەت و پێشکەوتنگەرایی. ئەم هەوڵانەش لەلای چەند ئەنترۆپۆلۆژیستێک هاتە خولقان و نەشونماکردن وەک: (شتراوس)(٣) و کلاستر دا بەرچاو دەکەون. کە وەک خاوەن خودێکی دیدرۆشن کراوەو تازە خولقا سەبارەت بەسەرجەم چەمکەکان و خولقاوی بەرهەمهێنەری گوزارشتی تازەیە سەبارەت بە چەمکە مێژوویی و گرفتە هزرییە مێژووییەکان ئەم رۆشنکردنەوەی (کلاستر) سەبارەت بەو چەمکە مێژووییانە وای کرد کە قیبلەنومای دیدەی خوێنەران و بینەران بگۆڕێت و وای کرد گۆشەیەمی دیکەوە بروانن رایەڵ و ئاسۆیەکی دی بەم ئاسۆیەش بروانن سەرجەم چەمکە مێژووییەکان، ژیارییەکان.. و خولقاندن و داهێنانی بونیادی گومانکردنی لۆژیکییانەی زانستیانە سەبارەت بە دووالیزم و دووریانی (سەنتەر/پەراوێز) (مەدەنییەت/بەربەرییەت) توانی میتۆلۆژیای گوتاری سەنتەریزمی خۆرئاوا خاپوور بکات و کەرەنای مەرگی بە گوێچکەی دابچرێنێ و سیمای بە مەدەنییەتیش بگەڕێنێتەوە بۆ ئەومیللەتانەی کە لە دەرەوەی بازنە و سکێچی خۆرئاوا هەناسە دەدەن.

دەمەوێ ئەوەش لە یاد نەکەین و دەمامک لەسەر ئەو پنتەی کە خۆی لە ژێر دەمامکێک لێڵ

**. کۆمەڵگای کلاسیکی خۆی بەوە هەڵدەدایەوە کە گوایە گەیشتۆتە دوا پلەی رەها بوونی رۆح و حەقیقەتەکان.**

حەشار داوە هەڵدەفەوە کە ئەویش یەکێکە لەو تایبەتمەندییەتی و میکانیزمییەتەی کە گوتاری سەنتەریزم بەکاری دەبات، ئەویش بە پرۆسەکردنی سیستەمە تیۆری و زانستی و ئەبستمۆلۆژی و فەلسەفییەکان کە وەک دەمامکێکی ئایدیۆلۆژی سەرجەم تێز و گوتارە هزری و فەلسەفی و مەعریفییەکانی خۆرئاوای لێ پڕکراون. ماهیەت و سیمەی گوتار و تێزەکانیش بە چەشنێ لە ئایدیۆلۆژی رەنگ کراون لێرەدا گوتاری سەنتەریزمی خۆرئاوا دەستی داوە بەو پرۆسەیە ئەویش بە دەمامککردنی سەرجەم کایە ئەبستیمەکان بۆ ژێر دەمامکێکی ئایدیۆلۆژی بۆ نۆو کایە ئەبستیمەکانی دیکە ئەم پرۆسەیەش خەونێکی قووڵ و چڕبوو بۆ مۆنۆپۆلکردنی ئەبستمۆلۆژیانەی گەردوون. کەواتە بەردەوام گوتاری سەنتەریزمی خۆرئاوا بە دوای ئەو هەوڵە دادەگەڕێت. بۆ خولقاندنی هزری باڵا دەست و ئیمپریالی بوونی خۆی. بۆ قەناعەتکردنی (ئەو)ی بەرامبەر و هەمیشەش بەو مەبەستە هەناسە دەدات کە جەستە و کایەی ماناکانی خودی خۆی لەسەر نەهێکردنی ماناکانی دیکە و جەستەی بەرامبەر فۆرمەلە بکات.

فینۆمینۆلۆژیای تیۆری(هەڵوەشاندنەوە)

بێگومان وەک دەزانین هەر میتۆدێکی رەخنەیی کە دەخولقێ و دەست بە نەشونما دەکات و دێتە نێو زەمینە و پانتایی میتۆدەکانی دیکەی رەخنەیی پێش ساتەوەختی خولقان، خودی جەستە و هەیکەلی خۆی باش دادەمەزرێنێ و هەوڵی ئەوەش دەدا کە لەنێو سیستەمێکی وا نەشونما بکات، بۆ ئەوەی نەکەوێتە بەر تەوژم و شەپۆلی ئەو میتۆدانە، کە لە دواتر دێنە خولقان، بەڵکو پێش وەختە هەڵدەستێت بە سازدان و دامەزراندنی چەند ستونێکی کۆنکرێتی بۆ ئەوەی بتوانێت جێ پێگەی خۆی بە چاکی قایم بکات و نەهێڵێت خودی خۆی تووشی ئیفلیجی و داڕووخان بێت. جا ئەم ستوونانە بریتین لە چەند پرەنسیپێک کە هەیکەلی خۆی لەسەر بونیاد دەنێ، کە بریتین لە پرەنسیپی (ئەپستمیی و فەلسەفی و هزری و زمانی..تاد) بێگومان بە دوایدا جەستەی ئەو میتۆدە رەخنەییە لەنێو رەگ و ریشەو مندالانی ئەو رایەڵ و پرەنسیپانە دێتە خولقان هەناسە دەدەن و فۆرمەلە دەکرێن. هەر وەک میتۆدی بونیاد گەری کە رایەڵ و پرەنسیپی تیۆریزە زمانی و ئەزموونگەرییەکانی کردبووە ستوونی هەیکەلەکەی.. یاخود میتۆدە رەخنەییەکانی دیکە، کە بە تایبەتی لەسەدەکانی نۆزدە و سەرەتاکانی سەدەی بیست، رایەڵە هزری و فەلسەفییەکانی ئەو سەردەمیان لە ئاستی ژێرەوە بونیاد نابوو، بێگومان ستراتیژیەت و گوتار و میتۆدی(تەفکیکییەت)یش. رایەڵە هزریەکانی نێو مندالدانی فینۆمینۆلۆژیای سەردەمی کردبووە رایەڵ و ستوونی هەیکەلەکەی و توانی هەر لە نێو ئەو کاسەیە هەناسە بدات و قاچەکان جەستەی پێڕاگیر بکات و بە خێرایی جەستەی خۆی پێ کۆنکریت بکات و دەست بە نەشونما بکات.

(فینۆمینۆلۆژیا) ئەو رایەڵ و وەتەرە فەلسەفیە چێنراوە هاوچەرخەبوو، کە توانی لە نێو پرۆسەی بەرجەستەکردنی مانا لە نێو هەناوی کایییەکی نا بەرجەستەدا توانی دید و روانینێکی رۆشن بە دیدگای (خوێنەر/وەرگر)ببەخشێ.. یاخود دەتوانین چەشنێکی دی زیاتر چەمکی (فینۆمینۆلۆژیا-دیاردەگەرایی) لە دیدگای (هوسرل)دا روون بکەینەوە.. هوسرل بۆ لێتوژینەوەی بابەتە فەلسەفی و هزریەکان پشت بە باتە ئاگاییەکان دەبەستێت نەک بابەتەکانی ئەو دیو جیهان دەرەکی و جیهان نابەرجستە ، زیاتر هەستکردن بە شتە بەرجەستە و مەلوسەکان و ئەو کایانەی کە ئێمە هەستی پێدەکەین. کە لەنێوخەلایەکانی هەستکردنەوەماندا دەردەکەون، بۆیە وشەو زاراوەی (pheomena) کە وشەیەکی گریکییە بەکاردەبات ئەو وشەیەش بەواتە ئەوەی لە (کایەکان) دەردەکەوێ(٤) تەبیعی ئەو رایەڵی فینۆمینۆلۆژیایە دوای رایەڵە چنراوەکانی پاش بونیادگەری هاتە خولقان و سەری هەڵدا. ئەمەش بۆ نەفیکردنی تاک رەهەندی مانا و تاک روانینی دەق لە میانی فرە مانایی و فرە روانین و فرە خوێندنەوەیدا، بۆ ئەوەی جەستەی دەق لەم جۆرە سڕبوون ئیفلیجییەتەی تاک روانین و تاک رەهەندیە رزگار بکەن و ئەو سەهۆڵبەندانەی دەق بشکێنرێ.

کێشەو گرفتی بەخودبوون یاخود هەناسە بەخشین بە خود لە تاکڕەوی گوتاری بەرامبەردا ئەوە بێگومان هەڵوەشاندنەوەیەکی بەرامبەریشی پێویستە و گەرەکی تێزێکی زانستی و لۆژێک رەخنەیی قوڵە، تاکو لە نێو ئەو پانتایی و زەمینەیەدا لە مانا و ماهیەتی خودی بەرامبەر تێبگەین بە سانایی راڤەی بکەین. جا لە کاتێکدا کە سەرجەم ماناو چەمکەکان بە داخراوەیی ختەرابوونە روو وەک ئەو گوتارە سێنتەریزمەی کە خودی خۆرئاوا بانگەشەی بۆ دەکرد. بۆیە چەندین میتۆدی رەخنەیی هاتنە نێو پانتاییە ئەبستیمی و

**. فینۆمینۆلۆژیا ئەو رایەڵە و وەتەرە فەلسەفیە چێنراوە هاوچەرخە بوو، کە توانی لە نێو پرۆسەی بەرجەستە کردنی مانا لە نێو هەناوی کایەیەکی نابەرجەستەدا روانینێکی رۆشن بە دیدگای خوێنەر ببەخشێ.**





فەلسەفی و هزریەکان کە یەکێکیش لەو دیاردەگەراییانە، فینۆمینۆلۆژیای(تەفکیکییەت) بوو. کە لەسەر دەستی (دریدا) هاتە خولقان، دەتوانین بێژین گوتار و مبتۆدێکە تا ساتەوەختی ئێستاکەش لە رووی بونیادی تێوریزەیی ئەبستیمیمەوە بونیادێکی کۆنکرێت و بەهێزە، چونکە پێم وایە توانیویەتی کەشفی رایەڵی چنراوەکانی جەستەیی خۆی و جەستە و هەیکەلی بەرامبەر کە (خۆرئاوا)یە بکات و، هەر چەندەش ئەگەر هاتوو پرۆسەی (بەخود بوون) لە بەرامبەر گوتاری سەنتەریزمی خۆرئاوادا لاواز و کزبوو، ئەو کات پێویستە ئەو تەق و سکێچە بشکێنرێ، بۆ ئەوەی بۆچوون و روئیاکان بە سەقەتی لەدایک نەبن بۆ ئەوەی بوونی گوتارمان بکەینە جەمەر و رەهەندێکی گوتاری لە بەرامبەر گوتاری فەلسەفەی و ژیاریانەی خۆرئاوا پۆویستە دوو کردە پراکتیزە بکەین ئەوانیش یەکەمیان: پشکنین و راڤەکردنی سیستەمە مێژوویی و فەرهەنگییەکان و گەرانەوە بۆ جەوهەر و تیمەی خود، گەرانەوە بۆ ئەو ساتانەی کە تێدا بوونی تیۆری و زانستی خولقاوە و بەرهەم هاتووە. دوومیان: گەران و پشکنین جەستەی بەرامبەر، بەواتە گەران و راڤە کردنی جەستە و هەیکەلی ئیمپراتۆریەتی ژیاری بەرامبەر، کە گوتاری سەنتەریزمی خۆرئاوایە.. هەروەها پێویستە لە روئیاییەکی لۆژیکییانەی زانستیانە سەرجەم رایەڵە چنراو و ژێیە سەردکییەکانی بونیاد و سیستەمەکانیان هەڵوەشێنینەوە و کردەی هەڵکۆڵین لەنێو هەناوی سەرجەم میاکنیزمیەتەکان پراکتیزە بکەین کە بەرهەمهێنەری سیستەمگوتاری خۆرئاوایە. لە رەهەندێکی دیکەشیەوە ئەو ساتانە کەشف بکەین کە تیایدا پانتایی گوتاری تیۆری و هزری و فەلسەفی خۆرئاوا کە توانیویەتی زەمینە پانتایی و هەناسەی گوتاردکانی دیکە هەڵمژێت وبۆ خودی خۆی قۆرخیان بکات. هەروەها گەران بە دوای ئەو ساتە و دختانەی کە خودی رۆژئاوا لە نێو پانتایی و فەزای تیۆری و فەلسەفی و زانستیەکاندا هەولی ئەودی داوە شوناسی جەستەی خۆی فۆرمەلە بکات.

بۆ خوێندنەوەو راڤەکردن و تێگەیشتن لە مێژوو و هزر و فەرهەنگی هەر خاودن گوتارێک، ئەوە پێویست بە میکانیزمییەتێکی شیاو دەکات بۆ تەفکیکیەتکردنی سیستەمێکی هزری و ئەپستمیی ئەو خاودن گوتارد و دەبێت خودی خۆشمان چەند گوتار و تیزێکی بە پێز ودک چەند رایەلەیەکی سەرەکی بەشداریین لە نێو خودی پرۆسەی هەڵوەشاندنەوە، بۆ ئەوەی بەزووترین تاف سەهەمەکانمان ئاراستەی هەدەف و ئامانجی خودی خاوەن گوتار بکەین و لێی تێبگەین، هەروەها لە ماهیەتی ئەو کایە حەشار دراوانەش بگەین کە خاوەن خودی گوتار مەبەست و گەرەکییەتی دایانمەزرێنێ و بیاندرکێنێ. بۆیە دەبێت شاولێکی مەعریفیانە و زانستیانە بەنێو جەستەی ئەو میتۆدەدا شۆڕ بکەینەوە، تا لەوێوەوە کەشفی سەرجەم کایە نابەرجەستەکان بکەین و لە بونیادی ئەو جەستە و هەیکەلسازی ئەم خاوەن گوتارە بگەین. تا بۆ ئەوەی ئیرادە و توانایی ئەوەمان هەبێ کەسەر لە نوێ وردە هەناسەکان بگەڕێنینەوە بۆ جەستەی مێژوویەکی نەفیکرا و شەختە بەندکراو و سەر لە نوێ بونیادی ئەم گوتار و مێژووە نەفیکراوە دابڕێژینەوە.

ستراتیژیەتگوتاری (فینۆمینۆلۆژیا) لەسەر دەستی (هۆسرل و ئەنگاردن و هایدگەرو گادامیر) هاتە نێو پانتایی گوتارە هاوچەرخەکانی دیکە. زۆری ئەو دیاردە گەرانە لەسەر ئەو رایەلە فەلسەفیە هاوکۆکن کە (جەستەی خود ) دەکا بە سەهم و کانگای (تێگەیشتن)، ئەو کاتەش خودی خاوەن (وەرگر-خوێنەر) توانای دووبارە هەناسە بەخشینەوەی بە تێکست هەیە. لەماوەی پرۆسەی تێگەیشتن و راڤەکردن، هەروەها توانای ئەوەشی هەیە کە دیوی ئەو دیوی شت و کایە نابەرجەستەکان کەشف بکاو رایەڵ و ژێیە سەرەکییەکانی مانا لە نێو هەناوی فرەمانایی فرە رەهەندی لە نێو هەناوی بونیادی دەق بەرجەستە بکات لێرەشەوە دەتوانین دیالۆگی بەردەوام لە نێوان جەستەی دەق و جەستەی وەرگرتن بخولقێنین. هەروەها کردەی کارلێکی نێوان هۆشیاری خوێنەر و هۆشیاری دەق کە هەستێکی هاوبەشیان لە چێژ ودرگرتن دا هەیە بەرجەستە بکەین. دەقی مۆدێرنیست دەقێکی مەعریفییە و لەنێو مندالدانی پێکهاتەکانی خۆیدا ماناکان خەزن دەکا، دەقەکە پتر دایەلۆگیە و لەسەر فرەیی ماناکانیدا دادەمەزرێ، ئەوەش زەمینە خۆشکردنێکی پتەون بۆ پرۆسەکانی سیستەمگوتاری تەفکیکییەت.

زیاتر (هۆسرل) جەختی لەسەر پانتایی بابەتە هەستپێکراوەکان دەکردەوە، چونکە ئەو بابەتە هەستپێکراوانە لەبەر دیدەی بینەرانەو دەچێتە نێو بازنەو سکێچی واقیعیەتەوە، وەک بابەتێکی واقیعی گوزارشت و مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت،

. خوێندنەوە و راڤەکردن و تێگەیشتن لە مێژوو هزر و فەرهەنگی هەر خاوەن گوتارێک ئەو پێویست بە میکانیزمییەتێکی شیاو دەکات بۆ تەفکیکیەتکردنی سیستەمێکی هزری و ئەبستیمی.

بەڵام کاتێ هایدگەر هات، روئیا فەلسەفی و هزرییەکانی (هۆسرل)ی سەبارەت بە چەمکی (دیاردە گەرایی) رەتکردەوە، کەچی هایدگەریش هەر لە نێو ئەو سکێچە فەلسەفیەدا خولی خواردۆتەوە لە پرەنسیپە هەمەکییەکانی ئەو هزرەیە لە پەیوەستبوونی بە (کەینوونە) گرنگیدا بە تیۆری خوێندنەوە.

یەکێ لە رایەڵ و ژێیە سەرەکییەکانی ستراتیژیەتی دیاردەگەرایی لە نێو پانتایی ئێستاتیکای وەرگرتن چەمکی (باڵا بوون) یاخود (هەڵکێشان)ە. ئەم چەمکە لە دیدگای هۆسرل بەو واتا و مانایە خۆی دەردەخا (واتای بابەتی) (موضوعي) کاتێک لە دایک دەبێت و دەخولقێ کە (دیاردە) (ظاهرة) واتایەکی پەتی لە نێو کاسەی (ئاگایدا) دەخولقێنێ، بەواتا دوای گەڕانەوەی لە دنیای ئاگایی و دەرەکی ماددییەتەوە بۆ نێو پانتایی دنیای ئاگایی ناوەکی)(٥).

لە دوایدا (ئەنگاردن) بە روئیا و سەهەمێکی دی لە روانین بۆ مانای چەمکەکان هات و هەندێک لە چەمکەکانی فراوانتر کرد و بەرەو راستکردنەوەی برد، لە دوایشدا خستییە نێو رایەڵ و وتەرە (مانا)دارەکانی کاری ئەدەبیەوە. لە دوایدا چەمکی (باڵابوون) لەکاری ئەدەبیدا دوو بونیاد لە خۆی دەگرێ: (بونیادی چەسپاو) کە بە چەمکی رەگەزایەتی یاخود چەشنێتی ناوزەدی دەکا کە بناخەی (تێگەیشتن)ە. (بونیادی گۆڕاو)یش بە چەمک و مانای ماتریالی یا ماددی ناوی دەبات)(٦).

هەروەها (ئەنگاردن) روئیا و بیر و بۆچوونی سەبارەت بە کاری ئەدەبی وا بەرجەستە دەکات کە (بریتیە لە بابەتی مەرامگەرایی)(٧).

بێگومانین لەوەی کە میتۆد و ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوە کە یەکێکە لەو میتۆدانەی لە نێو خانەکان و ریشاڵە زیندووەکانی (فینۆمینۆلۆژیا) خولقاوە و دەستی کردووە بە هەناسەدان و نەشوونماکردن. ئەم میتۆدەش وەک دەزانین لەسەر دەستی (جاک دریدا) هاتە بوون. لەکاتێکدا تیرەکانی رەخنە ئاراستەی سێنتەریزمی گوتاری خۆرئاوا کرا کە لەلایەن چەند بیرمەند و هزرڤانێکەوە بە تایبەتی (نیتشە، هایدگەر، هۆسرل، فۆکۆ)بوو، بەڵام خۆی لە خۆیدا ئەو سەهمە رەخنەییانە ئەوەندە بە ئازار و کاریگەر نەبوون، کە بە فۆرم و لەونێکی وا کە جەستە و عەقڵی خۆرئاوا بهێنێتەوە هۆش و ئاگاییەکی تەواو نەیخستە نێو پانتایی و بوومەلەرزەیەکی وا کە لەو مەرام و خواستە هەڵخەڵەتێنەرانەی رزگار بکات. ئەمەش رێگای بۆ (دریدا) خۆشکرد کە پرۆسە و ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوە بخاتە گەڕ و بخاتە نێو سەرجەم پرۆسە رەخنەییەکانی دی کە سەبارەت بە سێنترالیزمی لۆگۆسی خۆرئاوا هاتنەکایەوە، جا بۆیە (دریدا) هات و ئەو مەسەلەیەی کردە بابەت و زەمینەی خۆی پرۆسە و ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوەی کردە رایەڵ و ستراتیژیەتێک بۆ ئەوەی تاکو لە سایەی ئەم ستراتیژیەتە بتوانێت، رایەڵ و کردە هزریەکانی خۆی مسۆگەر بکات. هەروەها ئەم ستراتیژیەتگوتارە بۆ ئەمەش خولقا لەلایەن (دریدا) تا بۆ ئەوەی وەک دیسپلینێک بخرێتە سەر کەلتوور و فەرهەنگی سێنتەریزمی گوتاری رۆژئاوا تا دان بە بوونی ماهیەتی(جەستەی ئەو)ی رۆژهەڵات بنێت. کە لە دوایدا بە پوخت و چڕی دێینەسەر بونیاد و سیستەمگوتاریەتی تەفکیکییەت و باسی لێوە دەکەین.

هەڵکۆڵینی دەق/ دقی هەڵکۆڵراو:

لێرەدا ئێمە لە رێگەی رایەڵ و ژێیە سەرکییەکانی پرۆسەی خوێندنەوەو هەڵوەشاندنەو هەڵکۆڵینەوە، بونیادی دەق هەڵدەکۆڵین و شاولئاسا خودی خۆمان شۆڕ دەکەینەوە بۆ نێو جەستەی دەق و دەچینە ئاستی ژێرەوەی کە بە ئاستی کەڵەکەبووی هزر و فەلسەفی وستاتیکی ناوی دەبرێت و وەک ئەرشیفێک دەبینرێت کە سەرجەم کایە هزری و فەلسەفیەکانی تێدا کۆکراوتەوە.. جا بۆ ئەوەی ئەو کایە نا بەرجەستانە بەرجەستە بکەین، دەبێت خودی خۆمان شۆڕکەینەوە بۆ نێو جەستەی دەق و کردەی هەڵکۆڵین ئەنجام بدەین. جەستەی دەق بخەینە نێو پرۆسەی هەڵوەشاندنەوە بۆ ئەوەی راڤەی سەرجەم کایە بەرجەستە و نابەرجەستەکان بکەین. دوای هەڵوەشاندنەوە و هەڵکۆڵینی دەق. دووبارە جەستەی دەق دەخولقێنین و هەناسەیەکی زیندوو بە جەستە دەبەخشینەوە و دەیخەینەوە نێو کاسە مەرجاناوییەکانی ئێستاتیکا و سەر لەنوێ لەگەڵ سەرجەم کایە کریستاڵییەکانی دی بارگاوییان دەکەین و دەیانڕازێنینەوە سەر لەنوێ مانایەکی تازەی پێ دەبەخشینەوە. جا لێرەدا پرۆسەی هەڵوەشاندنەوە وەک میتۆد و تیۆر و چەمکێکی نوێ و هاوچەرخ دێتە نێو تیۆر و رایەڵە جۆراجۆرەکانی دی پرۆسەی هەڵکۆڵین و خوێندنەوە.

**• بابەتە هەستپێکراوەکان لەبەر دیدەی بینەرانە و دەچێتە نێو بازنە و سکێچی واقیعیەتەوە وەک بابەتێکی واقیعی گوزارشت و مەمەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.**

**. بۆ ئەوەی ئەو کایە نابەرجەستانە بەرجەستە بکەین، دەبێت خودی خۆمان شۆڕکەینەوە بۆ نێو جەستەی دەق و کردەی هەڵکۆڵین ئەنجام بدەین.**

کە (وەرگر/ خوێنەر) دەیکا بە پرەنسیپێکی هزری و فەلسەفی بۆ هەڵکۆڵین و خوێندنەوەی جەستەی دەق. کە وەک چەمک و ستراتیژییەتێک پشتی پێ دەبەستێت و بەکاری دەبات، کەواتە کردەی هەڵکۆڵین و هەڵوەشاندنەوە و گەڕان بە دوای کایە نابەرجەستەکانی نێو جەستەی دەق. بوون بە تەوەرەو رایەڵەیەکی سەرەکیٚ بۆ ئەو تیۆر ومیتۆدە رەخنەییانەی کە گرنگییەکی زۆر بە دەق و خوێنەر دەبەخشن ئەگەر چی ئەم تیۆرێز و میتۆدە رەخنەییانە لە چەندان دیدگا و سەهم و روانینی جیا جیا خولقێنراوە، بەڵام هەر هەموو روئیاکانیان لەو بڕوایەدان کە (خوێنەر/وەرگر) یەکەمین روئیا و ئاڕاستەیە کە دەبێتە خولقێنەری راستەقینەی مانا، جا ئەم خودی ( وەرگرە) یاخود (خوێنەر)ە، رەخنەگریێت یا هەر خاوەن خودێکی دیکە بێت، رەخنەگر و بینەر دەیەوێ لە رێگای هەڵکۆڵین و شۆڕبوونەوە بۆ نێو کایە نابەرجەستەکان و والاکردنی شفرەکانی تێکستەوە، خانە تاریک و نابەرجەستەکانی جەستەی دەق رۆشن بکاتەوە. هەروەک (سیلدن) دەبێژێت: (رەخنەگر، بینەر وەک فەرهەنگ و کەلتوور ناسێک زەوی و جەستەی دەق هەڵدەکۆڵیٚ بە هیوای بەرجەستە کردن و دۆزینەوەی کایە تازە و نوێیەکان..) هەر بۆیە (دریدا)ش لەسەر ئەو ڕایەدا نزیکایەتی هەیە کەدەبێژێت:(دەق بۆ ئەوەی دەلالەت بەخش بێت پێویستی بە کەرتکردن و راڤەکردن هەیە) چونکە پێم وایە کردەی بە ئارکیولۆژیا کردن و هەڵکۆڵین لەسەر زەمین و جەستەی دەق. خانە و کایەی تازە و نوێ بنیات دەنرێ جا بۆ گەڕان و کەشفکردنی خانە و کایەی نابەرجەستە رەخنەگر و لێتوژەر هاندەدات بۆ تەقاندنەوەی جەستەی دەق بۆ بەرجەستەکردنی لایەن وکایە حەشاردراوەکانی نێو هەناوی دەق ئەم پرۆسەی تەقاندنەوەو بەکاربردنی بوومەلەرزەیەی کە رەخنەگر بەکاری دەبات لەلای هەمان ئەو (بینەر/خوێنەر)ەش سەرچاوە دەگرێ کە پەرۆشی دۆزینەوەو کەشفکردنی کایەی تازە و حەشاردراوەکانی ناو جەستەی دەق، ئێمە وەکو دەزانین (جەستەی دەق) بریتییە لەو کەشکۆڵەی کە هەمیشە پڕیەتی لەو کایەو داڵە ستاتیکی و فەلسەفی و هزری و میتازمانی و هارمۆنیەتانەی کە لە نێو ئەم جەستەیەدا بە فۆرم و لەونێکی کارامایانە توێنراوەتەوە.. بەهۆی بەکاربردنی پرۆسەی هەڵکۆڵین و حەفر کردنەوەش دەتوانین سەرجەم ئەم کایە و داڵە ستاتیکیانە بەیان بکەین و گوزارشتیان لێوە بکەین.

بێگومان جەستەی هەموو دەقێک لە هەموو سەردەمێکدا جۆرە ئەسقێکی خوێندنەوەو راڤەکردنی تایبەت بە خودی خۆی هەبووە بۆ هەڵکۆڵین و شۆڕبوونەوە بۆ نێو کایەی (داڵ)ە حەشاردراوەکان و گەڕان و کەشفکردنە بەدوای ئەو (مەدلوول)ەی کە (رۆلان بارت) بە لەززەت ناوی دەبات.. (خواست و مەرامی خوێنەر لە نێو جەستەی دەقدا. بۆ دۆزینەوەو بەرجەستەکردنی جۆرە شەهوەت و لەززەتێکە..(٧). هەروەها (بارت) روئیای خوێنەر دەکاتە گۆشەیەکی دی لە گۆشەیەکانی دیکەی (نووسەر/ دەق)، بۆیە پێویستە لەم کاتەدا خوێنەر بە کەشکۆڵێکی مەعریفی و هزری و ستاتیکی گەورە خۆی بخاتە نێو ئەم پرۆسەیە تا بتوانێت بە دیدگایێکی رۆشنفکرانە مامەڵە لەگەڵ سەرجەم پرۆسە و پرەنسیپە ئەپستیمیەکان بکات زۆر لە هزرمەندە هاوچەرخەکانی دیکە روئیایان وایە کە رۆڵی (خوێنەر) هیچی کەمتر نیە لە رۆڵی (دانەر/دەق/ سەرچاوە)، چونکە لە پێشوودا سەرجەم میتۆدە رەخنەییەکان بە تایبەتی میتۆدە رەخنەییە مێژوویی و مارکسی و فۆرمالیزمیەکان بایەخێکی زۆریان بە رایەڵ و گۆشەو رەگەزیان پشت گوێ خستبوو، کە ئەویش گۆشە و رەگەزی (خوێنەر/وەرگر)ی خستە پاڵ هەردوو گۆشەکانی دیکەی (دانەر/ دەق) و سەر لەنوێ خستیەوە گەڕ و، چونکە ئەگەر رۆڵی (خوێنەر) فەرامۆشکرا بوایە ئەوە سکێچی ئەدەب لە نێو پانتایی و فەزایەکی بەرتەسک و بازنەبەند دەمایەوەو ئەو کاتیش جەستەی ئەدەب نەیدەتوانی بە ئاسانی هەناسەبدات مانا جۆراوجۆرەکانی دەقیش هەر بەو شێوە حەشارکراویە دەمایەوە، هەر ئەم پشتگوێ خستنەش بوو کە بووە هۆی کزکردن و گومکردنی رۆڵی خوێنەر بەسەر بونیادی دەق و دەقیش بەسەر خوێنەردا، ئێمە وەکو دەزانین دەقی سەرکەوتوو ئەو دەقەیە کە بتوانێت روئیای خوێنەر ناچار بکات ، بۆ ئەوەی بگەڕێت بۆ کەشفکردن و والاکردنی کۆدەکان و یەکەیەکەیان راڤە بکات و بۆ ئەوەی دەقەکە بە ئاسانی بخوێنێتەوە، چونکە وەک(دریدا)ش باسی لێوە دەکات، کە خوێندنەوە رایەڵەیەکە و جەدەلییەتێکی بەردەوام لە نێو رایەڵەکانی (دەق، خوێنەر)دا دەخولقێنێ ئەمەش لە رێگا لە ئاماژە دەلالیەکان و هێما کۆدەکاتەوەردەکرێت. جا لێرەدا مەبەستی ئێمە لە هەڵکۆڵین و هەڵوەشاندنەوەی دەق بە هیواو خواستەی دەست نیشانکردنی

پێکهێنەرەکان و سەر لەنوێ دامەزراندنەوەی ئەو پەیوەندیانەی کە بەیەکەوە دەیان بەستێتەوە، بەو شێواز و فۆرمەی کە روئیای خوێنەر لە ماناو دەلالەتەکانی دەق نزیک بکاتەوە، ئەو کاتیش ستراتیژیەتگوتاری تەفکیکییەتی دەق گەڕانەوەو دامەزراندنەوەی رەخنەی نوێیەکە خودی رەخنەگر ئەرک و رۆڵی ئەو پردەی نێوان جەستەی دەق و دیدگای خوێنەر بەرجەستە دەکات و دەبینێ.

سیستەمگوتاری هەڵوەشاندنەوە ئەو کردەیە پراکتیزە دەکات کە لەسەر کایە و جەستەی زمان بونیاد دەکرێت، چونکە بونیادی دەق یەکسانە بە بونیادی زمان(دەق/ زمان). هەروەک خودی (رۆلان بارت) دەبێژێت: (دەق بریتییە لە زمان) یا خود (بێرمان) دەڵێت: (جیهان زمانە، چونکە بە هۆی فاکتەر و رایەڵەکانی زمانەوەیە لە جیهان لێک حاڵی دەبین. (باختن)یش گومانی لەمەدانیە کە لەودیو دیوی سەرجەم دەقەکان سیستەمێکی زمانەوانی هەبێ.

لێرەدا دەمانەوێ ئەمەش روونبکەینەوە، هەر کاتێک جەستەی هەر دەقێک یاخود گوتارێک هەڵدەکۆڵین و راڤەی دەکەین ، دەبێت سەرەتا پشت بە کۆمەڵێک گوتار رایەڵی سەرەکی لە نێو کردەو پرۆسەی هەڵوەشاندنەوە ببەستین (ئەمە لەنێو میتۆدی هەڵوەشاندنەوە) بۆ ئەوەی لە مەبەست و خواستی خاوەن گوتاری بەرامبەر یاخود نێو دەق بگەین و لەوشت و کایە نەبینراوانە حاڵی بین کە خاوەن گوتار لەنێو جە ستەی دەق درکاندوویەتی یاخود ویستویەتی بیاندرکێنێ پێویستە کردەی هەڵکۆڵین لەنێو خانەکانی ئاگایی خودی خاوەن گوتار لێدەین بۆ ئەوەی بگەین بەو شتە درکاندراوانەی کە بەبێ ئەوەی مەبەستی بوو بێت لەو ساتە نەستیە زەینیەدا لە نێو بۆتەی سیماتێکی زمانی دەق ئاشکرای کردووە و درکاندوویەتی. ئەمەش بۆ ئەوەی تا لە نزیکدا بتوانین لە سەردەمێکی دواتر و نوێدا ئەو دەقە سەر لەنوێ راڤە بکەینەوەو دایبمەزرێنینەوە و سەرجەم کایە نابەرجەستەکانی نێو جەستەی دەقەکەش بەرجەستە بکرێت کە لەنێو سیاقی مێژوویی ئەوسات. شاراوە بوون، لەبەر ئەوە گەڕان و کەشفکردن و هەڵکۆڵینی دەق لە نێو میتۆدە ردخنەیەکەی (دریدا) هەڵکۆڵین و گەڕانێکە بۆ بەرجەستە کردن و گەیشتن بۆ مانا مەجازی و هێما و ئاماژە و رەمزی و کۆدانەی کە لە دواوەیان مانای راستەقینە خۆیان حەشارداوە، جا کارکردن و هەڵکۆڵینمان لەنێو جەستەی دەق، واتە هەڵکۆڵین و شۆڕبوونەوەمانە بۆ نێو سیاق و کایەی زمان، چونکە لە روئیای (بارات)دا ستراتیژیەتگوتاری هەڵوەشاندنەوە بریتییە لە (دەق/زمان) یاخود(دەق تەنیا زمان)ە. کە لەپێشوودا خستبوومانەتە روو هەر چەندە گوتار و دەق جیاوازییەکی زۆریان هەیە! هەروەک (تۆدۆرۆف) وای بۆ دەچێ کە ئەگەر هاتوو هەر دەقێک مەرز و سنوورە کۆنکریتەکانی دەورەی جەستەی خۆی بەزاند و شکاند. ئەوە ئەو کات دەبێتە جەستەیەک لە گوتار، بەڵام روئیای (بارت) جیاواز وپێچەوانەیە لەگەڵ روئیای (تۆدۆرۆڤ). (بارت) لە پەرتووکی (پلەی سفری نووسین)دا کە (خوێنەر) وەرگر (رەخنەگر) رۆڵی سەرەکیان کەشفکردن و دۆزینەوەی لە نێو جەستەی میتازماندا رەگی خۆی دادەکوتێ و بونیادیدەنێ..)(٨).

کەچی هەندێ گوتار هەیە لە رۆژانەدا بەکار دەبێت وەکو (فۆکۆ) دەبێژێت: ئەم جۆرە گوتارانە نامانبەنەوە بۆ سەر هیچ رەهەند و ئاراستەیەک کە مامەڵە لەگەڵ کایە و هێمای مەجازی و گوزارەدا بکەین..(٩) رەخنەگرانی میتۆدی هەڵوەشاندنەوە گومانیان لە هەموو دێڕو دەستەواژە و دالێکەوە هەیە، هیچ وشەیەک تاکە مانایەک لەخۆی بار ناکات، بەڵکو چەندین ماناو مەدلوولاتی جیاواز بە خۆیەوە هەڵدەگرێت. بۆیە دەبێت زۆ بەوردی بە دوای ئەو مەدلوولە شاراوانە بگەڕێین. هەروەک (ئەمبیرتو ئیکو) لە (تێکستی کراوە) کە یەکێکە لە پرۆسە و رەخنەییەکانی هانی خوێنەر دەدات کە بەدوای نهێنییەکانی دەق و مانا و دەلالەتە شاراوەکانی نێو جەستەی دەق لە هەوڵی گەڕان و کەشفکردن دابێت هەروەک دەبێژێت: (خوێنەری زرنگ هەمیشە دەبێت لە گومانی ئەوەدا بێت کە دەشبێ لەو دیو دێڕ و پەرەگرافەکانی هەر دەقێکدا واتا و مانایەکی شاراوە خۆی شاردبێتەوە)( جا خوێنەری زرنگ و هەستیار درک بەوە دەکات کە نهێنی هەر دەقێک لە بۆشایی و ماوەی نێو پانتایی دەقەکەدایە) (١٠). رەخنەگرانی تەفکیکییەت ئەوە دەسەلمێنن کە جەستەی دەق مانایەکی کۆنکریتی نیە! بەڵکو هەمیشە و بەردەوام جەستەی دەق لە تەقینەوەیەکی بەردەوامی مانابەخش دایە، واتە جۆرە گومانێک دەسازێنێ لە نێو پرۆسەی هەڵکۆڵین و هەڵوەشاندنەوە، ئەم گومانەش تاکە گومانێک نیە کە تەنها لە پێناو جەستە و مانای گومان دابێت! وەک گومانەکەی (ئەمبریکۆس و مۆنتانی) پێیگەیشتن، بەڵکو جەستەیەکە لەو گومانە میتۆدییەی کە لە شێوەی گومانی (دیکارت)ی هزرمەند دایە! گومانێکە کە لەکۆتایدا بە شێوەی ئاراستە و هێڵێک بەرەو کانگای یەقینێکی رەهایی و راستییێکی کراوە دەڕوات!.
جا پرۆسەی راڤەکردن و هەڵوەشاندنەوە و خوێندنەوە لە دوای رەوت و ئاراستە و تەوژمەکانی دوای بونیادگەری هاتنە خولقان و لە دایک بوون، بۆ کەشفکردن و دەرخستنی زیاتر لەمانا و دەلالەتێک و ناردنی پتر لە روئیایەک بۆ بینینێ زیاتر لە دیوێک لە دیوەکانی جەستەی دەق کە (خوێنەر/ وەرگر/ رەخنەگر) رۆڵی سەرەکیان لەکەشفکردن و دۆزینەوەی دا هەبوو، لەمەشدا سوودیان لە رایەڵەکانی(فینۆمینۆلۆژیا و ستراتیژیەتی تەفکیکییەت و هیرمینیۆتیکا..تاد) وەرگرتووە، بەتایبەتی هزرمەندانی وەک (دریدا، هایدگەر ، ئەمبێرتو ئیکو، هوسرل.. تاد).

# مۆدێرنیتەو شێتی

نیهاد جامی

**مۆدێرنیتە سەرپەنەوەی رابردووە.. سەپاندنی دەسەلاتێکی تازەیە، دەسەلاتێک تەنیا دان بەبوونی خۆی دەنێ، بۆ ئەوەی پایەکانی خۆی پتەوبکات، ئەوەش لەسەر قوربانیدان بە هەموو ئەوانەی لەپێشوودا هەبوون، بۆ ئەوەی گۆرانێکی بنەرەتی وەدەست بهێنێ کە لە مێژوو دایدەبرێت، ئەوەش ئەوەمان بۆ ساڵنا دەکات کە مۆدێرنیتە چەند مژدەیەکە بۆ ئاسۆیەکی روون هێندەش گوناهبارە، چونکە دەبێتە کوشتنی خەونی پەریزادەکان، بەوەی تاکێتی بونیادەکانی خۆی لەسەر ئەو بنەمایە پتەودەکات کە (کەسی بەرامبەر)ی رەفزە، بۆیە (عەقل، شێتی) لەیەکدی جیادەکاتەوە، بەوەی عەقل دەتوانێ گۆران لەپرواکان دروست بکات، بەوەی مرۆڤ توانای راگەیاندنی بالادەستیەتی خۆی هەیە، بەدەرکردنی شێت لەناو عەقل، ئەوەش عەقلانیەتی مۆدێرنیتە هەموو تواناکان بۆ ئیرادەی مرۆڤ دەگەرێنێتەوە، توانایەک (نیچە) پێی وابوو مرۆڤ دوای ئەوەی توانی خوا بکوژێت) (تواناکانی خۆشی لەدەست داوە)(١).**



ئەگەر مۆدێرنیتە (خود/عەقل)ی بەرەوپێشی هێنا، بەڵام لەشێوەیەکی دی بەهای لەمرۆڤ وەرگرتەوە، بەوەی ئیدی مرۆڤ ئەو بوونەوەرە بەنرخە نیە، بەڵکو لەسەر بنەمای عەقلیەتی مۆدێرنیتەوە مرۆڤ نرخی خۆی دادەنێ، بەوەش (عەقل/عاقل) دەبوونە ئایدیۆلۆژیای مۆدێرنیتە)، بۆیە (فۆکۆ) بەکتێبی (مێژووی شێتی لەسەردەمی کلاسیکدا) کەوتە دژایەتی مۆدێرنیتە بەوەی عەقل دەمامکێکی رووی دەسەلاتی مۆدێرنیتە کە توانای نیە لەزاتیەت و هزری بالا رزگاری بێت، دەیویست شێوەی بەکارهێنانی عەقل و ئەو رەهەندانە بدۆزێتەوە کە لە شوێنێک عەقل لەکاردەخات، ئەوەش پەیوەندیەکی دروستکراوی دەسەلاتە بە عەقل، بەوەی شێت لەژیانی کۆمەلایەتی دووردەخاتەوە، کۆکردنەوەی شێت لەناودامەزراوێک رێگەگرتنە لە ئازادی بەواتای لەدەرەوەی جیهانی عەقل شوورەیەک هەیە جیایان دەکاتەوە، ئەویش دیلکردنیانە.. بەتاوانی لەدەستدانی عەقل.. تاوانێک ئەو لێی بەرپرسیار نییە، کەچی مۆدێرنزم ئەوە بە تۆڵەیەکی یەزدانی دەزانێ، چونکە شێت بە کائینێکی درندەو زیانبەخش ناودەبات. (٢)

**• مودێرنیتە ئەوەی عاقل نەبێت و شێت بێ بەگوناهباری دەزانێت**

بۆیە مۆدێرنیتە ئەوەی عاقل نەبێت و شێت بێت بەگوناهباری دەزانێت، گوناهباریش بەلای مۆدێرنزم دەبێ بخرێتە زیندانەوە، ئەگەرچی شێتی نەخۆشیەکی جەستەیی نیە تا لێیەوە کۆمەڵگا تووشی بێت وەک «لەسەدەکانی ناوەراستدا ئەوە (گول)ەکان بوون کە لە کۆمەڵگاو شارەکان دەردەکران، هۆی دەرکردنی گولەکانیش بریتی بوو لە (ترس لە نەخۆشی و مردن) بەڵام شێتەکان لە پاڵ ئەوانی دیکەدا دەژیان» (٣)

بۆیە قەبووڵ نەکردنی شێتەکان بەردەوام وای لەخۆ کۆدەکرد ئەو گوتەیەی (باسکال) بێنێتەوە یاد «شێتەکان بەرادەیەک شێتن، کە ئەگەر بێت و مرۆڤ وابزانێت کەشێت نیە، ئەوا بەجۆرێکی دی شێتە» (٤)

بەواتای ئەو نەخۆشخانەیەی بۆ شێتەکان دەکرێتەوە، تا تێیدا زیندانیان بکەن، بۆخۆی شێتیەکی دیکەیە، چونکە مۆدێرنی دەسەلاتی ئەوان دەکات بە هۆزێک کە هۆزی شێتەکانن، هۆزێک هەر شێوەی هیندیە سوورەکانمان بیر دێنێتەوە، جیاکردنەوەیان لەعاقڵ بۆ دڵنیابوونە.. ئارامیەکە بۆ عەقڵ لە درندەیی شێت، ئەوە بەپێی بۆچوونی مۆدێرنزم، کە لە بەرامبەر ئەوەشدا (فۆکۆ) پێی وایە شێت لەو

کاتەدا کە جیادەکرێتەوە، مۆدێرنزمی گۆشەگیری بنیات دەنێت. کە شێت لەناو ئەو گۆشەگیریەدا بۆی هەیە مومارەسەی ژیانی خۆی بکات، بەوەی بێمانایی ببەخشێت بە لۆژیکی شێت و لۆژیکێکی عەقلانیش بداتەوە بە عەقڵ، ئەوەش هاتن و ڕێکخستنی دەسەڵات بوو، کە (بابەک ئەحمەدی) ئەو کارە دروست بوونی نەخۆشخانە بەشێوازێکی دی (مەعریفە، دەسەڵات) دەزانێ کە (پزیشکی یاسایی) دێنێت، ئەوەش بەدووبارەکردنەوەی بوونیادەکانی دەسەڵات سەیردەکات، ئەو کارەش بەپتەوکردنی دەزگاکان ناودەبات «دەزگایەک دروست دەکرێت بۆ ئەوەی دەزگایەکی دی بەهێزبێت، بەهۆی سۆزانیخانەوە بنەمای خێزان و بەهۆی شێتخانەوە بنەمای عەقڵخوازی پتەوودەکەن و عەقڵخوازی دەبێت بەبنەمای کارکردنی ئەو دەزگایانەی کە سەرەتا وا دەردەکەون کە چ پەیوندیەکیان بە شێتخانەوە نیە» (٥)

بۆیە دامەزراندنی بۆ پتەوکردنی پەیوەندیەکانی هێزە، مۆدێرنزم بەو کارە ئەوەی سەلماند کە نایەوێ شێتی لەناو پرۆژەکەی ئەودا بێت، بەواتای جگە لە عەقڵ هیچی دی قەبووڵ نیە، ئەو ماهیەت لەو گوتەیەی (مارکس) وەردەگرێتەوە «مرۆڤ بەنرخترین سەرمایەیە»، چونکە دەیەوێ مرۆڤ لەبونیادێکی (فیزیکی/ سەراپاگیری) بگوازێتەوە بۆ (شێت/عەقڵ) ئەو بەهایەش دەدات بە(عەقل)، ئەونەک بەها لە(شێت) وەردەگرێتەوە، بەڵکو وەک ئاشکراو تەماشای دەکات، ئەوە لە کاتێکدا لای (شکسپیر) شێتی پلەیەکە لە هۆشیاری (لیدی ماکبێس و شالیر) لە کاتی شێتی حەقیقەت دەڵێت، ئەوەش بەلای (جاک لاکان)ـەوە خەسڵەتێکی مرۆییانەیە، چونکە بەبێ شێتی توانای ناسینمان نابێت، بۆیە شێتی بەلای (لاکان) شوناسێکە بۆ ناسینی مرۆڤ، بەڵام مۆدێرنزم، چونکە مرۆڤ بە کائینێکی عاقڵ دەزانێت، ئەوا لە شێتی دەریدەکات.

دەرکردنێک کە ترسی لێی هەیە، ئەو ترسەش (فۆکۆ) بەوە ناودەبات کە شێت لەتوانای هەیە درک بە هەموو ئەو شتانە بکات کە کەسی عاقڵ لێی شاراوەیە، بۆیەشێت پلەیەکە لەسەر هۆشیاری، کەواتە جینالۆجیای شێتی چەمکێکی قوڵی لەناو یۆتۆپیادا حەشارداوە، ئەوەش بە بەرکردنی سرووتێکی فانتازیە بە ڕووداوەکان، کە لەودیو سرووتێکی یۆتۆپیانە پرسیار ئامادەگی هەیە، پرسیارێک کە عاقڵەکان درکی پێ ناکەن، بۆیە بوونی (فۆکۆ) ترسێک ڕووبەڕووی ئەو کایە مەعریفیە دەکاتەوە، کە ڕووبەڕووی پرسیارێکی گەورەمان دەکات بەوەی «کێ لەمیشیل فۆکۆ دەترسێ!؟». (٦)

ئەو ترسە لە (فۆکۆ) شێت ناگرێتەوە، چونکە شێتەکان هەست دەکەن (فۆکۆ) نزیکترین هاوڕێیانە، بەڵکو ئەوانە لێی دەترسن کە هەموو ئەو بوونیادە چەسپاوانە دەگۆڕێت بۆ بوونیادی دی، بۆیە بونیادە نوێیەکان دروستکردنی تێڕوانینی هاودژە بەکۆنەکان، ئەوەش ترسێکە بۆ ئەوانەی هەڵگری مەعریفەیەکی کۆن بوون، چونکە بەهاتنی (فۆکۆ) مەعریفەی پێشوو کەوتە ئاشکرا بوونی دامالینی دەمامکەکان، ئەگەرچی (هابرماس) هێرشێکی ڕەخنەیی توند ڕووبەڕووی فۆکۆ دەکاتەوە، چونکە ڕەخنەی ئاڕاستەی عەقڵ کردووە، بەوەش ئەو دەبێتە داکۆکیکەرێک لە عەقڵ و لەدژی (فۆکۆ) دەوەستێتەوە، شێتیش بەکارێک ناودەبات کە عەقڵی خۆرئاوا بۆ خۆی ئیدراکی پێکردووەو کاری (فۆکۆ)شی بە ئینتماو گەڕانەوەیەک بۆ ڕابردوو دەگەڕێنێتەوە بەتایبەت بۆ (باتای، فرۆید، نیتشە، شوپنهاوەر) (٧) کارەش (هابرماس، لایەنگیری خۆی بۆ مۆدێرنزم ڕادەگەیەنێت و شەڕێک دژی (فۆکۆ) بەرپا دەکات، بەوەش زیاتر لەسەر چەمکی دەسەڵات لای (فۆکۆ) دەوەستێت و نووسینەکانی دوایش بەپاشگەزبوونەوەی وتارەکانی پێشووی دەبینێ، تەنانەت کتێبی (چاودێری و سزا)ی بەپاکانە بۆ نووسراوەکانی پێشووی سەیردەکات، ئەگەرچی ئەو کارەی (هابرماس) دەیەوێ وێنەی بێگوناهی مۆدێرنزم دەربخات، کە کارێکە دامەزراوەکانی مۆدێرنزم داکۆکی لێ دەکەن، بۆ وەستانەوە بەڕووی ئەو ڕەخنانەی ئاڕاستەی کۆمەڵگای مەدەنی دەکرێت بۆیە بۆ ڕاکردن لەناواخنی بابەتەکە، دەیەوێ بە قسەکانی (فۆکۆ)ەوە خەریکمان بکاتەوە بەوەی کاتێ فۆکۆ لەسەر نیتشەو فرۆید دەیەوێ ئەرکیۆلۆژیایەکی دی بۆ مێژوو دروست بکات، ئەوا (هابرماس) ئەو کارەی بەدووبارەکردنەوەی بۆچوونەکانیان ناودەبات. (٨)

بۆیە ڕەخنەکانی هابرماس کارێکی تازەنیە، چونکە پێشتر وەک فۆکۆ دەڵێ



**. فۆکۆ پێی وایە شێت لەوکاتەدا کەجیا دەکرێتەوە، مۆدێرزمی گۆشەگیری بنیات دەنێت**

. (هابرماس) هێرشێکی توند رووبەرووی فۆکۆ دەکاتەوە، چونکە رەخنەی ئاراستەی عەقل کردووە



. شێتەکان هەست دەکەن (فۆکۆ) نزیکترین هاوڕێیانە.

«دەروونپزیشکەکان بەسەرۆکایەت مارکسیستەکان لە کۆنفرانسێکدا لەشاری تۆلۆز لە دەوری یەک کۆبوونەوەو بەدەهۆڵ کوتان، منیان بە ئایدیۆلۆگی بۆرژواو لەم بابەتانە تاوانبار کردو دادگایەکیان لە دەروونپزیشکەکان پێکهێنا بۆ مەحکومکردنی ئەو کتێبە».(٩)

بۆیە مۆدێرنزم هەرگیز توانای نیە گوناهباری خۆی لەبەرامبەر شێتی بسڕێتەوە ئەوەش پەیوەندی دەسەڵاتە بە بونیادەکانەوە، ئەو بونیادانەی دەسەڵات کۆنترۆڵی دەکات، بۆ ئەوەی چاوەکانی خۆی لە ئاستیدا دابخات، دەسەڵات لە تاکرەهەندیەوە مەبەستیەتی دیاردەکات لەچەشنی شێتی رابگرێت، وەک زاڵبوونی فەلسەفەی ماکسیزم بەسەر کۆمەڵگاوە لەکاتی دەرکردنی ئەو کتێبە، فۆکۆ بەوە تاوانبار کرا کە ئایدیۆلۆژیستێکی بۆرژوازییە، دیارە ئەو کارەش پەیوەندی بونیادەکان بەدەسەڵات دەکاتەوە بە پتەوکردنی کۆنترۆڵی ئەو پەیوەندییە ئەوەتە لەو دیدارەی (بۆنسن) لەگەڵ (فۆکۆ) کە دوای مەرگ فەیلەسوفی (مێژووی شێتی) بڵاوکرایەوە (فۆکۆ) دەڵێ «کۆمۆنیستترین دەروونپزیشکی فەرەنسایی لەدەهەی ١٩٥٠ دا چوو بووە مۆسکۆ دیبووی کە لەوێ چۆن لەگەڵ نەخۆشیە «دەروونییە»کاندا رەفتار دەکەن، بەڵام کە گەڕایەوە دوولێوەی نەکردبۆوە تەنانەت یەک وشەیش، نەک لەبەرئەوەی کە ترسنۆک بێ، بەڵکو بەڕای من، لەبەرئەوەی کەکەرامەتی رێی پێ نەدەدا، چونکە زەبرێکی وای لێکەوتبوو کەنەیدەویست هیچ بڵێ و هەتا چەند ساڵ دواتریش کە مرد، هیچ شتێکی سەبارەت بەوەی کە دیبووی نەگوت».(١٠)

بەڵام ئەوەی کەسانێک ناچار ناکات راستیەکان بڵێن ترس لەدەسەڵات، چونکە ئەو کەرامەت چوونەی فۆکۆ لەترست جیای دەکاتەوە، بۆخۆی لەبونیادی وشەکە ترسێکی دیکەی هەڵگرتوود بۆ شاردنەوەی حەقیقەت، حەقیقەتێک کە (فۆکۆ) بەجۆرێکی دەسەڵات تەماشای دەکات.

بۆیە حەقیقەتی شێت دەسەڵاتێکە دەسەڵاتی بەرامبەر (مۆدێرنزم) سەرکوتی کردۆتەوە، دوان لە شێتیش دوانە لە حەقیقەتی ئەو دەسەڵاتە، ئەو دەسەڵاتەی مۆدێرنزم لەباڵادەستی عەقلانیەتی خۆی دەیەوێ دانی پیانەنێت و بیسڕێتەوەو بەتاوانباری بزانێت، هەربەو تاوانەش دەسگیری دەکات، تا سیستەمەکەی ئەو لەشێتی بەدووربێت بۆیە دەبێ بپرسین ئایا مۆدێرنزم بەدەرکردنی شێت هەموو خەسڵەتە مرۆییەکانی لە کۆمەڵگا ناسەنێتەوە!؟ کۆمەڵگایەک هۆشیار بێت و قسە لەمەدەنی بکات یانی چی نەتوانێ شێتەکان قبول بکات، ئەوەش ئەو پرسیارانەن کە (فۆکۆ)یان دەخستە بیرکردنەوە، بیرکردنەوەیەک عەقلی خۆرئاوای خستەژێر رەخنەوە، رەخنەیەک هەموو دامەزراوەکان کە شوێنێک لە دەسەڵات بەڕێوەدەبەن بکەونە بەردەم مەترسی گەورەتر، مەترسیەک دیسان گومان لە ئایندەی خۆشنوودی مرۆڤی خۆرئاوایی بکەن.

### پەراوێزو سەرچاوەکان

١- زانین و دەسەڵات، بابەک ئەحمەدی، وەرگێڕانی (رێبین هەردی)، سەردەم ژمارە (٢) نیسانی ١٩٩٩ .

٢- میشیل فۆکۆ مسیرة فلسفیة، اوبیر دریفوس-پول رابینوف ترجمة (جورج ابی صالح) مرکز الانماء القومی، بیروت.

٣- زانین و دەسەڵات، بابەک ئەحمەدی، وەرگێڕانی (رێبین هەردی) سەردەم ژمارە (٢) نیسانی ١٩٩٩ .

٤- کێ لە میشیل فۆکۆ دەترسێت؟(محمد الراویی)، وەرگێڕانی (ئازاد بەرزنجی) ئێستا ژمارە (٤).

٥- زانین و دەسەڵات، بابەک ئەحمەدی (هەمان سەرچاوە)

٦- نووسەری عەرەبی (محمد الراوي) ئەو پرسیارەی کردووە بەناونیشانی وتارەکەی، تاوەکو لەپرسیاری ترسەوە ستراتیژی شێتی لای فۆکۆ وەدەست بێنێت، بۆ ئەوەش پێمان دەڵێ کە داهێنەرو شێتەکان لێی ناترسن، بەڵکو ئەوەی لێی دەترسێت، فەیلەسووف و دەروونناسەکان بوون.

٧-القول الفلسفی للحداثة، هبرماس، ترجمة (د. فاطمە الجیوشی)، دراسات فلسفیە-وزارە الثقافە (دمشق)، ١٩٩٥.

٨- لەوتارێکی دیکەدا گەڕاوینەتەوە سەرکارکردنی فۆکۆ لەسەر (نیتشەو فرۆیدو مارکس) بەناوی (ئەرکۆلۆژیای مێژوو).

٩- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ (فۆکۆ)دا، گەلاوێژی نوێ، ژمارە (١٤)ی ١٩٩٩ .

١٠- هەمان سەرچاوە.

# «سەرچاوەکانی داهاتی تیمە سۆفییەکان»

**نووسینی: مرتضی میر خانی**
**وەرگێڕانی: سالار عەزیز**

دیاردەیەکی وەک ڕێبازی سۆفیگەری لە کۆمەڵی ئیسلامدا پێشینەیەکی ئەوەندە درێژی هەیە کە لە بنەڕەتدا لە بەردەم هەر لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەلدا دەبێتە کۆسپ. هەروەها بۆ لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی ڕێبازەکەش کۆسپە.

بۆیە کردنەوەی هەر باسێک، لە هەر زەمینەو بابەتێک دا، خۆی لە خۆیدا، تەواو هەمەلایەن نابێ. لەبەر ئەوە دەڵێ هەندێک لە تایبەتمەندیەکانی ڕێبازی سۆفیگەری لەسەر بنچینەی دەستەو بنیادناسیدا نیشان بدرێ، لێکۆڵینەوە لەبارەی سەرچاوەکانی داهاتی سۆفییە موسڵمانەکان، لەو بابەتانەیە کە بۆ ئەم ڕێسایە دەست دەدات. ئەگەر لە هەرشوێنێکی جیهانی ئیسلامدا، وەک ڕێبازێکی کۆمەڵایەتی سەیری ڕەوتی سۆفیگەری بکرێ، دەبینرێ کەوا زۆر لە ئەدگارو داب و نەریتی تایبەتی چۆتە ناو ئەم ڕێبازەوە. بەجۆرێک ڕەنگ و چێژێکی تایبەتی بە پێکهاتەی ڕێبازەکە بەخشیوە. لەم ڕووەوە لێکوڵینەوە لەبارەی سەرچاوە دارایی و دەرامەتییەکانی سۆفیەکانیش تا ڕادەیەک لەگەڵ نیازمەندییە پێویستەکانی کۆمەڵی ئیسلامدا پەیوەست بووە.

بەم پێیە بۆ ڕەچاوکردنی کورتی وتارەکە، تەنها هەندێک لە تایبەتمەندییە گشتییەکانی ئەم ڕێبازە نیشان دەدرێت.

سەرهەڵدانی ڕەوتی سۆفیگەری ئیسلامی و پێگەیشتن و کەم کەم بڵاوبوونەوەی، جێ گیربوونی دامەزراوی تایبەتی پێویست دەکرد تا لایەنی داهات و دابین کردنی داراییەکەی بەرجەستە بکا. بۆیە کۆششی هەندێک لە پیاوە چالاکەکانیان تەرخان کرابوو بۆ دۆزینەوەو جۆراوجۆرکردن و پەیدا کردنی ڕێی تازە بۆ سەرچاوەکانی داهاتی ڕێبازەکەیان؛ بۆ ئەوەی جگە لە لابردنی هەموو پێویستییە دارایی و ڕۆژانەو ئاساییەکانیان، مانەوەو بەردەوامی ژیانی کۆمەڵایەتی ڕێبازەکەش مسۆگەر بکەن. هەروەها لە هەرگرێدراوییەک و لایەنگیرییەکی پیرەوانی سۆفیگەری بۆ دەسەڵاتداران و دەوڵەمەندان پێش گیری بکەن.

ڕێبازی سۆفیگەریی هەرچەندە لەم ڕێگایەدا گوێ ڕایەڵ و ئارەزوومەندانی ژمارە بەدەری هەبوو، کە هەموو سەرمایەو سامانی خۆیان دەبەخشیە دامەزراوەو کەسایەتییە سۆفیەکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕووبەڕووی گرفتاری و کۆسپی مەترسیدار بوونەتەوە.

ناکۆکی و کێش مەکێشی بەربڵاوی پەیڕەوانی شەریعەت و زانایانی ئیسلام لەگەڵ قەوارەو بانگەشەو بڵاوبوونەوەی سۆفیگەری لە کۆمەڵی ئیسلامدا، ڕەوایی هەندێک لە کارو ڕێچکەکانی سۆفییەکانی لاواز کرد. یەکێ لە بابەتە باس وروژێن و پڕ گفتوگۆکان، بابەتی داهاتە جۆراوجۆرەکانی سۆفییەکان بوو.

لە جیهانی واقیعیەتیشدا، سۆفییەکان کە داوای وازهێنانیان لە پارەو سامان دەکردو دژی هەموو ئەزموون و فێرکردنێکی دنیایی بوون، لەگەڵ ئەو سامان و سەرمایەی کە جاروبار لە هەندێک لە خانەقاکان دەبینران دژوار خۆی دەنواند. ئەمەش تانەو نەفرینی نارازیانی زیاتر دەکردو هێرشەکانیان بۆ سەر سۆفییەکان توندتر دەکرد.

ئامانجی گەلاڵەی ئەوباسەی کە بەدوادا دێ، بە کورتی ژماردن و خێرایی جۆرەکانی سەرچاوەی داهاتی سۆفییەکانە. لەگەڵ سەر لەنوێ تەئکید کردنەوەی ئەو خاڵەی کە لە پلەی یەکەم هەموو فرقەکانی سۆفیگەری لەم داهاتە جۆراوجۆرانە سوودیان وەرنەگرتووە، دووەمیان ئەو داهاتانە بە درێژایی مێژوو پەیدا بوونەو هەندێک جار گۆڕاون.

سێ یەمیان لەگەڵ پێش ڤەچوونی ئەم کۆڕو

**. لێکۆڵینەوە لە بارەی سەرچاوە دارایی و دەرامەتیەکانی سۆفیەکانیش تارادەیەک لەگەڵ نیازمەندییە، پێویستەکانی کۆمەڵی ئیسلامدا پەیوەستە.**

**. یەکێ لە بابەتە باس وروژێن و پڕ گفتوگۆکان، بابەتی داهاتە جۆراوجۆرەکانی سۆفییەکانە.**

کۆمەڵە سۆفییانە لە دنیای نوێدا، داهاتی نوێش خراوەتە سەر سەرچاوەکانی پێشووتر. چەندایەتی و چۆنایەتی ئەم سەرچاوانەش شایانی لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەیە.

دوا خاڵی زۆر گرنگ ئەوەیە کە لەبەر ئەوەی رەوتی سۆفیگەری لە مێژووی خۆیدا بێبەش نەبووە لە هێرش و تەنگ پێ هەڵچنین و هەمیشە بۆتە ئامانجی رەخنەو پەیامی نێگەتیفی ناحەزان؛ بۆیە هەردەم خەریکی دارشتنی سیستەمی دارایی بوونە بۆ خۆیان.

بۆ ئەوەی سەربەخۆییان هەبێ و دووربن لە گرێدراوی بە دەستگاکانی دەوڵەت لەلایەک، لەلایەکی دیش پێش گیری بکەن لە لاواز کردنی تەواوی سۆفییەکان بەهۆی کزولاوازی باری داراییەوە.

لەبەر ئەودی ئەو شێوەو شێوازانەی بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەم مەبەستە بەکاردێت، ورد بوونەوەو قووڵ بوونەوەی زیاتری دەوێ.

## رێگاکانی بەدەست هێنانی داهات لە لایەن سۆفییەکانەوە

١- خێر قەبوول کردن:

خێر قەبوول کردن هەر لە رۆژگاری کۆنەوە تا رۆژگاری ئێمە لە رێگا ستایشکراوەکانی سۆفییەکان بووە. جگە لە تەئکیدکردنی قورئان لەسەر پێویست بوونی خێرکردن لەلایەن موسڵمانانەوە(١)و ئەو ریوایەتانەی خێرکردن بە باشترین پارەو زەخیرەی ئادەمیزاد دەزانن(٢)، سۆفیەکانیش ئەو مەسەلەیان خستبووە روو کە ئێمە رۆڵە روحانییەکانی پێغەمبەری خوداین و پێغەمبەریش فەرموویەتی: سەدەقە بە خانەوادەو رۆڵەکانی پێغەمبەری خودا حەلاڵ نییە. هەروەها لەبەر ئەوەی سەدەقە چڵک و پیسی خەڵکە(٣)، ئێمە خێر وەرناگرین و قەبوولمان نییە، بەلام زۆربەی سۆفییەکان بەرە بەرە دڵیان چۆتە وەرگرتنی خێرو بە تێپەربوونی رۆژگاریش بەلاگێری خراوەتە سەرو ئەمەش لە ئاراستەکردن و رەوایی وەرگرتنی خێر کاریگەر بووە. بەجۆرێک وەرگرتن و خەرج کردنی خێر لەلایەن کەسانی سەر بەم رێبازانە بیرو ئەندێشەی تایبەتی بۆ دارێژراوە. خواستی ئەندامانی ئەم فرقە جۆراوجۆرانەی سۆفییەکان بۆ وەرگرتنی خێر لە لایەک و بیروباوەڕی کۆمەڵیش لە گۆڕینی خێر بە ناونیشانی شتێ پێدراوێکی هەمیشەیی بۆ هەژاران و دەروێشان لە لایەکی دی کاریگەر بووە.

٢- خەرج کردنی زەکات:

بەپێی بنچینەی تەئکید کردنی قورئان لەسەر زەکات دان(٤)و زۆر لە وتەی ئیمان و ئەولیاکانی دین لەسەر بەجێهێنانییەوە لەلایەن موسڵمانانەوە، ئارەزوو گەلێک لەلایەن هەندێ فرقە سۆفییەکانەوە دەبینرێ تا لەم پێدراوەی کۆمەڵیش سوود وەرگیرێ.

لە حاڵاتی (شێخ نجم الدين کبری) هاتووە: سۆفییەکان «بۆ خەرجی خۆیان و موریدانیان هەموو ساڵێک هەزارو هەشت سەد دینار لە پارەی زەکات کە حەلاڵترین پارەیەو دەگەیشتە (بيت المال) براندبۆوە(٥)».

هەڵبەتە هەوڵ و کۆششەکانی فرقە سۆفییەکان بۆ ئاراستە کردن و رەوایی نیشان دانی دەست تێوەردانی ئەم پارە شەرعییەی کۆمەڵی ئسلامی شایانی لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆیە.

٣- دیاریی قەبوول کردن:

لە سەرتاسەری مێژووی سۆفیگەریی دا، دیاری بە یەکێک لە سەرچاوە گرنگەکانی داهات دەژمێردرێ، چونکە دیاری بردن بە ئارەزوو و ویستەوە ئەنجام دەدرێ. هەندێک جار دیارییەکان ئەوەندە زۆر بوون قوتب و شێخە سۆفییەکانی دەکردە ئەشرافی کۆمەڵ.

دەگێڕنەوە کە شاە نعمت الله و لەگەڵ کچەکەشی دا چەند بارێکی زۆری دیاری بۆ ناردبوو».

لەو سەردەم و رۆژگارەی کە سۆفیگەری بەهۆی قەیرانە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانەوە برەوی دەسەند، داهاتەکەش زیاتر دەبوو. بەجۆرێک دەبوو بە پشتیوانێک بۆ راکێشانی هەرچی زیاتری خەڵک بۆ ناو خانەقاو هەڵقەی شێخە سۆفییەکان.

٤- نەزر کردن:

داب و نەریتی نەزر کردن بەهۆی پاڕانەوە بۆ گرێکردنەوەو لابردنی قەدەغە کراوەکان و شتی دیکە هەر هەبووە(٦). سۆفییەکانیش بە سوود وەرگرتن لەم ئارەزووەی خەڵک، سەرچاوەیەکی دیکەی داهاتیان بۆ خۆیان دەستەبەر کردبوو. ئەم کارە تا رادەیەک برەوی سەندبوو و بڵاوببۆوە، کە نەزرکردن بە رێبەران و خەڵکی دوعاگیر بە داب و نەریتێکی ئاسایی دەزانرا(٧). دەگێڕنەوە کە لەسەردەمی (ابو سعید ابوالخیر)دا، گەنجێک بە خزمەتکاری (ابو سعید) دەڵێ: «من نەزرم کردبوو ئەگەر لە دەست دزان رزگار ببم خەروارێک مێوژ بدەمە سۆفییەکان. ئێستا لەم بەڵایە رزگارم بوو، وەرن بیبەن(٨)». بۆ نموونە ئیسماعیلیەکان هەموو ساڵێک (٥٠٠) هەزار دینار زێڕی سووریان وەک نەزرکردن بۆ (جمال الدین گیلی) دەنارد(٩).

تا ئێستاش نەزرکردن لەلای هاوسۆزانی سۆنییەکان ماوەتەوە. فرقەی موریدەکان وەرگرتووەو بۆ فراوان کردنی نووسینگەو خانەقاکانی خۆیان لە دەرەوەی وڵات دا سەرف کردووە(١٠).

٥- کۆمەکی دارایی سوڵتان و هەڵبژێردراوە سیاسییەکان، پیاوانی سیاسەت و سەرۆک دیوانەکان کارسازییان بۆ دەکرد، یەکێک بووە لەو رێگایانەی کە زۆربەی خانەقاکانی پێ بەڕێوەدەچوو.

ئەمانە جگە لەوەی کە پەیوەندی دۆستایەتی و گوێ رایەڵییان لەگەڵ شێخە سۆفییەکاندا هەبووە، لە میانەی ئەم کارەدا، بەدوو ئامانجە سیاسییەکانی خۆشیان دەکەوتن. دەڵێن کە سوڵتانەکانی سەلجوقی زێڕو زیویان بۆ (جلال الدین محمد مولوی) دەنارد.

سوڵتانی سنجەر بۆ خەرجی خانەقای (قاسم بن حوکی) ٥٠ هەزار دیناری نارد(١١)و (خواجە نظام الملک توی) بۆ خەرجی مەزارگەی (ابو سعید ابو الخیر) سەد خەروار دانەوێڵەو سەد دیناری رەوانە کرد(١٢).

لەلایەن سوڵتانەکانەوە بۆ (ابو سعید ابو الخیر) ٤٠٠ ئەسپی بەزینەوە نێردراوە(١٣). لە مێژووی هاوچەرخی ئێرانیش دا، شێخە سۆفییەکان، هەندێ جار لەبەر زۆری دیاری و کۆمەکی خەڵکی گرێدراو بە دەستگای سیاسی وڵات ببوونە وێردی سەر زمان.

٦- وەرگرتنی پارەو کاڵای بڕیاردراو لە حکومەتەکانەوە جگە لە دیاری و بەخششەکانی سەرانی حکومەت، کە بە هەرحاڵ هەمیشەو بەتایبەتی لە رۆژگاری کاریگەری دەسەڵاتی شێخە سۆفییەکاندا بەردەوام بووە، دامەزراوەکانی گرێدراو بە حکومەت پارەو کاڵای بڕیاردراویان بۆ شێخە سۆفییەکان بڕیبۆوە. لەم بارەوە کارەکانی خواجە رشیدالدین فضل الله)ی وەزیری ئیل خانانی مەغۆل بۆ (شیخ صفی الدین اردبیلی) گەورەی شێخەکان شایانی سەرنجە(١٤).

٧- مەوقوفات:

داهاتی مەوقوفات بۆ سۆفییەکان هەمیشە گرنگ بووە. پارەو داهاتی تایبەتی مەوقوفات بۆ بەڕێوەبردنی خانەقاکان، بەرگوزاری کۆڕی تایبەتی دەروێشان و سۆفییان و هەر ئامادەکارییەکی پێویستی ژیانیان بووە. زۆربەی کاربەدەستە حکومی و دەوڵەمەندەکان بۆ ئەم مەبەستە سامان گەلێکیان بەناونیشانی داهاتی هەمیشەیی دامەزراوە سۆفییەکان تەرخان کردووە. بۆ نموونە (خواجە رشیدالدین فضل الله) بۆ خانەقاکانی غازانی تەورێزو خوراسان (١٥)، بەغداو هەمەدان(١٦) مەوقوفاتێکی زۆری دیار کردبوو. ئیمڕۆش زۆر لە خانەقاکانی وڵات لە داهاتی بەدەست هاتووی مەوقوفاتی خۆیان خۆراک دەخۆن. زۆر لەو موڵکانە جگە لە کاربەدەستانی دەوڵەت، لەلایەن هەواداران و گوێ رایەڵانی سەر بە فرقە جۆراوجۆرەکانەوە تەواوکراوە.

٨- ئازووقە وەرگرتن:

ئازووقە ناردن بۆ خانەقاکان لە دێرزەمانەوە رێ ورەسمی دەرباری سوڵتان و گەورەکانی وڵات بووە. ئەم ئازووقە ناردنە بە یەکێ لەو مهرەبانییانە دەژمێردرێ بەرامبەر سۆفییەکان،

**.لای خودی سۆفییەکانیش لەرێی سواڵکردن و بە هاوڕێبازانیان دابین دەکرد.**

**.لەلایەن سۆفیەکانەوە کۆشش کراوە بۆ وەرگرتنی داهاتەکان رەوایی پێی ببەخشرێ**

چونکە بە رواڵەت سۆفییەکان نە پەرژاونەتە سەر ئامادەکاری و فەراهەم کردنی خۆراک و پێویستیەکانی دیکەی خوان. گواستنەوەی چەند نموونەیەک لەم بارەوە سەرنج ڕاکێشە: سوڵتانەکانی هیند بەرهەمی ئەملاکی سندیان بەشێوەی بەخشش بۆ (شیخ شهاب الدین سهروردی) ناردووە(١٧). یا ڕۆن و کەشکی پێنج هەزار مەڕی خوزستان بۆ هەمەدان دەنێردراو خورییەکانیشیان بۆ شیراز ڕەوانە دەکرا تا بۆ خانەقای سوڵتانیە (زیلو)ی لێ دوست بکەن(١٨). لەبەر ئەمە لەدێر زەمانەوە خانەقاو شوێنەکانی کۆبوونەوەی سۆفییەکان بۆتە بنکەی خواردن پێدانی هەژاران و داماو موسافیرەکان.

٩- سواڵ کردن:

هەرچەندە داواکردنی یارمەتی لە کەسانی دیکەوە بەهۆی برسییەتی و نیازمەندییە سەرەتاییەکان بەکارێکی بێزەوەرو پەست ژمێردراوە، بەڵام بەپێی ئەزموونی سۆفییەکان وەک ئامرازێک بەکار هاتووە بۆ تەحقیرکردنی نەفس و فەرامۆش کردنی پێگەو بارودۆخی رابووردوی تاکەکەسی. بۆیە داواکردنی یارمەتی لەلایەن هەندێک لە فرقەکان تەنکیدی لەسەر کراوە(١٩). لە ڕاستیدا، هەندێک جار ئەندامی دەوڵەمەندی تازە هاتوو، بەناچار پارەی خۆی لە نێوان هاوڕێبازەکانیدا دابەش کردووەو ئینجا خۆشی سواڵی کردووە(٢٠). بە وتەی یەکێ لە شێخەکان «دەرۆزەکردن بۆ نەهێشتن و لەناوبردنی ئابروو پایەی کەسیەتییەو نابێ هیچ کەس بەشێوەی دیاری و قەرزو یارمەتی شتێک بدات بە ئادەمیزاد(٢١).»

هەڵبەتە بەرە بەرە بەپێی ئەم بیروباوەڕە سواڵکردن وەک ڕێ وڕەسمی دابین کردنی هەندێک کاڵای داواکردنی سۆفییەکانی لێهات، بەڕادەیەک خەیاڵ بۆ ئەوە دەچوو کە واژەی دەرویش (سۆفی) لەگەڵ واژەی سواڵکەرو هەژار یەکسان بێ. لای خودی سۆفییەکانیش لە ڕێی سواڵکردن و بە ڕێکخستنێکی تایبەتەوە نیازمەندییەکانی هاوڕێبازانیان دابین دەکرد(٢٢).

بەجۆرێک کە ئیمڕۆش دەرویشانی (نعمت اللهی، صفی علیشاهی، نعمت الله مونس علیشاهی وخاکساریه) سواڵکردن بە داب و نەریتێکی ڕەسمی دەزانن.

١٠- داهات لە ڕێگای کارکردنەوە:

بەپێچەوانەی ئارەزووی زۆری سۆفییەکان بە خۆ دوورخستنەوە لە کارکردن و پیشەگەری وهەر شتێکی دیکەی دنیایی ولە خەیاڵیاندا دژایەتیەک هەبووە لە نێوان کارکردن و سۆفیگەریدا(٢٣)، بەڵام هەندێک فرقە لارییان نەبووە لە کاروکاسبی کردن و بەڵکو بە حەڵاڵترین رزقیان داناوە. بۆیە هەندێک جار تووشی نازناوی تایبەتی شێخە سۆفییەکان دەبین کە لە ڕاستیدا کارو پیشەیان بووە. وەک: (حەللاج)، (ابوبکر نساج)، (بنان حمال)، (حمدون قصار)، (ابوبکر وراق)و ئەوانی دیکە(٢٤).

(ابن بطوطه) جیهان گەری سەدەی هەشتەمی کۆچی، دەربارەی چۆنیەتی کاروداهاتی هەڵقە سۆفییەکان و جوامێرانی تورکیاو ئەسفەهان ڕاپۆرتێکی نیشان داوە(٢٥). ئێستا هەندێک فرقە بۆ پارێزگاری خۆیان لە گرێدراوی بە دەزگا حکومییەکان و کەسایەتییە دەسەڵاتدارەکان ئابورییەکی سەربەخۆیان کردۆتە پیشە.

١١- داهاتە وەرزییەکان:

جاروبار هەندێک لە شێخە سۆفییەکان بەپێی داب و نەریتی ناسراوەوە بڕێک لە بەرهەمە دەست ڕەنجەکانی (کشتوکاڵ یا پیشەسازی) خۆیان بۆ لێپرسراوان دەنارد. ئەمەش جگە لە بەردەوام کردنی پەیوەندی و پارێزگاری کردنی کۆمەڵە سۆفییەکان لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە، لەجیاتی دیارییەکی گران بەهاتریان بۆ نێردراوەتەوە. بۆ نموونە (نصرالدین شاه قاجار) لە جیاتی ئەو دیاریانەی کە سۆفییە هاوچەرخەکان بۆیان ناردبوو، ئەویش دیاری گەلێکی وەک زیوو زێڕو قوماشی ناردۆتەوە. بۆ نموونە (حاج میرزا محمد علي پیرزادە) هەموو ساڵێک (١١٠)خەیاری لە بەرهەمەکانی خۆی بۆ (ناصرالدین شاه) ناردووە، لەو بەرامبەردا، شاش دیاری گران بەهای بۆ ناردۆتەوە. (حاج شیخ محمد حسن صالح علیشاه گنابادی) مافوورێکی بۆ (رضا شاه) ناردبوو، لە جیاتی ئەوە شاش (٣٠٠) تومانی بۆ ناردبۆوە(٢٦).

١٢- دەیەکی (عشریه):

ئەو ئارەزوو و مەیلانەی هەندێک لە فرقە سۆفییەکان هەیان بوو بۆ بەرقەرار کردنی جۆرە ڕێکخستنێک لەم شت پێدراوانە، بوو بەهۆی پەیدا بوونی دەیەکی.

(حاج میرزا زین العابدین رحمت علیشاه شیرازی) بە داهێنەری جۆرە یاسایەکی پێدراوی دەیەکی دەژمێردرێت و دەیەکی داهاتی مانگانە یا ڕۆژانەی تاکە کەسەو لە پێنج یەکییەو دەدرێتە شێخە سۆفییەکان. ئەم پێدراوە هەمیشەیی و ڕێکخراوە بەگوزەرگایەکی داهاتی شایانی سەرنج ئەژمێردرا(٢٧).

ئێستا بە چاوپۆشی لە ئارەزوو ومەیلی هەندێ لە

فرقەکان دەرهەق بە پشت تێکردن لە هەرشتێکی جوان و مادیاتێکی دنیایی و هەڵبژاردنی گۆشەگیری و دووری لە کۆمەڵ و رەتکردنەوەی هەموو جۆرە یارمەتییەکی خەڵک، زۆربەی فرقەکان لە وەرگرتن و سەرف کردنی یارمەتی خەڵک خۆش بین و ئارەزوومەند بوون.

بیروباوەڕی کۆمەڵ دەربارەی نزیکان و کۆمەک گەیاندن بەوانەی بە رواڵەت نیازمەند بوون، یا داب و نەریتی خەڵک لە رێزگرتن و بەگەورە دانانی پاک و خوا پەرستەکان و لەدڵدا خۆشەویستی و بەرژەوەندی و دووربینی هەندێک لە سیاسەتمەدارانی کۆمەڵ، هەمووی دەبووە هۆی جۆراوجۆری وزۆری پارە پێدراوە کۆمەڵایەتی ودارایییەکان بە سۆفییەکان.

لەلایەن سۆفییەکانەوە کۆشش کراوە وەرگرتنی داهاتەکان رەوایی پێ ببەخشرێ، چونکە دەیان ویست ئەم داهاتانە بەردەوام و سیستەم داربن. لەلایەکی دیکەدا، لەسەر بنچینەی رەوشت و کۆمەڵەوە، بەدوای داهێنانی داهات گەلێکی تازەدا دەچوون.

جگە لەمانەی سەرەوە، رێکخراوی دارایییش کە لێپرسراوی وەرگرتن و پاراستن و تایبەت کردنی داهاتە باسکراوەکان بوو، شایانی لێکۆڵینەوەیەکی جودایە. چونکە سەرپەرشتیارانی ئەم رێکخراوە لەلایەن شێخی خانەقا یا هەڵقەی سۆفییەکانەوە دادەمەزران و لەژێر چاودێری ئەودا چالاکییان دەکرد، جاری وا هەبوو داهاتە زۆرو زەوەندەکانی خانەقایەک یا شێخێک ئەوەندە زۆر بوو، پێویستی بە رێکخستنەوەیەکی هەمە لایەنەو چاودێری راستەوخۆی شێخ هەبوو.

دوا وتە ئەوەیە کە ئەم شت پێدراوانەی سەرەوە لە زۆر لایەنەوە شایانی لێکۆڵینەوەن. بە رواڵەت زەمینەی بەربڵاوی چالاکی زۆر لە فرقە سۆفییەکان لە شارەکانی ئێراندا بووە. هەرچەندە راپۆرتی واشمان هەیە کە چالاکی خانەقاو شوێنە سۆفییەکان لە هەندێک جێگای دەرەوەی شار نیشان دەدەن، بەڵام لێکۆڵینەوە لەسەر چەشن، بڕ، کالای پێدراو بەسۆفییەکان نیشان دەری ئەوەن کە پێدراوەکان کالا یا پارە بوونە. هەروەها رەنگە ئەمەش لە پێدانی ئەو شتانەوە پەیدا بووبێ کە لەلایەن چین و توێژە جۆراوجۆرەکانی خەڵک ئەنجام دراوە.

ئەم خاڵە دەتوانێ بکرێتە لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەل لەو دیدگایەی کە لەم سەدەی دوایی، چین بەندی کۆمەڵە سۆفییەکان گۆڕانکاری بەسەردا هاتووەو هەروەها کاریگەری و چالاکی کۆمەڵە سۆفییەکانیش لە چینەکانی ناوەندەوە بۆ سەرووی کۆمەڵ هەنگاوی ناوە.

## سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١- بقـــرة: ١٩٦، ٢٦٣، ٢٦٤، ٢٧١، ٢٧٦و نساء: ١١٤و توبة: ٦٠ - ١٠٢ و مجادلە: ١٢ .
٢- قال رسول الله (ص) خير المال المرء و ذخائرة الصدقة. بگەڕێوە: جامع احاديث الشيعە، ج ٨، ص ٣٥ .
٣- محجة البيضاء، ج ٢، ص ١٠٨
٤- بقره: ٤٣، ١٧٧ وحج: ٧٨ و انبياء: ٧٣ .
٥- تاريخ آل جلاير، ص ٢٦٥ .
٦- بگەڕێوە: فردوس المرشدية، ص ٤٩٧ - ٤٩٨، ٥٠٥ .
٧- (دهخـدا) لەژێر (نذر)دا واى لێكداوەتەوە. ب : لغت نامە، لەژێر واژەی (كلە نذر).

٨- ب: اسرار توحيد، ص١٦٦ .
٩- ب: حبيب السير، ج ٢، ص ٤٧٦ .
١٠- ب: فصلنامە صوفى، ص ٤٢ .
١١- قنديه، ص ٩ .
١٢- اسرار التوحيد، ص ٣٥٩ .
١٣- تذكرة رياض العارفين، ص ٤٨ .
١٤- ب: مكاتبات رشيدى، ص ٢٣٣ - ٢٣٤ و ١٨٣ . بەو پارەو داهاتی ئەو مولکانە دەڵێن کە بۆ بەرژەوەندی خەڵک بەکاردێت.
١٥- ب: تاريخ مبارک غازانى، ص ٢٠٧ .
١٦- ب: حبيب السير، ج ٣، ص ١٨٧ - ١٨٩ .
١٧- مكاتبات رشدى، ص٣٣ .
* جۆرە لبادێک بووە.
١٨- بۆ دیتنی نموونەی زیاتر، ب: نزهه القلوب، ص٧، تاريخ مبارک غازانى، ص٢٠٩ - ٢١٥، صفوة الصفا، ص١٨٧ .
١٩- ب: كشف المحجوب، ص١٦٤ .
٢٠- بۆ چەند نموونەیەکی تر ب: اوراد الاحباب، ص٨٥ .
٢١- ب: اللمع، ص١٩١ .
٢٢- مصباح الهدايه ومفتاح الكفايه، ص١١٩ .
٢٣- ب: تلبس ابليس، ص٢٨١ .
٢٤- ب: ارزش ميراث صوفيه، ص٦٦ .
٢٥- رحله ابن بطوطه، ج اول، ص١٢٥، ١٨١ .
٢٦- نابغەی علم و عرفان، ص٤٣٤، ٤٣٥ .
٢٧- بۆزانیاری زیاتر ودرێژی باسەکە ب: از كوى صوفيان تا حضور عارفان، مبحث عشريه.
لە گۆڤاری (انديشه جامعه)، شماره سريال بين المللى ١٥١٩ - ١٥٦٠، آذر ١٣٧٨، ص٢٢ - ٢٤ وەرگیراوە.

# یەکەمین حەیران هی منداڵدانی دەشتی هەولێر نییە

جەلال سنجاوی

له ژماره (١٤٥)ی گۆڤاری کاروانی نازیزو لـه دۆسـیـەی فۆلکلۆر. مامۆستا پیرداود مەخموری لێتۆژینەوەیەکی رەخنە نامێزی بەناوی (شەرت نییە بچیە حەوێ، شەرتە لە هەوێ بێیەوە)

بڵاو کردبۆوە کە لەپەنای هەڵسەنگاندنی کتێبەکەی مامۆستا عومەر شێخەڵڵا (داستان و گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردیدا) کەسانێکی زۆری تیرباران کردبوو، بەتایبەتی لەو جێگایانەی بەداڵغەو خەیالاتی کوڕینی تەڕادانێی بە نەسپی نارمزووە لە مێژینەییەکانی مەبەستی چەندین ساڵەی دابڕانی لە مەملەکەتی حەیران کردبوو، بەو نومێدەی لە سەنتەری بازنەی ئیازو مەرام نزیک بێتەوەو دەستی بگاتە دەسرازەی لانکەی بەرایی یەکەم شوێنزای حەیران.



بەر لە هەموو شتێک دەمەوێ بە ڕاشکاوییەوە ئەو راستییە بدرکێنم، کە من لە دوورو نزیکەوە پەیوەندیم بە بەرگری کردن لە کتێبی ناوبراو نییەو ئەوەیان وەک مافێکی شەرعی بۆ مامۆستا عومەر شێخەڵڵا بەجێ دێلم گەر جەنابیان لە ئایندەدا ئارەزووی وەڵام دانەوەی هەبێ، وەلێ مەبەستی بەندە لەو چەند پەیڤەدا تەنیا بەرگری کردن لە خودو لە راستییە مێژووییەکانە، چونکە مامۆستا پیرداود لە دووتوێی نووسینەکەیدا دەستی لە منیش وەشاندییە بەتایبەتی لە بابەتەکەم (لانکەزای حەیران) کە لە ژمارە (٢١)ی گۆڤاری رامان - ١٩٩٨ - بڵاوم کردۆتەوە.

کاکی رەخنەگر لەو هەموو بگرەو بەردەیەدا دەیەوێ بەو رایە بسەلمێنێ کە یەکەمین حەیران هی منداڵدانی دەشتی هەولێرەو رێک مەلۆتکەکەش بۆ ئامێزی مەخموورە گچکەلەکە دەباتەوە، ئەگەر وایە ئێمەش ناتوانین چیتر گازاندە لە بیروڕا ساکارەکانی (ئەسعەد عەدۆ) بکەین کە لە کۆڕو کۆبوونەوەکاندا دەیگوت ((حەیران لەسەر تۆقەرەی بێژنگ بەسەری پەڕوباڵی خۆی گیڤ کردۆتەوە))...

ئەم رایەش تیئۆری و زانستیاند نییەو ناکرێ وەک بەڵگەیەکی چەسپاو پشتی پێ قایم بکەین، چونکە ئەمەیان مەزندەیەو هەڵقوڵاوی کارێزمای سۆزو دەمارگیری ناوچەگەرییە. من پێش (لانکەزای حەیران) لە رامانی ژمارە (١٤)ی ١٩٩٧ بابەتێکی دیکەم بەناوی (مێژووی حەیران - جوگرافیای حەیران) بڵاو کردەوەو تیایدا بەشێوەی دوو قوتابخانە یان دوو کۆمەڵە بیروڕای فۆلکلۆریستانم لەمەڕ (لانکی سەرەتای حەیران) دابەش کردوون کە مامۆستا پیرداودیش هەمان شتی دووبارە کردۆتەوە بەبێ ئەوەی ناوی سەرچاوەی بابەتەکەی من بهێنێ لە هەمان مەدار سوڕاوەتەوە.

بەڵام بیرو بۆچوونی من لە لانکەزای حەیران لە وێوە لەگەڵ کاک پیرداود جیا دەبێتەوە کەمن لانکەی بەرایی حەیران بەهی دەشتی هەولێر نازانم و بۆ ئەم مەبەستەش چەندین بەڵگەی مێژوویی و جوگرافیم بە دەستەوەیە کە پتر لە بەڵگەکانی ئەو زانستی ترن، چونکە من هەرگیز گوتەی خەڵک و شتی مەزەندەو خەیالات و بۆچوونی ئێستاکی بە رای موتڵەق دانانێم لە کاتێکدا ئەو جۆرە رایانە پشتیان پێ نابەسترێ کە مێژوویەکی کورتیان هەیە، کە دەشزانین مەیلی مرۆڤی کورد بۆ گۆرانی و ئالودە بوونی بۆ گوێ راگرتن لە میلۆدی و مەقامە رەسەنەکانی کوردەواری زۆر لەوە کۆنترن کە ئێمە بیری لێ دەکەینەوە.

لە بەراییەوە وەڵامی ردتکردنەوەی بۆچوونەکانی مامۆستا پیرداود مەخموری لە مەڕ راکانی خۆم دەدەمەوە ئینجا لە هەردوو تەوەری مێژوویی و جوگرافییەوە زانستیانە دەخزێمە ناو مەملەکەتی حەیران و شوێنگەی هەوەڵین لانکەزای حەیران.

* مامۆستا پیرداود مەخموری لە پەرەگرافێکی لێتۆژینەوە رەخنە ئامێزەکەیدا دەڵێ: ((بۆ زیاتر بە دوادا چوون و رەتکردنەوەی بۆچوونەکانی (خالید جوتیارو جەلال سنجاوی) دەڵێین، بۆ دەبێ کورد هەر لە ناوچە شاخاوییەکانەوە بەرەو پێدەشت و دەشتایی و نشێو هاتبنە خوارێ، بۆچی نابێ بە پێچەوانەبێ، بەڵگەشم بۆ ئەو قسەیەم ئەوەیە ئەدی (هەولێر)

• لەلانکەزای حەیران لەگەڵ کاکی مەخموری جیا دەبمەوە کە من لانکەی بەرایی حەیران بەهی دەشتی هەولێر نازانم.

کۆنترین شارو وڵاتی هەموو جیهان نییە؟ ئەگەر هەر چ میللەتێکی لێ ژیابێ، یان بۆچی لە هەولێر جێگیر بوونەو نەگەڕاونەتەوە، خۆ لە قسان کورد بە رەوەندی ژیاون کوێستان و گەرمیانیان کردووە))...

دەربارەی نژادی کوردو ژیانی بەرایی کوردان لە پەیژە هەرە دێرینەکانی مێژوودا شتێکی چەسپاوو جێگیرە کە کورد نەتەوەیەکی شاخ نشینەو بە هەزاران ساڵ بەر لە ئێستا لە شاخە زەلامەکانی گرێی ئەرمینیا بەرەو ژێر تا دەگاتە دامێنی چیاکانی تۆرۆس و زاگرۆس دەسەڵاتی خۆیان بە زەبری هێز داکوتاوەو بە چەشنی پەرژینێکی پۆلایین رێگەیان لە لەشکرکێشی دوژمنکارییانەی ئەکەدی و ئاشووری و بابلیەکان گرتووە، ئەو کاتەی رژێمی فەرمانڕەوایەتی لە شارستانییەتی میزۆپۆتامیا بۆ یەکەمین جار لە ژیانی مرۆڤی ئەم ناوچانە پەیدا بوو ناوی (ئەربل - هەولێر) ریزبەندی ناوی شارۆچکە هەرە بەرچاوەکان بوو وەک (ئوور، ئەریدۆ، لەگش، سۆمەر، وەرکا، کالح، ئەمرود...تاد) ئەمەش مێژووەکەی بۆ دەوروبەری ساڵانی هەزارەی چوارەمی پێش لە دایک بوونی حەزرەتی مەسیح (سڵاوی خوای لێ بێ) دەگەڕێتەوە. ئەوکاتان هەولێر هەر هەبووە، بەڵام لە ژێر حوکمڕانی کوردان نەبووە.

کورد هەزاران ساڵ بەر لە ئێستا تێکەڵ بە رەوگەو لێشاوی خێڵەساتی کۆچەری مادەکان بوونە، لە سنووری چیای تۆرۆس و زاگرۆس بەرەو ژوور، چۆن دەبێ مامۆستایەکی وەک (پیرداود مەخموری) کە شارەزایە لە فەرهەنگ و کلتوورو مێژووی کورد، هەروا بە سووک و ئاسانی بیر بکاتەوەو لەبەر خاتری (حەیران) پشت لەو مێژووە دوورو درێژەی باب و باپیرانی بکات و بڵێ: (بۆ دەبێ کورد هەر لە ناوچە شاخاوییەکانەوە بەرەو پێدەشت و دەشتایی و نشێو هاتبنە خوارێ، بۆچی نابێ بە پێچەوانەبێ).

ئەم قسەیە هەویرێکەو زۆر ئاو هەڵدەگرێ بەگرانیش لەسەری رادەوەستێ، کەوابێ نابێ (لۆلۆیی و سۆباری و گۆتیەکان و کاردۆخیەکان و میتانییەکان و خوری و مادەکانیش) کورد بووبن و ئێمە بە زۆری بە مێژووی خۆمانیان دەلکێنین؟!!

دیارە بەڕێزیان پێی وایە کورد تەنها لە دەوروبەری قەڵاتی هەولێر دەوارو رەشماڵیان هەڵداوەو حەیرانیان گۆتیە! من و کاک خالید جوتیار کە دەڵێین (کورد میللەتێکی شاخ نشین بوونە، ژیانی ئێمە لە ئەشکەوت و گەلیانەوە پەخش بۆتە پێدەشت و دەشتاییەکان) ئەمەیان حەتمیەتێکی مێژووییەو لەلایەن زانایانی ئارکیۆلۆژی و ئەنترۆپۆلۆژی ساغ کراوەتەوەو بە هەزاران دیکۆمێنت و هەڵکۆڵراوی سەر گاشە بەردەکان و نووسین و هێڵکاری لاپاڵی ئەشکەوتەکانی (شانەدەرو هەزار مێردو زرزی و حەکاری و کۆتەپە سپی و مزباسان و چەرمۆو زاوی چەمێ و گوندۆک) جگە لە شوێنەوارەکانی کوردستانی ئێران و تورکیا تا دەگاتە سەر رووباری (ئاراس) و ترۆپکی ئارارات گەواهیدەری ئەو راستیانەن کە کورد نەتەوەی شاخ نشین بوونە و بە رەوگەو لێشاو لە چاخ و زەمەنی جیاجیادا بەرەو پێدەشتەکان شۆڕ بوونەتەوە، تازە کاک پیرداود دەیەوێ بەردنگاری مێژوو بێتەوەو ئاوی رووبار بەرەو سەرچاوە هەڵگەڕێنێتەوە!.

چونکە بابەتەکەمان پەیوەندی بە حەیرانەوە هەیەو سەنتەری باسەکەش لە دەوروبەری مەهابادو هەموو موکریان دەسوڕێتەوە، بۆیە دەبێ ئەوە بزانین کە کوردی ئاری نژاد لە کۆنترین ئەو نەتەوانەن کە بە درێژایی مێژوو شان بەشانی نەتەوەکانی دیکە لە ناوچەکانی ئێرانی کۆندا ژیاون و بەشدارییەکی راستەوخۆی ئاینەکۆنەکان و شارستانییەت و داب و نەریت و فەرهەنگی ئێرانی کۆنیان کردووە، بۆیە بە مافێکی شەرعی خۆمانی دەزانین گەر ئێمەش مێژووی مەقام و مۆسیقای خۆمان بگەڕێنینەوە ئەو سەردەمانەی کە گەلانی ئێرانی کۆن حوکمڕان و قەڵەمڕەوی هەموو ناوچەکانی کوردستان بوون، بەڵام کورد کە خاوەنی قەوارەیەکی سەربەخۆ نەبووە، بۆیە هونەرەکەش وەک خاکەکەی هەمیشە ژێر دەست و ریسواو پەرت بووە، چەشنی پەرت بوونی ئاردی ناو درک.

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێ ئێمەی کورد هەروا بە ئاسانی چاوپۆشی لەم گەنجینە بەهادارو پڕ لە بایەخەی سامانی نەتەوایەتیمان بکەین و بە ئێرانی بوونی ئەو مەقام و میلۆدیانەی خۆمان رازی ببین. تەنانەت ئاینی پیرۆزی (زەردەشتی)یش کە تاکە ئاینی ئاسمانی کۆنی کوردانەو لەسەر بنەمای یەکتا پەرستی و خۆشەویستی مرۆڤ و خاک و کردارو وشەی پیرۆز هەڵێنجراوە هەر لە کوردستانی ئێران و لە ناوچە شاخاویەکاندا سەری هەڵداوەو هەروەک لە ئاڤێستادا راسپێردراوە کە گاتاکان ((سروودەکان)) بە ئاوازەوە بخوێندرێنەوەو گۆرانی و ئاهەنگیش لە کاروباری ئاینیدا پەیڕەو بکرێ، چونکە (گاڤا - گاتا) یان (گاسە - گازە) بە مانای بانگ و هاوارو دادو فیغان و سکاڵاو بانگەوازی بە ئاوازەوە دێت، ئەم وشەیە (گاسە - گازە) تا ئێستاش لە هەموو ناوچەکانی موکریان و دەشتی هەولێر بۆ مەبەستی بانگ کردن بەکار دێت لە حەیرانەکانیش دەڵێن: ((حەیران بەوێ سبیانێ ئەمن چەندی گاس دەکەم و گاس دەکەم دەنگم نایگاتێ). تەنانەت کورد لە ئاینی (ئەهلی هەق)یش پەیامی (سروودی یارسان) بە ئاوازی تەمبوور دەچڕن، کوردە ئێزدییەکانیش بە ئاهەنگ و مۆسیقاوە (مەصحەفا رەش) دەچڕن، بۆیە من لەو بڕوایەدام کە (حەیران پاشماوەی داب و نەریت و موناجاتی ئاینییەو بە درێژایی مێژوو تێکەڵ بە ئەڤینی مرۆڤ بووەو کورت کراوەتەوەو ئەنجام لەناو جوانی سروشت و دڵداریدا مەییوەو لەگەڵ کۆچەری خێڵەساتی مەڕداران و زەبر بەدەستان بەرەو باشوور کشاوە).

* مامۆستا پیرداود مەخموری لە شوێنێکی



• بەماڤێکی شەرعی خۆمانی دەزانین گەر ئێمەش مێژووی مەقام و مۆسیقای خۆمان بگەڕێنینەوە بۆ ئەو سەردەمانەی کە گەلانی ئێرانی قەڵەمڕەوی هەموو ناوچەکانی کوردستان بوون.

دیکەی لێتوژینەوەکەیدا دەڵێ: (من لەسەر چەن خاڵێکی کاک جەلال سنجاوی هەڵوێستەیەک دەکەم بەتایبەتی لە خاڵی سێیەمی بابەتەکەیدا واتە (بابەتەکەی من - بڕوانە گۆڤاری رامان ژمارە (٢١)١٩٩٨ ل١٧٢) کە دەڵێ (ناکرێ ئەسعەد عەدۆو لایەنگرانی بۆ بەرجەستە کردن و چەسپاندنی راکانیان پشت بە گۆتەی حەیران بێژان ببەستن، چونکە هیچ شارەزاییەکیان لە جوگرافیاو مێژووی نەتەوەکان نییە، بۆیە راکانیان هەردەم لاوازو ناوچەگەرین)

نازانم بۆچی کاک پیرداود رەش بە سپی دەخوێنێتەوەو سپیش بە رەش، ئاخر زۆربەی حەیران بێژەکانمان نەخوێندەوارو کوڵەوار بوون، لە گوندی خۆیان وناوچەی خۆیان بترازێ جێگایەکی دیکەیان لەو دنیایە پان و پۆڕەدا نەدیتبوو، حەیران بێژی وامان هەبوو تاکو مردیش شاری هەولێری نەدیتبوو، کەچی حەیرانی بەسەر بەژن و باڵای کچە عەلمۆدەو حەمامی حاجی قادرو کارێزی حاجی سەعیدو کۆرانی کورتان درووانداا دەگوت، دەبێ ئەو حەیران بێژە چ رۆشنبیرییەکی هەبێ تا پرسی مێژوویی و جوگرافی پێ بکرێ نەخاسمە بۆ زانستێکی فرە لایەن و پەلهاوێژی وەک زانستی فۆلکلۆر!!

بۆنموونە: حەیران بێژ مستەفا کوێری خۆشاوێ لە دیمانەیەکدا ساڵی ١٩٩٠ دەربارەی ئەسڵی حەیران پێی گوتم (حەیران هەر حەیرانی کەندیناودیە هی ئەودیوی قەرەچووغ واتە (دیوی قەراج) لە ئێمەیان وەرگرتیە) ئایا کاک پیرداود بەرەوای دەزانێ من گۆتەی حەیران بێژێکی کوڵەواری وەک ئەم زاتە بکەم بە دیکۆمێنتی باوەڕپێکراو کە بە هەموو فکری خۆی وادەزانێ دنیا هەر ناوچەکەی خۆیەتی و (قەراج)یش کە لە پشت قەرەچووغە کەوتۆتە پشت کێوی قافێ!! ئەوا زانیمان مستەفا کوێر حەیران بێژێکی نابینایەو فکری هەر ئەوەندە بڕ دەکات، باشە خۆ یەکێکی وەک رەسوڵ گەردی دنیای زۆر دیتبوو، دەشتی هەولێرو تەواوی کوردستان و تاران و مازەندەرانیشی دیتبوو، کەچی لە دیمانەیەکدا لەگەڵ بەڕێز تاریق جامباز ئەنجامی داوە لە ژمارە (٥)ی گۆڤاری رامانی ساڵی ١٩٩٦ بڵاو کراوەتەوە.

دەربارەی لانکەزای حەیران دەڵێ ((شوێنی حەیران ناوچەی دزدییاتی و گەردیانە» جارێ مام رەسوڵ بیری لە (بەگەردی) بوونی حەیران کردۆتەوە وەک میراتی سێردکەی لەگەڵ دزدییان کردۆتە دوولەت.

نازانم بۆچی مامۆستا پیرداود ئەوەی لەدڵ گران هاتووە کە من گوتومە ئەم جۆرە حەیران بێژانە هیچ شارەزاییەکیان لە جوگرافیاو مێژووی نەتەوەکان نییە!

- ئاشکرایە لە سەرانسەری دنیادا لێتوژینەوەی فۆلکلۆری پەیوەستە بە زانایان و توێژەرانی ئەتنۆگرافی و ئەنترۆپۆلۆژی و تا رادەیەکیش زانایانی دەروون ناس.

**• من هەرگیز لەگەڵ ئەو رایەدا نیم حەیران سنوور بەند بکرێت.**

چونکە کۆکردنەوەی فۆلکلۆر وەک (دەق - تێکست) جیایە لە (گۆتەی خەڵک)، گۆتە واتە (ئەقاویل) کە زۆر جێی بڕواو متمانە نین بۆیەش من گوتومە (هیچ دەستنووسێکی هەڵکۆڵدراوی سەربەردو دەقێکی مێژوویی کۆنمان نییە تا لە چەسپاندنی راکانمان پشتی پێ قایم بکەین) مەبەستم ئەوەیە کورد دەقی مێژوویی تۆمار کراوی نییەو دەقەکان (دەماودەم) بۆمان ماوەتەوە کە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە جیاوازیان هەیە بۆیە ناکرێ پشتیان پێ قایم بکەین؟.

* مامۆستا پیرداود واپێ دەچێ لایەنگری ئەو کەسانە بکات کە بە خەیاڵی خۆیان سنوور بۆ حەیران دادەنێن، واتە حەیران سنوور بەند دەکەن، ئەمەش کاتی خۆی (ئەسعەد عەدۆ) نەخشەی بۆ کێشاو مامۆستا عومەر شێخەڵلاش لە کیتابەکەیدا پەیڕەوی کردوەو کاک پیرداودیش لایەنگری دەکاو دەڵێ: (نازانم کێ قەبوڵ دەکات کە ئەمە سنوور نەبێ؟ ئەدی سنوور چیە؟.....).

من هەرگیز لەگەڵ ئەو رایەدا نیم حەیران سنوور بەند بکرێت، کاتی خۆشی لەو کۆڕەی کە لەسەر حەیرانی هەردوو دەشتی کەندیناوەو قەراج لە ساڵی ١٩٨٥ لە هۆڵی نەقابەی کرێکاران ئەنجام دا - رەفزی دانانی سنوورم کرد بۆ حەیران، کەچی بۆ یەکەمین جار لە کۆڕی فۆلکلۆری تایبەت بە حەیران - نەخشە -م بەکار هێنا کە پتر بابەتەکەی دەوڵەمەند کردو لە رۆخانی زانستی نزیک کردەوە.

دەست نیشانکردنی سنووری جوگرافی بۆ حەیران کارێکی نارەواو ئەستەمە، بگرە هەرگیز ناتوانرێ حەیران بێژ پابەندی بازنەیەکی داخراو بکرێ لەکاتی دەنگ هەڵبڕین و حەیران گوتندا، کە ئەمەش تا رادەیەک پەیوەندییەکی گیانی و رۆحی بەکەسی حەیران بێژەوە هەیە، حەیران تایبەت نییە بە جێگایەکی بەر تەسک و دیاریکراو، بەڵام دەکرێ بڵێین لە هەندێ شوێن حەیران زۆرەو لە هەندێ شوێنیش کەمە، ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر خولیاو نارەزووی مرۆڤ و ژیانی رۆژانەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و داب و نەریتی خێڵەکی و رادەی داواکاری دەوروبەر لەسەر حەیران یان هەر جۆرێکی دیکەی مەقامات.

### سەرچاوەکان:

١- پیرداود مەخموری - گۆڤاری کاروان ژمارە (١٤٥)ساڵی ٢٠٠٠ .
٢- جەلال مەولود سنجاوی - گۆڤاری رامان ژمارە (٢١) - لانکەزای حەیران - ١٩٩٨ .
٣- جەلال مەولود سنجاوی - گۆڤاری رامان ژمارە (١٤) مێژووی حەیران - جوگرافیای حەیران - ١٩٩٧ .
٤- تاریق جامباز - بە بۆنەی ساڵڕۆژی کۆچی دوایی رەسوڵ گەردی - گۆڤاری رامان ژمارە (٥)

# چەند لاپەڕەیەکی (فەرهەنگی کوردستان) لەم وردەتێبینیانەدا

**•محەمەد هەڵەبجەیی**



فەرهەنگ کۆگایەکی گەورەی وشەکانی زمانە، پەنا گایەکی نارام و بێ مەترسی و هێلانەیەکی پارێزراوی گەرموگوڕە بۆ زاوزێ و پەرەوازە بوون و هەڵفڕینی وشەی پارا و بۆ ناو دنیای بەکارهێنانی زمان، دەریایەکی پڕ گەوهەری زمانە، فەرهەنگ بە پێی قەوارەی بەرگ، گەورەو بچووکی هەیە و بە پێی ناوەڕۆکیش جیاوازی، بەپێی گەورە بچووکی وشە لە خۆی دەگرێ و بەپێی ناوەڕۆکیش بەهاداری، هەوڵێکیشە بۆ نزیک بوونەوەو یەکگرتنەوەی زمانێکی چەند پارچە. کارکردن بۆ فەرهەنگ لەلایەن هەر نووسەرو پسپۆڕێک کارێکی ئاسان نییە.

وەک گیوی بەهەشتی دەڵێ: (لە ساڵی ١٩٤٠-١٩٤٨) دوە سێ جاران چوومە هەڵەبجە و هەورامان و زارادەی سلێمانی و شارەزوورو جاف و تاودگۆزی و هەورامان و نیدیکەم ئەوەندەی کە لەتوانای سەلیقەمدا بووبێ کۆکردۆتەوە، لە بەغداش لە نێو برافەیلیی و لوڕو کەڵهوڕ و شوانانادا زۆر کەسی وەک: دکتۆر جەعفەرو میرزا محەمەدی بوێژ و خوێندەوارانی دی یارمەتییان داوم.

لە هیچ سەردەمێکیدا کەم و زۆر، کاتی خۆم بە خۆڕایی رانەبواردووە لە نانێکی هەژاری بەدەر بەندیواریم بەسەر هیچ جۆرە خواردن و خواردنەوەو خۆشڕابواردن و هاموشۆی سینەما و تیاترۆ و باخ و باخچە و سەیران و سەریانگایانەود نەبووە، لەکاتی نەخۆشیشدا هەر خەریک بووم، لە هەینی و شەممە و یەکشەممەشدا و چانم نەداوە لەنێوانی(٥٠) ساڵاندا رۆژی جەژنانیش نەحەساوەمەوە).

هەوڵدان بۆ بەشاکار کردنی فەرهەنگ لە ناو ئێمەی کوردیش بەردەوام بووە، گرنگترینیان (هەنبانە بۆرینەی مام هەژار و فەرهەنگی کوردستانی گیو و شاکاری جوانە مەرگی زەبیحی)یە لەگەڵ هەندێ هەوڵدانی دیکەی دڵسۆزانی زمانی کوردی. بەڵام مەبەستی ئێمە لێرەدا (فەرهەنگی کوردستان)ە کە لە بەرگێکی نزیکەی(٩٤٠) لاپەڕەییدا لەم چەند مانگەی دوایی کەوتە بەر دیدی خوێنەری کورد، وەک خۆی مامۆستا گیو دەڵێ: ئەوەندەی لە توانای سەلیقەیدا هەبووە قسووری نەکردوە بۆیە ئێمەش بەمەبەستی بەرز راگرتنی ئەم کارەماندو و بوونەی مامۆستاگیو، فەرهەنگی کوردستان فەرامۆش ناکەین لەسەرنج و تێبینیەکانمان بۆ نرخاندنی . هەر چەندە ئەوی من دیتبێتم لەناو نووسەران و رۆشنبیران تەنها نوسینەکەی مامۆستا (عەزیزی مەلای رەش) بووە لە گۆڤاری کاروانی ژمارە (١٤٣)دا کە پاشتر دێینە سەر سەرنج و تێبینیەکانی مامۆستای بەڕێزیش.

ئەوەی کە سەرنج و تێبینی من بێ لە بەشێکی کەمی فەرهەنگەکە و لەم دەقەدا جێی ببێتەوەو بتوانم بەشەرمەوە دەست بۆ ئەم شاکارە

> **. فەرهەنگ هێلانەیەکی پارێزراوی گەرموگوڕە بۆ زاوزێ و پەرەوازە بوون و هەڵفڕینی وشەی پاراو بۆ ناو دنیای بەکارهێنانی زمان.**



مەزنەی مامۆستا گیو بەرم، لێرەوە و بەم خاڵانە دەست پێدەکەم

١- لە چاپکردنی فەرهەنگی کوردستاندا پەلە کردن و کاڵ و کرچیەکی پێوە دیارە.

٢- دەستەیەکی زمانزان و پسپۆڕ و خەڵکێکی بەر بڵاوی ناوچە و شێوە زارەکان بەشداریان تێدا نەکردووە کە هەندێ وشە بەهەڵە چاپکراوە و گۆڕاوە.

٣- دەتوانرا بەهەماهەنگی و هاوکاری رۆشنبیران و دڵسۆزان و بنەماڵەی گیو، فەرهەنگی کوردستان دەوڵەمەندتر و فراوانتر بکرایە کە ببوایە بە شاکارێکی شیاو بۆ تێکڕای زاراوەکان کە مامۆستا گیو لەم بواردا قسووری نەکردووە

٤- فەرهەنگی کوردستان زیاتر وشە و مانایە و هەندێ وشە بە باشی پێناسە نەکراوەو بە پێی پێویست مانای فەرهەنگی پێنەدراوە وەک گێڕانەوەی وشەکان بۆ ئەسڵەکەی و چۆنیەتی بەکارهێنان و لێکۆڵینەوەی زیاتری مانا و ڕێزمان. کە پێم وایە مامۆستا گیو.ئەگەر لە چاپکردنیدا بمابایە کەمتر هەڵەی تێدا دەبوو خۆ ئەگەر مامۆستا گیویش وەک مام هەژاری موکریانی کە لە چاپکردنی (هەنبانە بۆرینە)دا چاودێر و خەمخۆری بوو ئەوا بەهەشتی گیوش بمایە و پێداچوونەو زیاد و کەمی تیا دەکرد و پێموایە فەرهەنگی کوردستان زۆر لەمە شاکار و شیاوتر دەبوو هەرچەندە ئێستاش بۆ ئێمەی کورد زۆر سود بەخشە قەرزاری ئەو مرۆڤە مەزنەین؛ بۆیە هەر تێبینی و سەرنجێکیشمان هەبێ رووی دەممان لە گیو ناکەین و دەستخۆشیش لەسەرپەرشتیار و لیژنەی چاپ و راستکردنەوەی دەکەم و نموونە لە لاپەڕە(٥)دا هاتووە.

ئاڕوو: هاروێ، خەیار(باک) شەویکە، مەلاشو،

ا- پیتی(ڕ) قەڵەونیە واتە (ئاروو)ە، دیارە ئەمە هەڵەی چاپە

ب- لەناو جافیشدا (هاروو) بەمانای پدوو، پوک مەلاشو کە هەمان مانای(باک)ی هەیە کە دەکرا بۆی زیاد کرایە.

لە لاپەڕە (٥٧) هاتووە

باشقەیان: جۆرە مارێکی ئەستووری درێژ و سەر کلکیشی خڕە. ئەم وشەیە بەهەڵە نووسراوە یان هەڵە لە چاپدرایە یان نەبوونی شارەزای زمانە ناوچەییەکان لە سەرپەرشتی کردنیدا.

چونکە وشە وکە(پاشقە پان)ە نەک (باشقەیان).

لەلاپەڕە (٢٣٧)دا نووسراوە

تەوەقە: (ئەردە) تەبەق (برین)ی ماڵاتان

بەڵام تەوەقە یاخود تەوەق، تەبەق: برینی پێی ماڵاتلنە کەسمی وڵاخ بەزۆریش گاو مانگا سمەکانیان توشی سووتانەوەو جۆرە ئازارێک دێت پێی دەڵێن: تەوەق کە ئاژەڵی توش بوو بۆ کەم کردنەوەی ئازار پەنا بۆناو ئاو دەبا و حەزی لەوەیە پێیەکانی بخاتە ناو ئاو.

هەروەها لەلاپەڕە(٢٣١) نووسراوە:

تەڵەبەرد (بابا): ئاست، بەردی پان و درێژ.

لێرەدا من پێم وایە لە چاپەکەیدا و لە ناشارەزایی هەڵە لە چاپکردنیدا بووە چونکە (ل)ە کە لاوازە واتە (تالەبەرد)ە نەک تەڵەبەرد لەلاپەڕە (٢٣٤)دا نووسراوە تەم و فیز: تەنقەنە. بەڵام (تەنتەنە)یە نەک تەنقەنە ئەمەش هەڵەی چاپە.

هەروەها لەلاپەڕە (٢٥٧)دا نووسراوە:

تووتنجاڕ: زەوییەکە تووتنی تێدا بکرێ واتە ئێستا، رانەبردوو تووتنجاڕ یان جاڕەتووتن پارچە زەوییەکە پێشتر تووتن بووبێ و وەک جاڕەتووتنی پار، پێرار. یان جاڕەگەنمی پار...هتد، رابردوو. سەرنج و تێبینی لەم بارەیەوە زۆرن من تا پیتی (ت)م خوێندۆتەوە، بەڵام لەم نووسینەدا تەنها ئەوەندە دەگوترێ و دەنووسرێ، ئەمە و هەڵەی زۆریش لە وشە هەورامیەکاندا هەیە.

* ئەوجا دێینە سەر تێبینی و سەرنجەکانی مامۆستا عەزیزی مەلای رەش کە لە گۆڤاری کاروان ژمارە(١٤٣)دا بڵاوی کرد بۆوە:- لە خاڵی (١٢) لە تێبینیەکانی مامۆستا عەزیزی مەلای رەشدا باسی (بەل) دەکات واتە بزنی بەل.

(بەل) بە بزنێک دەوترێ گوێیەکانی ئەزۆر بۆ سەرەوەبن و ئەشۆڕیش بووبنەوە، واتە گوێیەکانی ئاسۆیی رادەوستێ ئیدی لوول بێ یاننە، سور بێ

. هەولدان بە شاکار کردنی فەرهەنگ لەناو ئێمەی کوردیش بەردەوام بوو.

ڕەشبێ ڕەنگی بزنەکە ڕەچاو ناکرێ بەڵکو مەبەست گوێیەکانە چونکە بەل ناوێکی گشتی نەناسراوە، هەر لە خاڵی (١٢)، (ب)،
کە دەڵێ: ب- ل٩٢:-بەلە=....
لێرەدا دیسان مامۆستاش باشی بۆ نەچووە، چونکە(بەلە) ناوێکی ناسراوو تایبەتییە لێرەدا ڕەنگ دووری نییە ئەمە لە حاڵەتێکدا بەکار دەهێنرێت کەڕانە مەڕێک تەنها بزنێکی بەلی تێدا بێت ئیدی سووربێ، ڕەش بێ، سپی ... گرنگ گوێیەکانیەتی بەڵام ئەگەر ڕانەمەڕێک چەند بزنێکی بەلی تێدا بێ ئەو کات پاش وشەی بەل ئەگەر بەشتی دیکە نەناسرابوو ڕەنگەکەشی دەوترێ بەلەبەش، بەلەسور، بەلەڕەش، بەلە باز، بازگ.. (ه)-ل٩٢- بەلەتاڵەڕەش بەلەک...
مامۆستا دەڵێ من لە وشەی(تاڵە) سەرم سووڕ ماوە، لام وایە تارەیە. بەڵام ئەگەر مامۆستا ئیزنم بدا دەڵێم نەخێر (تاڵە)یە و ڕاستە مامۆستا گیو دەڵێ من زۆر شوێن گەڕام وەک شارەزوورو هەڵەبجە و تاوەگۆزی کە هەموویان سەربەشارەزوور و جافانن،
ئەم وشەیە (تاڵە) لەو ناوچەیە زۆر بەکار دەهێنرێت، وەک: مانگاتاڵە، گوێرەکە تاڵە، گاتاڵە بۆ ئاژەڵی گچکە بەکار ناهێنرێت: بەوڵاخێک دەوترێت تاڵە کەپەڵەیەکی جگە لە سپی لەلاتەنیشتی بێت کە زۆربەی لاکەلەکەی داگرتبێت.
وشەی (تاڵە)ش لە (تاڵگ)ەوە هاتووە تاڵگ ئەو شوێنەیە کە زراویان زەرداو تاڵاوەکەی تێدایە و دەکەوێتە لاتەنیشتی وڵاخە و ئاژەڵان هەر وڵاخێک لاتەنیشتی پەڵەیەکی پێوەبێ پێی دەوترێ تاڵە. زۆرجاران کە بزنێک دەکوژنەوە دەڵێن وریای تاڵگەکەی نەڕژێ بە گۆشتەکەدا یان دەڵێن بەرد لەلاتەنگەی وڵاخ مەدە تاڵگی دەبڕی و دەمرێ. لە دەشتاندا ئەمە ناونیشانی نوسینێکی مامۆستا عەزیزی مەلای ڕەش لە هەمان بابەت لە خاڵی هـ- بەلەپۆش= گوێ(بدل) و مووڕەش و سپی تێکەڵاو (ماش و برنج)... بەڵام پۆش بە بزنێک دەوترێت کە تەنها سەری سپی بێت بەدەنی ڕەنگێکی دی یان ڕەش بێ.ئەمەش هەندێک جار لە ناو مرۆیانیشدا بەکاردێ وەک دەڵێن فلان کچ بە فلان کوڕی گوت سەرم پۆش دەکەم لە دیارت واتە سەرم سپی دەکەم لە دیارت و شووناکەم تا پیر دەبم و سەرم سپی دەبێ، واتە تەنها سەری سپییە مەرج نییە مووی ڕەش وسپی تێکەڵاوبێ، هەروەها لە سەرنجەکانی مامۆستادا هاتووە.

١٤- ل١٠٧:- بزنەپۆش (بزنێکە گوێی شۆڕ و درێژ بێ) پۆش بە ڕەنگی ڕەش و سپی.
ڕەنگی ڕەش و سپی لە هەندێ جێگا (بەڵەک)ە، بەڵام بەزمانی جاف ڕەنگی ڕەش و سپی پێکەوە لە هەر تەنێکدا دەوترێت (بازگ) بازە، ڕەنگی ڕەش و سپی پێکەوە پۆش ناگەیەنێ، سەری سپی پۆش دەگەیەنێ.
تێبینیەکی دیکەی مامۆستا لە ٧٠-ل٧٣٥:- کالیار= ترۆزی هەردەگەوریە بۆ تۆە وی دەهێڵرێتەوە (گیو)، مامۆستا عەزیز دەڵێ:- کالیار نە لە ڕەنگ، نە لە خواردن لە ترۆزی ناکات. بەڵام لێرەدا من لەگەڵ مامۆستا گیودام و هەرچەندە هەندێک شت لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە. دەگۆڕێ بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەش ئەم پێناسەیە دەکرێت

- ترۆزی بە تۆ و دەکرێ پاشان تۆوەکە دەتەقێ و گەورە دەبێ و تەرز دەهاوێ بە بەلەدرێژەکانی کە گەڵاو ترۆزی دەگرێ دەوترێ تەرز پاشان گوڵ دەگرێ و گوڵەکە دەبێتە بەڕوولە یان چەمیلە دواتر دەبێتە ترۆزی و دوا قۆناغ دەبێتە کالیار کە ترۆزیەکی گەورەی ڕەق و زەردە ئەگەر زۆریش ڕەق نەبێ بە ترش و خوێوە دەخورێ
- کاڵەکیش بە هەمان شێوە پاش سەوزبوون و (تەرز) هاویشتن گوڵ (زرک) یان زرکە تاڵ، زرکەکاڵ، پاشان دەبێتە کاڵەک.

لە کۆتاییدا هیوای ئەوە دەخوازم کە نووسەر و ڕۆشنبیران (فەرهنگی کوردستان) فەرامۆش نەکەن و سەرنج و تێبینیەکانیان بخەنە ڕوو تاکو لە چاپی دووەمیدا بتوانرێ دەوڵەمەندتر و بێ هەڵەتر بێ، هەروەها دەستخۆشی لە ماۆستا عەزیزی مەلای ڕەش دەکەم و داوای تەمەن درێژی بۆ دەکەم هەر چەندە پێشتریش ئیزنم لێ خواستووە کە ناوم هێناوە و وەڵامی تێبینیەکانم داوەتەوە.



# زەمەنی دەق
# گومانێک لەوێرانەیی ئەدەب

سمکۆ محەمەد



ئەگەر لەتێڕوانینی (نیتشە)وە تەماشای (دەق) بکەین کە دەڵێ(جیهان بۆ خۆی دەقێکە دەبێ بناسرێ، پاشان گومانی لێ بکرێ و رەخنەی لێ بگیرێ بەو پێ یەی کە ڕەوەندی مێژوویی بۆ (دەق) زادەی عەقڵە) ئیدی دەبێ لە خاڵی گومانەوە دەست پێ بکەین گومانیش واتە پرسیار بۆیە دەبێ بپرسین ئایا جیاوازیەک لە نێوان دەقی دوێنێ و دەقی ئەمڕۆدا هەیە..؟ ئەگەر هەیە ئەو فەزایە چیە ڕەهەندە مەعریفیەکان دیاری دەکات بەرەو ئاراستەیەکی نوێی ئەو چەمکانەی تا دوێنێ وەک کارپێکراوێکی میتافیزیکی و گوتارێکی باڵا دەست و خۆسەپێن لەبەر چاو گیرابوون. بەمانایەکی دیکە ئەگەر ئەدەبی کوردی لە قەیرانی دەقدا ببینین دەبێ بنچینەو بونیادی دەقە تەقلیدیەکان بخوێنینەوە کە دواتر دەقێکی خۆسەپێن هاتوودو دەبڕانەکەی بە خزمەتی کولتوری خۆی شکاندوەتەوە لەهەردوو رووی زەمەنی و مەعریفیەوە کە ئێستاش باڵا دەستە، کەواتە پرسیار لێرەیە ئایا تێگەیشتنی ئێمە بۆ (دەق) چۆنەو چیمان دەوێ لە دەقی شیعری و بەچ زمانێکی نووسین دەنوسین و بەرەو چ ئاسۆیەکی نوسین دەچین...؟ ئایا نووسین چارەسەری بنەڕەتی ئەو قەیرانەی ئێمە دەکات؟ ئەگەر دەیکات چۆنە.. یان خوێنەری دەق کەم و لاوازن و خودی ئەو دەقانەی ئێمەش ئیرۆسیەتیان تیا ئامادەنیە.. کە خوێنەر ناچار بەچەند جار خوێندنەوە بکات بۆ بونیادێک بۆ دەسەڵاتی (دەق)بەسەر زەینی خوێنەرەوە، کە ئەمە ئەسڵی گرێی ئەدەب و مەعریفیەکەی ئێمەیەو سەر تاپای ئەدەب و هونەری کوردی داگیرکردووە، پاشان دەبێ بپرسین ئەو دەسەڵاتەی کە خوێنەر هەیەتی و (رۆلان بارت) باسی لێوە دەکات بۆ ئامادەیی نیە؟ ئایا قەیرانەکەی لە دەقدایە یان عەقڵیەتی رەخنەگرتن لاوازەو دەقی خۆمان ناناسین...

* لەئەدەبدا گوتار رەگەزێکی گرنگ و بەرچاوە لە چوار چێوەی دەقدا کەڕەسەنایەتی و شوناس و لاسایی و جیاوازیەکان لەبەردەم یەکتردا یەکلادەکاتەوە. پاشان (زمان) تەرکیبەو مەجازیەت لە چەمکەکاندا دیاری دەکات، ئیدی ئەوەی کە دەمێنێتەوە سەر ئەنجامێکە بەشێوەیەکی سروشتی بەردەوامی بەگوتاری خۆی نەداوە بۆیە دەقێکی دیکەو زمانێکی دیکەو ریتمێکی دیکە دەربڕانێکی مەعریفی دروست کردووە کە ئەمە بۆ ئێمە بەشێکی زۆری لەزەمەنی دەقەکانمان داگیر کردووە تاهاتووە گرێکەی توندتر کردۆتەوە.

* یەکێک لەو ئەدیبە بەرچاوانەی کە شیعریەت و فەزای شیعرو زەمەنی شیعری لەگەڵ دەقی ئاینیدا بەراورد دەکات و خوێندنەوە بۆ زەینی عەرەبی و شوناسی عەرەبی دەکات لە دەقی (قورئاندا) و ڕەسەنایەتی شیعر دەباتەوە سەر(جاهیلی و فەراهیدی و جاحظ و... هتد) وەک ئەوەی بیەوێ ئەساسێکی پتەو بۆ شیعری عەرەبی و فکری عەرەبی دابنێ بۆیە دەقی قورئان بە گرنگترین هونەری نوسین لەقەڵەم ئەدا ئەمە جگە لەوەی روئیایەکی نوێی تیادا بەدی دەکات سەبارەت بەزەمەنی شیعری عەرەبی . کە چی ئەدەبی کوردی ئەو کەلتورە دەوڵەمەندەی هەیە کە لە دەقی (ئاوێستادا) بۆی ماوەتەوە و لە ڕووی زەمەنیشەوە چەندین سەدە پێش هاتنی دەقی(قورئان) هاتووەو سودی لێ نەبینراوە.

(نیتشە) لە کتێبی (هکذا تكلم زرادشت) دا نوسیویەتی کە(زەردەشت) لە بارەی فەلسەفەو عیرفانەوە دەڵێ(ئەو کاتەی کە دەڵێن

**.لەخاڵی گومانەوە دەست پێبکەین، گومانیش واتە پرسیار، بۆیە دەبێ بپرسین ئایا جیاوازیەک لەنێوان دەقی دوێنێ و دەقی ئەمڕۆداهەیە؟**

قازانجی عەقلم دادوەریە چیە..؟ کاتێ کە خۆم وەک ئاگرو خەلوز ئایەتە بەرچاو لەکاتێکدا کە دادوەر وەکو ئاگرو خەڵوز وایە) یان( ئەو کاتەی کە دەڵێن قازانجی میهرەبانی چیە..)؟

مەگەر میهرەبانی ئەو خاچە نیە کە مەسیح خۆی پێ هەڵواسی لە پێناو گوناهو خۆشەویستی بەڵام (نیتشە) دەڵێ چارەنووسی لە خاچ دانیە بەڵکو پەیوەندی بەبونەوە هەیە. بونێک کە بڕوای بەهێزە جا لەهەر ڕوویەکەوە بێ. کەواتە ئەدەب و فکری کوردی پێویستی بەخوێندنەوەی ئەو ووتە زایە هەیە کەشتەکانی ئیتر سەد دەر سەد پێچەوانەیان مانا بەدەستەوە دەدەن بۆیە دەبێ بیرکردنەوەی ئێمە خوێندنەوەی ئێمە بۆ (دەق) شێوەک بێ لە گومان کردن ئەمەش بەو مانایە نیە کە دەقەکانی دوێنێ بەشێک بوون لە ئایدیاو ئێمەش ئێستا ماتریالی بیر دەکەینەوە. نەخێر بەڵکو ئەم گومانەکەی کردند بە شکاندنی سنوورەکانی بیرکردنەوەو پرسیارەکان کە ئیتر ڕەنگە هەمان بۆ چوون هەمان وتەزا سەردەستی قسەکانمان میتۆدەکانمان بێ کە ئەدەبی نووسینی کوردی تووشی وێرانە کردووە.

* دەسەلاتی خوێنەرو دەسەلاتی بیرو دەسەلاتی ڕەخنەو.. هتد، هەموو ئەو میتۆدە مەعریفیانە بۆ (دەق) هەوڵدانە بۆ بنیادنانی دەقێکی ئەپستمی ڕزگار کردنی فکرو ئەدەب و هونەری کوردی لە گۆشەگیری، چونکە ماناکانی سبەینێ دەتوانی پرسیارەکانی سبەینێ لە خۆبگرن و لەم ڕاستایەشدا قسە دێتە سەر ئەوەی ئایا دەقەکانی دوێنێ ئەگەر بەرامبەر پرسیار دەبن بەوەڵامەکانی دوێنێ قایلن یان ئەمرۆ وەڵامیان دەداتەوە کە ئەم دوو جەمسەری و دوو فاقیە خوودی ململانێ زەقتر دەکاتەوە،دیارە بۆ ئێمە متێۆدێک پێویستە کە کاریگەری لەسەر خوودی ئەو ئەقڵە دۆگماییە نەگۆڕە دابنێ و لانی کەم ڕوخسارێک بدابە سیستەمی پەیوەندیە ئەدەبیەکان و ئەو پەرچەمە ناڕۆشنە لابەرێ کەسیمای ئەدەب و فکری کوردی شاردۆتەوە.

* دیارە شتێک کەبووەتە سێبەر بەسەر ئەم ئەدەبە وێرانەیەوە پیرۆز ڕاگرتنی ئەو دەقە کۆنانەو ئەو قەلەمە کۆنانەیە کە زۆر جار لەمپەرێک بوونە لەبەر دەم پرۆژەی بەمۆدێرن کردنی ئاستی ڕۆشنبیری کوردی بۆیە فۆرمی نوێ و زمانی نوێ لەزەینی کۆنخوازەکانی ئەم وێرانە ئەدەبیەدا وەرناگیرێ و ڕەت دەکرێتەوە، بەڵگەش بۆ ئەم مەبەستە ئەوەیە کە جگە لە شتە خوازراو و وەرگێردراوەکان دەقێکیان بەرچاو ناکەوێ کە داهێنانی تیا دابێ. یان ئەو دەقانەی کە بنچینەی ئەدەب و فکری کوردی لەسەر بونیاد نراوە وەک دەقەکانی(خانی و جەزیری و نالی و مەحوی و هتد...) لە سودێکی ئایدۆلۆژی بەو لاوە هیچی دیکەی لێ بەرچاو نەکراوە کە دەبوو خوێندنەوەیەکی مەعریفی و هەمە لایەنەیان بۆ بکرابا چونکە ڕۆشنبیرانی کورد ئەم زاتانە بە سەر چاوەی فکری کوردی دادەنێن.

* ئەگەر گەرانی ئێمەو ڕوانینمان بەگومانەوە بێهودە نەبێ بمانەوێ ئاکامی باش بەرجەستە بکەین کە بەشێک لە پانتایی فکری ئەدەب و کوردی بدۆزێتەوە بیباتەوە سەر ڕەسەنایەتی دەبێ باس لە دوو میحوەری بنچینەیی بکەین ئەویش هەردوو ڕووی بابەتی زەمەنیە بۆ (دەق)و کەلتورێک کە کورد هەیەتی.



بۆیە ئەگەر لە ڕووی زەمەنیەوە بڕوانین دەبینین کە دەقێک نیە پێش هەموو دەقە ئاینیەکان بەو هەموو ئیماو هارمۆنیەتەوە بەو هەموو عیرفانەوە گوتاری خۆی دیاری کردبێ ئیدی ڕەسەنایەتی پێ نەدراوە بەرز ڕاناگیرێ ئەمە پرسیارەکەیە... چونکە کەسێک لەدوای (نیتشەوە) نەهاتووە هونەری نوسین و شێوازی تەعبیر کردنەکانی دەقی ئاوێستای خوێندبێتەوە بۆیە بەداخراوی ماوەتەوە...

بۆ نموونە لە ئاخاوتنێکدا زەردەشت لەگەڵ (قەدیسێک)دا لێی دەپرسێ و دەڵێ:(تۆ لە تەنهایدا ژیاوی وەک بلێی دەریا قووتی دابیت بەداخەوە کەدەتەوێت بگەڕێیتەوە بۆ قەراخ دەریا بەداخەوە کە دەتەوێ دیسان دەریا لەشت هەڵگرێ و بیبا) لە وەڵامدا زەردەشت دەڵێ:(لە بیرت نەچێ کە من مرۆڤەکانم خۆش دەوێ، من کە باس لە عیشق دەکەم وەک دەریایەک وایە بۆ مرۆڤەکانم هێناوەو بەس). کەواتە لەڕووی بابەتیەوە ئەو دەقە هیچی لەفەلسەفەکانی دیکە کەمتر نیە کە کاری پێدەکرێ وەک دەقێکی کراوە. بەڵام کە نەخوێندراوەتەوە گرێیەکە لێرە

دایە بۆیە بونیـادەکـەشی پێکهـاتەیەکـە لە چەند قۆناغ و زنجیرەیەک هەمیشە دووبارە دەبێتەوە و لەو قەیرانە رزگاری نابێ. کەدەبوو ئەزموونەکان لە هەر قۆناغێکدا تەجاوزی یەکتریان بکردایەو چێژێکی ئیستـاتیکیـان بەرەسـەنایەتی بدایە. بەڵام ئەوەی کـە کـراوە نەک هەر ئیزافـە کـاری نەبووە بگرە هەرکــەسـێک هاتووە ئاردزووە ئەدەبیەکانی خودی خۆی تێدا مرکاندۆتەوە لە جیاتی ئەوەی سیماو پایەکانی هەیکەلی ئەو وێرانە ئەدەبیە بگۆڕێ بۆیە لە شتی ڕواڵەتی بەولاوە هیـچی دیکە نەبووە وەئەگـەر هەر پرۆژەیەکیش هەبووبێ سەر ئەنجام لە قالبی تەقلیدیەت دەرنەچووە و کە دادایی و سوریالی و نامەعقولەکان و قوتابخانەکانی دیکەی ئەدەب و هونەر تاقـیکردنەوەی خـۆیان کـرد. ئیـدی مانیفیستۆ و کاری گروپ گەرایی و شێوەکانی دیکەی کاری بە کۆمەڵ نەبۆتە جێگای قسەو باس و بگرە گرێ ئەدەبیەکەی مەگەر تەنها نائومێدی لەو کەلتورەی کە کاری پێ نەکراوە و بەهەڵوا سراوی ماوەتەوە بۆیە نەرو ناکبیری کـورد نەکـەینونەی تاکی کـورد ئاشنا نیـە بە ئایدۆلۆژیایەکی سـەپاو کـەدوورو نزیک نەپەیوەندی فەرهەنگی نەپەیوەندی کۆمەڵایەتی و نەپەیوەندی ئاینی پێوە نیـە. بۆیە ناسنامـەی کەلتوری شارستانی لە دەست داوەو لە پاشکۆی فـەرهەنگە بیـانیـەکـاندا(دەق) بەرهەم دێنێ لە کاتێکدا ڕەسەنایەتی ئەدەب و شعر بە تایبەتی لە دەقی ناوێستـادا بەدی دەکرێ بەو مـانـایەی ئەگەر شیعریەت لە دەقە کونەکاندا بدۆزرێتەوەو تایبەتمەندێکی بدرێتێ جگە لە گـوتارە فەلسەفیەکە دەبێ کەلتوری کوردی لە دونیای تازەگەریدا متمانەی بەخۆی هەبێ بەمەرجێ ژیاری خـۆی وەک شـتێکی ڕەسـەن نۆژەن بکاتەوەو تازە گـەریەتی لە شـیعـریەتدا بگەڕێنێتـەوە بۆ ژێر کـاریگەری دەقـەکـەی خۆی(٩) دەمەوێ بڵێم تازە گەری لە شیعردا بەبێ بونیادێکی ڕەسەن و فیکرێکی ڕەسەن کە ڕابردوویەک دامەزراوەکەی نەبێ نابێتە خاڵی وەرچەرخان کـەخـواست و ئارەزوەکـانی تیـا بەرجەستە بکرێت چێژێک بدات بەخوێنەر کە هەڵقولاوی نێو هەستی خودی مرۆڤ خۆی بێ.

بەگشتی زۆر بەدەگمەن دەقێک دەبینین کە دەربڕی بیـرو ئەندێشـەی کـوردی بێ ئیـدی لێرەوەیە دەتوانین شێوازەکانی لاسای کردنەوە لە ئەدەبی کـوردیدا دیاری بکەین بەناوی تازەگـەریەوە پانتـاییـەکی گـەورەیی ڕووبەری ئەدەبی داگیر کردووە. چونکە ئەگەر تازەگەری دابڕان بێ لە ڕابردوو دیسـان دەپرسین کـام ڕابردوو کـام زەمـەن ئەدەبی کـوردی پەیوەست دەکـات بەرەسـەنایەتیـەوە. ئایا چۆن دەتوانین بڵێین سفری زەمەنیمان تائێرەیەو لێرەوە بەدواوە دادەبڕێین لە تەقلیدیەت لە کاتێکدا فیکری ئەدەبی کلاسیکی ئێمە دیار نیە لەکوێوە تاکوێیە. بۆیە هەرگیز پۆلێن کـاری و تایبەتمەندێتی کاری ڕەخنەی لە ئەدەبدا ناتوانی شتێک ئاشکرا بکا و دەقێک بناسێنێ ئیدی ناچار دەبێت ڕەگەزێک لە ڕەگەزەکانی (دەقە) وەردەگـرێت کـە ئەم کـردەیە مـەحاڵە بتـوانێ بەهاکـان بدۆزێتەوە و کاریگەری ئەدەبی هەبێت بەشـێوەیەک کـە دەقی دووەم بەرهەم بێنێ هەر بۆیە ڕەخنەکـارەکـانیش تووشی هەمـان قـەیران هاتوون چونکە بە تێزێک کار دەکەن کە تەتبیق کردنی تیۆزە ئەدەبیەکەیە ناچێتەوە سەر بونیادو دامەزراوەی ئەدەبی کوردی دیارە ئەو پرسیارەی (کـاک ئازاد سوبحی) کە لە وەڵامێک بەرەخنە لە ژمارە(٤٧) گـۆڤـاری رامـان دا دەپرسێت و دەڵێ ئاخۆ لەو پرنسیبە ڕەخنەیانەی کەباسمان کرد کامیـان تا ئێستا توانویانە ووزەیەک بدەن بەرەخنەی کـوردی تا بگاتە ئەوەی دەقی کـوردی ببێتـە ئەختـوبوتێک یان تۆڕێکی فـراوان بۆ گرتنی تێکڕای جەستەی دەقێکی کوردی؟

دیارە مەبەستی کاکە ئازاد لەو پرنسیپانە ئەوەیە کـە ئەدەبی کـوردی فـەقیـرە بۆیە ناتوانێ گوتارێکی بەهێز دابمەزرێنێ بەرامبەر بەرەخنەی کوردی. کەواتە لێرەوە بۆمان بەدەردەکەوێت کە کـولتـوری کـوردی فـەقیـر نیـە بەڵکو ئەدەبی کوردی فەقیرە چونکە کاری لەناو خۆیدا نەکردوە و جیـاوازیەکی تیـۆری نەدۆزیتـەوە تاجەدەلێک دابمەزرێنێ ئیدی بەئاراستـەیەک کـە هەرگـیز پرسـیـاری لە ڕابردووی خـۆی نەکـردوە وەئەگـەر کـردبێتـیشی بەمیـکانیـزمێک کـاری نەکـردوە تابچێتـەوە سـەر ئەسڵی ئەو مەوداو ڕایەڵانەی کە بونیادی کولتوری کوردی پێک دێنن.

**. هەمـوو میـتـۆدە مـەعـریفـیـەکـان بۆ (دەق) هەوڵدانە بۆ بونیـادنانی دەقـێکی ئـەپـسـتـمـی رزگـارکـردنی فکر و ئـەدەب و هـونـەری کــوردی گـۆشـە گیری**

# بیرەوەرییەکی بڵاونەکراوەی مارکیز

و: مەجید عەبدولڕەحمان



گابریل گارسیا مارکیز لە (ئاراکاتاکا)ی کۆلۆمبیا لەساڵی (١٩٢٨) ھاتۆتە دونیا، لەدانشگای (بۆگۆتای) خوێندووە، کاری پەیامنێری رۆژنامەو رەخنەگری سینەمایی لەرۆژنامەی (ئەسبکتادۆر) کردووە... بڕوانامەی دکتۆرای فەخری لەئەدەب لەساڵی (١٩٧١) لەدانشگای کۆلۆمبیا وەدەست هێناوە لەساڵی (١٩٨٢) خەڵاتی نۆبلی لەئەدەب وەرگرتووە لەرۆمانی(سەدساڵ گۆشەگیری) لەرۆمان و چیرۆکەکانی (کۆلۆنێل کەسی نییە بیدوێنی و چەند چیرۆکی دی) و (گەردەلوولی گەلاکان و) (پایزی بەتریرک) و (لە ساتە وەختێکی شوومدا) و (رووداوەکانی مردنێکی راگەیاندراو) و (چاوەکانی سەگەشین) و (شینی دایکە گەورە) و (خۆشەویستی لەسەردەمی کولێرا)و زۆری دی شایانی باسە زۆربەی کارەکانی بۆ زمانی عەرەبی وەرگێڕدراون....

سەرەڕای ئەو چیرۆک و رۆمانانە لەزۆربەی رۆژنامەو گۆڤاردکان وتاری رەخنەیی نووسیوە... ئەوەی پێویستە ئاماژەی پێ بکەین شارۆچکەی (ماکاندۆ)ی کەناریی، لە لێوارەکانی کۆلۆمبیا پێوەری هاوبەشی هەموو رۆمانەکانیەتی ئەو شوێنەی کە هەموو رووداوەکانی ناو رۆمانەکانی تێدا رووی داوە بەدانانی نووسەر خۆی. گرنگترین رووداو لەژیانی مارکیز گەشت کردنەکەی بوو لەگەڵ دایکی کە دوو رۆژی خایاند بە کەشتی پاشان بە شەمەندەفەر کە گواستنیەوە لە (بارانکیلا) لەسەر لێواری کاریبی بۆ (ئاراکاتاکا) ئەو دێیە بچووکەی کە چاوی تیا کردۆتەوە هۆی گەشتەکەشی:- فرۆشتنی خانووی باپیری بوو، ئەو هەلەی کە مارکیز خەونی پێوە دەدیت لەوکاتەی کە تەمەنی (٢٢) ساڵ بوو، گەڕانەوە بۆ رابردوی ئەوەش چەند وشەیەکە لەبیرەوەریەکانی ئەو گەشتە کە بەتەنیا بەم دواییە گۆڤاری (مەگازین لیترزی) فەڕەنسی بڵاوی کردۆتەوە بۆ یەکەم جار، مارکیز دەڵێ دایکم داوای لێ کردم کە یاوەری بکەم و لەگەڵی بچم بۆ فرۆشتنی خانووی باپیرەم، هەر لەو بەیانیە گەیشتبووە جێ لەو دێیە دوورە هاتبوو کە خێزانەکە لێی دەژیا بێ ئەوەی هیچ زانیاری لەسەر ئەو شوێنە هەبێ کە منی لێیە چۆن دەمدۆزێتەوە، پێش وەخت لەهەندێک لە ناسیاو برادەرانی منی پرسی بوو کە چۆن و لەکوێ دەمدۆزێتەوە. پێیان گوتبوو لە کتێبخانەی (ئەلمونو) یا لە قاوەخانەی تەنیشتی کتێبخانەکە دەمدۆزێتەوە کە

هەموو رۆژێک لەکاتژمێر یەک تا شەش دەچوومە ئەو شوێنە قسەو گاڵتەمان لەگەڵ برادەرە نووسەرەکان دەکرد، بەڵام یەکێکیان ئاگاداری کردبووەوە « کە هەموویان تووشی نەخۆشی خوێندنەوە بوونە» دایکم لەکاتژمێر (١٢ی) تەواو پەیدا بوو... کە لەمێزە پڕ کتێبەکان .دەگەڕا یەکسەر لەیەک بەدەرکەوتین لەناو چاوم چەقی بێ ئەوەی ماوەم بدا هیچ هەنگاوێک باوێم بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی... من دایکتم... شتێکی وای لێ نەگۆڕا بوو کە نەیناسمەوە.... لەتەمەنی (٤٥) ساڵیدا بوو چوار ساڵ بوو یەکترمان نەدی بوو... دایکم یازدە زگی ببوو... دە ساڵ تەمەنی هەر زگی پڕ بوو... لەو ماوەیەدا منداڵەکانی بەخێو کردبوون، پرچی زوو خۆڵەمێشی ببوو.. چاوەکانی لەپشت شوشەی چاویلکەکان لەبەربێ هێزی چاوی لەبەری کردبوون کز دیار بوون، جلی رەشی لەبەر بوو لەبەر ئەوەی دایکی پێش ماوەیەکی کەم کۆچی کردبوو... بەڵام جوانیە.رۆمانسیەکەی هەر مابوو کە لەوێنەی کاتی شوکردنیدا دیار بوو... پێش ئەوەی ماچم بکا گوتی داوایەکم هەیە هاتووم لەگەڵم بێی بۆ فرۆشتنی خانوومان لەدێ. پێویستی نەدەکرد بپرسم لەکوێ، یا کام خانوو، چونکە جگە لەخانووی باپیرم لەدێی (ئاراکاتاکا) هیچ خانوویەکی دیکەمان نەبوو، ئەو خانووەی کە من لێی لەدایک بووم و لێی رۆیشتووم و چاوم پێی نەکەوتەوە تا تەمەنی هەشت ساڵی، هەر لەو دەمە بوو.کە خوێندنی یاسام جێ

**• ژیانم لەسەر بڵاوکردنەوەی ئەو نووسینانە بوو کە لە رۆژنامەکان بڵاوم دەکردنەوە، ئەوەش بەواتای مەمرەو مەژی دەژیام.**

هێشتبوو پاش ئەوەی سێ ساڵی تەواوم بە خوێندنەوەو لەبەر کردنی هۆنراوەی سەردەمی زێڕینی ئیسپانی بەسەر بردبوو.... زۆربەی وەرگێڕانەکان و هەموو کتابەکانی کە بۆ فێربوونی نووسینی ڕۆمان پێوست بوو خوێندبوومەوە، چوار ڕۆمانم لەپاشکۆ ئەدەبیەکان بڵاوکردبۆوە کە زۆربەی برادەران و هەندێک لە ڕەخنەگرانم پێ وروووژاندبوو، لەمانگی دواتر ئاهەنگی (٢٣) ساڵەی لەدایک بوونم دەکرد، لە خزمەتی سەربازیان بوردبووم لەبەر ئەوەی دووجار تووشی نەخۆشی (سیلان) ببووم ڕۆژێ دوو پاکەت سیغارم دەکێشا.

کاتێ خۆم دابەش کردبوو لەبەینی (کارانکیلا و قەرتاجنەی هیندیەکان) لەسەر کەناری کاریبی لەکۆلۆمبیا، ژیانم لەسەر بڵاوکردنەوەی ئەو نووسینانە بوو کە لە ڕۆژنامەکان بڵاوم دەکردنەوە ئەوەش بەواتای مەمردو مەژی دەژیام، لەشوێنی خۆش دەنووستم لەپێش مۆدێل بووم لەبیست ساڵ لە بەر هەوەسی خۆم نا بەڵکو لەبەر کەمی ماڵ و سامان... دوو سمێڵی کەتان پرچێکی بڵاو کراسێکی خەت خەت... لەوکاتەی دایکم داوای لێ کردم کە لەگەڵی بڕۆم بۆ فرۆشتنی خانوو هیچ لاریم نەبوو یەکسەر بە بەڵێ وەڵامم دایەوە و پێی وتم من پارەی تەواوم نیە بۆ سەفەر یەکسەر پێم وت من هامۆشۆی سەفەرەکە دەکەم... پشتم بەڕۆژنامە نەبەستبوو ڕۆژانە (٣) بیزەم لەهەر مەقالەیەک وەردەگرت و لەنووسینی هەر پێشەکیەک کە نووسەرێکی پێشەکی لەوێ نەبوایە من دەمنووسی (٤ بیزەم) وەردەگرت ئەوەش بە ئاستەم بەشی ئەوەی دەکرد پێی بژیم... ویستم سلفەیەک وەرگرم بەڵام بەڕێوەبەر بەبیری هێنامەوە کە قەرزم گەیشتۆتە سەد نووسین بەڵکو زیاتریش... لەو ڕۆژەدا لەکاتی ئێوارە شتێکم کرد کە لەتوانای کەسدانەبوو کاتێ لەقاوەخانەی کۆلۆمبیای نزیک کتێبخانە چوومە دەرەوە لە (ئەلدۆن رامۆن ڤاینس) نزیک کەوتمەوە کە مامۆستایەکی کۆن بوو داوای قەرزی (١٠ بیزەم) لێ کرد بەڵام لەشەش زیاتری پێ نەبوو، دایکم وای بەخەیاڵدا نەدەچوو کە ئەو سەفەرە هەندە گرنگە کە هەموو تەمەنی من هێشتا کەمە بۆ نووسینەوەی ئەو ڕۆمانە... نەرۆیشتبووم بۆ (ئاراکاتاکا) زیاتر لە (١٤) ساڵ بوو واتە لەمردنی باپیری دایکم لەوکات بردمیان بۆ ئەوەی لەماڵی باوکم بژیم... هەتا تەمەنی هەرزەکاریم، بیرم هەر بۆ دوارۆژ دەرۆیشت زیاتر لەرابردوو، ئەو یادگاریانەی کە لەم دێیەم وەگیر کەوتبوو زیاتر خۆشەویستی خاک و ئەو شوێنەی لا زیادکرد بووم کە چاوم لێی هەڵێنابوو... شوێنێکی باش بۆ ژیان، لەوێ هەموو خەڵک یەکتری دەناسی خۆشەویستیان لەبەین هەبوو ئەو دێیە کەوتبووە لێوارەکانی رووبار کە ئاوێکی ساف و بێ گەردی هەبوو، لەو بەری باخچەی مۆز هەبوو، زۆرجار هیندییەکانمان دەدیت کە وەک ڕێچکەی مێروو رایان دەکرد بۆ بناری چیاکان و کۆڵی زەنجەبیلیان لەسەر پشت بوو و گەڵای کەکاویان کۆ دەکردەوە...پلەی گەرما زۆرجار زۆر بەرز دەبووەوە کە گەورە لەبەری بەئازار بوون... وام بیستبوو کە هێڵی ئاسنی شەمەندەفەرو کۆمپانیای مێوەجات بەشەو ئیشیان دەکرد... لەبەر ئەوەی بەرۆژ کەس لەتوانای دانەبوو دەست لەو ئامێرانە بدات کە لەبەر گەرمای ڕۆژ سوور دەبوونەوە....

باشترین هۆکاری گواستنەوەمان لە (بارانکیلا بۆ ئاراکاتاکا) سوار بوونی کەشتی بوو کە لەو نۆکەندەوە دەرۆیشت کە کۆیلەکان لەسەردەمی ئیمپریالیزم هەڵیان کەندبوو، پاشان بڕینی زەلکاوێکی گەورەو ئاوی لێڵ بوو بۆ گەیشتن بەو دێیە ونە لە (سیاناکا)، لەوێ بەسواری شەمەندەفەر کە باشترین هۆکاری گواستنەوەبوو لەوکات لەوڵات هەروەها لەکۆتایی بەناو باخچە مۆزەکاندا دەرۆیشتین تا دەگەیشتینە جێ.

سەفەرەکەی من و دایکم دەستی پێ کرد لەکاتژمێر حەوتی ئێوارە ڕۆژی یەکشەممەی (١٩/ی شوباتی ساڵی «١٩٥٠») وەکو کەرنەڤاڵێک بوو باران بەلێزمە دەباری کە وەرزی بارینی باران نەبوو دوو بیزەمان لەگیرفان بوو بەشمانی دەکرد لەوکاتەی کە خانووەکەمان نەفرۆشابا... بای باکور لەو شەوە زۆر بەهێز بوو کە گەیشتینە بەندەر زۆر بەزەحمەت دایکمم سواری کەشتی کرد، ناحەقی نەبوو کەشتیەکی کۆن وەک کەشتیەکانی ئۆرلینازی نوێ بوو دوو سەوڵی هەبوو بۆ لێدان و بڕینی ئاوی دەریا مەکینەیەکی هەبوو بەسووتەمەنی کاری دەکرد کاتی کارپێ کردنی هەموو ئەوانەی لەسەر پشتی کەشتی بوون دەلەرانەوە... هۆڵێکی دانیشتنی هەبوو، کە کورسی داری لێبوو بۆ لەسەر دانیشتن و شتومەک و کەل و پەلی خۆیان و مریشک و هەتا بەرازەکانیان لەگەڵ خەڵکدا دەنا ئێمە دردنگ بەسەر کەوتین بەزەحمەت دوو کورسیمان پەیدا کردو لەسەری دانیشتین... پێش سەرکەوتن من چەند سیغارێکی هەرزانم کڕیبوو دامدەگیرساند بەرە بەرە خەریکی خوێندنەوەی (نورئاب) ی (ولیم فۆکنەر) بووم دایکم خەریکی تەسبیحەکەی بوو هەر دوعای خێرو سەلامەتی بۆ یانزە یەتیمەکەی دەکرد... وادیار بوو دوعاکەی قەبوول بوو باران بەرە بەرە کەم دەبوو... دایکم لەماڵێکی سادە لەدایک ببوو لەکۆمپانیایەکی مۆز بەرە بەرە ژیانی بەکارکردن دەبردەسەر... ئەمەش ماوەی دابوو کە لەدواناوەندی کچان (سانتبسیما) لە (سانتاماریتا) بخوێنێ... لەپشووی جەژنەکانی میلاد کارێکی لەگەڵ برادەرانی دەدۆزیەوەو ئامێری

**• سەفەرەکەی من و دایکم لەساڵی ١٩٥٠ وەکو کەرنەڤاڵێک بوو، باران بەلێزمە دەباری، کە وەرزی بارینیش نەبوو.**

(قیسارەی) لەئاهەنگە خۆشەویستیەکان دەژەند... کەس لەگەڵ هیچ گەنجێکی نەدیبوو رۆژێک لە رۆژان... مێردی لەدێ کرد، دژی ویستی دایک و باوکی تەندروستیەکی پۆلایینی هەبوو... توانایەکی یەکجار زۆری هەبوو لەشاردنەوەی نهێنیەکان، زۆر ئارام و لەسەرخۆ بوو سەر بە بورجی شێر بوو هەر ئەوەش بوو ئەو ڕەوشتە بەهێزانەی پێ بەخشیبوون.. لەوکاتە ئەو ڕەوشتانەیم بۆ دەرکەوت کە ئازارێکی زۆری لەو گەشتە کێشا لەدەست ماندووبوون و مێشوولەو، گەرمای بەتین و هاتووچۆی گەشتکەرەکان کە شوێن هات و چۆیان زۆر تەنگ بوو، هەودسبازە لاوەکان هەریەک لەلایەک لەگەڵ خۆشەویستەکەی دانیشتبوو... دایکم لەنزیک دەرگا دانیشتبوو هەر چرکەیەک کوڕو کچێک بەپێشیدا ڕەت دەبوون، وام بیر دەکردەوە کە دایکم سەرنجی لای ئەوان نییە، بەڵام پاش ماوەیەک دایکم وتی منداڵی نەزان و هەژارن، نازانن ئەو کارە هیچ نییە بەرامبەر ئەوەی دەیکەن لەپێناوی ژیان... هەتا نیوەی شەو دایکم دانیشت منیش لە خوێندنەوە ماندوو بووم سیغارێکم داگیرساندو لەوکاتەی گەیشتبووینە بیابانی هەرێمی (یوکناباتاوفا). ساڵێک پێش ئەوکات وازم لە خوێندن هێنابوو وام دەزانی کە دەتوانم بە ڕۆژنامەو ئەدەب بژیم بێ ئەوەی هیچ کامیان بخوێنم... وتەیەکی (برنادشۆ)م کردبووە پێڕەو کە دەڵێ «لەمنداڵی خوێندنم بڕی لەپێناو چوون بۆ قوتابخانە)، توانام نەبوو لەگەڵ کەس لەو بابەتە بدوێم چونکە دەمزانی کەس ئەو قسەیەم لێ ناکڕێ ئەو بیرۆکەیە تەنها بەهاکەی لەدەرونی خۆمدا هەبوو دایک و باوکم زۆریان لێم خەرج کرد بۆ ئەوەی بڕوانامەی دانشگا بەدیوارەوە هەڵبواسم هەرگیز ئەو قسەیە قەناعەتی دڵیان ناهێنێ و ئەو ئاواتەیان نەهاتەدی بەتایبەتی باوکم پاش ساڵێک ویستم بچمە لای و ئەو بیرۆکەیەی بۆ شی بکەمەوە بەڵام دایکم نەیهێشت هات و بردمی بۆ فرۆشتنی خانوو.. دایکم ئەو مەسەلەیەی نەزانی تا نیوەی شەو لەناو کەشتی کە وتی کاتی ئەوەیە بیرۆکەی ئەو گەشتەت پێ بڵێم و فرۆشتنی خانووم بۆ هاتە مێشک، وتی باوکت زۆر غەمبارە!... بۆ ... ؟ لەبەر ئەوەی خوێندنەکەت جێ هێشتووە... هیچم جێ نەهێشتووە، بەڵام پسپۆریەکەم گۆڕیوە... بەڵام باوکت دەزانی ئەویش خوێندنی خۆی جێ هێشت بوو، بۆ لێدانی کەمان... وام پێ وت و دەمزانی کە ئەوە ڕاست نییە... ئەوە پەیوەندی بەو قسەیە نییە... باوکم تەنها لە جەژنەکانی لە دایک بوون و بۆنەکان کەمانجەی لێدەدا... خوێندنی جێ هێشت لەبەر ئەوەی پارەی نانێکی نەبوو پێی بژی هەرنەبێ بووبە (هەواڵدەر) کە لەوکات کارێکی باش بوو بەتایبەتی لە (ئارکاتاکا)... بەڵام من بەکاری ڕۆژنامەنووسی دەژیم بەدرۆ پێم وت... تۆ بۆیە وا دەڵێی کە من غەمبار نەکەی... دایکم وتی، ئەوەش بەروونی دەبینم تا ئەو کاتەی تۆم دیت لە کتێبخانە نەمناسیتەوە... منیش تۆم نەناسی.. بەڵام لەبەر ئەو هۆیە نەبوو بەڵکو وامزانی کە سواڵکەری سەیری قاچەکانی کردم و وتی گۆرەویشت نیە لەپێی بکەی، وەها زۆر خۆشترە بۆم، دووکراس و دوو شەرواڵم هەیە یەکیان دەشۆم ئەوی دی لەبەردەکەم پێویستم بە زیاتر نیە یەکسەر وتی بۆیە وادەڵێم لەبەر ئەوەی زۆرمان خۆش دەوێی.

دەزانم بەڵام پێم بڵێ تۆ لەجێگای من بی هەمان شت ناکەی، نەخێر لەبەر ئەوەی دژی ویستی دایک و باوکە... ئێستاش بەبیرمە کە چەند دڵ ڕەق بوو تا مێردی بێویستی ئەوان کرد، بە پێکەنینەوە وتی دەزانم بیر لەچی دەکەیتەوە من دژی ویستی دایک و باوکم نەبووم، گفتوگۆکەمان لێرە وەستا لەبەر ئەوەی وەڵامی منی پێ نەبوو و دەیویست بچێتە گەرماو دەترسا گەرماوەکە پاک و خاوێن نەبێ بۆ لای بەرێوەبەری بەندەرەکە چووم داوای شوێنێکی پاکترم کرد بەڵام ئەویش وتی منیش ئەو گەرماوە بەکاردێنم قسەکەی (کۆنرادم) هاتەوە یاد کە دەڵێ (لەناو دەریا گشت یەکسانن) بۆیە پێویست بوو لەسەر دایکم بەیاسای دیموکراتیەت ڕازی بێت کاتێ هاتەوە چاوەڕوانی خراپترم دەکرد، کە دیتم بەزەحمەت خۆی ڕادەگرت لەبەر پێکەنین.... سێ سەعات دواکەوتین، گەرماو، مێشولەش تەنگیان پێ هەڵچنیوین بەڵام دایکم بەسەر خۆی نەدەهێناو هەر لە دانیشتنەوە باوشکی خەوی دەکرد... پاشان وتی هەر چۆنێک بێت دەبێ شتێک لەو بابەتە بەباوکت بڵێم بەدەنگێکی نزم ئەو قسەیەی کرد دوو دڵ مەبە، دەچمە سەردانی لەمانگی کانونی یەکەم و هەموو شتی بۆ ڕوون دەکەمەوە، کانونی یەکەم واتە پاش دەمانگی دی... بەڵێنم پێ دەدەی کە بچی.... بەڵێن دەدەم، واتە دەتوانم بەباوکت بڵێم کە دەڵێ بەڵێ، نەخێر، بێگومان نا... لەڕێگا لە چارەیەکی دی دەنۆڕی بەڵام من کۆتاییم بەقسە هێنا، ئەویش کەوتە خەوێکی قووڵ، کەشتیەکەمان سوک بیوو وەک کەشتیەکی چارۆکەدار، لە (سیاکاتای گەورە) بوین کە یەکێک بوو لە ناوچە ئەفسانەییەکانی منداڵیم، زۆرجار لێی تێپەڕی بووم لەگەڵ باپیرم (نیکۆلاس ریکاردۆ مارکیز) لەو گەشتەی لە (ئەرکاتاکا بۆ بارنکیا) دەمانکرد بۆ دیتنی دایکم، باپیرم دەیگوت پێویستە نەترسی لە سیاکانا، بەڵکو ڕێزی بگری چونکە ئاوەکەی دەمدەمی بوو دەمێک هەڵدەستا وەکو ئاوی زەریاکان دەمێک هێمن دەبووەوە وەک ئاوی زۆنگاوەکان، لەوەرزی باران لەژێر ڕەحمەتی باو زریان بوو لەکانوونی یەکەم تا مانگی نیسان، بای باکور هەڵی دەکردە سەری بەتوندو تیژی کە هەموو شەوێکی ترسناک دەکرد... لەبەختی ئێمە ئەو شەوە هێمن بوو بۆ پێشەوەی کەشتیەکە چووم بۆ ئەوەی کەمێک هەوای پاک هەڵمژم، چەند روناکیەکی بەلەمەکانی ڕاوم دیت کە ڕەونەقیان دەدا وەک ئەستێرەی بچووک دەنگی ڕاوچیەکانم گوێ لێ بوو بەیانییەک وەک ئەو بەیانی لەوکاتەی کە لە (سیاکانای گەورە) دەپەڕینەوە باپیرم بۆ چێشتخانە چوو منی بەنووستوویی جێهێشت نازانم کاتژمێر چەند بوو هەر ئەوەندەم زانی دەنگە دەنگ پەیدا بوو و لەخەو ڕاپەڕیم لەوکات تەمەنم (٥) ساڵ زیاتر نەدەبوو زۆر دەترسام وام دەزانی خەونە، بەڵام هەرزوو هێمنیەک پەیدا بووەوە بەیانی لەسەر شۆستەی بەندەری سیاکانا، باپیرەم ڕیشی دەتاشی لەبەرامبەر ئاوێنەیەکی هەڵواسراو بەڕۆخی دەرگا کراوەکە، زۆر باشم لەیادە کە کراسەکەی هێشتا لەبەرنەکردبوو کراسێکی خەت خەت بوو قسەی لەگەڵ یەکێک دەکرد کە ئێستاش دەموچاوی لەپێش چاومە، زنجیرێکی زێڕی گەورەی لەمل بوو کە بە باپیرمی گوت... باپێت بڵێم جەنابی کۆلۆنێل (دەیانەویست فڕێت بدەنە ناو ئاو) باپیرم زەردەخەنەی هاتێ و بەشانازیەوە کە دەستی لەئامێری ڕیش تاشینەکەی هەڵنەگرت گوتی (باشیان کرد کە نەوێران ئەو کارە بکەن) بۆ ئەو کارەم پاش بیست ساڵ هاتەوە یاد... ئەو بیرەوەرەیەم بۆ مامم (ستیبان) دەگێڕایەوە و مامم بەتووڕەیی هەڵستاو وتی: کێ دەیەویست باوکم بخاتە ناو ئاو نەیزانی باپیرم بۆچی بەرگری لەخۆی نەکرد، لەگەڵ ئەوەی تفەنگچیەکی بێ وێنە بوو هەمووکاتێک

چەکداربوو، کاتی نووستن دەمانچەکەی هەر لەدەست بوو پلەو پایەی بەرزی درا بویّ لەماوەی دوو شەڕی مەدەنی لەکاتی ئاشتی یەکێکی کوشتبوو کە ویستبووی غەدری لیّ بکا ئەویش بەرگریەکی شەرعی لەخۆی کردبوو.

بەپێی یاسای کۆچێرا، هەر یەکێک لە ئەندامانی خێزان تووشی غەدر لێکردن بوو پێویستە لەسەر هەموو نێرینەکانی خێزانی غەدرکەر دەبیّ بەهای غەدرەکە بدەن، هەرجاری بەیەک دەگەیشتین ئەو بەسەرهاتەی دەهێنامەوە یاد کە رابردووی خێزان بوو و دەیویست بیکەم بە کەرەستەی نووسینی یەکەم رۆمانم، دواجار کە دیتم لە (قەرتاجنەی هیندیەکان) پیرەمێردێکی دڵ ماندوو هەناسە سوار ماڵئاوایی لیّ کردم بەزەردەخەنەیەکی غەمبارەوە گوتی (نازانم چۆن بووی بەنووسەر ئەو مێشک و بیرە خراپەشت هەیە کە شتت زوو بەبیرنایەتەوە)، کاتژمێر هەشتی بەیانی تێپەڕی بوو کە لە بەندەر دابەزین لەکاتی خواردنی نانی بەیانی لەبەندەر، ماسی سیاناکای سور کراوەمان دەخوارد کە زۆر بەتام بوو دایکم بەهەڵی زانی و وتی پێم بڵیّ چی بەباوکت بڵێم، لەبارەی چی؟ لەبارەی خوێندنەکەت و بەختم باش بوو یەکێک لەتەکمان بوو هاتە ناو باسەکە، دایکم وتی نایەویّ خوێندنی تەواو بکات دەیەویّ ببیّ بەنووسەر، پیاوەکە وەڵامی دایەوە، نووسەری باش دەتوانیّ رزقێکی باش پەیدا بکات بەتایبەتی ئەگەر کاری بۆ میری کرد، نازانم بۆ دایکم گفتوگۆیەکەی بڕی و بیّ دەنگ بوو.... گەڕاینەوە بۆ وێستگەکە بەهۆی گالیسکەی فکتوری کراوە کە وڵاغێک رای دەکێشا... وابزانم تەنها ئەو تاکە مابوو لە سلالە ئەفسانەکەی کە کۆتایی هاتبوو لەگشت جیهان... دایکم خەریک بوو.. چاوەکانی بڕیبووە دەشتە وشکەکە کە خوێ داپۆشیبوو، لەبۆ من ئەو شوێنە شوێنێکی مێژوویی بوو لەو رۆژەی کە تەمەنم سیّ هەتا چوار ساڵ بوو باپیرەم دەستی راکێشام و بە هەنگاوێکی خێرا بیّ ئەوەی هیچ شتێکم بۆ روون بکاتەوە بردمی بۆ ئەو دەشتە سووتاوە... لەناکاو خۆمان لەبەرامبەر رووبەرێکی فراوان لە ئاوی سەوز دیتەوە کە هەزاران مریشکی خنکاوی لەسەر بوو گوتی ئەوە دەریایە...

لێم پرسی لەو بەری دی چی هەیە؟... لەوەڵامدا وتی لەوبەر کەنار نیە... ئەورۆ پاش ئەوەی بەئومێد بووم زۆر زەریا لەوبەر هەبن... ئێستاش وەڵامەکەی بەیەکێک لەوەڵامە سەیرەکانی دادەنێم.

ئەمرۆ بەبیرم نیە کەی لە چ رۆژێک بۆ یەکەمجار باسی دەریام بیستبوو و نەئەو وێنەیەی کە بۆ دەروونی خۆم دروستم کردبوو لە چیرۆکی گەورەکان باپیرم ویستی نیشانم بدات بەڵام لەقامووسە دڕاوەکەی هیچی نەدۆزیەوە... لەجیاتی ئەوە لە (سانتامارتا) قاموسێکی وێنەداری بۆ هێنام کە بەرگەکەی ئەتلەسێک بوو کە ئاسمانی لەسەر شانی خۆی هەڵگرتبوو... لەژیانی خۆم ئەوە یەکەم قاموسە کە هەمبیّ و بەپێی پیتی (ئەلف با) خوێندمەوە بیّ ئەوەی وشەیەکی لیّ تیّ بگەم وەک ئەوەی کە لە قوتابخانەیەکی سەرەتایی رۆمانێک بخوێنیتەوە... باپیرەم پێناسەی دەریای دۆزیەوە کە لە قاموسی دی نەبوو (پانتاییەکی فراوانی لەئاوی سوێر کە بەشی هەرە زۆری گۆی زەوی داپۆشیوە).

پێناسەیەکی وابوو کە من هیچم لە دەریا نەدەزانی ئەگەر باپیرم پێی نەگوتبام ئەوە دەریایە لەپێشت. لەبەر ئەوەی گشت ئەو وێنانەی لەپێش چاوم بوون بەو پارچە ئاوە نەدەچوون کە لەپێشم بوون، لە (سیاکانا) هەمان شت بەسەر دایکم داهات لەسەر دەریایەکە لەپەنجەرەی ماشێنەکە دەیدیت کە گوتی (هیچ شتێک وەک دەریای ریو هاشا) نیە... لەوکات بیرەوەریەکانی خۆم بۆ گێڕایەوە لەسەر مریشکە خنکاوەکان وەک هەر گەورەیەک وامدەزانی کە یاریەکی منداڵانەیە.... دەمزانی کە دایکم بیر لەو هەموو شتانە دەکاتەوە بەبیّ دەنگی... لەپێش گەڕەکەکانی ئەو بەری هێڵی شەمەندەفەر تێپەڕین کە خانووی بچووکی لیّ بوو، رەنگاورەنگ بوون و بانەکانیان ژەنگاوی بوون لەپێش ئەو شوێنە تیّ پەڕین کە (مارتینا فۆنسیکا)ی لیّ کوژرا... ئەو شارۆچکەیەمان بڕی بیّ ئەوەی لێی دابەزین بەڵام شەقامە پان و بەرینەکانمان دەدیت و خانووە کۆنەکانمان دەدیت کە مێژوویان.دەگەڕایەوە بۆ کۆنترین سەردەمی باب و باپیران... لەناکاو دایکم پەنجەی درێژ کردوو هاواری کرد (بڕوانە ئەوە کۆتایی جیهانە) بەرە بەرە رۆیشتین وێستگەکەم دیت کە لەدار دروست کرابوو بانەکەی بە زنک داپۆشرابوو کە لەپێشیدا گۆڕەپانێکی بچووک هەبوو کە لە (٢٠٠) کەس زیاتری نەدەگرت لەو جێگایە بۆی دیار کردم کە سوپا لەساڵی «١٩٢٨» بیّ ژمار کرێکاری باخچە مۆزەکانی کوشت.

سەیرم پیّ هات بەو زانیاریە چونکە من هەموو کاتێک وام دەزانی کە قەسابخانە تەنها لە (ئاراکاتاکا) رووی داوە لەو فکرانە دابووم کە دایکم وتی چی بەباوکت بڵێم بەهێواشی پێم وت پێی بڵیّ کە لە ژیانم هیچم ناویّ تەنها ئەوە نەبیّ کە دەمەویّ ببم بەنووسەر، دایکم بەدەنگێکی بەرز هاواری کردو دووبارەی کردەوە ناوی ئەو شوێنانەی کە لە پەنجەرە لێی دیار بوو و لێی تێدەپەڕین یەک لەدوای یەک و بەمنی وت (ئەوە ئەو خاکەیە کە بە باوکمیان فرۆشت) پاش ئەوەی وایان رازی کردبوو کە لەژێرەوەی زێڕ هەیە... بەباغ و گولستانێک دارۆیشتین لەشوێنێک نووسرابوو (رۆژ بۆ گشت کەسێک هەڵدێت) ئەوە یەکەم وشەی ئینگلیزی بوو کە من فێری دەبووم، شەمەندەفەر تێپەڕی لەسەر پردی چیمەنتۆ لەسەر قەناتەکە دایکم وتی، (ئەوە گەڕەکی کچە هەوەسبازەکانە) کە پیاوەکان لێرەدا سەمایان دەکرد سەمای کۆمبیا تا بەیانی ئەوە قوتابخانەی (مۆنتسۆریە) کە لێی فێرە خوێندەواری بووم... لەبەر تیشکی ئەو بەیانیە لەمانگی شوبات وێنەی گوندەکەمان شەوقی دا بەگشتی لێرەدا شەمەندەفەر فیکەی کۆتایی لێداو خێرایی خۆی بەرە بەرە کەم کردەوە تا لە کۆتایی وەستا.. هەموو شتێک کۆتایی هات بەتەنها ئەو بیرەوەریە کاریگەرەم بەبیر هاتەوە کە (٣٠٠٠) هەزار کرێکار بەدەستی هێزەکانی رژێم کوژران لەچاو تروکانێک لەو شوێنە ئاسەواری ژیانی مرۆڤ رەش بووەوە دایکم بۆ چەند چرکەیەک بیّ دەنگ دانیشتبوو سەیری گوندەکەی دەکرد، کە لەپێش چاوی وەک لاشەی مردوویەک وابوو هاواری کرد (ئەی خودایە)، ئەوە تەنها ئەو وشەیە بوو کە دایکم دەرکاندی.

**سەرچاوە**

**لەگۆڤاری (المغازین لیدیزی فرنسی) وەرگیراوە گۆڕینی بۆ عەرەبی (رجاء صبحي).**

**لەگۆڤاری الاقلام، ژمارە «٢» ساڵی ١٩٩٩**

# ژیاننامەی مەنسوری حەللاج

ئا/ میدیا

حوسێنی کوڕی مەنسور ناسراو بە (حەللاج) لەساڵی ٢٤٤ی کۆچی لەگوندی «توور»ی شاری (بیضاء)ی فارس لەدایک بووە. نازناوی حەللاجیان بۆیە پێداوە چونکە گوایە توانیویەتی بەناماژەی قامک، دان و گوڵی (لۆکە) لەیەک جیاکاتەوە. پاشان چارەسەری زۆر کۆسپی فەلسەفی و شەرعیشی کردووە. ئەودەم خەڵک نیتر بەراشکاوی پێیان گوتوە حەللاج وەهەروەها حەللاجی رازەکانیشان پێ گوتووە.

منداڵیی حەللاج: وەک دەڵێن باوکی مەنسور بەهۆی دەستەنگی و بۆ کارکردن لەناوچەی شیرازەوە چۆتە «شوشتر» ولەویوە چۆتە شاری «واسط» کە لەنێوانی کوفەو بەسرەدا بووە. حەللاجی منداڵکارە لەم سەفەرەدا هاوڕێی باوکی بووە. هەر لەوێ بوو کە حەللاج فێری زمانی عەرەبی بوو. لەشاری (واسط) قوتابخانەیەک بەناوی «دارالحفاظ» هەبوو کە حەللاج هەتا تەمەنی ١٢ ساڵان لەلای مامۆستا سەهلی کوڕی عەولای قەستەری خەریکی خوێندنی قورئان و زانستەکانی دیکە بوو.

لەسەرەتاوە کاتێک ١٨ ساڵان بوو یەکەم مامۆستای زانستی سۆفیگەری «تصوف» هەمان سەهلی کوڕی عەولای قەستەری بوو:

**رو، سینەرا چون سینەها هفت آب شوی از کینەها**
**وانکە بیا با عاشقان همخوانەشو همخوانەشو**
**(مەولەوی)**

تەمەنی ٢٠ ساڵ بوو، چووە بەسرەو لەوێ بوو بەقوتابی حەسەنی بەسری و ئاوێتەی فەلسەفەو زانستی حیکمەت و تەسەووف بوو. هەر لەو ساڵانەدا بوو خۆی لە جونەیدی بەغدایی و ئەبونەلحەسەنی نووری کە دووزانای قوتابخانەی سۆفیگەری بوون، نزیک کردەوە. لەکۆتایی ئەو ساڵانەدا حەللاج بووبە زاوای ئەبو یەعقوبی ئەقتەعی بەسری کە یەکێک لە شێخەکانی بەسرەبوو.

حەللاج هەتا ئاخرین ساڵەکانی تەمەنی هەر لەگەڵ ئەو ژنە (ام الحسنین) ژیاو چوار منداڵی لەپاش بەجێما. هەر لەسەرەتای چوونە ناو فەلسەفەی سۆفیگەرییەوە، خۆی لەزۆر یەک لەلایەنگرانی ئەو قوتابخانەیە جیا کردەوە.

**سەفەرەکانی حەللاج:**

یەکەم سەفەر/ - مەنسوری حەللاج بۆ درێژەدان بەباری زانستی و تێگەیشتنی چڕوپڕ لەتەمەنی ٢٦ ساڵیدا یەکەم سەفەری لێکۆڵینەوەی سۆفی گەریبانەی بەرەو مەککە دەست پێکرد. لەم سەفەرەدا حەللاج بۆ ماوەی یەک ساڵ لەمزگەوتی مەککە لەژێر هەتاودا مایەوە. بۆیەک جاریش بێجگە لەدەس نوێژگرتن نەدەچووە دەرێ و شوێنی نەدەگۆڕی. لەگەڵ کەس قسەی نەدەکرد، خۆراکی رۆژانەی ئەوساڵەی پاروە نانێکی هەژارانە بوو.

دوای ئەو یەک ساڵە حەللاج گوتبوی: ئەگەر زەڕڕەیەک لەوشتەی لەناو دڵمدایە برژێتە سەر کێوەکان، هەمووی دەتوێتەوەو ئەگەر رۆژی قیامەت تێکەڵاوی ئاگریم، ئاگرەکە دەسوتێنم و ئەگەر بچمە بەهەشتەوە بیناکانی هەموو وێران دەبن.

دووهەم سەفەر - حەللاج سەفەری دووهەمی خۆی لەگەڵ هێندێک لە مریدەکانی بەرەو مەککە سازکرد. بەم سەفەرەوە حەللاج زیاتر چووە ناو دنیای بیر کردنەوە.

حەللاج کاتێک لەم سەفەرە گەڕاوە تاقمێکی زۆر لە سۆفی و شێخەکان بەهۆی بیرو بۆچوونی توندو تایبەتی، دژایەتی ئاشکرایان لەگەڵ حەللاج دەکرد. ئەوانە دەستەیەک بوون پێیان دەگوتن «موعتەزیلە» وەهەروەها کەسانێکی وەک ئیبنو ئەلفورات وئیبنو نۆبەخت هەمیشە دژی ئەو قسەیان دەکرد.

سێهەم سەفەر - ئەم سەفەرەی حەللاج بەرەو دەرەوەی وڵاتانی ئیسلامی بوو.

چین و هیندستان و کشمیر ئەو وڵاتە ئەساتیریانە بوون کە زۆریان کارکردە سەر بیرو بۆچوونەکانی ئەو لەگەڵ لایەنگرانی «مانی» و «زەردەشت» و «بودا» قسەی دەکردو

بیرو رای دەگۆڕییەوە، دوای گەڕانەوە هێندەی دیکە ناوی حەللاج زەق بۆوە.

چوارەم سەفەر - لەچوارەمین سەفەردا حەللاج دیسان بەرەو مەککە رۆیشت. ئەم سەفەرەی حەللاج دنیایەک ئەزمون و زانستی بەدوادا هات. کاریگەری ئایەتی «وان من شئ والا ویسبح بحمده» بوو بەهۆی ئەوەی کە بڵێ: خودایە تۆ دەزانی کە من عاجزە لە هەڵوێستی شوکرانە بۆتۆ، کەوابێ ئەوە شوکرەو هیچی دیکە.

قووڵ بوونەوەی ژیانی حەللاج: حەللاج گەیشتبووە ئاستێک کە ئیتر خەڵکی ئاسایی لەمانای قسەکانی تێ نەدەگەیشتن. حەللاج دەیگوت: شەڕنەکردن لەگەڵ ئەو شێتییە وئاشت بوونەوە بێ ئەقڵی. هەروەها دەیگوت: بزانن خودا رشتنی خوێنی منی ئازاد کردووە. بمکوژن هەتا خوداتان لێ رازی بێ و منیش بچمەلای ئەو:

**عشق اینەایست کە اندرو زنگی نیست**
**بابیخبران دراین سخن جنگی نیست**
**دانی کە کرا عشق مسلم باشد**
**انرا کە زبدنام شدن ننگی نیست**

**(جامی)**

هەروەها دەیگوت: مەرگی من پەرەستنی دارە. مامۆستا ئەبولقاسم قوشەیری لەبارەی حەللاجەوە گوتویەتی: ئەگەر حەللاج پەسەند کرابێ بەقسەی خەڵک بایەخی کەم نابێتەوە. بەڵام ئەگەر پەسەندیش نەکرابێ، بەقسەی خەڵک نایەتە رادەی پەسەند کردن.

قسەی سەر زمانی حەللاج (اناالحق) بوو. هەرچی هەڕەشەیان لێ دەکرد نەدەترساو دەیگوت: «ئایا رەوایە بڵێ (انی اناالله) وەمن ناتوانم بڵێم (اناالحق).

دەگێڕنەوە دەڵێن حەللاج کاتێک دوای ژن هێنان لە بەسرەوە بەرەو بەغدا چوو، یەک راست چووە لای جونەیدو دوای چەند قسەیەک جونەید پێی گوت: «هێندەی پێ ناچێ لەدارت دەدەن» حوسێنی مەنسوری حەللاج گوتی: «ئەو رۆژەی من بچمە سەر دار تۆ جلی ظاهیریت لەبەردایە.» بۆیە دوای سی چل ساڵ کاتێک فەرمانی کوشتنی حەللاجیان دا خەلیفە گوتبوی: «دەبێ بە قەڵەمی جونەید بێ» کاتێک جونەید شاقەڵ وعەبای لەبەر کردو مێزەری ئایەسەری نوسی: «نحن نحکم بالظاهر». خەڵکی ئەهواز پێیان دەگوت: «حەللاجی رازەکان»و لە هیندستان پێیان دەگوت: «ئەبوو ئەلموغیس»، خەڵکی چین «ئەبوو ئەلموعین» وخەڵکی خۆراسان «ئەبوو ئەلمێهر» وخەڵکی فارس «ئەبو عەبدوڵڵای زاهید»یان پێ دەگوت. لە بەغدا پێیان دەگوت «موستەلەم» ولەبەسرە «موخبەر» لە حەللاج - یان پرسی: «چۆن دەتوانین بەخودا بگەین؟» گوتی: «هەنگاوێک لە دنیا هەڵگرەوە، هەنگاوێکیش بەرەو کۆتایی بەرە.»

هەروەها لێیان پرسی: هەژار کێیە؟ گوتی: «هەژار دەوڵەمەندێکە لەلایەن خوداوە بەرەو خودا.» ئەمجار گوتی: «زانین بریتییە لە دیتنی هەموو ئەو شتانەی کە سەرئەنجام نامێنن.»

بەندکردنی حەللاج: یەکەم جار کە حەللاج یان خستە ناو بەند، بۆماوەی یەک ساڵ حەپس کرا. پاشان چونکە ئەوکەسانەی وا ویستیان مەحکومی بکەن، نەیانتوانی بەشداری بن، بەناچاری لەبەند ئازادیان کرد. ئەو دەمەی کەزیندان کرابوو، خەڵک دەستە دەستە دەچوونە دیداری و پرس ورایان پێ دەکرد. هەر ئەوکات بوو کە شێخ عەتای سۆفی چووە دیداری وگوتی: «ئێستاکاتی ئەوە هاتووە لەقسەی (اناالحق) پەشیمان ببیەوە. حەللاج گوتی: «ئەو کەسەی وای گوتوە دەبێ پەشیمان بێتەوە...»

جاری دووەم فەرمانی گرتنی حەللاج لەلایەن خەلیفە «ئەلموقتەدیر عەلی کوڕی عیسا»وە درا. ئەمجار لە موحاکەمەکەدا زۆر بە توڕەییەوە قسەیان لەگەڵ کرد، پاشان حەللاج گوتی: «ئەگەر توند قسە بکەن و بێ ئەدەبی بەخەرج بدەن بە عەرز دەڵێم قوتتان دا. مەحکەمە شێواو قازی لە قسەکانی حەللاج ترساو دەسبەجێ کاری موحاکمەی بەجێ هێشت. پاشان سەرۆکایەتی ئەو مەحکەمەیە درا بە حامیدی وەزیرو چونکە ئەو بۆخۆی شیاوی ئەو کارە قورس وگرانە نەبوو، موحاکمەی حەللاج خرایە کاتێکی دیکەو دەستوری زیندانی کردنی حەللاجی دا. دوای ئەوە گوایە بۆماوەی (٩) ساڵ لە زیندان مایەوە. دەڵێن شەوی یەکەمی زیندانی بوونی، کاتێک حەرەسەکان دەچنە سەردانی، حەللاج لەوێ نابینن. شەوی دووەم نە حەللاج و نە زیندان نابینن. شەوی سێهەم دێن حەللاج لەوێ دەبێ. لێیان پرسی شەوی یەکەم لەکوێ بووی؟

شەوی دووەم تۆو زیندان لەکوێ بوون؟ گوتی: «شەوی یەکەم چوومە لای خوداو ئێستاش، واتە شەوی سێهەم منی ناردۆتەوە هەتا وەڵامی ئێوە بدەمەوە.»

حەللاج هەمیشە دەیگوت: «کەسێکی بزانێ لەکوێوە هاتووە دەشزانێ بۆکوێ دەچێ، بەڵام کەسێکی کە نەزانێ لەکوێوە هاتووە ناشزانێ بۆکوێ دەچێ. کەوابێ ئەوکەسە

نەزانەو نەزانیش دوودڵ و دڕدونگە.»

جاری سێهەم: سێهەمین جاری موحاکمەکردنی حەللاج لەنێوان ساڵی ٣٠٨ و ٣٠٩ی کۆچیدا بوو. ئەو تاوانەی وا لەجاری سێهەم دا خرابووە پاڵ حەللاج بەخوێندنەوەی وتارێک لەلایەن حامیدی وەزیرەوە دەستی پێکرد. حامید لە مەحکەمەدا گوتی: «مەحکەمەی ئەمڕۆ تایبەتە بە گەورە ئاژاوەگێڕو شەڕانخێو حوسێنی مەنسوری حەللاج. دوایە تاوانەکانی بۆ خوێندنەوە:

١- پێوەندی نهێنی لەگەڵ تاقمی (قرامطة).

٢- باسی ئاگاداری لە عالەمی غەیب و لێک دانەوەی دوا رۆژی خەڵک.

٣- گرینگی دان بە «دڵ» لەجیاتی حەج وزیارەت.

دوایە نوسراوەیەکیان نیشان دا بەخەتی حەللاج نوسرابوو کە هەر کەسێ ئارەزووی حەجی هەبێ بەڵام نەتوانێ ئەوسەفەرە بۆخۆی بڕەخسێنێ واباشە لەماڵی خۆیدا چوارچێوەیەک سازکاو بەخاوێنی رایگرێ وکەس نەچێتە ناوی، ئەمجار لە رۆژەکانی حەجی ساڵدا دەکرێ بەدەوریدا بسوڕێتەوە. دوایە سێ منداڵی بێ باوک تێرکەی وئەمجار حەمامیان پێ بکەی وکراسێکی نوێیان لەبەر بکەی. پاشان حەوت درەم پارە ببەخشیەوە، ئەمە بەرامبەرە لەگەڵ زیارەتی حەج...

دوایە لە حەللاجیان پرسی ئەم نوسراوانەت چۆن پەیدا کردووە. حەللاج گوتی لە کتێبی «ئیخلاس»ی حەسەنی بەسری - م دەرهێناوە، بەڵام قازی گوتی ئەو کتێبەم خوێندۆتەوە.

ئەوەی تۆ دەڵێی، تێی دا نییە. ئەمانە قسەو نوسراوی خۆتن. ئەمجار حامیدی وەزیر روی کردە قازی و گوتی: «کەوابێ دەستووری سێدارە دەبێ مۆر بکرێ. بەڵام قازی نەچووە ژێری. هەروەها ئەوانی دیکەش کەسایەتیەکانی وەک ئەبوعەبباسی سەریح، ئەبو عەبباسی عەتا، ئەبو عەبدوڵڵا خەفیف و شێخی شبلی و شێخ قاسمی نەسیر ئابادی هیچیان رازی نەبون، بەڵام حامیدی وەزیر خۆی گەیاندە لای خەلیفەو فەرمانی کوشتنی حەللاجی وەرگرت. دەڵێن کاتێک حەللاج لە زیندان بوو شێخێک چوو بۆ سەردانی. پێشتر لە ئێشک گری بەندەکەی ئەوی پرسی ئاخۆ حەللاج شەوانە چی دەکا. ئێشگکر گوتی حەللاج هەموو شەوێ تا بەیانی چەند سەد «رکعەت» نوێژ دەکا. دوای چوونە ژوریی لە حەللاجی پرسی تۆ کە دەڵێی (انا الحق) ئەی چۆنە بۆخۆت نوێژ دەکەی؟

حەللاج لە وەڵام دا گوتی: «راستە من دەڵێم (انا الحق)، بەڵام من بۆخۆم قەدری خۆم دەزانم!!»

حوکمی سێدارە: ئەو رۆژەی ویستیان حەللاج لە سێدارە دەن، پێشتر جاڕیان کێشاو خەڵکی بەغدایان لەم هەواڵە دڵتەزێنە خەبەردار کرد. لایەنگرانی حەللاج لەم لاو لەولاوە هاتن و بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە ئەو رووداوەیان دی و نەیانتوانی هیچ دژایەتییەک لەگەڵ ئەو کارە بکەن. دەگێڕنەوەو دەڵێن حەللاجیان بەسواری گایەکی سپی بەدەست ولاق بەستراوەیی هێناو لەپەنای پردەکەی چۆمی دیجلەدا دایانبەزاند هەتاکو حوکمی مەرگی بەسەردا سەپێنن. کاتێک حەللاج گەیشتە ئەوێ لەسەر تەختێک درێژیان کردو دەمەورو خەواندیان و بەشێلاق لە پشتیان دا. بێ دەنگی ولاتی داگرتبوو. ئەوکەسەی بەقامچیان لە حەللاجی دەدا کەسێک بوو بەناوی «ئەبو حاریس». بۆیەکەم جار هەزار قامچیان لێ دا. خەڵک دەگریان، بەڵام حەللاج لەبەر خۆیەوە دەیگوت: «یا بن منصور لاتخف». دەروێشێک چووە لای و پرسی عیشق چییە؟ گوتی: «ئەمڕۆو سبەیی و دوسبەی» یەکەم شەوی بەسەردا هات. بۆبەیانی رۆژی دووهەم، ئەشکەنجەگەران چوونەوە شوێنی دیاری کراو. خەڵک ئاپۆرەیان دابوو.

ئەمجار ئەشکەنجەگەر رووی کردە حەللاجی بریندارو پێی گوت «دەمەوێ دەستت بپەڕێنم.» حەللاج لەوەڵامدا گوتی: «دەتوانی دەستم لەمن جیا کەیەوە، بەڵام ناتوانی قسەکانم کە وەک کڵاوی پادشایی وان لەمنی بستێنی.»

بە دەستە ساغەکەی خوێنی داچۆڕاوی دەستی چەپی بە دەم وچاویدا هێنا.

خەڵک گوتیان بۆ وات کرد. گوتی: «دەستنوێژ دەگرم» پاشان ئاوا درێژەیدا بە قسەکانی: «نوێژێک دروستە کە بە خوێنی دڵ دەستنوێژت گرتبێ.»

پاشان لاقیان پەڕاند ئەمجار گوتی: «تا ئێستا بەپێ لە دوی خودا دەگەڕام بەڵام لەمەو دوا بەدڵ بەرەو لای خودا دەچم.»

پاشان چاویان هەڵکۆڵی و ئەمجار سوتاندیان و خەڵوزیان بەدەم چۆمی دیجلەدا وئیتر ئەم رووداوە لەوێدا کۆتایی هات.

**سەرچاوە:**

١- تذکرە اولیا

٢- حەللاج شناسی

# چاوخشاندنێک بە ژیان و بەرهەمەکانی ئێرنست هەمەنگوای دا

محەمەد حوسێن عابدی    و: دارا سوبحان



بە خێرایی ناسیم، رۆژێکی بەهاری ساڵی ١٩٥٧ بوو، باران دەباری ئەو لەگەڵ هاوسەرەکەیدا (ماری وش) لە شەقامی (س. میشل)دا دەرۆیشتن، پانتۆڵێکی کابۆی زۆر کۆن و کراسێکی زەردی لە بەردا بوو، کڵاوێکی خوری لەسەر کردبوو. تەنها شتێک کە لە تەک سیمایدا هەماهەنگ نەبوو چاویلکەیەکی فلزی بازنەیی بچووک بوو کە شێوەی باپیرەیەکی پێ بەخشیبوو: پەنجاو نۆ ساڵی تێپەڕاند بوو، پیاوێکی کەتەوبە هەیبەت بوو، بەڵام ئەو توانا زۆرەی کە بە دڵنیاییەوە حەزی دەکرد هەیبێت، پێوەی دیار نەبوو، قاچ و قۆڵ ورانەکانی زۆر لاواز و باریک بوون، لە نێو کتێبە کۆنەکان و شاڵاوی گەنجەکانی (سوربۆن)دا ئەوەندە زیندوو دەهاتە پێش چاو کە ئاسان نەبوو وا گومان بکەی کە چەند ساڵێکی کەمی لەتەمەن ماوە. لە ماوەی چەند چرکە ساتێکدا وەک هەمیشە لە دڵە راوکێی ئەوەدا بووم کە گفتو گۆیەکی لەگەڵدا ساز بکەم، یان تەنها لە شەقامەکەوە تێپەڕم بۆ ئەوەی ستایشی بێ پایانی خۆمی پێشکەش بکەم. هەڵبەتە لە هەردوو حاڵەتەکەدا گرفتێکم هەبوو ئەویش ئەوە بوو کەمن بە ئینگلیزیەکی تێک شکاو قسەم دەکردو هەروەها سەبارەت بە ئیسپانی هێند دڵنیا بووم، ئەو کات هیچ کام لەم کارانەم نەکرد، بۆ ئەوەی ئەو هەلەم لەکیس نەچێت وەک تەڕەزان لە جەنگەڵدا هەردوو دەستم کردە بڵند گۆو رووبە ئەو بەری شەقامەکە هاوارم کرد (مائێسترو) واتە (مامۆستا)، ئێرنست هەمەنگوای هەستی کرد کە لە نێو ئەو هەموو قوتابیانی زانکۆیەدا مامۆستا تەنها خۆیەتی بە دەنگێکی کەمێک منداڵانە هاواری کرد (ئەیووس، ئەمیگو) واتە (خوات لەگەڵ هاوڕێ) ئەمە تەنها جارێک بوو کە بینیم، ئەو رستانەی سەرەوە سەرەتای ستایشکردنی (هەمەنگوای)ە لە لایەن (گابرێل گارسیا مارکیز)ەوە، لە وتارێکدا بەناونیشانی (مامۆستا هەمەنگوای) نووسەری بێ هاوتای سەدەی بیست.

(ئێرنست میلر هەمەنگوای)(١) نووسەری گەورەی ئەمریکی لە ساڵی ١٨٩٩ لە (ئوک پارک)(٢) دەوروبەری شیکاگۆ لە ویلایەتی (ئیلینویز) هاتۆتەدنیاوە، باوکی هەمەنگوای پزیشک و دایکی مۆسیقار و وێنەکێش بووە، ئەو لە منداڵیدا لەتەک باوکیدا دەچوو بۆ راوکردن و ماسی گرتن لە نزیک دەریاچەی (میشیگان) کە لەو نزیکانە نیشتەجێ بوون، هەر لەبەر ئەم هۆیە لەم بوارەدا کارامە و لێهاتوو بوو بەهۆی ئەو نا ئارامییە رۆحییەوە کە هەیبوو خوێندنی دواناوەندی تەواو نەکرد، بۆیە تا کۆتایی ساڵی دووەمی دواناوەندی بەردەوام بوو.

لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەمداو کاتێک لەتەمەنی هەژدە ساڵیدا بوو خۆبەخشانە پەیوەندی کرد بەیەکەی گواستنەوەی بریندارەکانی جەنگ لە ئیتالیا، دواتر چووە یەکەی تۆپخانەو لەوێ بەسەختی بریندار بوو، ماوەی یەک ساڵ لە خەستەخانە مایەوەو دوای ئەوە مەدالیای زیوینی جەنگی لە وڵاتی ئیتالیا و نیشانەی شانازی لە دەوڵەتی ئەمریکا وەرگرت.

دوای جەنگ وەک هەواڵنێر لە رۆژنامەی (کانزاسی سیتی ستار)(٣) دەست بەکار بوو، ئەمەش دواتر بوو بە هۆی ئەوەی کە هەمەنگوای سوودێکی زۆر لە پەخشان و هونەری رۆژنامەگەری وەربگرێت لە بەرهەمەکانیدا هەروەها شێوەی تایبەتی خۆی لە وێنەکێشاندا لەسەر ئەم بنەمایە بنیات بنێت. دواتر لە ساڵی (١٩٢١)دا رووی کردە پاریس و لەوێ ئاشنا بوو بە کۆمەڵێک نووسەری وەک (گرترو داستاین،

• هەمەنگوای لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانی وەک هەواڵنێر لە رۆژنامەی (کانزاسی سیتی ستار) دەست بەکاربوو و سوودێکی زۆری لە پەخشان و هونەری رۆژنامەگەری بۆ بەرهەمەکانی وەرگرت

کارلوس ویلیامز، شرووود ندرسن، ئەزراپاوند). بارودۆخی ئەو کاتەی پاریس بە جۆرێک لە پایتەختی ئەدەب و هونەری جیهان دادەنراو هەڵس و کەوتی لەگەڵ گەورەترین نووسەران و هونەرمەندانی جیهان کاریگەریەکی زۆری لەسەر هەمەنگوای بەجێهێشت. هەمەنگوای لەبارەی ئەو ساڵانەی لە پاریس بەسەری بردووە دەڵێت، ئەگەر بەخت یاوەرت بێت و لە گەنجیدا لە پاریس ژیابیت، تەمەنی دواترت لە هەر کوێیەک بەسەر بەریت، بە دڵی خۆت دەبێت، چونکە پاریس جەژنێکی بێ کۆتاییە) هەمەنگوای وەک زۆرێک لە نووسەرە گەورەکانی دی ماوەیەک دەستی دایە شیعر نووسین و لە ساڵی (١٩٢٣)دا کۆمەڵێک شیعری لە گۆڤاری (پیۆتری)(٤)دا بە چاپ گەیاند، بەڵام زۆر سەرکەوتوو نەبوو. دواتر یەکەمین کتێبی بەناونیشانی (سێ چیرۆک و دە شیعر)(٥) لەهەمان ساڵدا لە پاریس بڵاوکردەوە. دووەم بەرهەمی ساڵێک دواتر بە ناونیشانی ( لەکاتی ئێمەدا)(٦) لە فەرەنسا بڵاو بوویەوە. ئەم کتێبە لە پانزە چیرۆکی کورت پێک هاتبوو کە زۆربەیان لە رۆژنامەکاندا بڵاو کرابوونەوە. پاڵەوانی ئەم چیرۆکانە کەسێک بوو بەناوی (نیک ئادامز)(٧) کە زۆر لە خودی هەمەنگوای دەچێت. هەمەنگوای لە تەمەنی لاوێتیدا لە (کانزای سیتی) رەفتاری توند و تیژی هەندێک لە گەورەکانی بەرانبەر منداڵان دیتبوو. ئەو ژینگەیەی ئەوی تێدا دەژیا پڕ بوو لە کەسانی خراپکارو لادەر، کە ئەمەش کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەسەر بەرهەمەکانی هەمەنگوای.

(نیک ئادامز) پاڵەوانی کۆمەڵە چیرۆکی (لەکاتی ئێمەدا)وەسفی ئەم توندوتیژیانە دەکات، ئەمە بووە بابەتێک کە لەبەرهەمەکانی دی هەمەنگوایدا بەردەوام بووە.

لە ساڵی (١٩٢٦)دا یەکەمین رۆمانی هەمەنگوای بە ناونیشانی (لافاوەکانی بەهار)(٨) بڵاو بوویەوە کە بە بەرهەمێکی گرنگ دانانرێت. بەڵام لە هەمان ساڵدا یەکێک لە باشترین رۆمانەکانی هەمەنگوای کە لە راستیدا بە یەکەمین بەرهەمی گەورەی ئەو دادەنرێت بەناونیشانی (خۆر هەردەم ئەدرەوشێتەوە)(٩) بڵاو بوویەوەو بوو بە سەرەتای دەست پێکردنی ناوبانگی. ئەم رۆمانە دەربارەی ژیانی ئەو ژن و پیاوانەیە کە لە دوای جەنگ لە ئەمەریکاوە پەنایان هێنابوو بۆ ئەوروپا بە تایبەت فەرەنسا. کەسانێک کە بەهۆی کاریگەری شەڕەوە دووچاری نارەحەتی گیانی جەستەیی زۆر بوو بوون و لە ئەنجامدا ژیانێکی بێ سەروبەریان دەگوزەراند. پاڵەوانی رۆمانەکە ئافرەتێکە کە عاشقی (کاوبۆی)یەکەو بە ناچاری وازی لێ دێنێت تاکو پیاوەکە تووشی نارەحەتی نەبێت. ساڵێک دواتر هەمەنگوای (پیاوە بێ ژنەکان)(١٠)ی بڵاو کردەوەو و لە ساڵی (١٩٢٩)دا یەکێکی دیکەی لە شاکارەکانی بڵاوکردەوە بە ناونیشانی (خودا حافیزیی لە چەک)(١١)، ئەم رۆمانە لە راستیدا ئەزموون و بەرهەمی ئەو شتانەیە کە هەمەنگوای لە جەنگی جیهانی یەکەمدا لە ئیتاڵیا بینویەتی. ئەویش دەربارەی ئەفسەرێکی ئەمەریکی بووە بەناوی (فردریک هنری)(١٢) کە لە شەڕێکی بێ مانادا گرفتار بووە، ئەو لە تەک پەرستارێکدا بەناوی (کاترین برکلی)(١٣) ئاشنایی پەیدادەکات و پێکەوە هەڵدێن بۆ سویسرا. سەرەنجام (کاترین) لە کاتی منداڵ بووندا دەمرێت (فردریک) نائومێد دەبێت. ئەم رۆمانە پێشوازییەکی زۆری لێ دەکرێت، بەڵام دواتر تاکو چەند ساڵێک هەمەنگوای نەیتوانی ئاوها سەرکەوتنێک بەدەست بێنێت. بەرهەمەکانی دواتری تاکو بیست ساڵێک لەژێر کاریگەری و شۆڕەت و خۆشەویستی (خودا حافیزیی لە چەک)دا مانەوە.

لە ساڵی (١٩٣٢)دا هەمەنگوای (مەرگ لە دوانیوەڕۆدا) بڵاودەکاتەوە لەم رۆمانەدا هەمەنگوای بە شێوەی کەسی یەکەمی تاک قسە دەکات و ستایشی (کاوبۆی) یەک دەکات، وەسفێکی وردو هونەری دیمەنی پێشبڕکێیەکی (گا) بەشێوەی نمایشێکی پڕ شکۆ و پیرۆز، بیروباوەڕی فەلسەفی هەمەنگوای دەخاتە روو. ململانێ لەنێوان مرۆڤ و گادا لە دیدی هەمەنگوایدا وێنەیەک لە ژیانی مرۆڤ دەخاتە پێش چاو. هەریەک لە دوو لایەنی ململانێیەکە لە هەوڵی مەرگی بەرانبەرەکەیدایە، تەنها شتێک دەبێتە هۆی سەرکەوتنی مرۆڤ ئەوەیە کە مرۆڤ هیچ جووڵەیەک بەبێ هۆ ناکات لە کاتێکدا کە گا کوێرانە دەجەنگێت، لە ساڵی (١٩٣٣)دا کۆمەڵە چیرۆکی (براوەپشکی نییە) بڵاو دەکاتەوە، لە ساڵی (١٩٣٧)دا کۆمەڵە چیرۆکی (بوون و نەبوون) بڵاو دەکاتەوە بەڵام پێشوازییەکی ئەو تۆی لێ ناکرێت. لە هەمان ساڵدا (بەرزاییە سەوزەکانی ئەفریقا)

**• زەنگەکان بۆکێ لێدەدرێن ئاڵۆزترین و درێژترین رۆمانی هەمەنگوایە و لەشەڕی ناوخۆی ئیسپانیا دەدوێ**

بڵاودەکاتەوە کە لە راستیدا بەرهەمێ گەشتی (هەمەنگوای)ە بۆ ئەفریقا، هەروەها دوو بەرهەمی دواتری بەناوی (بەفرەکانی کلیما نجارو) و ژیانی کورت و خۆشی و فرانسیس مکومبر لە هەمان بارودۆخی بەرهەمەکانی پێشوتریدابوون.
لە ساڵی (١٩٣٨)دا شانۆنامەی (ستونی پێنجەم)ی بەناوەرۆکێکی سیاسییەوە بە چاپ گەیاند، دوای ئەوەش لە ساڵی (١٩٤٠)دا (زەنگەکان بۆ کێ لێدەدرێن؟) بڵاو دەکاتەوە، کە ئاڵۆزترین و درێژترین رۆمانی (هەمەنگوای)ە. بابەتی ئەم رۆمانە شەڕی ناوخۆی ئیسپانیا و ململانێی کۆماری خوازەکان لە تەک هەوادارانی ژەنەراڵ (فرانکو) دیکتاتۆری رژێمی ئیسپانیا. پاڵەوانی رۆمانەکە مامۆستایەکی ئەمریکییە کە لە ئیسپانیا پەیوەندی دەکات بە کۆماری خوازەکانەوە و لەم پێناوەدا گیانی بەخت دەکات.
دوای ئەم رۆمانە هەمەنگوای نزیکەی دەساڵێک هیچ بەرهەمێکی بڵاو نەکردەوەو کاتێک لە ساڵی (١٩٥٠)دا (پەڕینەوە لە رووبارو جەنگەڵ)ی بڵاوکردەوە سەرکەوتنێکی کەمتری لە بەرهەمەکانی پێشوی بە دەست هێنا. وا دەهاتە پێش چاو (هەمەنگوای) توانای رابردووی خۆی لە نووسیندا لە دەست دابێت و بەرەو دواوە چووبێت. چەند ساڵێک تێپەڕی هیچ بەرهەمێکی سەرکەوتوی بەرهەم نەهێنا، بەڵام لە ساڵی (١٩٥٢)داو بە چاپ گەیاندنی (پیرەمێرد و دەریا) بەتەواوی ئەو لاپەڕەیە هەڵدەدرێتەوە، پێشوازی لەم رۆمانە رۆژ لەدوای رۆژ لە زیادبوندا بوو تا دەگاتە ئەوەی لە ساڵی (١٩٥٣)دا خەڵاتی (پولیتزر) پێشکەش بە هەمەنگوای دەکرێت. ئەم رۆمانە بوو لە ساڵی (١٩٥٤)دا هەمەنگوای) گەیاندە چڵەپۆپەی شانازی و خەڵاتی نۆبڵی بە نسیب کرد. پاڵەوانی رۆمانەکە (سانتیاگو) پیرەمێردێکی کوبایییە کە زۆر لە خودی هەمەنگوای دەچێت، کە ئیتر لەوەودوا بە (پاپا هەمەنگوای) ناویان دەبرد. هەروەک خودی هەمەنگوای کە چەند ساڵێکی زۆر هیچ سەرکەوتنێکی ئەدەبی بەدەست نەهێنابوو، (سانتیاگو)ی پیر ماوەی (٨٤) رۆژ بەدەستی خاڵی لە راوەماسی دەگەڕێتەوە. دوای ئەوە بەبێ هاوڕێ و بە تەنهایی روودەکاتە دەریا و ماسییەکی گەورە دەگرێت. شەڕ لەنێوان پیرەمێرد و ماسیە گەورەکەدا سێ رۆژ درێژە دەکێشێت، سەرەنجام پیرەمێرد ماسییەکە کێش دەکات بۆ کەنار دەریا، بەڵام لەو کاتەدا قرشەکان هێرش دەکەنە سەر ماسییەکە و لەناوی دەبەن، ئەوەی کە بۆ پیرەمێرد بەجێ دەمێنێت تەنیا ئێسقانی ماسییەکەیە.

**• رۆمانی پیرەمێرد و دەریا هەمەنگوای گەیاندە چڵەپۆپەو خەڵاتی نۆبڵی بەنسیب کرد**

به پێچەوانەی زۆربەی ئەو لێکدانەوانەی کە رەخنەگران کردویانە بۆ ئەم رۆمانە و هەروەها بە پێچەوانەی ئەو لێکدەرەوانەی بە شێوەیەکی (تمثیلی) رەفتاریان لەگەڵ ئەم رۆمانەدا کردووە، هەمەنگوای خۆی لە بارەیەوە دەڵێت (من هەوڵم داوە پیرەمێردێکی واقیعی، کوڕێکی واقیعی، دەریایەکی واقیعی، ماسییەکی واقیعی و قرشی واقیعی بخوڵقێنم) ئەکادیمیای نۆبڵی سوید، تەواوکردنی رەوشتێک کە لەنێو رۆمان نووسەکانی ئەو سەردەمەدا باو بوو، وەک هۆکاری بەخشینی ئەو خەڵاتەی بە هەمەنگوای دەست نیشان کرد. رەوشی نووسینی هەمەنگوای زۆر سادەیە، رستەی کورت بەکاردەهێنێت و، زیادەکات لا دەبات، شێوەی گێڕانەوەی زۆر لە شێوەی راپۆرتە هەواڵ دەچێت، هەروەها سوود وەرگرتن لە زمانی گفتوگۆی رۆژانە و، هەڵبژاردنی ناوەڕۆکی سادەو بەرجەستە و سەرنج راکێش، نیشان دانانی زۆر لە دەقدا و راڤەی گێڕانەوە بە شێوەیەکی تەواو واقیعی لە تایبەتمەندییەکانی دیکەی بەرهەمی هەمەنگوایدا هەن.دوای (پیرەمێرد و دەریا) هەمەنگوای هیچ بەرهەمێکی گەورەی بەئەنجام نەگەیاندووە، بەڵام لە ساڵی (١٩٥٨)دا یادداشتەکانی خۆی لەسەردەمی نیشتەجێ بوونی لە پاریس نووسیەوەو لە ساڵی ١٩٦٠دا تەواوی کرد. ئەم بەرهەمە کە لە راستیدا بریتییە لە پێنج ساڵ ژیانی هەمەنگوای بە قەڵەمی خۆی، بۆ ئارەزومەندانی زۆر سەرنج راکێشەو لە ئێرانیش لەلایەن (فەرهاد غبرایی) و لە ژێر ناونیشانی (جشن بیکران) وەرگێڕدراوەتە سەرزمانی فارسی و بڵاو کراوەتەوە.

هەمەنگوای مرۆڤێکی بێ ئارام بوو، لە ماوەی تەمەنیدا هەریەک لە (هەرمی ریچاریدسون، پۆلین فایفر، مارتا گلهورن)ی یەک لە دوای یەک بە هاوسەر گرتووەو دوایش لێیان جیابۆتەوە. دوایین هاوسەری بەناوی (ماری وش) بوو.

هەمەنگوای جارێک لەساڵی (١٩٥٤)دا لە هاڤانای پایتەختی کوبا نیشتەجێ بووەو بەڵام رژێمی کاسترۆ دەریکردوە، ئەوەی جێگەی ئاماژە پێکردنە ئەوەیە کە کاسترۆ بە (مامۆستا) ناوی

دەبرد .

(گابریل گارسیا مارکیز) ئەم یادگارییە لە فیدل کاسترۆوە دەربارەی هەمەنگوای دەگێڕێتەوە (چەند ساڵ لەمەوپێش، لەناو ئۆتۆمبیلەکەی کاسترۆدا دانیشتبووم کتێبێکی بچوکی بەرگ سوورم بینی، کاسترۆ گوتی : (بەرهەمی مامۆستا هەمەنگوای)ە. بەڕاستی هەمەنگوای چەندەها ساڵ دوای مەرگیشی هەمیشە لەو جێگایە کە کەمتر لە هەرجێیەک چاوەڕوانی دەکرێت، رۆشتوو لە هەمان کاتدا ئامادە، وەک ئەو بەیانییەی کە لە شەقامی (سن میشل)دا(١٤) خودا حافیزی لێ کردم) هەمەنگوای لە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنیدا دووچاری بیرچوونەوەو نارەحەتییەکی توند بوو بوو ، تاکو سەرەنجام لە ١٩٦١/٦/٢دا لە خانوەکەی خۆیدا بەفیشەکێک گیانی لە دەستدا، هەندێک پێیان وابوو کە خۆی کوشتوەو هەندێکیش وای بۆ دەچوون کە رێکەوت بووە. بەڵام هەمووان لە مەرگی ئەو نارەحەت و بێتاقەت بوون. ئەمەی خواردوە کورتەیەک لەو گفتوگۆیەی رەخنەگری ئەمریکی جۆرج پلیمون(١٥). لە ئاداری ساڵی ١٩٥٤دا لە مەدرید لە تەک هەمەنگوایدا ئەنجامی داوە: (١٦)

**• ئایا چێژ وەردەگریت لەو کاتانەی کە لە نووسیندا بەسەری دەبەیت؟**

-زۆر

**• چ کاتێک کار دەکەیت؟ ئایا بەرنامەیەکی دیاریکراو و رێکخراوت هەیە؟**

- کاتێک لە چیرۆک یان کتێبێکدا کار دەکەم هەموو رۆژێک سەر لەبەیانی دەست پێ دەکەم. لەم کاتانەدا کەس نیە بێ تاقەتم بکات. هەوا فێنک یان ساردەو مرۆڤ دەتوانێت بە نووسین خۆی گەرم بکاتەوە. سەرەتا ئەودی نووسیومە دیخوێنمەوە، لەوێوە کە هەمیشە لە شوێنێکدا رادەوەستم کە دەزانم دوای چی روودەدات، دەست پێ دەکەم. ئەوەندە دەنووسم کە هێشتا توانای نووسینم ماوەو دەزانم دواتر چی روو دەدات، لێرەدا دەوەستم تاکو سبەینێ چاوەڕێ دەکەم تاکو ئەوەی کە ماوە درێژەی پێ بدەم. بۆ نمونە ئەگەر لە سەعات (٦) بەیانییەوە دەستم پێ کردبێت، هەندێک جار تا نیوەڕۆ بەردەوام دەبم و هەندێ جار زووتر دەست هەڵدەگرم. کاتێک تەواو دەبم ئەوەندەی مێشکم خاڵی بۆتەوە لە حاڵەتی پڕ بوونەوەدا دەبینم. ئیدی هیچ شتێک نیە ئازارم بدات، هیچ شتێک مانایەکی تایبەتی نیە تا سبەینێ کە دەست دەکەمەوە بەکارکردن. چاوەڕێ کردن تا سبەینێ نارەحەتە بەلامەوە.

**• رۆژی دوایی کاتێک ئەو بەشەی پێشتر دەخوێنیەوە، دەستکاری دەکەیت یان وازی لێ دەهێنیت بۆ دوای تەواو بوونی بەرهەمەکەت؟**

- من هەمیشە دەستکاری کاردکانم دەکەم، کاتێکیش کە بەرهەمەکە تەواو دەبێت ئاساییە کە جارێکی دی دەیخوێنمەوە، کاتێکیش چاپ دەکرێت یەک بوار هەیە کە چاککارییەک لەم تێکستە چاپ کراوەدا بکەم، دواین بوار کاتێک کە نوسخەی چاپخانە دەخوێنمەوە، لەم هەموو بوارو شانسە رازی و خۆشحاڵم.

**• تا چ رادەیەک دووبارە نووسی دەکەیتەوە؟**

- دەگۆڕێت، دواین لاپەڕەی (خوداحافیزی لە چەک)م سی ونۆ جار گۆڕیم تاکو رازی بووم.

**• ئایا قەت روو دەدات کە ئیلهامی نووسینت نەبێت؟**

- بۆچی نەء، بەڵام ئەگەر لە شوێنێکدا دەست هەڵگریت کە بتوانیت بەردەوام بیت گرفتەکە چارەسەر دەبێت، هەر کە دەستت کرد بە نووسین ئیتر هیچ گرفتێکت نابێت.

**• ئێوە جارێک بەمنتان گوت کە تەنها کاتێک دەتوانیت باش بنووسیت کە عاشق بیت. دەتوانیت تۆزێک زیاتر ئەم بابەتە روون بکەیتەوە.**

- پرسیارێکی سەیرە، بەهەر حاڵ هەوڵدەدەم وەڵامی بدەمەوە. هەر کاتێک کە خەڵکی واز لە مرۆڤ بهێنن. نارەحەتی نەکەن دەکرێت بنووسێت، تەنانەت ئەگەر بە ئەندازەی پێویست نارەحەت بیت هەر دەکرێت بنووسیت، بەڵام باشترین بەرهەم کاتێک دەخولقێنرێت کە مرۆڤ عاشق بێت. ئەگەر بەلاتانەوە ئاسایی بێت لەوە زیاتر نامەوێت بابەتەکە بکەمەوە

**• بە بۆچوونی تۆ باشترین پێشەنگی رۆشنبیری بۆ نووسەرێکی گەنج چییە؟**

- باشترە بڵێم ئەگەر نووسین بە دژوارو زەحمەت دەزانێت بچێت خۆی لەدار بدات، دوایی بێ هەست کردن بە بەزەیی خۆی لە هەموو شتێک دابڕێت و قاچەکانی بشکێنێت و دانیشێت بنووسێت. بۆ دەست بەکاربوون ئەو خۆ لە داردانە دەتوانێت یارمەتی دەری بێت.

1- Ernist Miller Heming way.
2- Oak- Park.
3- Kansus city star.
4- Poetry.
5- Three Stories and ten Poems.
6- In our time.
7- Nick Adams.
8- Torrents of Spring.
9- The Sun also Rises.
10- Men without women.
11- A Farewell to Arms
12- Fredrick Henry.
13- Catherine Barkley.
14- Death in the A fternoon.
15- Geirgo Plimpton
١٦- ده گفتوگو، ترجمه أحمد پوری، نشر چشمه ١٣٦٩

# باسێکی گشتی سەبارەت بە چیرۆکنووسی

ن: مەحمود حەکیمی
لەفارسییەوە: ئەحمەد رەحمانی
کوردستانی ئێران

**چارلز دیکنز لەچیرۆکی (دووشار) بەهونەرمەندییەوە باسی تێکچوونی بنەمای کۆمەڵگایەک دەکات کە ژێر دەستەیە.**

چیرۆکنووسی هونەرێکە کە کاریگەری کۆمەڵایەتی ئەو نینکار ناکرێ، چیرۆکی باش یان خراپ کاریگەرە لەسەر روحیەی خوێنەرو رێگایەکی تازە نیشانی ئەو دەدات.

خوێنەری چیرۆک بێ شک دەکەوێتە ژێر تەوژمی دەوروبەری چیرۆک و بیروڕای نووسەر کە بەشێوەی ناڕاستەوخۆ لەزمانی پاڵەوانەکانی چیرۆک بەیان کراوە و پەسندی دەکات، یان لەوانەیە لەبارەی ئەوانەوە بیربکاتەوە.

بۆ زیاتر ناسینی کاریگەری کۆمەڵایەتی چیرۆک چەند باشە کە بگەرێینەوە بۆ مێژوو، چارلزدی کنز نووسەری بەناوبانگی ئینگلیزی لەبەرهەمە بەناو بانگەکەی خۆی چیرۆکی (دووشار) بەهونەرمەندییەکی تەواوە، باسی، هەژاری، بێ ئەوایی، برسیەتی خەڵکی فەرەنسە دەکات.

چارلزدیکنز بەهونەرمەندییەوە نیشان دەدات کە ماڵ و سامانی زۆری نەجیب زادەو خانەدانەکان، چەندە رقوکینەو بێزاری لەدڵی مرۆڤێکی بێ بەشدا پێک دێنێ.

رەنگە هیچ دەوڵەمەندێکی فەرەنسەیی نەیزانیبێ کە لە روحی مرۆڤێکی بێچارە کاتێک بەپێش ماڵە خۆشەکەی ئەودا تێدەپەڕێ چ شەپۆلێکی رقوکینە پێک دەهات، بەڵام دیکنز لە چیرۆکی خۆیدا، باسی ئەم شتە دەکات.

چارلزدیکنز لەچیرۆکی (دوو شار) بەهونەرمەندییەوە باسی تێکچوونی بنەمای کۆمەڵگایەک دەکات کە ژێر دەستەیە، ئەو باسی راستییەک دەکات کە لەساڵی ١٧٧٥ زایینی لەدوو شاری پاریس و لەندەن روویان داوە.

لەو تێدەپەڕین، چیرۆکی پڕ لەجۆش و خرۆشی (بیرەوەریەکانی ماڵی مردووان)ی دوستۆیێڤسکی دەخوێنینەوە، دوستۆیێڤسکی بەڵێهاتووییەوە باسی یەکێک لەبەندیخانەکانی حکومەتی روسیەی تەزاری لەسیبریا بۆ خوێنەر دەکات، بەشێوەیەک کە خوێنەر تەنیایی بەندییەکان و غەم و خەفەتە بێ کۆتاییەکانیان بەهەموو وجودییەوە هەست پێدەکات، ئەو بەندیانەی کە هەر رۆژێ بەکێشانی جغزێک لەسەر دیوار، ژمارەی ئەو رۆژانەی کە هەر ئاوا دەبێت لەبەندیخانە بمێننەوە دەژمێرن و ئەو بەندییانەی کە بۆ دەهەزارەمین جار میللەکانی دەوروبەری بەندیخانەیان ژماردووە ئەو بێ چارانەی کە بۆ ڕاکردن لەکاری قورس و بەزۆری خۆیان نەخۆش کردووە، تاکو بڕۆنە نەخۆشخانە پیسەکەی بەندیخانە.



دوستۆیێڤسکی لە (بیرەوەریەکانی ماڵی مردووان) بەپێنووسی خۆی... خوێنەر دەباتە نێو قووڵایی روحی بەندییەکان، روحی ئەو رۆشنبیرانەی کە لەبەر بەربەرەکانی لەگەڵ حکومەتی روسیەی تەزاری دورخراونەتەوە، بۆ سیبریاو روحی ئەو مرۆڤە بێ ئەوایانەی کە لەبەر هیچ و تەنیا لەبەر هەڵەیەکی بچووکی کاربەدەستی بۆ بەندیخانە بردراون.

هەژاری لەچیرۆکی (تیردروزان) بەشێوەیەک بوو کە رەخنەگری بەناوبانگ «بلینسکی» گوتی: (من ئەو کتێبەم لەکۆبوونەوەیەکدا، ئەویش لەحاڵێکدا کە فرمێسک لەچاوەکانم دەهاتنە خوار خوێندەوە).

وەرگێڕی کتێبی (خاطرات خانه مردگان) لەپێشەکی ئەودا نووسی:

(بڵاوبوونەوەی ئەو کتێبە، کاریگەریەکی گەورەی کردە سەر بارودۆخی بەندیخانەکانی روسیە، ئەشکەنجەکانی گیانی کە تاوانباران دەیانکرد دەرکەوت، دوستۆیێڤسکی لەپەراوێزی کتێبەکەی خۆشی ئیشارەی بەو ناوەرۆکە کردووە).

(سالتیکون سچدرین) لەچیرۆکی (میراتی شووم) بەهونەرمەندییەوە باسی چینی نەجیب و دەوڵەمەندەکانی ئەوکات دەکات بەشێوەیەک کە خوێنەر ئاوات دەخوازێ، خۆزگە دەیتوانی پێ بنێتە نێو مەیدانی چیرۆکەکە تف بکاتە رووی ئەو ژنە خانەدانە کە بەچاوێکی سووک سەیری رەعیەت و نۆکەرەکانی خۆی دەکرد.

(ئیلینا تسیوسیلونە) لەچیرۆکی (فانتومارا) باسی گوندێک دەکات لەئیتالیا، کە لەسەر ئەو خاکی مەرگ چێنراوەو دێهاتیەکان لەتوندوتیژی ئەو چەوسانەوەیە تووشی مەرگی هەمیشەیی بوون.

ئەو چیرۆکانە هەموویان باسی راستی ژیانی خەڵکن لەم روەوەیە کە لەڕیزی چیرۆکە ریالیستەکانن، بەڵام ئایا ئازاری بنەڕەتی خەڵکی رۆژ رەشی گوندی (فانتوراما) تەنیا نان بوو، ئایا ئەو خەڵکە رۆژ رەشە جگە لەمەسەلەی نان پێویستییان بەبروایەکی راست نەبوو، کە بەبوونی ئەو رێگەی بەرەو پێشچوونی خۆیان بپێون؟ ئەوە پرسیارێکە کە پاشان وەڵامی دەدەمەوە، بەڵام لێرەدا دەمویست بڵێم کە کاریگەری ئەو چیرۆکانە لەکۆمەڵگادا زۆربوو، بەوجۆرە کە بوو بەهۆی هەرەس هێنانی سیستەمە دژە مرۆییەکان.

لەروسیەو ئەوروپا، نووسەرە گەورەکان، بناخەی جیهانی کۆنیان روخاند، بەڵام دەبێ بپرسرێ کە لەسەر وێرانەکانی جیهانی پڕ لەزوڵم و چەوسانەوەی کۆمەڵگای

دەرەبەگایەتی چ شتێک دروست کرا، (ئارنۆلد توین بی) مێژوونووسی بەناوبانگ دەڵێت:

(پاش هەردس هێنانی بنەمای جیهانی کۆن، مرۆڤ کەوتە شوێن ڕێگا چارەیەکی زۆر، بەڵام هەموو ئەوانە ڕێگا چارەیەک بوون خواوەندی لێ دەرکەی لەئەنجامدا بەڵای تازەمان تووش بوون.

هەر ئەو مێژوونووسە لەوتاری خۆی بەناوی (دەرسی مێژوو بۆ مرۆڤی ئەمڕۆ)دا دەڵێت:

ترلژیدیای دیکەی سەردەمی ئێمە ئەوەیە کە خواوەندمان لەژیانی خۆماندا وەلاناوەو ئەوکات دەمانەوێت ئەخۆشییەکۆمەلایەتییەکانی خۆمان چارەسەر بکەین. جولانەوەی پرۆتستان بووە هۆی دروست بوونی و ڕێنیسانس، بەڵام بەداخەوە لەسەردەمی ڕێنیسانسدا، زۆر لەنووسەران بەبینینی وەزعی کلیسا هەولیاندا کە خواوەندو ئایین لەژیانی مرۆڤ وەلانێن، ئەوەش ڕووداوێک بوو، لەبەرئەوەی مرۆڤایەتی ڕووبەڕووی مەترسی نازیەت و فاشیەت کرد.

(ئەریش ماریا مارک) لەچیرۆکێکی خۆی بەناوی (لەرۆژئاوا هەواڵێک نییە) باسی ڕووداوەکانی شەڕ بەتەواوی دەکات، خوێنەر زوو تێدەگات کە ڕێگا چارەکان بێ بڕوابوون بەخواوەند چۆن لەگەڵ تێکشکان ڕووبەڕوو دەبن، لەروسیەش بەم شێوەیە بوو، دوستۆیێفسکی و نووسەرەکانی دیکەی وەک (سالنیکوف سچدرن) کارو کردەوە خراپەکانی کۆمەڵی تەزاریان نیشاندا، خەڵکی یەکیەتی سۆڤیەت بەخوێندنەوەی ئەو بەرهەمانە، وەئاگا هاتنەوەو بناغەی جیهانی کۆنیان هەرەس پێهێنا، بەڵام دەبێ بپرسێ چ شتێکی تازە شوێنی وێرانەکانی گرتەوە.

بەداخەوە کۆمەڵی نوێ کە لەسەر وێرانەکان بنیات نرا، بەتەواوی حاشای لەبوونی خواوەند دەکرد ئەوەش کارەساتێک بوو، ئەنجامی ئەوەبوو کە نزیکەی سەد ساڵ پاش بڵاوبوونەوەی کتێبی (بیرەوەریەکانی ماڵی مردووان) کە ڕەخنەگرتن بوو لەبنیادەکانی روسیەی تەزاری، نووسەرێکی دیکە بەناوی (سولژنیتسین) لەدڵی کۆمەڵێکدا کە پڕوپاگەندەی ئەوەی دەکرد کە لەشوێنی وێرانەکانی جیهان، جیهانێکی نوێ بنیات نراوەتەوە لەگۆڤاری (جیهانی نوێ) چاپی مۆسکۆ، چیرۆکی (رۆژێک لەژیانی ئیوان و نیسوویچ شوخوف)ی بڵاوکردەوە، ئەو چیرۆکەش کە بەرهەمی تاقیکاریەکانی (سولژنیتسین) لەبارەی بەندیخانەی روسیەی ئستالینی بوو، لەڕاستیدا پرۆپاگەندیەک بوو دژی کۆمەڵێک کە خواوەندی لەژیانیدا وەلانابوو و پروپاگەندیەک بوو دژی، ئیدیۆلۆژییەک کە خۆی بەرزگارکەری مرۆڤایەتی دەزانی.

لەپێشەکی چیرۆکی (ماڵی ماتریونا) لەباسی حاڵی سولژنیتسین دەخوێنینەوە:

(لەچیرۆکی رۆژێک لەژیانی شوخوف) سولژنیتسین ئەیدەویست کە بەبەرهەمەکەی خوێنەر بجوڵێنێ و تووشی جۆش و خرۆشی ساختەیی بکات.

سولژنیتسین واقعیەتی بەوپەڕی ساویلکەییەوە دەربڕی بوو، لەو نواندنە ساویلکەیەدا هەندێک سودی لەشێوەی (تەنز) وەرگرتبوو.

(پاڵەوانی چیرۆکی، ئیوان دنیسوویچ شوخوف) جوتیارێکی روسیە کە لەهەمان کاتدا زۆر زیرەک و تێگەیشتووە، لەماوەی شەڕی دووهەمی جیهانی، ئەو ناوچەیە کە ئەو تێیدا دەژیا، دەورەی دەگیرێ و دەبێتە دیلی ئەڵمانیەکان، پاش ماوەیەک، لەو ئۆردوگایەی کە لەوێدا، دیل بوو رادەکات و بۆ لای سنورەکانی روسیە دەگەڕێتەوە، بەڵام لەوێ لەلایەن هاوڵاتیەکانی واتە روسیەکان، بەتاوانی سیخوڕی دەگیرێت و بۆ ماوەی هەشت ساڵ کاری زۆرەملێ لەئۆردوگا حوکم دەدرێت، ئەو بەناچاری ئەو زۆرە ملێیە قبوڵ دەکات تەنیا هەوڵ و تەقەلای ئەوەبوو کە زیندو بمێنێ، ئەو خۆراگرییە بۆ زیندومان و مانەوە، توخمی ئەسڵی لەچیرۆکی (رۆژێک لەژیانی چوخوف) پێکدێنێ، چەند وێک چوونێکی سەیر هەیە لەنێوان نووسراوەکانی دوستۆیێفسکی لە(بیرەوەریەکانی ماڵی مردووان)و چیرۆکی سولژنیتسین لە (رۆژێک لەژیانی شوخوف).

دووبارە ڕیزبوونی بەندیەکان، لێک بڵاوکردنی بەردە سەهۆڵییەکان، کارەبایەک بۆ دروستکردنی دیوارەکان و بن میچی ئوردوگاکان ئامادەو ئامادەنەبوونی ماندووکەرو ژیان لەساڵۆنە ساردەکانی بەندیخانە، بەکورتی هەردوو نووسەر کەوتونەتە تاوانبارکردنی بنیادە فکرییەکانی کۆمەڵی خۆیان و هەستاون بەپارێزگاریکردن لەمرۆڤایەتی، بەو جیاوازییە کە دوستۆیێفسکی پڕۆپاگەندەکەی دژی کۆمەڵگەی روسی دەنووسێ و سولژنیتسین دژی کۆمەڵگەی کۆمەنیستی.

بۆچی؟

لەبەرئەوەی کۆمەڵگای روسیەی تەزاری و ئەو کۆمەڵگەیەی کە سولژنیتسین تێیدا دەژیا خودا یا لەژیانیاندا وەلانابوو.

هەڵبەتە لەروسیەی تەزاری، کلیسا بەتوندی خەریکی چالاکی بوو، زەنگەکان لێ دەدران، قەشەکان قەیان بۆ جوتیاران دەکرد ژن و پیاوەکان لەسەر سینگی خۆیان خاچیان دروست دەکردو ئینجیلیان دەخوێند، بەڵام لەگەڵ هەمووی ئەوانە، خودا لەسەر کۆمەڵ حاکم نەبوو لەبەرئەوەی کۆمەڵگا کەوتبووە نێو گێژاوی ریاکاری، چاپلوسی، درۆ، بەرتیل خواردن و خراپەکاری، ئەوانەی کە لەهەموویان زیاتر ئینجیلیان دەخوێند لەهەموویان زیاتر درۆیان دەکرد و زیاتر لەهەموویان سەروسامانی جوتیارانیان دەبرد، خودا لەکۆمەڵدا نەبوو، بەڵکو ریاکاری باوی هەبوو، ریاکاری و پەنابردنە بەر ئایین لەهەموو هۆیەک زیاتر کۆمەڵی بەرەو لەنێوچوون دەبرد.

سەرەڕای ئەوە من پێموایە کە مەبەستی نووسەر لەکردنەوەی نهێنی و گرێ، باسکردنی ئاڵۆزیەکانی کۆمەڵگا، ئەگەر پێکهێنانی کۆمەڵگایەک بێت لەسەر بنچینەی فەزیلەت و ڕەوشت، خزمەتێکی گەورەیە، ئەگەر تەنیا ڕەخنەگرتن بێت، چیرۆکنوس ئەیتوانیوە پەیامەکەی خۆی بەئەنجام بگەیەنێ.

• پاش هەرەس هێنانی بنەمای جیهانی کۆن، مرۆڤ کەوتە شوێن ڕێگا چارەیەکی زۆر.

**سەرچاوە:**
سخنی دربارۀ: ادبیات کودکان و نوجوانان

شارستانییە لەیاد کراوەکان

# وڵاتی میزۆپۆتامیا

عەبدولخالق قەرەداغی/
سلێمانی

وڵاتی میزۆپۆتامیا پێش ٦ هەزار ساڵ لەمەوبەر مرۆڤی تیا ژیاوەو کەوتۆتە نێوان روباری دیجلەوفوراتەوە. خاکی یەکەمین لانکەی شارستانی کۆنە، گریکەکان پێیان دەوت وڵاتی نێوان دووروبار یان (میزۆ پۆتامیا)، ئەمرۆش پێی دەڵێین عێراق، گەر لاپەڕەکانی مێژوو والا بکەین و بەناخی مێژوودا بچینە خوارەوە بەکۆمەڵێ رووداو ئاشنا دەبین. ساڵی ٥٨٦ پ.ز سوپای (نەبوخوذنەسر)ی پاشای بابلییەکان، پەلاماری قودسی پیرۆزیاندا، ئەمە واتە (٦) سەدە پێش لەدایک بوونی (عیسا) سڵاوی خوای لێ بێ، لەو کاتانەی کە هێشتا رۆما بیری لە دروست کردنی ئمپراتۆرەکەیان نەکردبۆوە، بەم شێوەیە بابلییەکان بەرەو پێش ملیان نا، ئاکام ١٠ هەزار کەس بەدیل گیراو رەوانەی بابل کرا، دیلەکان لە قودسەوە کەوتنەرێ و ٥٠٠ میل یان بڕی و بە ئوردن و سوریاو عێراقدا گوزەریان کرد تا گەیشتنە بابل، زۆربەی دیلەکان جولەکە بوون و بەم شێوەیە لە بابل دا مانەوە. (بریان فاغان)ی نووسەرو زانای شوێنەوار دەڵێ (ئەو کارەسات و رووداوانەی تۆمار کراون بەوشێوەیە نین کە دەقاو دەق راست بن، بەڵکو لەوە دەچێ زیاتر لە دەقی تەوراتەوە وەرگیرابن).

خاکی کۆنی بابلییەکان بنکەی بەناو (خواوەندی وەسەنییەکان) بووەو وڵاتی یەکێک لە کتێبە ئاسمانییەکان نەبووە، بەڵکو کەش و باری ناوچەکە زیاتر رێ خۆشکەر بووە بۆ خوێندنی تەورات، فاغان دەڵێ: (کە جولەکە دیل کراوەکان هاتنە بابل لە هەموو روویەکەوە لە خەڵکی بابل جیاواز بوون بۆیە هەندێکیان چونەسەر ئاینی بابلی و هەندێکی دیکەیان وەک خۆیان بە جولەکەیی مانەوە) جولەکەکان لە پەرستگایەکدا خۆیان بینییەوە کە پڕ بوو لە رەگەزو زمانی جیاواز، جگە لە بوونی کۆمەڵێ خواوەندو شەیتان و بەرەڵایییەکی بێ سەرو بن لەبەر ئەوە جولەکەکان وا تەوراتیان نووسیەوە کە لەگەڵ بەرژەوەندی خۆیاندا بگونجێ بەتایبەتی لەم کۆمەڵگە نوێیەدا، بە درێژایی (٣) نەوەی بابلییەکان نووسەرە جولەکەکان ئەفسانەو داستانیان تێکەڵ بە تەورات کردو هەر هەموویان لە کتێبێکدا کۆکردەوەو ناویان نا (تەوراتی سەردەم).

(فاغان) دەڵێ: (بابلییەکان رێیان بە جولەکەکان دا کە مومارەسەی کاری رۆشنبیری و کۆمەلایەتی و ئاینی خۆیان بکەن واتە رێیان لێ نەگرتن، هەر ئەمەش رێی بۆ سەر هەڵدانی تەوراتێکی دروست کراو خۆشکردو تا ئەمرۆش هەر ماوە)، بەڵام لە زۆر شوێندا کاریگەری رۆشنبیری بابلییەکانیان پێوە دیارە، ئەمەش دیارە بەهۆی ئاڵوگۆڕکردن و گۆڕینەوەی بیرو راکانەوە بووە، چونکە جولەکەکان نەیان دەتوانی وا بە ئاسانی ئەو شارستانییەتە گەورەیە واتە شارستانی بابلییەکان لە نووسینەکانیاندا فەرامۆش بکەن، بەتایبەتی تەلارو کۆشکەکانی، لەوانە کۆشکی (نەبوخوذنەسر)و باخچە هەڵواسراوەکانی، دەرگای عەشتار، ، هەموو ئەمانەش زەنگی گەورەترین شارستانی لێ دەدا کە کۆمەڵێ خەڵکی زۆرو بازاڕو کۆڵانی تەسکی لەخۆ گرتبوو، تەنانەت یەکێ لە کتێبە کۆنەکان دەڵێ (بەرزی هەڵچوونی بورجی بابل بۆ ماوەیەکی زۆر جێی تێڕامان و هەوارگەو مەڵبەندی حاجییەکان بووە)، یەکێ لە نووسەرەکان دەڵێ (بورجەکە لەناوچەیەکی چۆڵی بیاباندا دروست کراوەو پڕە لە مارو دوپشک لەبەر ئەوە هەموو کەس ناتوانێ بە ئاسانی سەردانی بکات).

بورجی بابل لە چاو وێنەی مێژووە کۆنەکەیدا لە رووی بەرزی و گەورەییەوە زۆر جیاوازە، پێش (١٥٠٠) ساڵ لەمەوبەر شوێنەواری ئەو بورجە دۆزرایەوە دوور لەشورای بابل، پاش ئەوەی زانای شوێنەواری ئەڵمانی (رۆبن ئۆردوەی) دەریخست و ژوورێکی کۆنی دۆزییەوەو بەردەوام بوو تا شوێنەواری بورجەکەشی دۆزییەوە... بەڵام گرنگترین شت تا ئێستا لە شارستانی بابلییەکان ما بێتەوە (یاساکانی بابلە)، بابلییەکان یەکەم

**بەرزی هەڵچوونی بورجی بابل بۆماوەیەکی زۆر جێی تێڕامان و هەوارگەو مەڵبەندی حاجییەکان بووە.**

کەسانێک بوون کە یاسایان دارشتووەو تا ئێستاش نەخشەکانی هەر ماوە بەردێک لە کۆتایی سەدەی (١٩)دا دۆزرایەوەو گرنگترین بەڵگەنامە یاساییەکانی لەسەر تۆمار کراوە، پێش (١٥٠٠) ساڵ لەمەوبەر یەکێ لەپاشاکانی بابل فەرمانی داوە کە یاساکان بنووسرێتەوە بەناوی (یاساکانی حامورابی).

حامورابی لە زۆربەی کارەکانیدا پشتی بەم یاسایانە بەستووە ئینجا پەیوەست بن بەمردنەوە یان بەژیانەوە، تەنانەت هەندێ لە داب و نەریتی ناوچەی بابل ئەمڕۆ وەک نەریتەکانی حامورابی وایەو پەیڕەو دەکرێت بۆ نموونە: یەکێ لە گەورەی هۆزێکی گوندی بابل بۆ ئەوەی دوو تاوانبار دەرکەون کە کامیان دزیان کردووە کەوچکێکی داخ کراو دەهێنرێت بەزمانیاندا.

هەردوو تاوانبارەکە دەبێ زمانی لێ بدەن، پاشان سەرۆک هۆزەکە هەردوو زمانەکە فەحس دەکات و دەزانێ کامیان تاوانبارە، بەم شێوەیەش حامورابی حوکمی خۆی کردووە (دە) وەسیەت نامەکە، بناخەی حوکمی تەوراتی حامورابی بووە، لەو یاسا نامەیەدا بە ئاشکرا کۆمەڵێ یاسای دارشتووە کە لەکاتی خۆیدا داهێنان بووەو توانیویەتی پێش هەزار ساڵ لەمەوبەر بەکاری بێنێ واتە هەموو شتێک بەرامبەر بەخۆی (العين بالعين) و(السن بالسن)، تەنانەت ئەمانە ئەمڕۆ لە زۆر کۆمەڵگەدا پەیڕەو دەکرێت، بەڵام بابلییەکان بەهۆی ئەم یاسایانەوە توانیویانە پێش شارستانییەکانی دیکە بکەون، لەوانە شارستانیەتی ئاشور کە لە کتێبە مێژووییەکاندا بە(زەوی خوێناوی) ناو دەبرێ، سەربازەکانی ئاشور بەدڵ رەقترین و خوێن رێژ ترین سەربازی میزۆپۆتامیا ناو دەبرێن لەشەڕدا نیشانەی ئاگرو رق و خوێن ڕشتن بوون وەک لە تەورات دا هاتووە، پێش سەد ساڵ لە سەر هەڵدانی بابلییەکان و (نبەوخوزنەسر)دا، «٢» (سەنحاریب)ی پاشای ئاشورییەکان پەلاماری خاکی پیرۆزی قودسیان دا، ئاشوریەکان باوەڕیان زۆر بە دەسەڵات هەبوو، دەسەڵاتیش واتە هێزی سەربازی و بەکارهێنانی زەبرو زەنگ وکوت و بەند کردنی بیروهۆش، بۆیە سەر دیوارەکانیان هەمیشە بە وێنەی شێرو جەنگاوەرو پاشاکانیان نەخشاندووە، لەوکاتانەی رۆمانیینەکان ساوا بوون ئاشورییەکان لەوپەڕی دەسەڵاتدا بوون و بەدرێژایی هەزار ساڵ مێژوویان ون و نادیار بووە تەنانەت (نەینەوا«١»)ی پایتەختیشیان ناسراو نەبوو بەجیهانی نوێ.

تا ساڵی (١٨٥٢) شوێنەوار ناسی بەریتانی (ئۆستن هێری لێر) لە.سەروی عێراق شوێنەواری تەلاری پاشایەتی دۆزییەوە، پاش گەڕان و هەڵکەندنێکی زۆر بە پەیکەری گایەکی باڵدار ئاشنا بوو، جگە لەوەی دۆزینەوەی کتێبخانەیەکی گەورە لە (نینوی) ئەوەندەی تر (لێری) حەپەساند کە بریتی بوو لە (٢٢) هەزار تابلۆی بەردین و بەخەتی مسماری نوسرابوون.

هاوکات بۆمان دەردەکەوێ کە حوکمی ئاشورییەکان چینایەتی و پشتاوپشت بووە، هەروەها ژنەکانیان لەلایەن پیاوانیانەوە چەوسێندراوەتەوە، هاوکات ژنەکانیان رازی نەبوون بەوەی پیاوەکانیان یاسای فرە ژنی پەیڕەو بکەن، بەڵام بەرامبەر بەمە رێی بە مێردەکەی داوە کە چەند دۆستێکی هەبێ، بەڵام شاژنەکانیان شوێنی تایبەتیان هەبووەو ئەمەو ساڵی ١٩٨٩ شوێنەوار ناسان شوێنێکی دیکەیان دۆزییەوە کە وەک گۆڕی (توت خەنغ ئامون) وابوو، ئەویش سەروەت و سامانی (نەمرود) بوو بەپێی قسەی (د. مؤيد سعيد) بەرێوەبەری گشتی شوێنەوار لە عێراق (پاش گەڕانێکی زۆر کۆمەڵێ بازنی ئاڵتونی و خشڵ دۆزرانەوە کە مێژووەکەیان دەگەڕایتەوە بۆ ٢٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر، ئەمەش یەکەم جارە گۆڕی شایەکی ئاشوری بدۆزرێتەوە کە دەستی کەسی نەگەیشتبێتێ، جگە لە کۆمەڵێ تابلۆی قوڕین)، ئاکام شوێنەوار ناسە عێراقییەکان نزیکەی (١٢٥) رەتڵ ئاڵتون و خشڵیان دەرهێنا کە نەخش و نیگارەکانی سەر ئاڵتونەکان گەواهی باشترین نەخش سازی لێ دەدرا، بەپێی بۆچوونی ئاشورییەکان گەر شاژنەکانیان بمردایە هەرچی زێڕو زیوی هەبوو لەپاڵ خۆیدا دەیان ناشت، بەڵام پاشاکانی ئاشور مێژوویان بۆ خۆیان تۆمار دەکرد چونکە دەیان ویست ئیمپراتۆریەکی گەورە بنیات بنێن، ساڵی ٧٠١ پ . ز پاشا (سەنحاریب) بەرەو وڵاتی شام و دەریای سپی ناوەڕاست کەوتە ڕێ، ئاکام توانی کۆنترۆڵی ئەو ناوچانە هەموو بکات لەوانە قودس و دەست بەسەراگرتنی پاشاکەشی کە ناوی (حسنقيا) بوو بەم شێوەیە هیچ کەسو وڵاتی لەبەردەم پەلاماری ئاشورییەکاندا خۆی بۆ نەدەگیرا، ودنەبێ ئەم ناوچانە تەنها کاول کارییەک بێ کە بەخۆیەوە دەیبینێ بەڵکو وێران کاری دیکەشی بەخۆوە دیوەو لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی بۆکراوە ئەویش مێژووی نوح پێغەمبەرو لافاوە گەورەکەو

**• سەربازەکانی ئاشور بەدڵ رەقترین و خوێنڕێژترین سەربازی میزۆپۆتامیا ناو دەبرێن، لەشەڕدا نیشانەی ئاگرو رق و خوێنڕشتن بوون.**

دروست کردنی بەلەمێکی گەورەو هەڵگرتنی هەموو جۆرە گیان لەبەرێک ئەوەی لەگەڵ نوح دا سواری بەلەمەکە بوو بوو رزگاری بوو، بەڵام سەراپای بەشەکانی دیکەی سەرزەوی کەوتە ژێر ئاوەوەو نوقم بوو تا نوح سەلامی خوای لێ بێت داوای لە خوای گەورە کرد کە لەشوێنێکی پیرۆزدا دایگرێ و ئاکام لەسەر شاخی (جودی) گیرسایەوە، لە نوسراوەکانی سۆمەردا باس لەم لافاوە کراوە، پاشان لەناو ئەو نوسراوانەدا باس لە گەورەترین ئەفسانە دەکرێت کە داستانی (گەلگامش)ە، لەو داستانەدا هاتووە کە بۆ ماوەی ٧ شەوو ٧ رۆژ لافاو زەوی داپۆشی، پێش ٥ هەزار ساڵ لەمەوبەر لەشاری (سۆمەر) باس لەم لافاود کراوە، تەنانەت سۆمەرییەکان عەرەبانەو گالیسکەو زانستی بەستەنەو یاسایان دارشتووەو بە یەکەمین ژیاری مەدەنی دادەنرێ لەسەر رووی زەمیندا، تەنانەت تەلارو خانوەکانیان لەو خشتە دروست کراون کەتا ئەمرۆش کاریان پێدەکرێ.

سۆمەرییەکان بەهۆی نووسینەوە توانیویانە هەموو شتەکان بەدوای خۆیان بگەیەنن (ستیڤ دینی) توێژەردوە لە شارستانی سۆمەردا دەڵێ: (راستە سۆمەرییەکان بەهۆی نووسینەوە هەندێ شتیان بۆ تۆمار کردوین، بەڵام زۆر شتی دیکە هەن وِنن چونکە هەمویان نەنوسیوە، پێش ٥ هەزار ساڵ سۆمەرییەکان لەسەر قوڕ نوسیویانە، بەڵام سۆمەرییەکان وەک گەل لە گەلانی دیکە پێشکەوتوتر بوون. حەزیان لە کاروباری کۆمەڵایەتی و شەڕو خۆشی هەبووە) شاری ئوریش بنکەی شارستانی سۆمەرییەکان بووە. تەنانەت دەڵێن هەوارگەی ئیبراهیم پێغەمبەر بووە، (ئور) یەکێکە لە شارە هەرە کۆنەکان و کاتی خۆی شوێنەوارناسی بریتانی (لیوناردۆ وۆلی) لە سەپێدەی سەدەی ١٣و ١٤ دا سەرقاڵی شوێنەواری ئور بووە، (لیۆناردۆ) یەکەم کەس بوود کە لە نزیکەوە بەخاکی ئور گەیشتووەو کاری تیاکردووە. تەنانەت تا ئەوکاتەی کە خەڵکیش تیا ژیاوە، (ایۆ ناردۆ) چاڵێکی گەورەی هەڵکەندو رۆژ بەرۆژ دەچووە خوارێ، تا ژنەکەی هات بۆلای و چاوی بە ناوچەکە کەوت ر رتی ئەمە شوێنی لافاوە گەورەکەیە، لیۆناردۆ باوەڕی وابوو کە ئەم شوێنە شوێنی ئەو لافاوەیە کە لە قورئان و تەورات دا هاتووە ئەمەش ئەوەندەی تر پاڵی بەخەڵکەکەو لیۆناردۆوە نا تا زیاتر کاری تیا بکەن و بگەن بەشتێک، ئاکام (وۆلی) کۆمەڵێ زێڕو زیوو نوسراوی دەست کەوت، (لیۆناردۆ) بەردەوام بوو لەسەر هەڵکەندن تا نزیکەی ٤٧٠ کەللەسەری دۆزییەوە کە هەر هەموویان لەیەک کاتدا نێژراون، لێرەوە (لیۆناردۆ) ئیلهامی چیرۆکێکی ئەندێشەی ئۆری بۆهات بەم شێوەیە تۆماری کردووەو دەڵێ: (سەرەتا چاڵێکی گەوردیان هەڵکەند سەکۆیەکی بەرزیشیان لەلایەکەوە دروست کرد، پاشان مردوویان لەسەر دانا، پاشان هەر هەموو ئەوانەی دەوریان داوە ژەهریان خواردووەو لەپاڵیا کەوتن، ئەمەش بەگەورەترین چیرۆک و دۆزدرەوەی نوێ دادەنرێ، چونکە دۆزینەوەی ئەم گۆڕە بەکۆمەڵانە سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ شوێنەواری ناسان بەمەش نهێنییەکانی یەکەم شارستانی دەردەکەوێت)، بەڵام داستانی گەلگامێش بەشێوەیەکی دیکە چیرۆکەکە راڤە دەکات و دەیبەستێتەوە بە مەسەلەی بەهەشتەوە بەوشوێنە خۆشەی گەلگامێش بە (دیلمۆن) ناوی دەبات، بەو مانایەی هەر کەسێ لەو لافاوە رزگار بێ بەرەو بەهەشت دەچێ، تەنانەت وڵاتی نێوان دوو رویار بە بەهەشت ناوبراوە، چونکە لە کتێبە کۆنەکان بەناوچەیەکی خۆشی پرسەوزایی و پڕ لە ئاو ناوبراوە. تەنانەت لە داستانی گەلگامێشدا باسی ماریش کراوە.

بیرۆکەی بەهەشت و دۆزەخیش هێندەی بوونی مرۆڤ کۆنە، تەنانەت هەموو پێغەمبەرانیش مژدەی بەهەشتیان داوە، ئەمەو بە دووری ٤٠٠ میل لە خواروی (ئورەوە) دورگەی (بەحرەین) بەدی دەکرێ، مەڵبەندێکی بازرگانی بووەو سەرجەم ناوچەکانی دەوروبەری پێکەوە گرێداوە. بەحرەین ناوچەیەکی ئاوەدان و پڕ لە درەخت و سەوزایی بووەو بەپێی کتێبە کۆنەکان پێشی دەڵێن (دیلمۆن).

(دیلمۆن) شوێنێکی ئەوەندە خۆش بووە زۆر لە سۆمەرییەکان بە بەهەشت ناویان بردووەو جگە لەوەی نزیکەی ١٥٠٠ گۆڕی لێ بووەو هەموو کەس لەپاڵ کەل و پەلەکەی خۆیدا ناشتویانە، جگە لەوەی ئێسک و پروسکی مارەکانیش هەر لەیاد نەکراوەو لەسەر گۆڕەکان دانراوە بەوشێوەی گەلگامێش باسی دەکات، دیارە گەشتی بەرەو دواوە بەرەو ژیانی بابلی و ئاشورییەکان دەمان بات تا دەگاتەوە سەر ئادەم، بەڵام تۆ بڵێی لەوە زیاتر بتوانین بچینە دواوەو بە شوێنەوارو شوێن پێی ئادەم بگەین؟!

**سەرچاوەکان:**

١- کەناڵی ابوظبي / الحضارة المنسية / بلاد ما بين النهرين.
٢- = mbc / اعجب احداث القرن العشرين.
٣- کتێبی / تاريخ الموصل / القس سليمان الموصلي / جزء الاول.
٤- = / تاريخ الموصل / سعيد الديوەچي / مطبوعات مجمع علمى العراقي.
٥- کەناڵی دوبەی / مذكرات من التأريخ

**پەراوێز:**

١- مێژوونوسێکی یۆنانی بەناوی (کزینیفون) دەڵێ (کە سوپای یۆنانی لە بەغداوە هات بەدرێژایی ٣٠ کم گەیشتنە شوێنێک پێیان دەوت (موسبێلا)و مادەکانی تیا دەژیان.
٢- (ابن خلدون)یش دەڵێ: (جەرامقەکان لە نەژادا خەڵکی نەینەوا بوون و دەستیان گرت بەسەر بابل داو پاشاکەشیان ناوی سەنحاریب بوو) .

# بڵباس و پەیماننامەی زەهاو

ن: محەمەد بێورەیی

**هەمیشە کورد لە ئەنجامی پەیماننامەو ڕێکەوتن نامەکانی نێوان دوژمنەکانیدا تووشی کارەسات و تێکشکان بووە، چونکە بەندەکانی ئەم ڕێکەوتننامە بە بەرژەوەندی دوژمنانی کوردو زیانی گەلەکەمان کۆتایی هاتووە، ئەمەش لەبەر گرنگی شوێنی کوردستان کە کەوتۆتە ناوجەرگەی کۆمەڵێک دەوڵەتی نەژاد جیاواز، دابەش بوونیشی بەسەر ئەم وڵاتانەدا کەعەرەب و فارس و تورک و نەتەوەی دیکەی تیا دەژی، هەریەک لەم نەتەوانە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان هەبووە و لەلایەکی دیکەشەوە ئەم ناوچانە هەڵقەیەکی گرنگە بۆ پێکەوە بەستنی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کە هەمیشە لە ململانێی سەختدا بووە بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان جگە لەوەش کە بوونی نەوتێکی زۆر لە کوردستاندا، هەمیشە دوژمنان چاویان تێ بڕیوە و گژلمەزی شەڕو پێکدادانیان هێناوەتە کوردستان و باجەکەشی کوردو بزوتنەوەکانی داویانە. جا هەر دەوڵەتەو بەشێوەیەکی تایبەت بەخۆی هاتوونەتە پێش و خۆیان کردۆتە دۆستی کورد و هەر کاتێکیش مەرامیان هاتبێتە دی ئەوە پشتیان لە کورد کردووەو کردوویانەتە قۆچی قوربانی ئەم جۆرە پەیماننامە تاڵ و تفتانە، نموونەیان زۆرە لە مێژووی دێرین و نوێی گەلەکەماندا.**



پەیماننامەی درێژخایەنی «زەهاو» کە لە ساڵی «١٠٤٩»ی کۆچی «١٦٣٩ز» لە نێوان ڕۆم و عەجەمەکاندا بەستراو کۆتایی بە شەڕو شوری نێوانیان هێنرا، دەست نیشانی سنوری نێوانیان کرا کە سنورەکەیان بەناو جەرگەی کوردستاندا تێدەپەڕی، بێ ئەوەی هیچ حیسابێک بۆ کورد بکرێ، تەنانەت ئەم نەهامەتییە ئەرمەن و گورجی و عەرەبەکانیشی گرتەوە، هەر بۆیەش پەیماننامەکە نەیتوانی چارەسەری بنبڕ بۆ کێشەی نێوان ڕۆم و عەجەم دابین بکات. بەڵام کورد لە هەموان زیاتر کەوتە نێوان بەرداشی هێزەکانی ڕۆم و عەجەم.

ئەحمەدی خانی (١٦٥١ -١٧٨٣ز) لەم بارەیەوە دەڵێ: «تێ بفکرە لەلای عەجەمەوە تا دەگاتە گورجستان، کورد بۆتە بورج، لە چوارلاوە بۆتە حەساری ڕۆم و عەجەم، کەچی هەردووکیان کوردیان کردۆتە تیری قەزا. «گوایە ئەوانە کلیلی سەر سنورەکان و هەر تیرەیەکیان دیوارێکی پتەون». «ئەم قولزومی ڕۆم و بەحری تاجیک کەد ئەکەونە جوڵان و لەشکرکێشی»

«کورد لە خوێنی خۆیدا دەگەوزێ، چونکە لە بەینی ئەواندا بووتە بەرزەخ» لەو ماوە ئارامیەدا کە بەدووی پەیماننامەی ئاشتی زەهاو دا هات عەجەم توانی شان و شکۆی ئێلی برادۆست کە هاوسنوری عوسمانی بوو بشکێنێ و نەهێڵێ جارێکی دیکە ڕاست بێتەوەو مەترسی بۆ دروست بکەن، بەڵام هاوزەمان لەگەڵ کزبوونی ئێلی برادۆست، ئێلی «بڵباس» لەلای خوارووی عەجەم نشینەکان لە مەڵبەندی ورمێ گەشەی کرد و بەهێزبوو.

ئێلی « بڵباس» لەو سەردەمەدا پێکهاتبوو لە یەکگرتنی چوار هۆزی سەرەکی (مەنگوڕ، مامەش، پیران، باڵەک)، هۆزەکانی ئەم ئێلە ڕەوەندی تەواو نەبوون، ئەگەر چی هاوینان بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵ دەچوونە چیای قەندیل. بەڵام بنەیان لەبناری قەندیل و دەشتی لاجان و موکریان و سڵدۆز بووەو کشتوکاڵیان تێدا دەکرد، مەزنایەتی ئێلی «بڵباس» لەدەست ئاغاکانی مەنگوڕدابوو تا «باپیر ئاغا» و هەزار کەس لە

**. ئێلی (بڵباس) لەلای خوارووی عەجەم نشینەکان لەمەڵبەندی ورمێ گەشەی کردو بەهێزبوو.**

پیاوە هەڵبژاردەکانی ئێلەکەی لە میوانداریەک دا لە (مەراغە» لە خەودا کوژران، ساڵی (١١٩٨ک،١٧٨٣ز).

خداد بەگی ئەفشار لە پاداشتی ئەوەی لە تەنگی ئابی گەرمدا شۆرشگێرانی کوردی شکاندبوو دەرباری ئێرانی نازناوی (خان)ی پێ بەخشیبووکردبوویە (بێگ لەربێگ) واتە بەگی بەگەکانی ئەفشار. لەساڵی (١١٣٤ک،١٧٢١ز) دا جارێکی دیکە بەلەشکری عەجەمەوە هێرشی کردە سەر لاجان و لە بناری قەندیل کە مەڵبەندی هێزی بلباس بوو، لە گەڕانەوەیدا بەدیل و تالانیەوە شەرکەرەکانی بلباس لەناکاو هەڵیان کوتایە سەری و پاسەوانەکانیان کوشت و دیلەکانیان لێ ستاندنەوە و تالانەکەیان پێ بەجێ هێشتن بۆیە (بێگلەربێگ) لە سەر ئەم ریسواییە خۆی کوشت.

ئێلی بلباس و ئێلی زەرزا ببوونە دڕک لە گیانی عەجەم دا لەبەر ئەوە یەکێک لە پەژارەکانی حاکمەکانی ورمێ و مەراغە هەمیشە لەناوبردنی ئەم دوو ئێلە بوو.

ئێلەکانی کوردیش بەهۆی ناکۆکی ناوخۆیان و نزمی ئاستی ئابووری و کۆمەلایەتی و سیاسی و فەرهەنگی خۆیانەوە، نەیانتوانیبوو بۆ پێکهێنانی قەوارەی سەربەخۆیی خۆیان کەڵک لەو پشێویە فراوانە وەربگرن کە بەهۆی هێرشی ئەفغانەوە بۆ سەر ئێران و لەناو چوونی بنەماڵەی «سەفەوی» و گۆڕانی یەک لەدوای یەکی بنەماڵە حوکمڕانەکانەوە دروست ببوو...

لە سەردەمی دەسەلاتی «نادرشا» دا ساڵی(١١٤٨- ١١٦٠ک،١٧٣٥ز-١٧٤٧ز) «محەمەد عیساخان» ی بەگلەر بەگی ئەفشار داوای لە نادرشا کرد بۆ سەر کوت کردنی ئێلی بلباس یارمەتی بدات، ئەویش هێزێکی گەورەی بەسەرکردایەتی «نصرالله میرزا» ی کوڕی و «ئیبراهیم خانی ظهیر الدولە»ی برای بۆ نارد. لەگەڵ هێزەکانی «محەمەد عیسا خان» لە نزیک سابلاخ یەکیان گرتەوە و هەڵیان کوتایە سەر (ترکەش) لە قەندیل لە ساڵی (١١٤٩ک، ١٧٣٦ز) ئێلی بلباس هەر دوو هەزار کەس دەبوون هەندێکیان کوژران و هەندێکیشیان گیران ئەوانی دیکەش هەڵهاتن، نادرشا خۆشی بۆ چاوترساندنی خەڵکی ناوچەکە لە دوای ئەوەی دەستی لە ئابلۆقەدانی موسڵ هەڵگرت لە (سائێن قەلا) وە چوو بۆ سەردانی سومای برادۆست و



قەلاکانی (باینەو بەردەڕەش). ساڵی (١١٥٨ک، ١٧٤٨ز) بلباس ئێلێکی دەولەمەند بوون، خاوەنی ئاژەڵ و گاڕان و زەوی زۆر گەورە بوون، هەروەها زەوی بەپیتی فراوانیان لەبەر دەستدا بوو، کار بەدەستانی عەجەم چاوی تەماعیان تێ بڕیبووە سامان و داراییان و دەیانویست بەزەوت کردن و تالانی ماڵ و دارایی ئەوان خۆیان دەولەمەند بکەن، مەزنەکانی بلباسیش دەیانویست کەمترین باج و سەرانە بدەن.

هۆی سەرەکی ململانێ و تێکهەڵچوونی خوێناویی ئەفشاری عەجەم و بلباسی کورد، ئەگەر چی تێکەلاو بوو لەگەڵ ناکۆکی مەزهەبی نەتەوەیی بەلام لەڕاستیدا زۆر لایەنی ئابووری هەبوو نەک لایەنی سیاسی.

حاکمەکانی ورمێ و مەراغە هەر کەس بوایە دەبوو یەکێ لەبەندەکانی کارنامەکەی تەمێ کردنی بلباس و ئێلە کوردەکانی دیکە بێ. چەند جار تێکهەڵچوونی خوێناوی لە نێوان سوپای عەجەم و ئێلە کوردەکان ڕوویدا، دەزگای بەڕێوەبردنی ئێران تا دەهات بۆگەن تر دەبوو. ئاڵوگۆڕییەک لە دوای یەکەکانی بنەماڵە دەسەلاتدارەکانی سەفەوی و ئەفغانی و ئەفشارو زەند و قاجار، هەمیشە گۆڕانی حاکمەکانی ورمێ مەراغەشی بەدوادا دەهات. بەرتیل وەرگرتن بەناوی پێشکەشەوە بووبوو بەیەکێ لە نەریتەکانی خۆ نزیک خستنەوە لە دەرباری شاهی و حاکمەکانی تەورێز. حاکمەکان پلەو پایەکانی خۆیان بەپارە دەکڕی، لەبەر ئەوە ئەوانیش پلەو پایە حکومەتیەکانی

**، حاکمەکانی ورمێ و مەراغە هەرکەس بوایە دەبوو یەکێ لەبەندەکانی کارنامەکەی تەمێ کردنی (بلباس)وئێلە کوردەکانی دیکە بێ.**

**.دەربارەی قەتل و عامەکەی بلباس و کوشتنی باپیر ئاغا زۆر سەرچاوە لەدەمی زۆر بەیت بێژەوە باسی ئەم کارەساتەی بەشیعر هۆنیوەتەوە.**

خوار خۆیان بەپارە دەفرۆشتەوە، هەریەکەش هەوڵی دەدا زۆرترین سامان و دارایی پێکەوە بنێ، ماوەی دەسەڵاتداریێتی خۆی بەکار بهێنێ بۆ خۆ دەوڵەمەند کردن بەهەر ڕێگەیەکی ناڕەوا زیادکردنی باج و سەرانە، داگیرکردنی زەویی و زار، زەوت کردنی ماڵ و دارایی، تالان، باج سەندنی بەناهەق، ئێڵەکانی بلباس و زەرزا ئەوەندەیان زوڵم لە دەزگای کاربەدەستی عەجەم دیبوو، شۆڕشیان هەڵگیرساند. بناری قەندیل و شنۆ هەتا دۆڵیان لە عەجەم ئازاد کرد، هێزەکانی خۆیان بۆ بەرەنگاری لێ دامەزراند، هێزەکانی عەجەمیش کەوتنە خۆ سازدان بۆ بەربەست کردنیان. ڕۆستەم خانی حاکمی ورمێ لە ڕێگای(جاریجان قاشقە گدوکەوە) بۆ سەر لاجان و محەمەد بەگی قەرەحەسەنلۆ و مونمین خانی حاکمی سائینێ قەڵا لەگەڵی قاسملووەوە بۆ سەر شنۆ چوون، (کابایزی) مەزنی بلباس لە شنۆوە سەرپەرشتی شەرەکەی دەکرد، ئێلی زەرزا لە (دەشتەبیل) شکان لە گەردەنی شنۆ خۆیان گرتەوە، لەم شەڕەدا لە کورد (کابایزی) مەزنی بلباس و لە عەجەم (محەمەد بەگی قەرەحەسنلو) کوژران (١١٧٨ک،١٧٦٤ز).

کاربەدەستانی عەجەم لە پاڵ بەکارهێنانی زەبرو زەنگی دژی ئێلەکانی کورد بۆ دەستەمۆکردن و سەرپێ نەواندنیان کەوتنە بەکارهێنانی هەندێ ڕێگەی دیکەی وەک دامەزراندی خزمایەتی بەهۆی ژن و ژن خوازییەوە لەگەڵ هەندێکیان دروست کردنی ناکۆکی ودوژمنایەتی لەنێوان هەندێکی دیکەیاندا بەگژداکردنی یەکدی. هەروەها هەوڵیان دەدا لەململانێی ناوخۆیاندا کەڵکیان لێ وەربگرن. لەو کێشەیەدا کە نەیارێکی(نەجەف قولی خانی دونبولی) حاکمی تەورێز نەیان ویست تەورێزی لێ داگیر بکەن....، (نەجەف قولی) لە دەستی ئەوان بۆ خۆی هەڵات و داوای یارمەتی لە (ئیمام قولی خانی) حاکمی ورمێ کرد ئەویش جگە لە هێزەکانی ئەفشار، (شێخ عەلی خانی موکری) حاکمی سابلاخ و (جەعفەر سوڵتانی) زەرزا حاکمی شنۆ و (قەرەنی ئاغای) مەزنی بلباس و (میرزا ئاغای) سەرخێڵی شوکاکی بەشەرکەرانی ئێڵەکانیانەوە ڕەوانەیخۆی کرد(١١٩٥ک، ١٧٨٠ز )بۆ یارمەتی دونبولیەکان و بەلاداخستنی ئەو ناکۆکیە بە قازانجی ئەوان...

(ئەحمەد ئاغای مقدم) تاوانێکی گەورەی بەرامبەر بلباس کرد. (نەجەف قولی) حاکمی تەورێز (حاجی عەلی محەمەد ئاغای) مەراغەی لەسەر راوەڕووت کوشتبوو (١١٩٠ک،١٧٧٦ز)، (ئەحمەد ئاغای) کوڕی لە جێگای ئەو کرابووە حاکمی مەراغە. (ئەحمەد ئاغا) بەپێی راسپاردەی حاکمی ئێرانی بەپیلان کەوتە دامەزراندنی دۆستایەتی لەگەڵ باپیر ئاغای مەنگوڕ مەزنی ئێلی بلباس و هێمنی کردەوە. دۆستایەتیەیان ئەوەندە بەهێز بوو داوای لە باپیر ئاغا کرد بۆ تۆڵە سەندنەوەی باوکی لە حاکمی تەورێز هاوکاری بکاو بەخۆی و هەزار کەس لەسوارە هەڵبژاردەکانی بلباسەوە بچن بۆ یارمەتی دانی. باپیر ئاغا هەزار سوارەی هەڵبژاردەی لەگەڵ خۆی برد بۆ مەراغە. ئەحمەد ئاغا بەناوی میوانیەوە هەر چەند کەسێکیانی لەماڵێک دامەزراند لە نیوەی شەودا بەنوستوویی هەموویان کوشتن (١١٩٨ک،١٧٨٣ز) شایەرەکانی موکریان ئەم کارەساتەیان کردۆتە بەیتێکی تراژیدی و بە گۆرانیەوە ئەیلێن. کاربەدەستانی ئێرانی لەسەر ئەم تاوانە نازناوی «خان»یان بە ئەحمەد ئاغا بەخشی و بوو بە (ئەحمەد خانی مقدم).

محەمەد عەلی خانی بەگلەرێکی ئەفشاری بۆ ئەوەی دۆستایەتی لەگەڵ ئێلی زەرزا دابمەزرێنێ خوشکێکی خۆی دابوو بە ئەفراسیاب سوڵتانی زەرزا لەو سەردەمەدا ململانێی نێوان ئاغا محەمەد خانی قاجار (١١٩٣ک، ١٧٧٩ز) و لطف عەلی خان زەند (١٢٠٣ک، ١٧٨٨ز) - (١٢٠٩ک، ١٧٩٤ز) لە سەر تەختی ئێران هێشتا بەلایەکدا نەکەوتبوو، ئێران هێشتا ناوەندێکی دەسەڵاتداریێتی تێدا جێگیر نەبووبوو.





حاکمەکانی ناوچەکان هەوڵی خۆ بەهێز کردن و خۆ دەوڵەمەند کردنیان دەدا کەسیان چارەنووس و پاشەڕۆژی خۆی نەدەزانی.

محەمەد قولی خانی حاکمی ورمێ ئێلەکانی زەرزا و شکاکی بەلای خۆیدا راکێشابوو بۆ تالآن کردنی ئێلی بلباس کە هێشتا سێ ساڵ بەسەر کوشتنی بە کۆمەڵی مەنگوڕدا لە مەراغە تێ نەپەڕیبوو، هێزێکی ناردە سەر بلباس کەلەو کاتەدا قەرەنی ئاغا مەزنی بلباس بوو، لەسەر (چەمی لاوێن) تێکهەڵچوون (١٢٠١ک١٧٨٦ز). بلباس شکان و هەڵهاتن بۆ چیا، ماڵ و دارایییان تالآن کرا، (بوداق خانی موکری) ئەگەر چی لە هوکاری عەجەم درێخی نەکردبوو، کەچی ئەویش لە سزادانی عەجەم رزگاری نەبوو چاویان هەڵکۆڵی (١٢٠٣ک، ١٧٨٨ز).

ئاغا محەمەد خانی قاجار بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی شاهێتی خۆی رووی کردە ئازەربایجان و ویستی محەمەد قولی خان حاکمی ورمێ بگۆڕێ، محەمەد قولی لە ترسی گیانی خۆی پەنای برد بۆ ئێلی زەرزا لە شنۆ ئاغا محەمەد فەرمانی دا بە قاسم خانی ئەفشار بچن بۆ تەمێ کردنی ئێلی زەرزا. محەمەد قولی گەڕایەوە لای عەجەم و بەخشیان. بەڵام دالدەدانی ئەو بوو بەوهانەی پەلاماردانی زەرزا، ئێلی زەرزا داوای لە ئێلەکانی بلباس ؤ هەرکی کرد بەدەنگیەوە بێن بۆ بەربەستی هێرشی عەجەم. قاسم خان جگە لە هێزی ئەفشار هێزەکانی دونبولی و موکریشی لەگەڵ خۆی برد بۆ سەر زەرزا رێک کەوتبوون شەڕی یەکدی نەکەن، هێرشی عەجەم تێک شکا هەزار کەس لە شەڕکەوانی ئەفشار و دونبولی کوژران (١٢٠٦ک، ١٧٩١ز) (محەمەد قولی خان) سەر لە نوێ بودوە بە حاکمی ورمێ (١٢٠٧ک، ١٧٩٢ز). (ئەفراسیاب سولتانی) زەرزا هەم زاوای بوو هەم لە تەنگانەدا دالدەی دابوو بە خۆشی دامەزرانەوەیەوە چوو بۆ پیرۆزبایی لێ کردنی بۆ ورمێ، بەڵام لەوێ دەرمان خواردنیان کرد و مرد.

فەتحعلی شاهی قاجار (١١٨٥ک، ١٢٥٠ک١٧٧١ز ١٨٣٤ز- بۆ جێگیر کردنی دەسەڵاتی خۆی لە ئازەربایجان و سەرکوت کردنی سەر پێچی محەمەد قولی خان خۆی لەرێگای تەورێز -مەراغە - سابلاخەوە رووی کردە ورمێ. محەمەد قولی بە برینداری لە شەڕدا گیرا. فتحعلی شاه، حوسێن قولی خانی لە جێگەی ئەو کردە حاکمی ورمێ و عەباس میرزای کوڕی خۆی کە (نائب السلطنە)ی بوو کردە والی ئازەربایجان. عەباس میرزا (١٢٠٢-١٢٢٤ک، ١٨٠٩-١٧٨٧ز)، ماوەیەکی درێژ لە ئازەربایجان حوکمڕانی کرد لەسەر دەمی ئەوا رووداوی گرنگ رووی دا. جەنگی روسی- ئێرانی کە چەندین ساڵی خایاند و قۆناغی یەکەمی بەسەپاندنی پێکهاتنی گولستان (١٣٢٨ک، ١٨١٣ز) و قۆناغی دووەمی بە سەپاندنی پێکهاتنی تورکمان چای(١٢٤٣ک، ١٨٢٨ز) کۆتایی هات و جەنگی عوسمانی- ئێرانی کە ئەویش چەند ساڵی خایاند بە پەیماننامەی ئەرزەڕۆم (١٢٣٨ک، ١٨١٢ز) تەوابوو. دابین کردنی خەرجی جەنگەکان و بژاردنی زەرەری روسیە و خەرجی نوێ کردنەوەی قشونی ئێران وخەرجی پێویستیە زۆرەکانی دەرباری بۆگەنی قاجارو خێزانە دەسەڵاتدارەکانی باری سەر شانی هەموو خەڵکی ئێرانی قورس کردبوو بەتایبەتی خەڵکی کوردستان، ئەو بەشەی کەکەوتبووە ناوچەی دەسەڵاتی عەباس میرزاوە.

ئێلی بلباس کەڵکیان لە ئاڵۆزانی هەلومەرجی ئازەربایجان وەرگرت و ناوچەکانی خۆیان لە ژێر دەستی عەجەم دەرهێناو تا نزیک قەڵای ورمێ پێشڕەویان کرد(١٢١٤ک، ١٧٩٩ز) هێزەکانی عەجەم چەند جارێک چوونە سەریان بێ ئەوەی بتوانن چاریان بکەن. عەباس میرزا فەرمانی دا بە حسێن قولی خانی بەگلەر بەگی ئەفشار کە بەسوپای ئەفشارو بە ئەحمەد خانی مقدم مەراغەیی کە بە سوپای مقەددەمەوە لە کەناری (چەمی گادەر) یەک بگرنەوە بۆ ئەوەی بەیەکەوە پەلاماری ئێلی بلباس بدەن و شۆرشەکەیان دابمرکێننەوە. لەم سەردەمەدا عەجەم توانیبووی هەندێ لە ئێلە کوردەکان دەستە مۆ بکات و بیانهێنێتە ژێر فەرمانەوە بۆ ئەم هێرشە هەندێ لە شەڕکەرانی ئێلەکان شوکاک و زەرزا و شەمزینانی سازدرابوون، هەموویان لە (سلدەز) کۆبوونەوە تۆپخانەیان لەگەڵ خۆیان برد. هێزەکانی بلباسیش لە دەشتی لاجان دامەزرابوون، هۆزی پیران بە سەرۆکایەتی مامەند ئاغای هۆزی مەنگوڕ بە سەرۆکایەتی هەمزاغاوە هۆزی مامەش بەسەرۆکایەتی سوار ئاغاو هۆزی باڵەک بەسەرۆکایەتی ئیبراهیم سولتان. حسێن قولی خان سەرکردەی گشتی هێزەکانی عەجەم، هێزەکانی خۆی بۆ شەڕ دابەش کرد. شەڕکەارنی ئێلی شوکاکی بەسەرۆکایەتی ئیسماعیل ئاغای شکەفتی، شەڕکەرانی ئەفشاری لە قولی راست و شەڕکەرانی مقدم مەراغەیی لە قۆلی چەپدا، ئاو خۆشی لەناوەندی هێزەکەدا جێگەی گرت و تۆپخانەیان لێ دابەستن لە رۆژی هەینی (١٢١٦ک، ١٨٠١ز) دا هێرشیان دەست پێکرد. تا بەرامبەرێکی ئاشکرا لە ژمارەو چەک و

ڕێکخستنی ئەم دوو هێزەدا هەبووە لە ئەنجامی شەڕەکەدا ئێلی بلباس تێکشکاو شپرزە بوو، ژمارەیەکی ئەوەندە زۆریان لێ کوژرا بە قسەی میرزا رەشید بە فەرمانی بەگلەر بەگ لە بناری چیای قەندیل دا لە کەللەی سەری پیاوەکانی ئەم ئێلە لە دوو جێگە منارەیان دروست کردوە و موئەزین بۆ بانگ دان لەسەریان راوەستاو پێنج شەش ئەسپی رەسەنی ئەو تالانەشیان هەلبژارد لە سەلکی شەرکەرانی کورد باریان کردن و بە رەشید سولتان قاسملوی ئەفشاردا بەدیاری بۆ فتحعلی شایان نارد. مال و دارایی و ران و رەوەی ئەم ئێلە تێک شکاوەو هەرچی بەردەستی دوژمن کەوت بەتالان برا.

دوای ئەم سەرکەوتنە بەگلەر بەگ لە لاجانەوە چوو بۆ سەردانی شنۆوە قاسم سولتان زەرزا کەئەویش لەم کوشتارەدا هاوڕێ لەگەل عەجەم بەشدار بوو، لە گەڕانەوەی بەگلەر بەگ بەدەم ڕێگاوە ڕێ و شوێنی جۆری بەڕێوەبردنی لێرە بەدواوەی شنۆی بۆ قاسم سولتان روون دەکردوە لەو کاتەدا لەسەر بەرزایی گردەکە گۆڕستانێکی گەورە سەرنجی حوسێن قولی خانی راکێشا کە لە گۆڕستانی خێلە کوردەکانی نەدەکرد. بەگلەر بەگ لە قاسم سولتانی پرسی ئەوە گۆڕستانی کێ یە؟ ئەویش زمانی سووتا ووتی: ئەوە گۆڕستانی کوژراوەکانی ئەفشارە کە لەسەردەمی محەمەد قولی خاندا لە تێکهەلچوونێکی ئەفشاردا بەسەرکردایەتی قاسم خانی برای محەمەد قولی خان لەگەل ئێلی زەروزادا کوژراون. مەبەستی لەوەش تێکهەلچوونەکەی سالی (١٢٠٦ک، ١٧٩١ز) بوو. لەسەر ئەو قسەیە بەگلەر بەگ بەندی گرانیان خستە گەردنی قاسم خان و بەگیراوی لەگەل خۆیان بردیانە ورمێ. لە کاتێکا لە ورمێ بەبۆنەی ئەم سەرکەوتنەوە ماوەی سێ رۆژ بووبە جەژن و شاییان کرد. لە گەرمەی ئەم ئاهەنگەدا قاسم سولتانی زەرزا ئەگەر چی لەگەل هێزی عەجەمدا چووبووە سەر هاونەتەوەکانی خۆی لەباتی ئەوەی خەلات بکرێ بەفەرمانی حوسێن قولی خان لەسەر ئەم قسەیە بەدارو فەلاقەوە بەسترا پاش سزادانێکی سەخت (٣) هەزار تومان جەزایان لێ سەند ئینجا بەریان دا. عەباس میرزا لە کاتێکدا خەریکی گفتوگۆی رێکەوتنێکی زەلیلانە بوو لەگەل روسیا سالی (١٢٢٧ک، ١٨١٢ز) تالان کردنی ئێلی بلباسی سپارد بەئەحمەد خانی مقدەم و عەسکەرخانی ئەفشار بەومەرجەی (١٥) هەزار تومان لەباتی ئەو تالانیە بە دیوانی بەرزی عەباس میرزا بدەن. ئەحمەد خان بۆ ئەوەی عەسکەرخان لەو دەستکەوتە بێ بەشی بکات پێشدەستی کرد خۆی بە تەنیا چووە سەریان کوشتاری لێ کردن و سەر لەنوێ تالانی کردنەوە. بێ بەش کردنی عەسکەرخان لەم تالانیە دوژمنایەتی لەنێوان ئەو دوو پیاوەدا دروست کرد. عەباس میرزا بۆ ئەوەی تەنگ بە هۆزی بلباس بچنێ یاخود بەقسەی میرزا رەشید بوو بە (دەفعی شەر) ی ئەم (طائفە ظالە) یە ناوچەی سلدوزی بەخشی بە ئێلی قەرەپاپاخ کە لە ئەنجامی دەست هەلگرتنی ئێران لە ئەرزەکانی ئەوبەری رووباری ئاراس بۆ دەولەتی روسیا ناچار بوو کۆچ بکەن بۆ ئێران.

عەجەم بۆ ئەوەی پرزەی ئەم ئێلە سەرکێشە ببڕێ ئەمیر خانی قاجار (خالۆی نائب السلطنه) لەناو بردنی پاشماوەی ئەم ئێلەی بە هاوکاری سوپاکانی ئەفشار و مقدم پێ سپێردرا. ئەویش دوو سال لەسەر یەک هەلی کوتایە سەریان دوای کوشتارو تالان پەراوەزەی کردن و هەتا شارەزوور و گەرمیان راوی نان (١٢٣١ک،١٢٣٢ک، ١٨٠٥-١٨٠٦ز). بلباس لە دوای ئەو کارەساتە خوێناویانە ئەگەر چی لەهەندێ شوێنی دێرینەی خۆیان مان، بەلام وەکوو کۆنفیدراسیۆنێکی بەهێزی (ئێل گەل) لەبەریەک هەلوەشان، هەندێکیان پەروازە بوون بۆ شارەزوور، بتوێن، پشدەر، بناری کۆسرەت، دۆلی شەهیدان، تەنانەت هەندێکیان پەڕینەوە لای هەولێرو موسل.

لە بارەی قەتل و عامەکەی هۆزی بلباس و کوشتنی باپیر ئاغا زۆر سەرچاوە لەدەمی زۆر بەیت بیژەوە باسی ئەم کارەساتە دلتەزێنەیان بەشیعری هۆنیوەتەوە. بەناوبانگەکەیان ئەوەیە کە لە ( تحفة مظفرية) بەرگی یەکەم لاپەرە (١٤٩) چاپکراوە و مامۆستا (مەحمود ئەحمەد محەمەد) لە مێژووی هۆزی بلباس لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ ئەم بەیتەی بلاوکردۆتەوە، بۆیە بە پێویستمان نەزانی جارێکی دیکە بلاوی بکەینەوە. بڕوانە ئەو سەرچاوەیە ل ٩٣، ١٠١ کەبەبەیتی عەلی بەردەشانی دەزانرێ.

**سەرچاوەکان:**

کورد و عەجەم / نووسینی: سالح محەمەد ئەمین
کە ئەویش لەم سەرچاوانە وەری گرتووە:
١- مەم و زینی خانی.
٢- س.ن میرزا رەشید - (لاپەڕەکانی ١٩، ٢٤١.
٣- س. ن نۆسکارمان - لاپەڕەکانی ٧٤٥، ٧٥٩.
٤- هـ. س لاپەڕەکانی - ١٨٧، ١٨٩، ١٩١، ٢٣٩، ٢٦٥، ٢٦٦، ٢٨١، ٢٨٩، ٣٠٨، ٣١١، ٣١٢، ٣١٤، ٣٧١، ٥٠٤.
٥- تحفة مظفرية، لاپەڕەی ١٤٩.
٦- «کۆرزۆن» ئێران و مەسەلەی فارسی، بەرگی «١» (١٩٠٦ز).
٧- مێژووی هۆزی بلباس لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ. ل ٩٣ تا (١٠١) (١٩٨٩ز).
٨- ئەرشیفەکانی ناوەندی حوکمی جۆرجیا بەدرێژایی سالەکانی ١٨٢٦ز تا ١٨٢٨ز، تێهەلقوتانی روس لە کێشەکانی کورددا.
٩- سالە کۆچیەکان بە هاوکاری مەلا مستەفا مەلا حەسەن بلباس کراوە بە زایینی.

# گومانی ئەپستمۆلۆژی

رێبین رەسول ئیسماعیل



ئەو هزرڤان و فەیلەسووفانەی لەسروشتی مەعریفەو ئامرازو سەرچاوەکانی دەگەڕان گریمانی ئەوەیان کردبوو مەعریفەی ڕاست و دروست بوونی هەیەو دەکرێت بەدەستیش بهێندرێت. ئەم بڕوایە پتەوو نەگۆڕو چەسپاودو لەڕادەبەدەرە بەعەقڵ و ئامرازەکانی مەعریفە لەلای زۆر لەبیربارانی دیکە جێگای گومان و دڵەڕاوکێی بەردەوام بوو لەبەرئەوەی هەندێک لەفەیلەسووفان بڕوایان بەبوونی مەعریفەی ڕاست و ڕەهانەبوو، بگرە بڕوایان بەبوونی ئامرازی مەعریفیش نەبوو بۆیە ئەم ئامرازانەیان خستەبەر تیشکی ڕەخنەو لێکۆڵینەوەی قووڵی بەردەوام تا گەیشتنە ئەو بڕوایەی مرۆڤ لەتوانایدانیە بگاتە مەعریفەی ڕەهاو ڕاستیەکان ئاشکرا بکات، ئەم هەڵوێستەش لەئاست مەعریفە وای لەهزرڤانانی دیکە دەخواست ڕووبەڕووی ئەم بۆچوونانە بوەستن و ڕەتی بکەنەوە، پۆلە هزرڤانی یەکەم لەنێو بواری فەلسەفەو ئەپستمۆلۆژیادا بەیەقینیەکان ناسراون، پۆلی دووەمیش بە گومانکارەکان، (خودی گومانکردن مەزندەکردنێکی فەلسەفییە) توانای بوون مەعریفەی بابەتی بۆ واقیع دەخاتە بەر پرسیارو لێکدانەوەو ڕاڤەکردن، گومان وەکو بیروباوەڕێکی فەلسەفی لەکاتی قەیرانی کۆمەڵگای گریکی کۆنداو لەسەدەکانی بەرلەزایینی وەکو کاردانەوەیەک لەدژی مەزهەبە فەلسەفیەکانی بەر لەخۆی کەوا هەوڵیانددا جیهانی هەستی لەڕێگای دیالۆگی تێرامانکاریدا ڕاڤە بکەن پەیدابوون و لەسەردەستی (بیروە - ئەرسیلاوس - کاردنیاس - ئەنیسدیموس - سکتوس ئەمبریکوس) سەریهەڵدا، ئەم گومانکارانە لەسەرهەمان میتۆدی کلاسیکی کۆنی سۆفستائیەکان دەڕۆیشتن و جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە مەعریفەی مرۆڤ مەعریفەیەکی ڕێژەییەو ناکرێت بەشێوەیەکی وێنەیی بسەلمێندرێت و وابەستەیە بەبارودۆخی جیاوازی سەردەمەکان، بارودۆخی ژیاری و حاڵەتی ئەندامەکانی هەست و کاریگەری داب و نەریت و عورف.. هتد)«١»

• گومان وەکو تیۆرێکی مەعریفە مەبەستی ئەوەیە ئاستێک بۆ بڕیار دەرکردن لەبواری فەلسەفەو مەعریفە دابنێت

گومان وەکو تیۆرێکی مەعریفی مەبەستی ئەوەیە ئاستێک بۆ دەرکردنی بڕیار لەبواری فەلسەفەو مەعریفە دابنێت بەپێی ئەو بۆچوونەی کە واپێی وایە هەموو مەسەلە بەئاستێکی یەکسان و هاوسەنگ لایەنی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ لەخۆیەوە دەگرێت و ئامرازەکانی مەعریفەش لەعەقڵ و ست و..هتد ناتوانن گریمانی یەقینی ڕەهامان پێبدەن، کەچی فەلسەفەکارە یەقین خوازەکان پێیان وایە زۆر مەسەلەو مەعریفەی فەلسەفەی و هزری هەیە ڕاستەو جێگای گومان نیە، بۆیە پێویست ناکات بەڵگەمان بەدەستەوەبێت تاوەکو بیانسەلمێنین لەبەرئەوەی ئەم مەسەلەو مەعریفەو هزرانە ڕاستەوخۆ بەشێوەیەکی ئەبستراکت کراو بانگەشەی ڕاستی دەکەن و جێگای گومان و دڵەڕاوکێ نین.

## مەزهەبی گومان

گومان وەکو زاراوە دەلالەت و ماناو چەمکی فرە لایەن و فرە ڕەهەند بە خۆیەوە دەگرێت، ئەم فرە دەلالەت و ماناو چەمکەش لەوەوە سەرهەڵدەدات کەوا بەسەر زۆر بوارو لایەنی هزری و زانستی و ئەپستمۆلۆژی و فەلسەفیدا پراکتیک دەکرێت، بەڵام دیارترین نمونەی گومانکردن لەدوو بواردا خۆیان دەردەخەن وەکو تیۆرێک لەمەعریفەو میتۆدێک بۆ بیرکردنەوە، بۆیە ئەگەر عەقڵ خۆی بەتوێژینەوە لەکێشەیەک خەریک کرد دواتریش لەنێو ئەم کێشەیەدا سەرە دەری دەرنەکردوو نەیتوانی بپەڕێتەوە یا چارەسەرییەک بخاتەڕوو، واتا بەمانایەکی دی تیایدا نەگەیشتە باری یەقینی ڕەها ئەوکاتەش نەیتوانی بڕیار لەسەر کێشەکە بدات بۆیە بڕیاری وەستان دەدات و ئەوەش ڕادەگەیەنێت کە لەتوانایدا نیە بڕیارێکی ڕاست و ڕەوان و دروست دەربکات ئەوکاتە گومانکردن دەبێتە تیۆرێکی مەعریفی، بەڵام ئەگەر لێکۆڵەرەوە گومانی کرد بەمیتۆدێک بۆ بیرکردنەوەو بەویستی خۆی گریمانی گومان خستنە بەردەستی خۆی تاوەکو عەقل لەم زانیاریانە پاک بکاتەوە کە وەری گرتووە تاوەکو سەرلەنوێ بەشێوەیەکی گونجاوتر بەبێ پشت بەستن بەزانیاریەکانی پێشووتر، مەسەلەکان لێکبداتەوەو ڕاڤەیان بکاتەوە، ئەوە لێرەدا گومان دەبێتە میتۆدێک بۆ بیرکردنەوە، کەواتە گومانی ئەپستمۆلۆژی واتا وەستان لەدەرکردنی بڕیار، مەرج

نیە بڕیارەکە نێگەتیڤ یان پۆزەتیڤ گرنگ ئەوەیە گومانی ئەبستمۆلۆژی فەلسەفەکار ناچار دەکات ئەوە رابگەیەنێت کە ناتوانێت هیچ جۆرە بڕیارێک دەربکات، لەبەرئەوەی گومانی ئەپستمۆلۆژی گومانێکە وا لە هزرڤان دەکات نەتوانێت راستی مەسەلەیەک رابگەیەنێت لەبەرئەوەی گومان لەوە دەکات ئامرازەکان بتوانن ئەم جۆرە مەعریفەیەی بۆ دابین بکەن کەوا راستیەکی رەهابێت، بەڵام خودی ئامراز لەنێو پرۆسەی کاری هزریدا چییە؟ ئەو ئامرازانە چین فەلسەفەکار بۆ وەرگرتنی مەعریفە پەنایان بۆ دەبات؟.

ئامراز بەچەمکە مەعریفیەکەی شێوازێکە بۆ ئیدراک بەکاردێت بۆ تۆمارکردنی چەندەها جۆری جیاواز لەپێوانەو راستەوخۆ ئاوەژوو کراوەو گەورەکراوی هەستەکانی مرۆڤن بەشێوەیەکی وا داهێنراون لەبری هەستی مرۆڤ کاردەکەن و ئەو شتانە دەپشکنن کەوا ئیدراکی هەستی راستەوخۆ ناتوانێت هەستیان پێ بکات، یەکێک لەو ئامرازە سەرەکیانەی فەلسەفەکار پشتیان پێ دەبەستێت هەستە، خودی هەست کردارێکە لەدەرئەنجامی کاریگەری ئەندامە هەستیارەکان بەئاگادارکەرەوە دەرەکیەکانیەوە دێتەبوون و بەسێ قۆناغدا تێدەپەڕێت:

١- قۆناغی فیزیکی، بریتییە لەکارتێکەرە فیزیکیەکان وەکو رووناکی و گەرمی و... هتد کەوا لەو شتە دەرەکیانەوە هەڵدەستێت و دەگاتە ئەندامەکانی هەست.

٢- قۆناغی فسیۆلۆژی، تیایدا ئەندامە هەستیارەکان دەکەونە ژێر کاریگەری، دواتریش دەمارەکانی تایبەتی یا گشتی هەست هەڵدەچن تاوەکو دەگەنە سەنتەری سەرەکی دەمار.

٣- قۆناغی دەروونی، تیایدا مرۆڤ هەست بەم کارتێکردنە دەکات، لێرەدا هەست دێتەبوون«٢».

جگە لەهەستەکان فەیلەسووفان پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە (حەدس)یش وەکو ئامرازێک بۆ وەرگرتنی مەعریفە بەکاردێت، ئەگەرچی حەدس ئەو مەعریفەیەیە کەوا بەبێ سەلماندن واتا بەبێ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت بیسەلمێنێت بەدەست دەهێنرێت و تێرامانی راستەوخۆیە لەڕاستیدا، خودی حەدس؛ بریتییە لەوەرگرتنی راستی بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەبێ بەڵگە خرازی پێشینەی لۆژیکی و شێوەیەکی تایبەتیە لەچالاکی مەعریفی، (دیکارت) پێی وابوو شێوەی هەڵێنجانی بەڵگە پشت بەبەدیهیات دەبەستێت، بەدیهیاتیش بەشێوەیەکی حەدس تەواو بەبێ بوونی بەڵگە بەدەست دێت، بۆیە لەلای ئەودا حەدس پەیوەستە بەمیتۆدی هەڵێنجان و دەکرێت وەکو پێوەرێک بۆ راستی هەمەکی گشتی سەیر بکرێت، حەدس لەنێو فەلسەفەکەی (سپینۆزا)شدا شوێنێکی گەورەو پڕ بایەخی هەیەو پێی وابوو جۆری سێیەمی مەعریفەیە، بگرە لەوەش زیاتر پێی وابوو لەهەموو جۆرەکانی دیکەی مەعریفە بەسوودو پڕ بایەخترەو لەسایەی ئەوەوە دەکرێت لەگەوهەری شتەکان بگەین«٣».

لەگەڵ پێشڤەچوونی ئەپستمۆلۆژیادا دووجۆرە مەعریفەی راستەوخۆ لەیەکدی جیاکرانەوە ئەوانیش مەعریفەی راستەوخۆی هەستی و مەعریفەی راستەوخۆی عەقلی یا حەدس بوو، مەعریفەی راستەوخۆی هەستی بەر لە(کانت) بەردەوام واتێی دەڕواندرا کەوا مەعریفەیەکە بەر لەئەزموون بوونی هەیە. بەڵام (کانت) جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە جگە لەمەعریفەی راستەوخۆ شێوەی پێشینەی دیکەی مەعریفەی راستەوخۆی هەستی هەیە وەکو کات و شوێن.

جگە لەهەست و حەدس ئەزموونیش یەکێکە لەو ئامرازانەی فەلسەفەکار بۆ وەرگرتنی مەعریفە پەنایان بۆ دەبات، ئەزموون لایەنێکی پراکسیس کردنی مێژوویی کۆمەڵایەتی مرۆڤایەتیەو سەرچاوەی مەعریفەیەو پێوەری پێوانەی راستی ئەگەرو تیۆرەکانە.

### باگراوندی هزری گومانی ئەپستمۆلۆژی

گریکیەکان لەدوای مردنی (ئەرستۆ) توانای داهێنان هزری رەسەنیان لەدەستدا، بەرلەوکاتیش سەربەخۆیی سیاسی و ئازادی تاکەکەسیشیان لەدەست دابوو. کێشەی هزری نوێترو مەزنتریش هاتنەبوون و فەلسەفەکاری مەزنیش نەبوو راڤەیان بکات ولێکیان بداتەوە وەکو تێزێکی فەلسەفی دایانبڕێژێتەوە، لەسەریەک کێشەو مەسەلەی بچووک چەندین مەزهەب و تیۆری هزری دەکەوتنە دژایەتی کردنی یەکدی، بەم جۆرە زۆر لەبیریاران بڕوایان بەعەقڵ وەکو ئامرازێک بۆ ئیدراک نەماو بەرەو ئەوە هەنگاویان نا گومان لەبوونی پێوەرێکی راستەقینە بکەن تا لەسایەیەوە راست و هەڵە لەیەکدی جیابکەنەوە، ئەوەی رێگا خۆشکەربوو لەبەردەم بۆچوونی ئەم بیریارو فەلسەفەکارانەش ئەو رەخنانەبوون کە (میگاریەکان)«٤» ئاراستەی مەعریفەیان دەکرد، لەپاڵ ئەم هەموو رێنماییەی (کەلبیەکان و قۆرینائیەکان) کەوا لەسایەیەوە گاڵتەیان بەتێرامانی ئەبستراکتی عەقلی دەکردو بەچاوێکی سووک سەیریان دەکرد، لەولاشەوە

**• دیارترین نموونەی گومانکردن لەدوو بواردا خۆیان دەردەخەن وەکو، تیۆرێک لەمەعریفەو میتۆدێک بۆ بیرکردنەوە**





فەلسەفەی مادیەت لەسەر دەستی لایەنگرانی (دیموکریتس)«٥» گەشەی دەکردو رەخنەی زۆریان ئاراستەی عەقڵ دەکرد، لەنێو ئەم بارودۆخە ئاڵۆزو ناجێگیرو پڕ لەململانێیەدا گومان نەگەیشتن بەمەعریفەیەکی یەقینی سەری هەڵدا، قوتابخانەی گومانکاری لەهەمان ئەوکاتەدا سەری هەڵدا کەوا قوتابخانەی (ئەبیکۆری و رواقی) سەریان هەڵدا لەسەردەمی هلێنستی، بۆیە (بیرۆن)«٦» ئاماژەی بەگومانی راستەقینەدا، ئەکادیمیەتەکەی، ئەفلاتونیش لەسەردەستی (ئەرکسیلاوس) پەیوەستی جۆرە گومانێک بوو کاتێک گەرەکی بوو رەخنە ئاراستەی هزریکات و هزرەکانیش وەکو چەمک بهەژێنێت و بلەقێنێت، گومانی راستەقینەی بیرونی لەدوای مردنی داهێنەرەکەی (بیرون) و قوتابیەکەی (تیمون) ئەویش لەناوچوو، بوونی لەسەر گۆڕەپانی هزری وەکو قوتابخانەو میتۆد نەما، بەڵام دواتر پاش سەدەونیوێک لەشاری ئەسکەندەریەو لەسەردەستی هەندێک لەلایەنگرانی گومانی راستەقینەی وەکو (ئەنیدیموس - ئەگریبا - سکتۆس ئەمپریکۆس) سەری هەڵدایەوەو درێژەی بەبوونی خۆی دایەوە تاوەکو سەدەی سێیەمی پاش زاینی، بەڵام گومانی ئەکادیمیەتی نوێ، کەمێک لەدوای وەستانی گومانی بیرونی سەری هەڵداو بەردەوامیش بوو تاوەکو نیوەی سەدەی چوارەمی پێش زاینی، ئەم قوتابخانەی سەردەمی هلینستی کە ئاماژەمان پێدان لەسەر ئەوە کۆک بوون مەبەست لەژیانی مرۆڤ کات بەسەربردن و خۆش و شادی و رابواردن و چێژ وەرگرتن و دوورکەوتنەوەیە لەکێشەو ئازارو ئەشکەنجە (تیمون) پێی وایە ئەو خۆشمەندەی بەدوای خۆشیدا دەگەڕێت دەبێت وەلامی ئەم پرسیارانە بداتەوە راستی ئەو شتانەی بوونیان هەیە چیە؟ ئاراستەی ئێمە لەبەرامبەریاندا چیە؟ دەرەنجامی ئەم ئاراستەیە چیە)؟ (بیرون)ی پێشڕەوی گومانی کۆن بەم شێوەیە وەلامی ئەم پرسیارانەی قوتابیەکەی خۆی دەداتەوە.

(توانای گەیشتن بەراستی شتەکان رەتدەکەمەوە لەبەرئەوەی مرۆڤ ئامرازی ئیدراکی راستی لانیە، لەبەرئەوەی بڕوای بەعەقڵ و ئامرازەکانی دیکەی ئیدراک نەماوە، شتەکان وەکو دیاردە دەرک پێدەکات، بەڵام راستیەکانیان نازانێت!).

کاتێکیش لەسەر قسەکانی خۆی بەردەوام دەبێت و دێت وەلامی بەشی دووەمی پرسیاری قوتابیەکەی بداتەوە دەڵێن: (ئەگەر ئێمە راستی شتەکان نەزانین تەنها دیاردەکانیان نەبێت دڵنیانەبین لەبوونی ئامرازێک بۆ ئیدراک و بۆبوونی پێوەرێک بۆ لەیەکدی جیاکردنەوەی راست و هەڵە، ئەوە هەموو ئەو شتانەی لەدیدی مرۆڤدا وەکو راستی دیارن دەکرێت بەهەمان هێز هەڵەش بن، هەر راست بێت! بۆیە ئەگەر دەربارەی شتێک بلێی بوونی هەیە، دەکرێت بەهەمان هێزیش دەربارەی هەمان شتەوە بلێی بوونی نیە! یا بوونی هەیەو بوونیش نیە، یانەبوونی هەیە نەبوونی نیە! کەواتە راستیەکان رێژەیین و رەهانین)«٧»، لێرەدا ئەگەر وتووێژ لەسەر ئەم لێکدانەوەیەی (بیرون) کەمێک دوابخەین هەوڵدەدەین زیاتر جەخت لەسەر راستی بکەین، دیارە لەتێڕوانینی فەلسەفیدا راستی دەبێتە دووجۆر، راستی رەهاو راستی رێژەیی، راستی رەهاو راستی رێژەیی دوو چەمکی فەلسەفیی کرداری مەعریفەی واقیعی بابەتی مێژوویی لەنێو خۆیاندا ئاوەژوو دەکەنەوە، خودی مەعریفە دەستکردی بزاڤێکی مێژوویە لەنامەعریفەوە بەرەو مەعریفەو ئاشکرا کردن و دۆزینەوەی شتەکان دەچێت، سەرەتا دیاردەکان وەکو بەش دەرک پێدەکات تاوەکو لەکۆتاییدا لەسایەی ئەم بەشە بچووکانەوە بتوانێت یاسا گشتیەکانی پێشڤەچوون بدۆزێتەوە، مەعریفەی مرۆڤ لەهەر سەردەمێک و قۆناغێکدا پەیوەستە بەو ئاستەی تەکنیک و زانست لەم قۆناغەدا پێی گەیشتوون، هەرچەندەی زانست پێشدەکەوێت مەعریفەی مرۆڤ زیاتر قووڵترو وردتر دەبێت و بەرەو تەواوبوون دەچێت بۆیە بەپێی ئەم بۆچوونە راستیە زانستیەکان کۆتاییان نیەو رەهانین، بەڵکو بەردەوام راستی رێژەیین و دەچنە ژێر باری پێشڤەچوون و ئەزموونی دواتر، دانپیانان بەرێژەیی مەعریفەکان مانای ئەوەیە کەوا ئەم مەعریفانە لەناوەڕۆکدا پەیوەستن بەقۆناغی مێژوویی لەبەرئەوەی گۆڕانی ئەم قۆناغە مێژوویە واتا گۆڕینی راستیەکانی ئەم قۆناغە بۆیە ئەوەی لەقۆناغێکدا راستە رەنگە لەقۆناغێکی دیکەدا راست نەبێت، لەنێوان راستی رەهاو راستی رێژەییدا هیچ بەربەست و جیاکەرەوەیەک نیە ناکرێت بەلاوە نەنرێت لەبەرئەوەی کۆمەڵەی راستیە رێژەییەکان بریتین لەقۆناغێک لەئیدراکی راستی رەهاداو لەکاتی پێشڤەچوونیدا راستیەکی رەهامان بۆ نمایش دەکات، دانپیانان بەراستی رێژەیی مانای بەلاوەنانی راستی نیە، بەڵکو مانای ئەوەیە کە ئێمە ناتوانین لەهەرچرکەیەکدا گەرەکمان بێت بگەینە راستی رەها(٨)، لەگەڵ ئەوەشدا بڕوابوون بەرەهایی یا رێژەیی راستیەکان پەیوەستە بەخودی مرۆڤ لەبەرئەوەی زۆرشت لەنێو ژیانی مرۆڤدا هەیە

**• مەعریفەی مرۆڤ لە هەر سەردەمێک و قۆناغێکدا پەیوەستە بەو ئاستەی تەکنیک و زانست لەم قۆناغەدا پێی گەیشتوون**

راســـتی ڕەهان و مـــرۆڤ ناتوانێت نکۆڵیـــان لێ بکات، تەنانەت لەنێـو پرۆسـەی مـەعـریفـەی زانسـتیـشـدا زۆر ڕاستی هەن مۆرکی ڕەهاییـان هەڵگرتووە، ئەگەر لێرەدا بگەڕێینەوە لای (بیرون) دەبینین ئەو دوو چەمکە فەلسەفییەی ڕاستی ڕەهاو ڕاستی ڕێژەیی بەو مەبەستە بەکارناهێنێت وەکو ئەوەی خستـمـانەڕوو، بەڵکو ئەو لەدەربڕینی ئەم مەسـەلەیەدا ئامانج و مەبەستی دیکەی تایبەتی خۆی هەیە لەبەرئەوەی ئەگەر لەگەڵ ئەودا گوتمان ڕاستی ڕەهابوونی نیە و ڕاستیـەکان ڕێژەیین ئەوە دەبینین ئەو بۆ خۆی لەنێـو وەڵامـەکەی خۆیدا دان بەڕێژەیی ڕاستیـەوە نانێت، بگرە ئەو گومان لەوە دەکات ڕاستی بوونی هەبێت، کەواتە ئەگەر گومان لەبوونی ڕاستی بکات چۆن دان بەبوونی ڕاستی ڕێژەییەوە دەنێت؟ بەپێی ئەم لێکدانەوەو بۆچوونەی (بیرون) ئەگەر مرۆڤ گومانی لەڕاستی ئیدراکی عەقڵ و ئامرازەکانی ئیدراک و مەعریفەوە هەبوو ئەوە دەکرێت لەکاتی دەرکردنی هەر بڕیارێکدا ڕاستی بڕیارەکە تەواو دژکارو پێچەوانەی بۆچوونەکـان بێت لەبەرئەوەی هەرچەندە دەکرێت بۆچوونەکان ڕاست و دروست بن، بەڵام لەهەمان کاتیشدا بەهەمان پێوانەو هێرش دەکرێت دژکارو ناکۆک و هەڵەش بن، بۆیە ڕاستترین و باشترین هەڵوێست لەئاست مەسەلەیەکی ئاوادا بۆ فەلسەفەکارو هزرڤانان ئەوەیە بڕیار دەرنەکەن و بەوەندە بوەستن و دان بەوە دابنێن و بڵێن (نازانین) لەبەرئەوەی هەموو ڕاستیەک بەیەک پێوانە لایەنی ڕاست و هەڵە لەخۆوە دەگرێت، بەڵام ئەنجامی وەڵام نەدانەوەو نەزانین چیە؟.

دیارە کـاتێک مرۆڤ دان بەوە دادەنێت گوایە ڕاستی مەسەلەیەک نازانێت دەگاتە ئاستێک کەوا خۆی لەئاست ئەم مەسەلەیەوە وەکو یەکێک پیشان بدات گوێ بەم مەسەلانە نادات و بەلاوەیان بنێت، ئەوەش وای لە فەلسەفەکارە گومانکارەکان کرد بگەنە ئەو دەرەنجامەی کەوا دەرەنجامی ئەم گوێ نەدانەیان دەبێتە هۆی حەسانەوەی عەقڵ و دەروون، حەسانەوەی عەقڵ و دەروونیش یەکێکە لەخاڵە بنەڕەتیەکانی دابینکردنی خۆشی و شادی بۆ مرۆڤ«٩»، کەواتە ئەم گوێ نەدانە دەبێتە مایەی ئەو خۆشیەی گومانکارەکان لەپاڵ ڕواقی و ئەبیکۆریەکاندا بانگەشەیان دەکردو بەدوایدا دەگەڕان، ئەگەرچی شێوازی گەڕان و لێکۆڵینەوەی هەریەکێکیان بۆخۆی جیاوازبووە، لەبەرئەوەی ڕواقیەکان لەو باوەڕەدابوون مرۆڤ دەبێت ژیانێکی وا گوزەران بکات لەگەڵ سروشت کۆک و تەباو ڕێک بێت و دژکاری سروشت نەبێت بۆیە ئەم ژیانە لەلای ئەواندا ژیانی مرۆڤی عاقڵ و هۆشمەندبووە چونکە جەختیان لەسەرئەوە دەکردەوە کە هەمووشتێک لەژیاندا لەنێو چارەنووسدا نووسراوە ئەو کەسەی بەم چارەنووسە ڕازی نەبێت و دژایەتی بکات ئەوە لەکۆتاییدا چارەنووس ملی پێ کەچ دەکات«١٠». کەچی ئەبیکۆریەکان لەگەڵ ئەوەی پێیان وابوو هەستەکان مەعریفە بەرهەم دێنن، بەڵام پێیان وابوو مەبەست لەمەعریفە ئازادکردنی مرۆڤە لەنەزانی و خورافات و ترس، کەواتە لێرەدا ژیان بەبێ مەعریفە مەحاڵە، بۆ گەیشتن بەحاڵەتی ئاسوودەگی و حەسانەوە ئەوان پێیان وایە مرۆڤ لەسایەی چالاکییەوە ناگاتە ئەم حاڵەتە، بەڵکو لەڕێگای گوێ نەدان و بەلاوەنانی هەموو شتێک و ژیانێکی سروشتیانەوە مرۆڤ دەگاتە ئەم حاڵەتە دەروونیە.

ئەوە گومانی ئەپستمۆلۆژی ڕاستەقینەی ڕووخێنەربوو وەکو ئەوەی (بیرون)ی پێشڕەوی مەزهەبی گومان بانگەشەی بۆ دەکرد، ئەوە گومانێکە بۆ کەم و کورتی و ناتەواوی بیرکردنەوە دەگەڕێتەوە لەگەڵ هەستکردن بەپێویستی بوونی زانیاری یەقینی ئاوا خاوەنەکەی بەرەو ڕازیکردن ئاراستە بکات، کەواتە فەلسەفەکار گەر نەگەیشتە یەقین ئەوە دەبێت خۆی بێدەنگ بکات، واتا نەڕاستیەکان بسەلمێنێت و نەبەدرۆیان بخاتەوە لەبەرئەوەی ئەگەر بەدرۆشیان بخاتەوە ڕەنگە بەهەمان ڕادەی کەوا بەدرۆیان دەخاتەوە ڕادەو ئاستیش هەر ڕاست بن، بۆیە فەلسەفەکارە گومانکارەکان کاتێک دووچاری بارێکی ئاوا دەهاتن ناچاربوون دەیانگوت، (من هیچ شتێک نازانم، بگرە من نازانم کەهیچ نازانم)«١١». واتا لێرەدا گومان لەوەش دەکەن کەوا بۆ خۆیان گومان دەکەن، ئەگەر (سوکرات) گەیشتبووە ئەو باوەڕەی لەهەموو خەڵکی سەردەمی خۆی هۆشمەندترە چونکە ئەو خەڵکە لەگەڵ ئەوەی نەزانن، بەڵام نازانن نەزانن، کەچی (سوکرات) بۆخۆی نەزانێکە دەزانێت هیچ شتێک نازانێت، لێرەدا گومانکارەکان ئەو ئاستەی نەزانینشیان بەخۆیان ڕەوانەدیت لەبەرئەوەی ئەوان گەیشتنە ئەو بڕوایەی گومان لەوە دەکەن گومانکارن، چونکە ئەگەر بانگەشەی ئەوەیانکرد کە ئەوان گومانکارن ئەوە واتا ئەوە دەسەلمێنن کەوا ڕاستی ئەوە دەزانن کە گومانکارن بەوەش لەگەڵ خودی خۆیاندا دووچاری دژکاری و ناکۆکی دەبنەوە.

هەندێک لەبیریارانی کۆن کاتێک دەیانڕوانیە

**• خودی حدس، بریتیە لەوەرگرتنی ڕاستی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەبێ بەڵگەخوازی پێشینەی لۆژیکی و شێوەیەکی تایبەتیە لەچالاکی مەعریفی.**



مەزهەبی گومان، بەجیا سەیری گومانی قوتابخانەی (بیـرون) و ئەکـادیمیـەتی نوێیـان دەکـرد، ئەوەتە (سکتـــۆس ئەمـــبـــریکۆس)«١٢» دەڵێت: (قوتابخانەی یەکەم قوتابخانەی ئەو گومانکارانەیە کـە لەبڕ یاردەرکـردن دەوەستن و بڕیار نادەن، کـەچی شوێنکەوتووانی ئەکادیمیەت بڕیار لەسەر ئەوە دەدەن کەوا مەعریفەی یەقینی بەدەست ناهێنرێت، بەوەش بڕیارێکی یەکلاکەرەوە دەردەکـەن) «١٣». کـەواتە بەپێی ئەم پۆلینکردنەی (سکتۆس) بیرونیـەکان و ئەکـادیمیـەکـان جیـاوازن لەمـەسـەلەی گـومـاندا، بیـرونیـەکـان بڕیار لەسـەر هیچ شـتـێـک نادەن لەبەرئەوەی چونکە گـومـان لەبڕیاردکـەی خـۆیان دەکەن، کەچی ئەکادیمیەکان گـومان دەکەن ودوای گومانیش دەگەنە راستی ئەوەی کەوا ناتوانن بگەنە راســتی، گــەیشتن بەحــاڵەتی یەقین نەگــەیشتن بەراســتی واتا گــەیشتن بەحــاڵەتی یەقین لەنێــو مەسـەلەی گوماندا، لەبەرئەوەی بڕوابوون بەگومان و توانانەبوون لەســەر دەرکـــردنی راســـتی جـــۆرە مــەعــریفــەیەک لەخــۆیەوە دەگــرێت، ئەوە جـۆرە مەعریفەیەکەو گەیشتنە بەتوانای نەبوونی ئیدراک کــردنی مــەعــریفــە، ئەوە دەرکــردنی بڕیارێکی نێگەتیڤانەیە لەئاست ئەم مەسەلەیەدا.

هەر لەوکاتەشەوە (سکتۆس) گەیشتبووە ئەو باوەڕەی کـەوا رەتکردنەوەو دانپیـانەنان شێـوەیەکە لەشێـوەکانی مـەزهەبی یەقـینی کە لایەنگرانی دان بەوەدا دەنێن گوایە دەکرێت راستیەکان دەرکیان پێ بکرێت و مەعـریفـەش بەدەست بهێندرێت لەهەمـان کـاتیـشـدا وەسـتـاندنی بڕیار دەرکـردن رەتدەکەنەوە وەکـو ئەوەی گـومـانی ئەپسـتـمۆلۆژی بۆی دەچێت، جگە لە (سکتـۆس) فـەلسـەفـە کـارێکی دیکەش گــومــانی لەمــەعــریفــەی هەســتی دەکــرد ئەویش (ئەنســیـدامـــۆس) بووکــاتێـک چەندین بەهانەو بەڵگەی بۆ نەبوونی مــەعــریفـەو دەست نەکـەوتنی هێنایەوە، بەڵام بەڵگەو بەهانەکان دەکرێت بەگشتی بکرێنە دووجۆرو دووبەش، بەشێکیـان پەیوەست بوو بەبیـرۆکـەی هۆکـار ئەوی دیکەشیـان پەیوەست بوو بەتیـۆری مـەعـریفـەی بەگـشـتی لەباردی بیـرۆکـەی هۆکــــار)ی دەبینین رەخنەی توند ئاراستــــەی ئەبیکۆریەکـان دەکـات و دەڵێت: (ئایا دەکـرێت وامـەزندەی هۆکـار بکـەین بەوەی کـەوا شـاردراوەو نادیارە؟ ئەگـەر وابێت ئایا ئەو هێـمـایانەی کـەوا دیارن دەکــرێت بەڵگەبن لەســەربوونی هۆکـــاری نادیار؟ جگە لەوەش دەکـرێت هێـمـاکـان بەراڤـەی جیـاواز راڤـەبکرێن، لەبەرئەوەی تاکە هێـمـایێک رەنگـە دەلالەت یا مـــرۆڤ بەچەندین جــــۆری تێگەیشتن تێی بگات، بۆ نموونە دکـتــۆرەکــان ئەوانەی لێـدانی ترپەی دڵـی مـرۆڤـێک دەپێـون بەچەندین تەئویلی جـیـاواز راڤـەی دەکـەن، جگە لەوەش ئەبیکۆریەکـان ناچارن لەهەندێک مەسـەلەدا بەتەنهـا جـەخت بکەنە سـەر هەندێک سـەرچاوە بەوەی گوایە هۆکاری شتێکن، هەندێک جاری دیش ئاماژە بەهۆکـاری وادەکەن بۆ خـۆیان ناتوانن هەمـوو ئەوشتـانەی لێـوەربگرن کـە پێـویسـتـیانە، هەروەها جیـاوازی لەنێـوان پاشـماوە جیـاوازەکان ناکـەن کە دەرەنجـامـی یەک شتن، لەوانەش دەردەکـەوێت کـە بیرۆکەی هۆکارێتی بیرۆکەیەکی راست نیە)«١٤».

جگە لـەم بـەهـانـەیە لەدژی هـۆکـــــارێتی (ئەنسیدامۆس) بەهانەی دیش دەخاتەڕوو کە دژی مـەعـریفـەیە بەگـشـتی و هەڵوێـسـتی سـەرجـەم گـومـانکـارەکـانە بۆیە بە(هەڵوێستی گـومـانکاری) ناسـراون و بریتـیـە لە (١٠) بەهانە، یەکـەمـیان مرۆڤ لەئاست ئاژەڵدا جیاوازە چونکە ئەوەی بەسەر هەسـتی ئاژەڵدا دەسـەپێت بەسـەرهەسـتی مـرۆڤـدا ناسـەپێت، بەم پێـیـەش هەسـتـەکانی مـرۆڤ و ئاژەڵ جیـاوازن، لێرەدا دەبینین (سکتـۆس) کـاتێک لەلای خـۆیەوە ئەم بەهانەیە شـیکـاردەکـات ئامـاژە بەوە دەدات گـــوایە ئاژەڵ لـەمـــرۆڤ بـەرزترە، دووەم هەسـتـەکان جیاوازن بەجیاوازی مرۆڤەکان بۆیە ئەوە پەیوەسـتـە بەجەسـتـەو دەروون، سێیـەم، هەسـتـەکان کـاتێک شـتـێـک ئیـدراک پێـدەکـەن لەنێـو خـودی خـۆیاندا جـیـاوازو ناکـۆک دەبن لەبەرئەوەی هەر هەستێک بۆ خۆی بەشێـوەیەک مەزندەی دەکات جیا لەمـەزندەی هەسـتـەکـانی دی، چوارەم، لەنێـو یەک هەستیشدا ئەو هەستانەی لەیەک جۆرن جیاوازن و لەگـۆڕاندان بەپێی حـاڵەتی ئەو کـەسـە لەکـاتی هەسـتكردندا، پێنجـەم و شـەشـەم و حـەوتەم و هەشتەم و نۆیەم پەیوەستن بەو بارودۆخە جیاوازانەی کەوا پێیانەوە هەستەکان لەواقیعدا راست دەرناچن لەئاسـتی ئیدراکی هەسـتی سەبارەت بەدووری، یا پەیوەندی شـتـێـک بەشـتـێکی دیکەوە یارێژەی شتێک لەئاست شتێکی دیکەوە... هتد، لەهەموو ئەو مەسەلانەدا بەردەوام تێبینی ئەوە دەکرێت کەوا جیاوازی دەکەوێتە نێو هەستەکان بەپێی رێژەی ئەو جـیـاوازیانەی نێـوان خـودی شـتـەکـان، دەیەم، پەیوەسـتـە بەم هەمـوو هەڵە زۆرەی نێـو مـەعـریفـەی کـلاسـیکی کـە ئەوەکـان لەسـەلەفی رابردوو وەری دەگـرن، ئەم (١٠) بەهانەیە هەڵوێـستی گـشـتی گومانکاریە لەئاست بەدەست نەهێنانی مەعریفەدا، کــەچی دەبینین (ئەگـریپـا)ی هاوسـەردەمی (ئەنسـیـدامۆس) جگە لەم (١٠) بەهانەیە بۆ خـۆی

• مـرۆڤ لەسـایەی ئیدراکەوە دەکرێت مـەعـریفـەی راستەقینە بەدەست بێنێت

٤) بەهانەی دیکەش دەهێنێتە ئاراوە کە دژی دەستهێنانی مەعریفەیە بۆیە دەڵێت:

١- هەر قسەیەک بکەین دەتوانین قسەیەکی ...یکەی بەهەمان پلەی یەقینەوە بخەینە بەرامبەرو ...ی. ئەوەش بەدژکاری ناسراوە.

٢- ئەگەر بڵێین دەکرێت پرنسیپەکانی مەعریفە ...ین، ئەوە ئەوەمان بۆ ناکرێت تەنها لەڕێگای ...ە دەرککراوو دیارەکانەوە نەبێت، واتا هەموو ...ەیەک و گوتەیەک سیفەتی گریمانی تیادایە.

٣- بۆ ئەوەی گوتەیەک بسەلمێندرێت ئەوە ...ێت لەسایەی گوتەیەکی پێشتری ئەوەوە بێت، ... شێوەیەش بەبێ کۆتایی دەبێت گوتەیەکی پێشتر ... بهێنێت تاوەکو گوتەی دواتری پێ بسەلمێنێت ...کو ئەوەی دەگەینە زنجیرەیەکی بێ کۆتایی و ...ەوە.

٤- بۆ ئەوەی شتێک بسەلمێندرێت لەڕێگای ... شتەوە نەبێت ناسەلمێندرێت.

٥- بەهانەی بازنەی داخراو، ئەوەش دەکاتە ...ی ئەوەی لەهەموو سەلماندنێک بۆ توانای ...مەعریفە پەیوەستێک هەیە لەبەرئەوەی مرۆڤ ...تێک گەردکیەتی توانای بوونی مەعریفە یا ...ی عەقڵ لەسەر مەعریفە بسەلمێنێت دەبێت ...ت بەتوانای عەقڵ ببەستێت وەکو ئەوەی شتێک ...یەی خۆیەوە بسەلمێندرێت ئەوەش مەسەلەیەکی ... لێنەکراوە«١٦».

بەڵام گومانی ئەپستمۆلۆژی لەلای زۆر ...ێژوونووسان فەلسەفە مانایەکی تۆتالیتاری ...یکەی فراوانتری هەیە لەبەرئەوەی دەبێتە مانای ...تکردنەوەی مەعریفەو دانپیانان بەنەبوونی وەکو ... گومانەی سۆفستائیەکان هەیان بوو، یا ... نەبوونە بەئامرازەکانی مەعریفەو خۆ بەلاوەنان ... کێشەو ناکۆکیانەی نێوان فەلسەفەکاران بەخۆ ...گرتن وەکو ئەوەی شوێنکەوتوانی ئەکادیمیەتی ...ی کۆن دەیانکرد، سۆفیستائیەکان کە ...مەعریفەیان بۆ هەست دەگێڕایەوە گەیشتنە ئەو ...ەی هزر هەرگیز ناکەوێتە سەر شتێکی جێگیر ...یە توانای دەرکردن بڕیاری گشتیان ڕەتکردەوە ...ئەوەی دەرکردنی بڕیاری گشتی وادەخوازێت ...ۆکەکە لەنێو هەموو عەقڵەکاندا بوونی هەبێت و ... دەبێت. لەگەڵ ئەوەی پێیان وابوو ڕاستی تەنیا ...یوەستە بەتاک، واتا هەر ڕاستییەک تەنها ...یوەستە بەخودی ئەو کەسەی پێیگەیشتووە، ...هەمان کاتیشدا ڕاستی ڕەهای گشتیان ...تکردەوە. لەبری ئەویش دانیان بەبوونی کۆمەڵێک بەش بەشی ڕاستی دانا جەختیشیان کردە سەر ئەوەی کە ڕەنگە هەندێک شت هەیە لای کەسێک ڕاستیە لەهەمان کاتیشدا لای یەکێکی دی هەڵەیە لەگەڵ ئەوەشدا پێیان وابوو هەردوو کەسیش ڕاست دەکەن لەبەرئەوەی تاکەکەس بۆ خۆی بەتەنیا پێوەری ڕاستیەکانە.«١٧»

سۆفستائیەکان بەگشتی لەدوو لایەنی دژ بەیەکەوە دەستیان پێکرد تاوەکو گەیشتنە یەک دەرەنجام، هەندێکیان پشتیان بەمەزهەبەکەی (هرکلیتس)«١٨» بەست و هەندێکی دیش بەمەزهەبەکەی (بارمدیس))«١٩»، لێرەدا دەپرسین چۆن لەدوو ئاراستەی دژیەک دەستیان پێکردو لەکۆتایشدا گەیشتنە یەک دەرەنجام، سەرەتا دیارە پێشڤەچوونی دیالێکتکیانەی مێژوو پەیوەستە بەکارو کاردانەوەو ململانێی دژەکان و گۆڕینی چەندایەتی جیاواز بۆ چۆنایەتیەکی بابەتی جیاوازتر. ئەوە لەلایەک و لەلایەکی دیکەشەوە خودی سۆفستائیەکان پەیڕەویان لەم مەزهەبە مەعریفیانە دەکرد هەرگیز مەبەستیان ئەوەنەبوو بانگەشەی خودی ئەم مەزهەبانە بکەن کە بوونیان هەیە لەبەرئەوەی سۆفستائیەکان هیچ بایەخێکی ئەوتۆیان بەتوێژینەوە سروشتیەکان نەدەدا چونکە ئەوانە ڕوویانکردبووە مرۆڤ و لەخودی مرۆڤیان دەکۆڵیەوە. لەبەرئەم دووفاکتەرە زۆر سروشتی بوو گەر لەدوو ئاراستەی پێچەوانەو دژیەک دەست پێبکەن (بروتاکوراس)«٢٠» پشتی بەمەزهەبەکەی (هرکلیتس) بەست، بەڵام هەرگیز بەهەموو وردەکاریەوە لایەنگی ئەم مەزهەب و بۆچوونە نەبوو بەڵکو تەنها پشتی بەبیرۆکەی سەرەکی باڵادەست بەست ئەویش بریتی بوو لەوەی بوون بەردەوام لەپێشڤەچوون و ڕۆیشتن و داڕژان دایە، بۆ بەجەختی لەسەرئەوە دەکرد کە هەموو سروشت لەگۆڕانی بەردەوام دایە، ئەم گۆڕانە لەنێوان دژکارەکانیشدایە بۆیە دژکارێک بەردەوام دەگۆڕێت بۆ دژکارەکەی دیکە ناکرێت سیفەتێکی دیاریکراو بەسەر هیچ شتێکدا بڕیاربدەین، تاکە سیفاتی شتەکان گۆڕانە لەدژەوە بۆ دژ بۆیە ناتوانین بەشتێک بڵێین ئاوایە یا ئەوها نیە بەڵکو بەردەوام دەگوترێت ئاوای لێدێت و ئاوای بەسەردێت، واتا لێرەدا کرداری کەینوونە، یابوون دەبێت بگۆڕێت بەکرداری سەیرو ڕەت و گۆڕان، گۆڕانەش لەسەر دوو جۆرە کاروکاردانەوە، ئەو شتە کار لەشتەکەی دی دەکات، شتەکەی دیکە لەژێرکاریگەری و کارلێکردنی شتەکەی یەکەمدا دەبێت، لەبەرئەوەی زاراوەو وشەی کاروکاردانەوەش ناکرێت بەبێ یەکدی

**• مەعریفەی ڕاستەقینە بریتییە لەمەعریفەی ماهیەت، زانستیش دەبێت لەسەر ئیدراک کردنی ئاشکرای ماهیەتەکان بونیاد بنرێت**

بوونیان هەبێت، یاخود هەریەکەیان بۆ خۆی بەتەنیا مانابەخش نین تەنها گەر بەیەکەوە نەبن ئەوەش وا دەخوازێت بەردەوام پەیوەستی یەکدی بن، هەستکردنین ئەوکاتە بەردەوام لەنێوان دووشتی دژکاردا دەبێت کەوا لەژێر کاروکاردانەوەدان، هەست ئەوکاتە ئیدراک بەم دژایەتی کردن و گۆڕانە بەردەوامە دەکات بۆیە بەپێی ئەم گۆڕانە بەردەوامە ئەویش لەمرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی دیکە دەگۆڕێت چونکە هەر کەسێک لەگۆشەنیگاو دیدگای خۆیەوەو بەشێوازێکی جیاواز ئەم گۆڕانە بەدی دەکات سیفەت و خاسیەتە جیاوازەکانیش دەستکردی مرۆڤن و ناکرێت بلێین لەدەرەوەدا بوونێکی راستەقینەیان هەیە، بەپێی ئەوەش مەعریفەی هەستی کەمەعریفەیەکە پەیوەستە بەتاکەکەس و پشت بەتاک دەبەستێت، ئالێرەدا (بروتاگوراس) وتە ناودارەکەی خۆی دەڵێت: (مرۆڤ پێوەری هەموو شتێکە، ئەوەی بوونی هەیە وەکو ئەوەی بوونی هەیە، ئەوەی بوونی نیە وەکو ئەوەی بوونی نیە)«٢١»، کەواتە هەرشتێک ئەگەر بەهەستەکانمانەوە هەستی پێنەکەین لەلای (بروتاگوراس)دا بوونی نیە لەبەرئەوەی ئەگەر هەستەکان بەلاوە بنێین ئەو پێی وایە بەهیچ شێوەیەک ناتوانین مەعریفە بەدەست بێنن.

گومانی ئەپستمۆلۆژی لەسەردەمی نوێدا لەفەرەنساو ئینگلتەرا دەست پێدەکات بەتایبەتیش لەسەدەی (١٦) هەمداو لەسەر دەستی (کۆرنی ئەگریبا - سانتیە - مونتانی)، ئەوانە هاتن ئەو مەزندەو راستیانەی سەردەمی خۆیانیان لەقاندو لەرەگوڕیشەوە هەڵیان تەکاندن، ئەو مەزندانەی وایان لەمرۆڤ کردبوو بکەوێتە هەڵەی ئەوەی گوایە لەنێو زانستەکاندا گەیشتۆتە یەقین، بۆیە پێوەرە باوەکانی بڕیاردان و تاقیکردنەوە لەناوچوون و نەمان، یەقینیش بوونی سڕایەوە، بەم جۆرەش هێدی هێدی گومان جێگای گرتەوە لەبەرئەوەی ئەگەر هەموو شتێک مومکین بێت ئەوە دیارە هیچ شتێک بەڕاستی بوونی نیە، ئەگەر هیچ شتێکیش بەڕاستی بوونی نەبێت دیارە تەنها هەڵەبوونی هەیە، (ئەگریبا) هەموو زانستەکانی لێکداوەو راڤەکردووەو بەسەرکردەوە تاوەکو بگاتە یەقینی بوونیان ئینجا دواتر گومانی خۆی لەئاست سەرجەم زانستەکاندا راگەیاند، گومانی ئەوەی زانستەکان مرۆڤیان هەڵخەڵەتاندووە، گومانی ئەوەی راستیەکان راستی نین، بەڵکو رەنگە هەڵەبن و لەلای مرۆڤدا وەکو راستی مەزندەکران و واش مامەڵەیان لەگەڵدا کرابێت، (سانشیە) هات و رەخنەی زۆری ئاراستەی هزری مرۆڤ کرد و لەساڵی (١٥٦٢)دا رایگەیاند: (ئێمە هیچ شتێک نازانین، بگرە ناتوانین هیچ شتێک بزانین، نەجیهان و نەخودی خۆمان)«٢٢» ئەو راگەیاندنەی (سانشیە) مرۆڤی هێنایەوە هۆش خۆی، ئەو مرۆڤەی لەچرکەساتێک لەچرکە ساتەکانی مێژوودا پێی وابوو لەنێو زانستەکاندا گەیشتۆتە راستی یەقینی و هەنگاوی مەزنی هاوێشتووە بۆ گەیشتن و نزیکبوونەوە لەڕاستیە مەزنەکان، گومانکردن لەنەزانینی جیهان کێشەیەکی مەزن نەبوو ئەوەی کێشەیەکی مەزنی نایەوە دانپیانان بوو بەوەی مرۆڤ نەوەکو جیهان بگرە خودی خۆشی ناناسێت و نازانێت و نەگەیشتۆتە ئاستێک لەمەعریفەی یەقینی تاوەکو خۆی پێ بناسێت، دواتریش (مونتانی)«٢٣» هەمان هەڵوێستی گرتە بەرو ئاماژەی بەوەدا کە مرۆڤ هیچ شتێک نازانێت لەبەرئەوەی بۆخۆی هیچ نیە! راوبۆچوون و گومانی ئاوا توندڕەو لەئاست ئیدراک و مەعریفە وای لە (مونتانی) کرد دەست بەرداری هەموو لێکۆڵینەوەو توێژینەوەکانی خۆی بێت دەربارەی جیهانی دەرەوە چونکە گەیشتە ئەو باوەڕەی جیهانی دەرەکی جیهانی گومانە بۆیە هات لەنێو دالانەکانی نێو دەروونی خۆیدا بەدوای راستی و یەقین گەڕا تاوەکو بەتەواوی گەیشتە گومانکردن لە هەموو شتێک، بەڵام لەئینگلتەرا ئەوەی بانگەشەی گومانکاری دەکرد (داڤید هیوم)«٢٤»بوو. کە بەفەلسەفەکاری گومانکار ناوزەدکرابوو، بگرە ئەو بۆخۆیشی ئەو ناوەی لەخۆی نابوو، زۆر بەشان و باڵی فەلسەفەکارو هزرڤانە گومانکارەکان هەڵدەداو ئەو مەعریفەیەی ردتدەکردەوە کە لەسەر عەقڵ بوونیاتنرابوو، بۆیە تێڕامانێک لەهزری (هیوم) لەشیکارکردنی مەعریفەدا دێتە بەرچاو کەوا لەهەموو مەسەلەیەکی عەقڵ بەدەرەو بەپێی پرنیسپەکانی هەست گریمانی بەهای مەعریفە دەکات، بەپێی ئەم شیکارکردنەش ئەو بەپێی پرنسیپی مەزندەگەری دەگاتە ئەو باوەڕەی هیچ شتێک نایێتە ناو زەین تەنها وێنە یا ئیدراک نەبێت، بۆیە مەزهەبەکەی ئەو بەسەر دووخاڵدا دابەش دەکرێت، ئەو دووخاڵەش بەرەو دەرەنجامی گومانکردنی زیاتری ئاراستە دەکەن، ئەوەبوو وەکو گومانکارێک خۆی دەرخست، لەلای (هیوم) مەعریفە بەگشتی بریتییە لەکۆمەڵە ئیدراکێک یاهزر بەزمانی (دیکارت)و ماناش بەزمانی (لۆک و بارکلی)، ئیدراک بۆخۆی دەبێتە هەڵچوون و هزر یا مانا و پەیوەندی نێوان خودی ماناکان لەگەڵ یەکتریەوە، لەلایەکی دیکەوە لەنێوان ماناو هەڵچوونەکاندا. هەڵچوونەکان بۆ خۆیان دیاردەی ویژدانین، یا بریتین لەئیدراکی دیارو بەهێزی خۆمان وەکو هەڵچوونی هەستە دیارەکان، چێژو ئازارو هەڵچوونی بیرکردنەوە، خۆشەویستی و رق لێبوونەوە، سکاڵاو ترس، ماناش وێنەکردنی هەڵچوونەکانی بۆیە لەهەڵچوونەکان بێهێزترە، مانا هیچ بەهایەکی نیە گەر وێنەی هەڵچوون یا کۆمەڵە هەڵچوونێک نەبێت، ئەگەر واش نەبوو ئەوە دیارە پێکهاتەیەکی لێکدراوی دەستکردە دەبێت لەبنەچەکەی بکۆڵدرێتەوەو بەلاوەبنرێت، ئەوە تاسەبارەت بەمانا دەڵێت: (لەڕاستیدا سەرجەم مانا هەمەکیەکانمان مانای بەش بەش و بچوکن و پەیوەستن بەناوێکی هەمەکی)«٢٥».

پەیوەندیەکان لەلای (هیوم) بەهۆی کرداری یاسایەک دێتە بوون بەیاسای دارژانی مانا ناوزەدی دەکات، یاساکانیش یاسای هاوشێوەو بەراوردەکارین لەشوێن و کات و هۆکاردا، ئەم یاسایانە یا سامەرەتاییەکانی زەین بۆ خۆیان لەنێو زەیندا کاردەکەن بەبێ ئەوەی زەین دەستیان تێوەربدات، لەلای ئەو زەین کارێکی وای نیە لەلێکدان و دروستکردن و ئەبستراکت کردندا کەوا شێوازی پێکهاتنی مانان و فەرمانی زەین تەنها دەکاتە وەرگرتنی هەڵچوونەکانە تاوەکو لەسایەی ئەم هەڵچوونانەوە بەشێوەیەکی میکانیکی بەپێی یاسای دارژانی مانا، مانایان لێوەردەگرێت،

پەیوەندی نێوان زانستکانیش دووجۆرە، ئەو پەیوەندیانەی نێوان هەڵچوونەکان بوونیادنراوە لەوەی هەندێک هەڵچوون هۆکارن و هەندێکی دیکەش ئەنجام و کارلێکراون، کەچی جۆرەکەی دی پەیوەندی نێوان خودی ماناکانە، کاتێکیش قسە لەسەر عەقڵ دەکات ئاماژە بەوە دەکات کە عەقڵ ناتوانێت ئەوە بسەلمێنێت کە ئەو حاڵەتانەی ناکەونە نێو رووداوە ئەزموونیەکانمان دەبێت هاوشێوەی ئەم حاڵەتانەبێت کەوا ئەنجامان داوە، بەم شێوەیە تێرامانی (هیوٚم) بۆ فەلسەفە بەگشتی ئەوەبوو کە فەلسەفە بریتیە لەو گومانەی مرۆڤ لە دەوروبەرو مەعریفە دەیکات.

لەولاشەوە (بارکلی)«٢٦» گەیشتبووە ئەو جۆرە گومانەی گومان لەبوونی جیهانی دەرەوە بکات و پێی وابوو تەنها وەهمێکە ئەگینا لەواقیعدا بوونی نیەو پێی وابوو خودی عەقڵ بۆخۆی بریتییە لەکۆمەڵێک هەستی لەدوا یەک هاتوو لەژێر کاریگەری دارژانی مانادا، مەسەلەی هۆکاریشی بەمانا تەقلیدیەکەی رەتکردەوە ئەوکاتەی راوبۆچوونی عەقڵیەکانی بەلاوەنا کاتێک بانگەشەی بوونی پەیوەستکارێکی پێویستی بوونیادنراویان لەنێوان هۆکارو دەرەنجامدا کرد، ئەو بانگەشەکردنەی (بارکلی) و بەلاوەنانی هۆکارێتی تەقلیدی زەندەقی فەلسەفەکارە عەقڵیەکانی بردو (بارکلی)یشی بەئاراستەیەکدا بردو جۆرە گومانێکی هێنابوون نەگومانی کۆنی (بیرون) بوو، نەگومانی نوێی (مونتانی)، لەگەڵ ئەوەشدا گومانێکی بوونیادنەر بوو نەوەکو روخێنەرو مەبەستی ئەوەبوو بگاتە سەر سنووری مەعریفەی مرۆڤایەتی پاش ئەوەی ئەو سنوورانەی رەتکردەوە کە فەلسەفەکارە عەقڵیەکان بوونیادیان نابوو، بەلاٚم دەبێت ئەوەش بڵێین کەوا گواستنەوە لەدڵنیایی و یەقینەوە بەرەو گومانکردن پرۆسەیەکە ناکرێت بەردەوام بێت، بۆیە کاتێک دەڕوانینە مێژووی فەلسەفەو هزری مرۆڤایەتی ئەوە بەدی دەکەین لەدوای هەر قۆناغێک لەقۆناغەکانی گومانکاریدا قۆناغێکی دیکە دێتە ئارا تیایدا جەخت لەسەریەقینی عەقڵ و دڵنیایی و دڵنەوایی دەکرێتەوە قۆناغێک دێت گومانکردن بەلاوە دەنێت، مێژووی گومان بۆ خۆی شایەدی ئەم راستیەیە، گومانی سۆفستائیەکان یەقینی (سوکرات و ئەفلاتون و ئەریستۆ)ی بەدواداهات، گومانی قوتابخانە دواکانی یۆنانی یەقینێکی فەلسەفی و ئاینی سۆفیانەی بەدواداهات کاتێک شارستانیەتی یۆنانی لەگەڵ شارستانیەتە دەوڵەمەندو مەزنە ئاینیەکانی رۆژهەلاٚت کاریان لێککرد، گومانی فەرەنسا لەسەدەی (١٦)هەمدا یەقینێکی ئاینی لەلای (شارۆن)و ئەزموونگەری لەلای (بیکۆن) و عەقڵیکان لەلای (دیکارت)و قوتابخانەکەی بەدواداهات، (کانت)یش لەسایەی مەزهەبە رەخنەییەکەیەوە گومانەکەی (هیوٚم)ی بەتاڵکردەوە«٢٧».

**مەزهەبی یەقینی**

یەقین وەکو پێناسەیەکی لۆژیکی: بریتییە لەهەر مەعریفەیەک جێگای گومان و دوو دڵی نیە، بۆیە هەندێک جار دەبێتە یەقینێکی حەدەسی ئەوکاتەش دەکاتە بڕوابوونی تەواو بەهەندێک هزری پێشینە لەنێو زەیندا، یا یەقینی بەڵگە خوازی مرۆڤ پاش سەلماندنی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پێی دەگات، یاخودیەو تایبەتە بەبڕواو قەناعەتی تاکێک و ناتوانێت بگوازرێتەوە یەکێکی دیکە، یا یەقینێکی بابەتییە خۆی دەسەپێنێتە سەرعەقڵی مرۆڤ وەکو یەقینی زانستی، «٢٨» بۆیە لێرەدا ئەگەر گومانکارەکان پێیان وابوو مرۆڤ ناتوانێت بگاتە راستی یەقینی هەموو مەعریفەیەک بۆیە دەبێت لە بڕیاردان بووەستێت و قسە نەکات! ئەوە یەقینیەکان جەختیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە مرۆڤ دەتوانێت بگاتە راستی هەموو راست و مەعریفەیەک، لەگەڵ ئەوەی لایەنگرانی یەقینیەت لەسەر ناوەڕۆک و جۆری مەعریفەکان جیاوازو ناکۆک بوون، بەلاٚم بەگشتی لەسەر ئەوە کۆک بوون کە مرۆڤ لەسایەی ئیدراکەوە دەکرێت مەعریفەی راستەقینە بەدەست بێنێت ئەوەبوو لەسایەی ئەم بۆچوونەیاندا توانیان گومان وەکو تیۆرێکی مەعریفەی ئەپستمۆلۆژی تێک بشکێنن، بەلاٚم گومان وەکو میتۆدێک بۆ بیرکردنەوە لەلای زۆر لەفەلسەفەکارو بیریاراندا مایەوە، لەواقیعدا ئەو گومانەی بانگەشەی بۆ دەکرا لەنێو لۆژیکی عەقڵدا قەبوول نەبوو تەنها ئەو کاتە نەبێت کەمافی بڕیار دانمان لەعەقڵ سەندەوە، ئەوەش ناکرێت لەبەرئەوەی دیارە عەقڵ ئاڕاستە کاری بزاڤی رۆژانەی مرۆڤەو کاری پێشڤەچوونی کەوتۆتە ئەستۆ، خۆ ئەگەر دانمان بەوەش دانا هەموو بڕیارەکانی عەقڵ پووچ و بەتاڵن ئەوە ئەوکاتە دەبێت دان بەوەش دابنێین کە مرۆڤ ناتوانێت فێری هیچ شتێکیش ببێت، ئەوەش هەڵەیەکی گەورەیە فەلسەفەکارە گومانکارەکان تێی کەوتن، ئەگەر لەنێو لۆژیکی فەلسەفەشدا هەڵەبوونی نەبێت ئەوە دەکرێت بڵێین مەسەلەیە کەجێگای گومانێکی زۆرە، گومانکارەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە عەقڵ ئەو ئامرازە نیە بتوانێت بڕیاری راست و رەوان و دروست دەربکات، بەلاٚم لێرەدا دەپرسین باشە بەچ لۆژیکێک دان بەوە دابنێین ئەم عەقڵە دەبێت بەم بانگەشەکردنە بۆ نەزانی مرۆڤ رازی بێت؟ گومانکارەکان دەڵێن عەقڵ توانای ئەوەی نیە بڕیار لەسەر راستی یا ناڕاستی مەسەلەیەک بدات! باشە ئەی کەواتە عەقڵ چۆن بڕوا بەڕاستی گومان و راستی بۆچوون و ئاڕاستەکەی بکات؟ بەپێی ئەم لۆژیکە بۆ عەقڵ دیارە گومان وەکو مەزهەبێکی مەعریفی لەنێو ئەپستمۆلۆژیادا گومان لەخۆوە دەگرێت و لەناوەوەی خۆیدا دژکاری خۆی هەڵدەگرێت و بۆخۆی لۆژیکی خۆی پووچەڵ دەکاتەوە، ئەگەر بانگەشەکارانی گومانکاری دانیان بەوە داناوە کە ناکرێت مەعریفەی راست بەدەست بهێنرێت و گەیشتنە ئەو باوەڕەی راڤەکردنی شتەکان کارێکی سانا نیەو مەحاڵە! دانپیانان بەگەیشتن بەم لۆژیکە خۆی لەخۆیدا مانای بەدەستهێنانی مەعریفەو زانیاریە جا ئەم مەعریفەیە هەرچەندە کەم و بێ بابەخیش بێت!، بەلاٚم هەردەچێتە رێزی مەعریفە لەبەرئەوەی لۆژیکێکە قەبوولکراوە، کەواتە قەبوولکردنی ئەم مەعریفەیە بچووکەو بێ بەهایەش دەبێتە بناخەی قەبوولکردنی مەعریفەی گەورەو پڕ بایەخترە لەبەرئەوەی بەپێی لۆژیکی عەقڵ ئەوەی دان بەبوونی مەعریفەیەکی بچووکەوە بنێت دەبێت دان بەبوونی

مەعریفەی مەزنتریشەوە بنێت، لەگەڵ ئەم هەموو لێکدانەوەو راڤەکردنە بۆ گومان و پووچەڵکردنەوەی بۆ چوونەکان، گومان وەکو میتۆدێک بۆ بیرکردنەوە لەلای زۆر لەفەلسەفەکاراندا جێگای مەزن و دیاری مابوو، لەنێو لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی فەلسەفی و هزری و زانستیدا بەهای خۆی هەیە.

## گومانی میتۆدی

لەنێو ئەو چەند لاپەڕەیەی رابردوودا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژەمان بەوەدا کە گومان دەبێتە دووجۆر (گومانی راستەقینە یاڕەها - گومانی میتۆدی یا زانستی): قسەمان لەسەر گومانی رەهاکردو گوتمان خاوەنەکەی بەگومانەوە دەست پێدەکات و بەگومانیشەوە کۆتایی دێت، ئەو جۆرە گومانەش گومانێکی بێ ماناو مەبەست و تەمبەڵانەیە و رێگرە لەبەردەم بیرکردنەوەدا. بەڵام گومانی میتۆدی ئەوە بۆ خۆی میتۆدێکە فەلسەفەکار بەویستی خۆی بۆ یەکلاکردنەوەو هەڵهێنجانی زانیاریەکانی و پاککردنەوەی ئەم زانیاریانە دەیگرێتە بەر تاوەکو عەقڵی خۆی لەهەموو ئەو هەڵەو بۆچوون و تیۆرە گەندەڵانە پاک بکاتەوە کە رێگای بیرکردنەوەیان لێ گرتووە، ئەم گومانە میتۆدیە وا لەبیریاران دەکات لەخاڵی سفرەوە دەست بەکارو تێڕوانین و دیدگاکانیان بکەنەوە وەکو ئەوەی هیچ شتێک نەزانن، ئەوەش باشترین رێگایە بۆ بەلاودنانی هەڵەو پەیڕەوکردنی زانیاریە راستەقینەکان، هەنگاوێکە بۆ گەیشتن بەیەقین کەوا ئاڕاستە کارە بەرەو مەعریفەی راستەقینەی راست لێرەشدا گومانی میتۆدی دەبێتە شێوازێک نەوەکو ئامانج و مەبەست فەلسەفەکارە مەزنەکانی گریک پەیڕەویان لەگومانی میتۆدی دەکردو پێیان وابووە زۆر پێویستە لەنێو دیالۆگ و لێکۆڵینەوەی فەلسەفیدا پەیڕەو بکرێت، (سوکرات) کاتێک دیالۆگی لەگەڵ هۆشمەندو بیریارانی سەردەمی خۆی دەکرد پەیڕەوی لەم گومانە میتۆدیە دەکرد تاوەکو لەسایەی ئەم شێوازەی گومانەوە بتوانێت هەڵەکان ئاشکرا بکات و ریسوایان بکات و راستیەکانیش جێگیرتر بکات، میتۆدی (سوکرات) لەکاتی دیالۆگ و وتوویژ لەگەڵ نەیارانیدا زۆر ناسراوە لەمێژووی فەلسەفەداو دەبێتە دوو لایەن، لایەنی نێگەتیڤی بریتییە لە پێکرد (تەهەکوم) کە دەگاتە دەرەنجامی ئەوەی عەقڵ لەهەڵەو کەموکوڕیەکان پاک بکاتەوە، لایەنی پۆزەتیڤی بریتییە لەداهێنانی بوون و مرۆڤ بەرەو راستی ئاڕاستە دەکات، لەقۆناغی یەکەمدا (تەهەکوم)ی (سوکرات) وا دێتە بەرچاوی نەیارانی وەکو ئەوەی لێیانەوە فێری مەعریفە دەبێت و نەزانینێکی دروستکراو بۆ خۆی بوونیاد دەنێت و بەقسەیان رازی دەبێت، دواتر دەست بەپرسیار دەکات، پرسیارکردن بازدانە بەرەو قۆناغی دووەم و لایەنی پۆزەتیڤی میتۆدەکەیە، لەسایەی پرسیارە گومان لەوشتانە دەکات کە بانگەشەی بۆ دەکەن، لەپرسیارکردن بەردەوام دەبێت بەشێوەیەک لەنێو قسەو بۆچوونەکانی ئەواندا هزری نوێ تێزو راوبۆچوونەکانی خۆیاندا، بەم شێوەیە قۆناغی گاڵتەپێکردن (تەهەکوم) بەوە کۆتایی دێت کە عەقڵ لەهەڵەولادان دەرباز بکات،«٢٩» بۆیە کاتێک (سوکرات) دەگاتە کۆتایی ئەم قۆناغە دەست بەقۆناغی دووەم دەکات و بەرامبەرەکەی بەرەو راستی ئاڕاستە دەکات لەسایەی ئەو میتۆدەی لەشتی بچووکەوە بەرەو مانای هەمەکی ماهیەتی گشتیەوە هەنگاوی دەنا لەبەرئەوەی ئەو پێی وابوو بۆ زانینی شتێک نابێت تەنها پشت بەبوونی هەستپێکراوی ئەو شتە ببەستین، بەڵکو دەبێت ماهیەتی ناقووڵی بزانین تاوەکو دەگەینە یەکێتی هەمەکی شتەکە لەبەرئەوەی مەعریفەو زانینی بەشە بچووکەکانی شتێک مەعریفەیەکی ناتەواوەو بەرەو هیچ شتێکمان نابات، ئەوەی بەڕاستی بەرەو شتێکمان ئاڕاستە دەکات مانای هەمەکی و مەعریفەی هەمەکیە بۆیە مانای هەمەکی دەبێتە بنەڕەتی، بەبێ بوونی بنەڕەتیش مەعریفەی راستەقینە بوونی نابێت، ئەوە مەزهەب و فەلسەفەی (سوکرات) بوو بۆ گەیشتن بەمەعریفە، چونکە مەعریفەی راستەقینە بریتییە لەمەعریفەی ماهیات، زانستیش دەبێت لەسەر ئیدراک کردنی ئاشکرای ماهیەتەکان بوونیاد بنرێت، بەم شێوەیەش (سوکرات) خاڵی قورسایی مەعریفەی لەمەعریفەی بەشە بچووکەکانەوە بەرەو مەعریفەی ماهیەت و گشتەوە برد، گرنگترین هەنگاوی ئەم میتۆدە قۆناغی دووەمیەتی کەوا قۆناغی دروستکردن و بەرهەمهێنانە لەبەرئەوەی ئەو پێی وابوو ئەگەر مرۆڤ زانستی راست نازانێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا راستی وای لەناوەوەدا هەیە دەکرێت لەخەڵکانی دیکەوە وەریان بگرێت، چونکە ئەم راستیانە مرۆڤ پێیان نازانێت لەگەڵ ئەوەی لەناوەوەیدایە شێوازی دەرهێنان و دروستکردن و بەرهەمهێنانی ئەم زانیاریانەش دیالۆگە«٣٠» (ئەرستۆ)ش لەکتێبی (میتافیزیکیا)دا گەیشتە ئەو گومانە میتۆدیەو جیاوازی کرد لەنێوان گومانی میتۆدی و گومانی رەها، بۆیە گومانی راستەقینەی رەهای بەلاوەناو پاڵپشتی گومانی میتۆدی کرد، بگرە لەوەش زیاتر بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە زۆر پێویستە لەکاتی لێکۆڵینەوە فەلسەفی و مەعریفیەکاندا هزرڤان گومانی میتۆدی پەیڕەو بکات لەبەرئەوەی (ئەرستۆ) ئەم پەیوەندییە پێویستە بوونیاتنراوەی نێوان گومان و مەعریفەی راستەقینەی دۆزیەوەو توخمی بڕوای نقووم بووی شاردراوەی لەنێو گومانی پاک و بێگەردا دۆزیەوەو گەیشتە ئەو باوەڕەی ئەو بیریارەی گەرەکیەتی مەعریفەیەکی راست و رەوان بەدەست بێنێت ئەوە دەتوانێت لەسایەی گومان و لێکدانەوەی لەسەرەخۆی میتۆدیەوە بگاتە مەبەست و ئامانج لەبەرئەوەی ئەو مەعریفەیەی لەدوای گومانەوە دێت زۆر لەڕاستیەوە نزیکە بۆیە دەڵێت: (ئەوانەی سەرەتا بەبێ گومانەوە دەست بەلێکۆڵینەوەی زانستی دەکەن وەکو ئەو کەسانە وان کە بەڕێگایەکدا دەڕۆن و نازانن پێویستە لەسەریان چ ئاڕاستەیەک بگرنەبەر)«٣١»، هەربۆخۆیشی وا رێنمایی هزرڤانان دەکات کە هەر بڕیارێک دەردەکەن دەبێت سەرەتا ئەو هۆکارانە دەستنیشان بکەن کە پاڵپشتی لێدەکەن و ئەو بەهانانە بهێننەوە کە دژایەتی دەکەن، کەواتە ئەو گومانەی (ئەرستۆ) قسەی لەسەر دەکات هەنگاوێکە بۆ گەیشتن بەیەقین.

توێژینەوە عەقڵیە نوێیەکانیش بڕوایان بەم گومانە هەیە بۆیە

(هاملتـــــۆن)«٣٢» لەو باوەڕەدابوو بیـــــریاران بۆیە پەیڕەو لەگومانکردن دەکەن بەو هیوایەی بیانگەیەنێتە ڕاستی یەقینی، (لاد)یش پێی وایە گومان و لێکۆڵینەوەو پووچەڵکردنەوە تیۆرو ڕاوبۆچوون و سەلماندنیان و بەلاوەنانیان لەبواری ڕەفتارو زانست و بیرکردنەوەی تیۆریدا زۆر پێویستە بۆ پێکهاتنی مەعریفە، بگرە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بەدەست هێنانی مەعریفەو زانیاری ڕاستەقینە لەسەر ئاڕاستەیەکی عەقڵی بوونیادنراوە کە بەگومان و نازانمگەری«٣٣» دەردەبڕێت، (دیکارت)یش لەکتێبی (پرنسیپەکانی فەلسەفە)دا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئێمە بۆ ئەوەی ڕاستی بپشکنین دەبێت گومان لەهەموو ئەو شتانە بکەین کە ڕووبەڕوومان دەبنەوە لەبەرئەوەی مرۆڤ لەقۆناغەکانی گەشەکردنی فسیۆلۆژیدا و لەماوەی ژیانیدا چەندین جار بڕیاری ڕاست و هەڵە بەسەر دیاردەکاندا دەردەکات، بۆیە کاتێک عەقڵ بۆ گەیشتن بەمەعریفەی ڕاستەقینە بەکاردێنین لەوە ئاگادارمان دەکاتەوە کە هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نیە تاوەکو خۆمان لەم هەموو بڕیارە هەڵانە دەرباز بکەین ئەگەر ڕێگای گومانکردن نەگرینە بەر بۆیە لەلای ئەودا پێویستە مرۆڤ گومان لەهەموو شتێک بکات جێگای گومان و دڵەڕاوکێ بن، (دیکارت) لەکتێبی (تێرامان لەفەلسەفەی یەکەم)یشدا جەخت لەسەر ئەم گومانکردنە دەکاتەوە بۆیە باس لەوە دەکات کە ئەو لەتەمەنێکی دوورەوە هەندێک ڕاوبۆچوون و تیـۆری وەرگرتووەو پێی وابوو ڕاست و دروستن و ئەوەی لەسەر ئەم ڕاوبۆچوونانەی بوونیادی ناوە هەمووی جێگای دڵەڕاوکێن و دوودڵی و گومانکردنە، بۆیە دەگاتە ئەو بڕوایەی کە پێویستی بەوە هەیە ئەگەر بۆ جارێکیش بێت، بەڵام دەبێت خۆی لەهەموو ڕاوبۆچوونەکان دابماڵێن و هەموو ئەو شتانەش بڕوخێنێت کە لەسەر ئەم بۆچوونانە بوونیادی ناون تاوەکو سەر لەنوێ مەعریفەکانی خۆی بخاتەوە خانەی ئەزموون و تاقیکردنەوە. (دیکارت) لەنامەیەکیدا کەوا بۆ (میلاند)هاوڕێیی ڕەوانەکردبوو بەجوانی ڕۆشنایی دەخاتە سەر مەبەستی ئەم گومانە میتۆدیەی خۆی و دەڵێت: (ئەگەر سەبەتەیەک سێوت هەبوو هەندێکیان بۆگەن بوون ئەوا ئیدیکەیشیان بۆگەن دەکرد چی دەکەیت تاوەکو ئەم سێوە بۆگەنانە فڕێبدەیت و سێوە ساغەکانیش بهێڵیتەوە؟ هیچ ڕێگایەک نیە تەنها بەتاڵکردنی هەموو سەبەتەکە نەبێت لەسێو دواتر پشکنینی یەکە بەیەکەی سێوەکان تاوەکو سێوە ساغەکان یەکە یەکە بخەیتەوە نێو سەبەتەکەو سێوە بۆگەنەکانیش فڕێبدەیتە دوور)«٣٤»، عەقڵ لەلای (دیکارت) هەمان شێوەی سەبەتەکەیە پڕە لەتیۆرو هزر و بیرۆکەو تێزو بۆچوون، هەندێکیان ڕاست و دروستن و هەندێکیشیان هەڵەو خراپن، پاککردنەوەی عەقڵ لەم بۆچوونە هەڵەو خراپانە وادەخوازێت مرۆڤ عەقڵی خۆی لەهەموو بۆچوونێک بەتاڵ بکات، لێرەدا (دیکارت)عەقڵ بەبەتاڵی بەجێ ناهێڵێت و چۆڵی ناکات بەیەکجارەکی ئەگینا ئەوە ڕاستەو خۆ دەچێتە خانەی گومانکارە ڕەهاکان، نەخێر.. ئەو دێت هزرو بۆچوون و تیۆرە ڕاستەکان دەخاتەوە نێو عەقڵ و خراپەکانیش فڕێدەدات، لێرەدا گومان دەبێتە پێوەری ڕاستەقینە و ڕاست و هەڵە لەیەکتر جیادەکاتەوە و عەقڵیش لەوەهمەکانی خۆی دەرباز دەکات، بەڵام بۆ لەیەکدی جیاکردنەوەی هزری ڕاست و دروست لەهزری هەڵەو، بۆ ئەوەی مرۆڤ لەمەزندەوە بچێتە نێو بوون ئەوە (دیکارت) هات هزری بەسەر سێ بەش دابەشکرد، یەکەمیان ئەو هزروبیرۆکە تێپەڕانەیە کە پێمان وایە لەدەرەوەی جەستەوە وەری دەگرین، واتە ئەوانەی لەسایەی جووڵەوە هەستەکان لەدەرەوەدا وەری دەگرن و پێمان دەدەن وەکو (دەنگ و ڕەنگ و تام و بۆن و گەرمی و ساردی و..هتد) ئەوانەش هزرو بیرۆکەی تێکەڵاوو نادیارن، دووەم هزرو بیرۆکەی دروستکراوە، ئەو هزرو بیرۆکانەن کەلەو هزرانەی بەشی یەکەمەوە بۆ خۆمان لێکیان دەدەین و ئاوێتەیان دەکەین و لەدەرەنجامی ئەو ئاوێتە کردنە دا دێنە بوون وەکو مەزندەکردنی وێنەی خورافی و خەیاڵی (ئەسپێکی دوو باڵ یا ئاژەڵێک نیوەی ئەسپ و نیوەی مرۆڤ..هتد) سێیەم هزرو بیرۆکەی غەریزەیین لەنێو دەروونی مرۆڤدا بۆ خۆیان بوونیان هەیە واتا لەهیچ شتێکی دەرەکی وەرنەگیراوەو بەویستی مرۆڤیش لێک نەدراوەو دروست بکرێت و دابهێنرێت، بەڵکو دەروون لەنێو خودی خۆیدا هەڵیدەهێنجێت، ئەوەی ئەم هزرو بیرۆکانە لەوانەی پێشـووتر جیادەکاتەوە ئەوەیە سادە و ساکارو ڕوون و دیارن، ئەوانەش بەمانای ڕاستەقینە ژیانی عەقڵی مرۆڤ پێکدەهێنن وەکو.. (بوونی خواو دەروون و کشان و شێوەکانی و جوڵە و شێوەکانی و کات و شوێن و..هتد).

کاتێکیش لە(دیکارت) یان پرسی مەبەستی لەوەچیە کاتێک دەڵێت: هزرو بیرۆکەی غەریزە بین، ئاماژەی بەوەدا ئەوەیە هێزێک هەیە لەناوەوەدا دروستیان دەکات، ئەم هێزەش سروشتیەو غەریزەییە لەنێو دەرووندایە وەکو ئەودی بڵێین نەخۆشیەکی دیاریکراو شتێکی سروشتیە لەنێو خێزانێکدا دڵپاکی شتێکی باوە لەنێوخێزانێکدا، کەواتە ئەوە دەچێتە خانەی سروشتی دەروونی و غەریزەی دەروونی، (دیکارت) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە ئەم بیرۆکانە لەنێو عەقڵی منداڵی بچووکیشدا هەیە وەکو چۆن لەنێو عەقڵی مرۆڤێکی پێگەیشتووشدا هەیە بەڵام بیری لێ نەکردۆتەوە،

دواتریش دەگەڕێتەوە سەر هۆکاری ئەم هزرانەو پێی وایە بەشی یەکەم و دووەمی هزرەکان پێویستیان بەهیچ هۆکارێک نیە، تەنها دەروون نەبێت! چونکە ئەم هزرانە بریتین لە کارلێکردنی دەروون بەکارلێکەرە دەرەکیەکان و لێکدان و بەستنەوەی ئەم کارلێکردنانە بەیەکەوە لەگەڵ یەکدی، بەڵام هزری خۆڕسکی کە دەبێتە بەشی سێیەمی هزرو بیرۆکەکان ئەوە بریتیە لەسروشتی ساکارو ڕاستی بابەتی، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵەیە گەر وابزانین عەقڵ تاکە هۆکاریەتی لەبەرئەوەی عەقڵ تاکە هۆکاری بیرۆکەیە وەکو کردارێکی دەروونی نەوەکو بابەتی کردارەکە بۆیە دەبێت هزرە خۆڕسکەکان بخرێنەڕوو پێیان بڕواندرێت تاوەکو بزانین تەنها لەسایەی هزردوە ڕاڤە دەکرێن، یا پێویستی بەهۆکارێکی دەرەکی هەیە، ئەوەش ڕێگامانە بۆ بازدان لە مەزندەوە بەرەو بوون«٣٥» بەم شێوەیە دەبینین (دیکارت) هزری ڕاست و هەڵە لەیەکدی جیادەکاتەوە.

### شێوازەکانی گەیشتن بەیەقین

بانگەشە کارو لایەنگرانی یەقینیەت پێیان وایە توانای مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی مەعریفەی یەقینی لەهیچ ئاست و پلەیەکدا گیرنابێت و ناوەستێت بۆیە دەتوانێت بگات بەپێناسەی مانا عەقڵییە ئەبستراکت و کراوەکان کە لەپلەو پایەدا لەئاستی پلەو پایەی یەقینی مەعریفەی بەدەستهێنراو لەرێگای ئەزموونەوە نزمترنین، ئەم بۆچوونەش لەفەلسەفەی فەلسەفەکارە عەقڵییەکاندا رەنگی دایەوە لەسەدەی (١٧-١٨) هەمدا، ئەگەر ئەوەمان زانی گومانی سۆفستائیەکان کە (ئەرستۆ) رووبەڕوویان بۆوە لەلای زۆر لەبیریاران گومانی راستەقینەی رەهانییە، ئەوە ئەو بەڵگانەی سۆفستائیەکان هێنایانەوە تاوەکو گریمانەکانی خۆیانی پێ بسەلمێنن لەلای زۆر لەفەلسەفەکارە گومانکارەکانی دوای خۆیاندا لەسەردەمی کۆن و نوێدا دەنگدانەوەی گەورەی هەبوو، ئەو بەڵگانەی (ئەرستۆ)ش بۆ بەتاڵکردن و رەتکردنەوەی ئەم گومانەی هێنایەوە تائێستاش هەندێکیان راست و رەوانیان پێوە دیارە تائەو رادەیەی هەندێک لەفەلسەفەکارە نوێخوازەکان گەیشتنە ئەو بڕوایەی گومانکارەکانی دوای (ئەرستۆ) پەندیان لەم بەڵگانە وەرگرت و جارێکی دی خۆیان نەخستەوە ناو سەرنگەری گومانکارە کۆنەکان، وەک دیاریشە زۆر لە فەلسەفەکارە نوێکارەکانی وەکو (ئەزموونگەری لۆژیکی)«٣٦» دڵیان بەزۆر لەبەڵگەکانی (ئەرستۆ) توند دەبێت و بڕوا بەو شتانە ناکەن کەوا دەری بڕیبوون وەکو راستی رەهاو دانانی عەقڵ وەکو ئامرازێک بۆ ئیدراک و زۆرشتی دیک ە«٣٧»، لەگەڵ ئەوەشدا بەڵگەکانی (ئەرستۆ) بۆ رەتکردنەوەی گومانی سۆفستائی تائێستاش کاتێک قسە لەسەر توانای مەعریفە بکرێت جێگای قسەو سەرنجن، لەبەرئەوەی سۆفستائیەکان لەبواری زانستیدا راستی رەهایان رەتکردەوەو لەبری ئەوەش هەندێک پرنسیپی یەق..ان لەبواری رەوشتدا داهێنا، وەکو باسمانکرد سەرەتا (سوکرات) رووبەڕووی سۆفستائیەکان بۆوە تاوەکو دواتر (ئەرستۆ)ش هاتە مەیدان و چووە بەرامبەریان، (ئەرستۆ) سەرەتا دەستی کرد گومانی سۆفستائی رەتکردەوە تاوەکو بەڵگەی توانای مەعریفە بەدەست بێنێت، بۆیە لەنێو کتێبی (میتافیزیکیا)دا کاتێک وەڵامی سۆفستائیەکان دەداتەوە کە راستی رەها رەت دەکەنەوە ئاماژە بەوە دەکات گوایە دەکرێت دوو دژکار لەنێو یەک شت و لەیەک کاتیشدا بەیەکەوە کۆببنەوە، بەڵام لەدوولای جیاواز ئەوەکو لەیەک لایەنداو بڕیاردان لەسەر شتێک لەخودی خۆیدا سانایە، بۆ نموونە تام و چێژی شتێک کە مرۆڤ دەیخوات ناگۆڕێت هەمان تام و چێژە تەنها ئەگەر باری تەندروستی مرۆڤ لەلەش ساغییەوە گۆڕابێت بەرەو نەخۆشی، مرۆڤێک دووچاری هەڵامەتێکی توند بووبێتەوە توانای کاری تامکردن و بۆنکردنی خواردن لەدەست دەدات، بۆیە ناگوترێت شتەکان لەلای کەسێکدا بەچەندین شێوە دەردەکەون تەنها ئەوکاتە نەبێت کە رەچاوی ئەم گۆڕانکاریانە دەکەین کە بەسەر ئامرازەکانی ئیدراک دادێن.

لەپاڵ ئەم نموونەیەشدا (ئەرستۆ) زۆر نموونەی دیکە لەم بابەتانە دەخاتەروو تاوەکو بتوانێت گومانی سۆفستائیەکان بەلاوە بنێت و راستی رەها بوونیاد بنێت، بەم شێوەیەش توانای مەعریفەو فێربوونی مەعریفەو وەرگرتنی مەعریفەی سەلماندوو ئاماژەی بەوەکرد کەماهیەت یابوون لەنێو خودی خۆیدا بابەتەکەیەتی و هەستەکانیش ئیدراک بەشتە رێژەییەکان دەکەن و ئیدراکی رەهاش بۆ خودی عەقڵ گێڕایەوە لەبەرئەوەی عەقڵ ماهیەت دەرک پێدەکات، کە بریتیە لەوێنەی هەمەکی، هەستیش لەسەر لێواری ئیدراک پێکردنی شتە تێپەڕەکان دەوەستێت کە ماهیەت پێی هەڵدەستێت و، بریتییە لەوێنەی بەش بەش، بەڵام سەبارەت بە(دیکارت) ئەگەرچی لەبەشەکانی رابردوو قسەمان لەسەر هەندێک شتی کرد، بەڵام وا پێویست دەکات لێرە وردتر بەگومانە میتۆدیەکەیدا رۆ بچینەخوار تاوەکو بگەینە ئەو دەرەنجامەی کاتێک گومانە میتۆدیەکەی خۆی بوونیادنا مەبەستی ئەوە بوو بگاتە یەقینی عەقڵی، سەرەتاش بەهەر هەمان رێگادا رۆیی کە (مونتانی) گرتیەبەر لەگومانی راستەقینەی رەهادا، بەڵام (دیکارت) لەنێو گێژاوی گوماندا تادوا هەناسەرۆیی تاوەکو لەبەردەستیدا بوو بەمیتۆدێک بۆ، بیرکردنەوە، لێرەدا گومان بوو بەئامرازێک بۆ رەخنە ئاراستەکردن و شێوازێک بۆ لەیەکدی (دابڕاندن و جیاکردنەوەی راست و هەڵە، (دیکارت) تا ئەوپەڕ لەنێو گوماندا رۆچووەخوار بەبێ ئەوەی لەنیوەی رێگادا بووەستێت و ئیفلاسی خۆی رابگەیەنێت وەکو ئەوەی (مونتانی)کرد، ئەم بەردەوامبوونە بوو گەیاندیە کۆتایی و سەرکەوتنی پێ بەخشی و لەدوا وێستگەدا یەقینی راستەقینەی بەدەستهێناو گەیشتنە سەلماندنی بوونی خوا، کەچی (مونتانی) لەنێو بۆشایی نیوەی رێگادا وەستاو نەیتوانی بگەڕێتەوە خاڵی سەرەتاو پەشیمانی خۆی رابگەیەنێت و توانای بەردەوامبوونیش نەمابوو، ئەوەبوو لەنێو گێژاوی گوماندا نقوومبوو کۆتایی هات، (دیکارت) وەکو ئەو گومانی لەشتە هەستپێکراوەکان و دواتریش لەماقوولکرد وەکو زۆر لەلایەنگران و شوێنکەوتووان گومانی راستەقینەی رەهای رووخێنەر، بەڵام وەکو ئەوان بەوە رازی نەبوو، رازی نەبوو لەنێو گێژاوی گوماندا تا ئەبەد مەلە بکات بۆیە لەگومانکردن بەردەوام بوو بەهیوای ئەوەی خودی گومان تێک بشکێنێن، ئەوەبوو خۆی گریمان ئیبلیسێکی پیسی بۆ خۆی دانا گوایە ئەم ئیبلیسە بەهەموو توانای خۆیەوە، بەفێڵ و مەکرو تەڵەکەبازییەوە هەوڵدەدات بەرێگای هەڵەیدابیات و لەنێو گێژاوی گوماندا نقوومی بکات، بەڵام ئەو لەسایەی عەقڵەوە گەیشتە ئەوەی بۆ خۆی گومان لەهەموو شتێک دەکات! تەنها ئەوە نەبێت کەوا گومان لەهەموو شتێک دەکات«٣٨»، ئەوەش راستیەکە گومان هەڵناگرێت، بەم شێوەیەش رووبەڕووی گومانی راستەقینەی رەهابۆوە، کە لایەنگرانی بانگەشەی ئەوەیان دەکرد گوایە ئەوان گومان لەوە دەکەن کە گومان دەکەن، بەوەش گومانی میتۆدی لەگومانی رەها جیاکرایەوە، (دیکارت) جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە هەموو مەعریفەیەک گەر پەیوەست نەبێت بەحەدەسی تەواو

ئەوە دیارە دەبێت دەستکەوتووی بەراوردەکاری نێوان دوو بابەت ی کۆمەڵە بابەتێک بێت، بەتەنیا بەراوردکاری بواری ئەوەمان پێدەدات لەنێو هەموو بەڵگەخوازیەکدا بگەینە راستی و دیاری بکەین بۆیە ئەگەر موگناتیس وەکو توخم لەنێو بووندا نەبوایە ئەوە عەقڵی ئێمە ئەبەد نەیدەتوانی شتێک ئیدراک پێ بکات وەکو ئەو بێت بۆیە نابێت بەئومێدی ئەوەبین رۆژێک لەرۆژان لەرێگای بەڵگە خوازییەوە بیناسین. کەواتە لەلای (دیکارت) سروشتی شتێکی نادیار لەسایەی پەیوەندی بەشتە دیارەکانەوە دەستنیشان دەکرێت، لێرەدا لەگەڵ ئەوەی نادیار لەنێو ئەم هاوکێشەیەدا بۆ خودی خۆی لەدەرەوەی سنووری پەیوەندییەکان بەرێژەیەکی ناسراوەوە نەبێت هیچ نیەو سروشتی خودی خۆی لەنێو سایەی ئەم پەیوەندیانەوە وەردەگرێت ئەوەش واقیعی حاڵە سەبارەت بەهەموو راستییەک کە لەرێگای دەرەنجامەوە وەردەگرێت، لێرەدا (دیکارت) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە (حەدەس و دەرەنجام) میتۆد نین لەبەرئەوەی میتۆد فێری ئەوەمان دەکات چۆن دەبێت حەدەس بەکار بهێنین تاوەکو نەکەوینە نێو هەڵەی پێچەوانەی راستی و چۆن دەبێت دەرەنجام وەربگرین تاوەکو بگەینە مەعریفەی هەموو شتێک «٣٩» (دیکارت) گەیشتبووە ئەو باوەڕەی ئەو کاتێک گومان دەکات بیردەکاتەوە، هەرچەندەی زیاتر گومان بکەین و بیربکەینەوە ئەوەندە زیاتر ئەم زێدە رۆییەمان بەردو ئەوەمان ئاڕاستە دەکات دان بەبوونی خود بنێین، خودێک گومان دەکات و بیردەکاتەوە، ئالێرەوە گەیشتە یەکەم بنەماو پرنسیپی یەقین کەوا هەوڵیدا لەسەر بنچینەیەوە هەموو فەلسەفەکەی خۆی بوونیادبنێت کە بریتییە لەکۆجیتۆی (من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم) ئەوەش یەکەم مەسەلەیە رووبەڕووی ئەو کەسە دەبێتەوە کە هزری خۆی رێکترو زیاتر بەیەقینەوە ئاڕاستە دەکات، (سانشیە) دەیگوت: (هەرچەندە زیاتر بیردەکەمەوە زیاتر گومان دام دەگرێت). (دیکارت) هات رووبەڕووی ئەگەر نسیبە بۆوەو گوتی: هەرچەندەی بەگومانتر دەبم، زیاتر بیردەکەمەوە بۆیە زیاتر بڕوام بەبوونی خۆم هەیە)«٤٠».

بەم شێوەیە گومانی رەها ئەوکاتە تێکشکێندرا کە (دیکارت) تا ئەوپەڕی رۆچووە ناوی بەم رۆچوونەش یەکەم پرنسیپی یەقینی داهێنا بۆیە دەڵێت: (لەم گومانکردنەدا تەقلیدی خاوەنی گومانی رەهام نەکردووە، ئەوانەی تەنیا گومان لەبەرگومانکردن دەکەن و خۆیان بەردەوام بەداماوی دەهێڵنەوە، بەڵکو من بەپێچەوانە لەیەقین بەولاوە مەبەستی دیکەم نیە)«٤١» بەم جۆرە (دیکارت) پرنسیپێکی عەقڵی باڵای گەرەک بوو لەسەرووی هەموو گومانێکەوە بێت تاوەکو فەلسەفەکەی خۆی لەسەر بونیاد بنێت، بۆیە دەبینین کاتێک قسە لەسەر ئەم پرنسیپە دەکات ئاماژە بەهەوڵ و کۆششەکانی (ئەرخەمیدس) دەدات کاتێک بەدوای یەک خاڵی چەسپاوو جێگیرو نەگۆڕدا دەگەڕا تاوەکو گۆی زەوی بهەژێنێت و شوێنەکەی بگۆڕێت، بەم شێوەیەش (دیکارت) پێویستی بەپرنسیپێکی یەقینی بوو لەسەرووی هەموو گومانێکەوە بێت تاوەکو بیکات بەبنچینەی فەلسەفەکەی، بەڵام ئەگەر تاکە خاڵێکی جێگیرو نەگۆڕ لەلای (ئەرخەمیدس) بوونی نەبوو، ئەوە لەلای ئەو دۆزینەوەی ئەم بنچینە عەقڵییەی کە فەلسەفەکەی لەسەر بونیاد دەنێت کارێکی مەحاڵ نەبوو، ئەم پرنسیپەو یەقینەی یەکەمی لەنێو کۆجیتۆکەی خۆیدابوو (من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم).

**«پەراوێزو سەرچاوەکان»**

١- الموسوعة الفلسفية/ م، روزنتال-ی یودین/ بیروت/ ١٩٨٠- ص٢٦٤ .
٢- مفاهيم في الفلسفة والاجتماع/ احمد خورشيد/ بغداد/ ١٩٩٠- ص١٧ .
٣- الموسوعة الفلسفية/ م. روزنتال - ی - یودین/ بیروت/ ١٩٨٠- ص١٧٧ .
٤- میگاریەکان قوتابخانە و بۆچوونێکی فەلسەفی بوو لەسەدەی چوارەمی پێش زاینی لەسەر دەستی (ئەقلیدس ، میگاری (٤٥٠-٣٨٠) کەوا قوتابی و هاورێی سو-رات) بوو دامەزرا.
٥- (دیموکریتس)ی ئەبدیری (٤٦٠-٣٧٠)ی پێش زاینی، فەلسەفە کارێکی مادی گریکی کۆن بوو (لینین) پێی وایە ناودارترین بانگەشەکاری مادیەتە لەجیهانی کۆندا، دامەزرێنەری تیۆری ئەو بەشەیە کەوا بەش ناکرێت، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کەوا گەردیلە بریتییە لەبەشی بچووک کەوا دابەش ناکرێت لەگەڵ ئەوەشدا نەمرەو لەبزاڤی بەردەوام دایەو لەشێوەو قەبارەو بارودۆخ و تەرتیبدا جیاوازن.
٦- (بیرون)ی ئەیلی (٣٦٥-٢٧٥)ی پێش زاینی، فەلسەفەکارێکی گریکی کۆنەو دامەزرێنەری گومانکاری کۆنەو خۆی بەمەسەلەی گەیشتن بەخۆشی و شادی و دابینکردنی خەریک کردبوو پێی وابوو لەسایەی خۆ دوورگرتن لەئازارەوە دێتە دی و گەیشتە ئەو باوەڕەی کەوا لەسایەی گومانکردنەوە بەدی دێت.
٧- اسس الفلسفة/ د. توفيق الطويل/ القاهرة - ١٩٧٦- ص٣٠٥ .
٨- مذاهب ومفاهيم فى الفلسفه والاجتماع/ د، عبدالرزاق مسلم/ بيروت- ص٤٤ .
٩- اسس الفلسفة/ د. توفيق الطويل/ القاهرة - ١٩٧٦- ص٣٠٥ .
١٠- الموسوعة الفلسفية/ م. روزنتال - ي - يودين/ بيروت/ ١٩٨٠- ص ٢٣٠ .
١١- اسس الفلسفة/ د. توفيق الطويل/ القاهرة - ١٩٧٦- ص٣٠٥ .
١٢- (سکتۆس ئەمبر یکۆس) ە (٢٠٠-٢٥٠) فەلسەفەکارو

فیزیا زانێکی گریکی بوو.

١٣- اسس الفلسفة/ د. توفيق الطويل/ القاهرة - ١٩٧٦- ص٣٠٥ .

١٤- خريف الفكر اليوناني/ عبدالرحمن بدوي/ بيروت/ ١٩٧٩- ص٨٤ .

١٥-هەڵوێستی گومانکاری بریتییە لەو (١٠) خاڵەی گومانکارەکان بۆ رەتکردنەوەی بوون و بەدەستهێنانی مەعریفە دایانرێژتبوو و سەرجەم گومانکارەکان داکۆکیان لێدەکرد.

١٦- خريف الفكر اليوناني/ عبدالرحمن بدوي/ بيروت/ ١٩٧٩- ص٨٥ .

١٧- اسس الفلسفة/ د. توفيق الطويل/ القاهرة - ١٩٧٦- ص٣٠٧ .

١٨- (هركليتس. (٥٤٤- ٤٨٣)ی پێش زاینی، فەلسەفەکارێکی مادی گریکی کۆن بووەو بڕوای بەدیالیکتیک هەبووە.

١٩- (بارمندیس) لەنێوان سەدەی شەشەم و پێنجەمی پێش زاینیدا ژیاوەو لەباشووری ئیتالیا لەناوچەی (ئیلیا) لەدایک بووەو رابەری قوتابخانەی (ئەیلی) بووە پێی وابووە جیهان لەبارێکی چەسپاوو نەگۆڕدایە و دژی بۆچوونە دیالیکتیەکەی (هرقلیتس) بوو.

٢٠- (بروتاگوراس) ، (٤٨١-٤١١)ی پێش زاینی، فەلسەفەکارێکی گریکی کۆنەو رابەری سۆفستائیەکان بووەو لەبەر بێ بڕوایی لەئەسینا دەرکراوەو کتێبێکیش (لە بارەی خوایەکان) سوتێندراوەو زۆر لەهزرڤانان لەو باوەڕەدان گومانکارێکی رەهابێت.

٢١- ربيع الفكر اليوناني/ عبدالرحمن بدوي/ بيروت/ ١٩٧٩ - ص١٧٦ .

٢٢- اسس الفلسفة/ د. توفيق الطويل/ القاهرة/ ١٩٧٦- ص٣٠٧ .

٢٣- (میشێل دی مۆنتانی)، (١٥٣٣-١٥٩٢) فەلسەفەکارێکی فەرەنسی سەردەمی رێنیسانسەو پێ لەسەر ئەوەدا دەگرێت کەوا مرۆڤ مافی ئەوەی هەیە گومان لەهەموو شتێک بکات و گومان لەفەلسەفەی سکۆلائی سەدە ناوەندییەکان و بیروباوەڕی کاتۆلیکی و بۆچوونی مەسیحیەت لەسەر خوا دەکات و گومانکردن لەلای ئەو پەیوەستە بەنازانگەری.

٢٤- (داڤید هیوم) ، (١٧١١- ١٧٧٦) فەلسەفەکارو سایکۆلۆژست و مێژوونووسێکی ئینگلیزی بووە پێی وابووە مەعریفە لەوەدانیە مرۆڤ لەبوون بگات بەڵکو لەتوانای ئەوەدایە ک بتوانێت ببێتە رێبەرێک بۆ ژیانی کردارەکی و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کەتاکە بابەت دەکرێت لەبنەڕەتدا مەعریفەی لێ بەدەست بهێنرێت ماتماتیکە.

٢٥- تاريخ الفلسفة الحديثة/ يوسف كرم/ بيروت/ - ص١٧٤

٢٦- (جورج بارکلی)، (١٦٨٥-١٧٥٣) فەلسەفەکارێکی ئایدیالیزمی خودیە.

٢٧- اسس الفلسفة/ د. توفيق الطويل/ القاهرة/ ١٩٧٦- ص٣١٠ .

٢٨- مفاهيم في الفلسفة والاجتماع/ احمد خورشيد/ بغداد/ ١٩٩٠- ص٢٥٥ .

٢٩- اسس الفلسفة/ د. توفيق الطويل/ القاهره/ ١٩٧٦- ص٣١٥ .

٣٠- من الفلسفة اليونانية الى الفلسفة الاسلامية/ د. محمد عبدالرحمن مرحبا/ بيروت- ص٩٧ .

٣١- اسس الفلسفة/ د. توفيق الطويل/ القاهرة/ ١٩٧٦- ص٣١٥ .

٣٢- (ولیام هاملتون)، (١٧٨٨-١٨٥٦) فەلسەفەکارو لۆژیکزانێکی ئایدیالیزمی ئوسکتلەندیەو پێی وابووە مەعریفە بریتیە لەدەستنیشانکردنی مەرجی بوونی بابەتی ئەو بابەتەی لێی دەکۆڵدرێتەوەو راستی بابەتی رەتکردۆتەوەو بەرەو نازانگەری چووەو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە واقیعی مادی نازاندرێت تەنها لەرێگای سروشتێکی باڵاوە نەبێت.

٣٣- نازانگەری زاراوەیەکی فەلسەفیە بۆ یەکەم جار لەلایەن (تۆماس هکسلی)یەوە بەکارهاتووە، بۆخۆی وەکو ماناو دەلالەت تیۆرێکی گومانکاریەو مەعریفە وەکو بەش و هەمەکی بەلاوە دەنێت و رەتی دەکاتەوە، (لینین) کاتێک نازانگەری وەکو تاراوەیەکی گومانکارەکان راڤە دەکات جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەوان گەوهەری شتەکان لەشێوە دادەبڕێن و لەهەستەکان زیاتر پشت بەهیچ سەرچاوەیەکی مەعریفی دی بۆ ئیدراک نابەستن.

٣٤- اسس الفلسفة/ د. توفيق الطويل/ القاهرة/ ١٩٧٦- ص٣١٧ .

٣٥- تاريخ الفلسفة الحديثة/ يوسف كرم/ بيروت- ص٧٣ .

٣٦- ئەزموونگەری لۆژیکی بۆچوونێکی فەلسەفەی ئایدیالیزمی هاوسەردەمە راستەوخۆ لەپۆزیتڤیسمی لۆژیکیەوە هاتۆتە بوون لەسەرەتای سییەکانی ئەم سەدەیەماندا و بانگەشەکارانی بریتی بوون لە (کارناپ- ریشنباخ - فایگل ....).

٣٧- اسس الفلسفة/ د. توفيق الطويل/ القاهرة/ ١٩٧٦ - ص٣١٨ .

٣٨- هەمان سەرچاوە.

٣٩- تاريخ الفلسفة - القرن السابع عشر/ اميل برهييه/ جورج طرابيشي/ بيروت - ١٩٨٣- ص٧٩ .

٤٠- اسس الفلسفة/ د. توفيق الطويل/ القاهرة/ ١٩٧٦ - ص٣٢٠ .

٤١- هەمان سەرچاوە.

# مەرگ لە هزری هیگڵ و فیورباخدا

ئا/محەمەد سلێمان عباس

## پێشەکی:

**مردن یەکێکە لەو کێشەو بابەتە گرنگانەی کە مرۆڤ و مرۆڤایەتی بەخۆیەوە خەریک کردوە هەر لە دێر زەمانەوە تاکو ئێستا، مردنیش دژی ژیانەو زۆر بەترس و ناخۆشەو هەست و سۆزی مرۆڤ دەهەژێنێ بۆیە مرۆڤ زۆر جاران هزری لە مەرگ کردۆتەوە، ئایا پاش مردن مرۆڤ چی لێدێت؟ چی لێدەکەن؟ بۆ کوێ دەبەن؟ ئایا مردن کۆتایی ژیانە یان پاش مردن ژیانێکی دیکە هەیە، ئەگەر هەبێت دەبێ ئەو ژیانە چۆن بێت خۆش بێت یان ناخۆش شاد بێت یا ناشاد، ئەم پرسیارانە و چەندین پرسیاری دی بە هزر و بیرو خەیاڵی مرۆڤدا هاتووە.**

فەخری دەباغ لە کتێبی (الموت... اختیارا)دا دەڵێت: هەموو مرۆڤێک لە ساتێک لە ساتەکانی ژیانیدا بیر لە مردن و نەمان دەکاتەوە بە تایبەتی کاتێک یەکێک لە خزم و کەسە نزیکەکانی یا کەسێکی خۆشەویستی لێ دەمرێت یا کاتێک بە چاوی خۆی ڕووداني مردن دەبینێت. دەڵێ ئەگەر مردن نەبوایە مرۆڤ بە دوای نهێنیی ژیان نەدەگەڕا و هەوڵی نەمری نەدەدا. بۆیە مرۆڤ لە ژیان ناگات تاکو لە مردن نەگات. (١)

مەرگ گەورەترین کێشە و ئاستەنگە لەلای مرۆڤی کۆن و نوێدا. مردن ڕووداوێکە دوو ڕوو یان دوولایەنی هەیە لەلایەک گشتی و ڕەهایە لەلایەکی دی و تەنها و کەسیە، چونکە ئێمە گشتمان دەمرین، بەڵام هەریەک لە ئێمە بەتەنیا دەمرێت کەس لەجیاتی ئەو نامرێت و تەنها خۆی دەمرێت.[٤] لەبەر ئەودی هەموو مرۆڤێک دەمرێت و نامێنێت جیاوازی لەنێوان مردنی زانایەک یا نەزانێک، پیرێک یا منداڵێک، پاشێک یاخراپێکدا نیە، وتویانە مردن سیاسەتێکی دیموکراتی بەرامبەر مرۆڤ بەکاردێنێت. (٣)

یەک لە سروشتەکانی مردن دژدیەکییە چونکە ڕاستی و ناڕاستی تیادایە واتە هەموو مرۆڤێک دەزانێت دەمرێت(٢) ، بەڵام نازانێت کەی دەمرێت. (٤) زۆر لە فەیلەسوف و ڕوناکبیرانی جیهان باسی مردنیان کردووە و هزروبیروڕای خۆیان لەمەڕ مەرگ و مردن دەرخستوود، هەروەها دوو فەیلەسوف دەرئەخین و باسی دەکەین ئەویش (هیگل و فیورباخ)ە مەرگ لای هیگڵ(١٧٧٠-١٨٣١): هیگڵ هۆشیارانە هەستی بە دژواری و ناخۆشی مردن کردووە لە (پەڕدکانی قۆناغی یێننا) کە لەکاتی لاویدا نووسیویەتی دەڵێ (مردن ئەولوتکەیە کەدەبێت لێی دەربازبین). کاتێک تەمەنی (١٣)ساڵان بوو دایکی مرد و ئەو مردنە زۆر کاری کردە سەر هیگڵ و هەروەها مردنی کچەکەشی زۆر کاریگەری هەبوو لەسەر ژیانی هیگڵ لەگەڵ ئەوەشدا هیگل خۆڕاگر و بەتوانا بوو بەرامبەر مردنی کەسە خۆشەویستەکانی و دەیگوت ئازایەتی مرۆڤ بەرامبەر مردن سیفەتێکی پێویستە بۆ فەیلەسوفی ڕاستەقینە. لە پێشەکی (فینۆمینۆلۆژیای گیان)دا دەڵێ: ژیانی گیان تەنها ئەوە نیە خۆی لە مردن دووربخاتەوەو ڕزگاری بکا و لەناو نەچێت، بەڵکو ئەو ژیانەیە کە بەرگەی مردن دەگرێ ونەترسێت و ڕۆح ناگاتە ڕاستی تاکو خۆی لەناو نائومێدیەکی تەواودا دەبینێتەوە. ئەگەر چی هیگل نکۆڵی لە نەمری تاکە کەس دەکات بەڵام دەیەوێت بەهانە بۆ مردن بهێنێتەوە.

ئەو(نائومێدی تەواو ڕەها)یەی باسی دەکات نزیکی دەکاتەوە لە بۆچوونی ئاینی مەسیحی لەمەڕمردن، ڕێزگرتنی مەرگ و مردن لەلایەن ئەلکسەندەر کوژیف لە کتێبی کاریگەری هۆلدرین و شاعیرە ڕۆمانسیەکان. ئەلکسەندەر کوژیف لە کتێبی (بەراییەک بۆ خوێندنەودی هیگڵ)دا دەڵێ: هزری مردن دەورێکی باڵای لە فەلسەفەی هیگلدا هەیە. و دەڵێ بەڕای هیگڵ مردنی ئاژەڵ دەبێتە هۆی ئەوەی کەهۆشی مرۆڤ بگۆڕێت. مرۆڤ لای هیگڵ نەخۆشیەکی کوشندەی سروشتە و دەڵێت مرۆڤ نەک تەنها لەناودەچێت و بەس بەڵکو جەستەی مردنە و مردنیش خودی ئینسانە هیگڵ زاراودی (ein.Aufheben) بۆ مردن بەکار دەهێنا کە لە زمانی ئەڵمانیدا سێ مانای هەیە(لابردن. مانەود. بەرزکردنەوە)(٥).

هیگڵ لە لێکچەردکانی لەمەڕ فەلسفە و ئاین)دا دەڵێ: مردن لەکارد گرنگەکانی خۆشەویستیە. مردن بریتییە لە خۆشەویستی و لە مەرگ و مردندا خۆشەویستی ڕەهایە دیار دەکەوێت و یەکگرتنی خواوندو مرۆڤە. (٦)

لودفیگ فیور باخ (١٨٠٤-١٨٧٢):

فەیلەسوفێکی ناسراوی ئەڵمانیە لە ساڵی (١٨٣٠) کتێبی (هەندێک بیروباوەڕ دەربارەی مەرگ و نەمری) بڵاوکردەوە کە بوە هۆی دەرکردنی لە زانکۆ. (٧)



**مەرگ گەورەترین کێشە و ئاستەنگە لای مرۆڤی کۆن و نوێدا.**

**خۆشەویستی سەرچاوەی هەموو کردارەکانی مرۆڤە.**

فیورباخ بە درێژایی تەمەنی بایەخی بە گرفتی مردن و نەمری داوە.

باسی مەرگ و نەمری مرۆڤ نووسراوەکانیدا بەرچاو دەکەوێت، فیورباخ دەڵێ: خۆشەویستی سەرچاوەی هەموو کردارەکانی مرۆڤە، مرۆڤ دەبێ خۆشەویستی تیایدا بێت بۆ ئەوەی مرۆڤێکی تەواو کامل بێت پێویستە ئەنانیی و خۆویست نەبێت، و ژیانی سەرودری ئەوەیە کە خودی خۆمان فەرامۆش کەین و بەسەریدا زاڵ بین، خۆشەویستی مرۆڤیش بۆ ئەوەی راستەقینە و تەواو بێت پێویستە مردنی لە گەڵدا بێت چونکە مردن دوا قوربانی و بەڵگەی خۆشەویستیە ئەو کاتە مرۆڤ دەبێتە خود و زاتێکی تەواو راست و دروست کاتێک دەمرێ و نامێنێ.(٨). هەر چەندە مردن رواڵەتێکی سروشتیە بەڵام لە هەمان کاتدا قوربانی دان و پاراستنی خۆشەویستیە.

لەبەر چی گیاندار و رووەک دەمرن؟ فیور باغ دەڵێت: چونکە مرۆڤ دەمرێت واتە مردنی مرۆڤ دەبێتە هۆی مردنی زیندەودرانی دی. لەبەر ئەوە شتی بەرز و سەرەوە هۆیەکە بۆ شتی نزم وخواردوە.

بەڕاو هزری فیور باخ مەرگ هۆو بنەڕەتی میتافیزیکی و دەروونی و ئەندامی هەیە.(٩)

فیورباخ لەو باوەڕەدایە کە مەرگ و نەمری بەو شێوەیە نیە کە ئێمە تێی گەیشتووین چونکە خەم و ناخۆشی مردن پێش روودانی مردنە نەک دوای مردن، مردن شەبەحێکە یا تارماییێکە بونەکەی لە نەبونیدایە نەبونیشی لە بونیدایە. دەیگوت مەرگ شتێک نیە لە خودی خۆیدا و راستی تیادا نیە تەنها لە بیروباوەڕی مرۆڤدا نەبێت. واتە مردن تەنها بۆ زیندەورانە نەمانێکی رەهانیە بەڵکو مردنی زاتی خۆیەتی یا مردنی مردنە کاتێک دەبێتە هۆی کۆتایی ژیان لە هەمان کاتدا کۆتایی خۆیەتی،(١٠) بنچینەو بنەڕەتی مرۆڤ لە مەرگ و نەمری بەهێزترو بەرزترە چۆن مردن هیچ لە مرۆڤ کەم ناکاتەوە ئاوەهاش نەمری هیچی لێ زیاد ناکات. یەک لە خاسیەتەکانی فەلسەفەی فیورباغ دەربارەی مەرگ ریزگرتنی مەرگە ئەم ریزگرتنەش لە دوو توخمدا دەردەکەوێت یەکەمیان بریتیە لەوەی کە سروشت حەز و ئارەزووی لە ژیان نیە چونکە لە دایک بوونی بوونەوەرێک لە هەمان کاتدا نەمان و لەناوچوونی بونەوەرێکی دیبە.(١١)

توخمی دوودەمیش ئارەزووی مردنە یا کشانە بەرەو مردن. ئەمەش لە کتێبی(هزر دەربارەی مەرگ) بە دیار دەکەوێت کە تیایدا (هاتووە: ئەی مەرگ ناتوانم خۆم لە سروشتە ناسکەکەت جیابکەمەوە کە پەیوەندییەکی بە هێزی بە سروشتی منەوە هەیە، ئەی ناوێتەی گیانم و رەنگدانەوەی بونم تۆ ئەستێرەی ئێوارانی لە سروشتدا و ئەستێرەی بەیانیانی بۆ گیان، هەروەها دەسپێکی شیعری (هەڵبەستێک بۆ مەرگ) بەهەمان شێوە و رامان دەست پێکردوە کە دەڵێ:

من بەرەو مەرگ و نەمان دەکێشم
بۆ ئەوەی ژیانێکی نوێ گەرم بگرێ و
هەڵگیرسێ.(١٢)

لە شوێنێکی دی شیعرەکەدا دەڵێ:

چۆن بەری دارەکان ناوکیان تیادایە
ئاواش ژیان مردنی لەناوخۆ گرتووە
مەرگ کرۆک و ناوکی ژیانی پێکهێناوە
یان دەڵێ:
مردن پەردە لەسەر بنچینەی بوون لا ئەدات
و تیشک دەخاتە سەر سروشت
هەر لە مەرگدا بوون بە دیار دەکەوێت
ودێتەدی.(١٣)

ئەم هەڵوێستەی فیورباخ لەمەڕ مەرگ لە شیعری (هەڵبەستێک بۆ مەرگ) دەربڕیووە نزیکە لە بۆچوون و هەڵوێستی شاعیرە رۆمانسیەکان بە تایبەتی نۆڤالیسی شاعیر. هەروەها (بودلێر)ی شاعیریش لە شیعرێکدا داوای مەرگ دەکات و لەگەڵیدا دەدوێ و دەڵێ(ئەی مەرگ، ئەی کە شتیوانە کۆنەکە، کاتی ئەوە هاتووە برۆین ئەم جیهانە بێزارمان دەکات ئەگەر زەوی و ئاسمان رەش و تاریک بن خۆ دڵمان پڕی لە (روناکی).(١٤) ئەمەش حەزکردن و کشانە بەردو مەرگ.

خاڵێکی هاوبەشی هەیە لە نێوان هیگڵ و فیورباخدا پەیوەندی نێوان مەرگ و خۆشەویستی ئەو خاڵەیە چونکە بەبڕوای هەردووکیان مەرگ پەیوەندی بە خۆشەویستی هەیە.

بەڕای فیورباخ هەرچەندە مەرگ هەیە بەڵام پێویستە مرۆڤ بە هەموشیان و توانایەکەوە ژیان بباتە سەرو بەسەروەری بژی.

## سەرچاوە و پەراوێزەکان:-

١-فخري الدباغ(الموت. اختيارا)- بيروت-.١٩٦٨ل١١
٢-الموت و العبقرية. تأليف: عبدالرحمن بدوي. بيروت. ل٦
٣- الموت فى الفكر الغربى: تاليف جاك شورون ترجمه: كامل يوسف حسن، كويت. سلسله (عالم المعرفه). ١٩٨٤-ل٥
٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٥
٥-هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٦
٦-هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٦٦
٧-الموسوعة الفلسفية: بأشراف (م. روزنتال، ب يؤدين) ترجمة سمير كرم بيروت-١٩٨١-ل٣٦٥
٨-الموت في الفكر الغربي.ل١٩٧
٩-الموت في الفكر الغربي.ل١٩٨
١٠-الموت في الفكر الغربي.ل٢٠٢
١١-الموت في الفكر الغربي.ل٢٠٥
١٢- الموت في الفكر الغربي.ل٢٠٦
١٣-الموت في الفكر الغربي.ل٢٠٩
١٤- الرمزية و السريالية في الشعر الغربي و العربي. تأليف: ايليا الحاوى بيروت- ١٩٨٠ل٧٢

# نائارامی دەروونی و چارەکردنی

و:د. فەیسەڵ عارەب بڵباس

زانایان دەڵێن نائارامی وەکو خوێی چێشت وایە، کەمی چێشتەکە خۆش دەکاو زۆری تێکی دەدات. نائارامی (قلق) بەبڕێکی کەم بۆمرۆڤ زۆر پێویستە، چونکە هەر ئەو نائارامی و دڵە ڕاوکێیەیە کە کەسایەتی کۆمەڵایەتی بۆ دروست دەکات و بەرەو پێگەیشتنی دەبا. هەروەها ئەو ئامادە باشییەی لەکاتی تەنگانەو ڕووبەڕوو بوونەوەدا نیشانی دەدا بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە نائارامی و کشتی (توتر) دەروونی کاریگەری باشیشی هەیە. لەم جۆرە بارودۆخانەدا پەیدابوونی نائارامی دەبێتە هۆی خۆئامادە کردن و پلان دانان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە تا وای لێ دێ کە هەمیشە لەبارێکی خۆئامادەکردندا بێت بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئەوهەموو مەترسیانەی کە ڕۆژانە تووشیان دێت.

بەڵام کاتێک کە ئەو نائارامییە لەئاستی سروشتی و پێویست تێدەپەڕێ و دەبێتە هۆی هەڵچوون بەجۆرێک کە ئەو کەسە لەتواناو شنگی دەکەوێ و ناتوانێ کارە کۆمەڵایەتی و هزرییەکانی ڕۆژانەی بەڕێوە ببات. ئەوا پێویستە لەوبارە نائارامییە ڕزگاری بێ و چارەسەری پێویستە، لەگەڵ ئەوەشدا چارەکردنی ئەم جۆرە نائارامییە بەبێ دەست نیشان کردنێکی وردی ئەوبارو دۆخانەی کە بوونەتە هۆی پەیدابوونی ناکرێت.

زانایانی دەروونناس، نائارامی بۆ چوار تەوەرە دابەش دەکەن: یەکەمیان ئەو هەڵوێستانەی کە دەبنەهۆی سەرهەڵدانی وەک (تاقیکردنەوە، بەیەک گەیشتنێکی گرنگ، ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی کۆمەڵایەتی. دوارۆژێکی بزرو پڕمەترسی...تاد).

دووەمیان: ئەو گۆڕانە فیزیۆلۆجی وعاتیفیەی ناخەوەی کە لەگەڵیدا پەیدا دەبێ کە بەزۆری لەسەر شێوەی گۆڕانی ئەندامی دەردەکەون جا چ دەرەکی بن یان ناوەکی وەک: ئەو گۆڕانانەی لەکاتی ترساندا ڕوودەدەن لەسەر شێوەی خێرا بوونی لێدانی دڵ. هێڵنج هاتن، گوشرانی گەدەو ڕیخۆڵەکان، هەناسە بڕکێ، گرژ بوونی ماسوولکەکانی دەموچاو، ڕەق بوونی ماسوولکەکانی پشت، لەرزینی دەستەکان...

سێیەمیان: لایەنە هزری و بیرکردنەوەکانە، واتە ئەو کۆمەڵە بیروباوەڕو بەهایانەیەی کە مرۆڤەکە لەگەڵ خۆیدا پێیان دەدوێ لەکاتێکدا کە تووشی ئەو جۆرە هەڵوێستانە دەبێت. بەجۆرێک بیرو باوەڕەکانی ئەو کەسە لەکاتی نائارامیدا پتر لەڕادەی ئاساییەو هەست بەترسێک دەکا کە هیچ بنچینەیێکی بۆ نیە، بۆیە دەروونناسان ئەو هزرە بەفالۆجیک و ناماقوڵ دادەنێن.

چوارەمیان: دەرکەوتن یان ڕەفتاری کۆمەڵایەتی ئەوکەسەی کە تووشی نائارامی بووە لەکاتی کارکردنی ڕۆژانەیدا وەک: شەرم کردن، خۆبەدوورگرتن، ناجێگیری و خۆکێشانەوە لەکۆمەڵ...

ئەم چوار تەوەرەیە دەبنە هۆی نیشاندانی نائارامی بەجۆرێک کار لەکەسایەتی ئەو مرۆڤە دەکەن و دەبێتە ئاکارێکی بەردەوام، بۆیە چارەسەری نائارامی دەبێ بەرەو ڕووی ئەم چوار تەوەرەیەوە بکرێت. هەرچەندە هەندێ جار چارەکردنی تاکە تەوەرەیەک لەم تەوەرانە بەسە بەتایبەتی ئەگەر ئەو تەوەرەیە زۆرتر کاریگەر بێت لەپەیدابوونی نائارامییەکە.

یەکێک لەڕێگەکانی چارەسەری دەروونی نەخۆشی نائارامی، ڕێگەی ڕووبەڕوو بوونەوەو ڕاهاتنە. دەزانن بەشی زۆری خەڵک لەسەر ئەو گوتەیە دەڕۆن کەدەڵێ: «ئەو کونەی بای لێوە دێت بیگرە». بەپێی ئەم گوتەیە خەڵک خۆیان لە نائارامی دەشارنەوە بەخۆکێشانەوەو لەبەر هەڵاتن و خۆبەدوور گرتن لەو هەڵوێستانەی کە دەزانن دەبێتە هۆی نائارامی و دڵەڕاوکێ.

**• خاوکردنەوەی ماسولکەکان بەشێوەیەکی ڕێکوپێک، بوەتە ڕێبازێک بۆ چارەسەر کردنی ئەوگرژبوونانەی ماسوولکە کە لەدوای نائارامیدا پەیدا دەبن**

بەمەش خەڵک بەو شێوازەی خۆکێشانەوەو هەڵاتنە هەڵەیێکی گەورە دەکەن بەپێی زانستی دەروونناسی. چونکە هەڵاتن لەبەر گیروگرفت وا لەوکەسە دەکا کە لەگەڕان بەدوای چارەسەرییەکی کاریگەرانە دوور کەوێتەوە، هەروەها دوور کەوتنەوە لەو گیروگرفتانە ڕۆژ دوای ڕۆژ دەبنە بەربەست لەپێش گەشەکردنی ئەو کەسەو لەکۆتاییدا ئەنجامێکی پێچەوانەی لێ دەکەوێتەوەو دەبێتە هۆی پتر تێکچوونی باری دەروونی. بەواتایەکی دیکە چارەکردنی گیروگرفتەکان لەڕێگەی لەبەرهەڵاتنیان لەجیاتی ڕووبەڕوو بوونەوەیان، چارەسەری نییە تەنیا لەوکاتانەدا نەبێ کە ئەو کەسە جارێکی دیکە تووشی ئەو جۆرە گیروگرفتانە نەبێتەوە کە ئەویش زۆر دەگمەنە.

ئێستا ڕێگەی (خۆگونجاندن = habitua-tion) یان خۆڕاهێنان کە بەنوێترین ڕێگە دادەنرێت لەچارەکردنی ڕەفتاریانە (سلوکی)ی نەخۆشییەکانی دەروونی بە باشترین ڕێگە چارە بۆ نائارامی دادەنرێت. بەم ڕێگەیە هانی ئەوکەسە دەمار گرژە دەدرێ کە ڕووبەڕووی ئەو هەڵوێستە ببێتەوە کە بووەتە هۆی پەیدابوونی نائارامییەکەی تا ئەوکاتەی هەستی نەخۆشەکە لەو هەڵوێستە لادەداو گۆڕانە عاتیفیەکانی وردە وردە لەبەرامبەریدا کەم دەبێتەوە.

ڕێگەچارەی گونجاندن و لەسەر ڕاهاتن یان پلە بەپلە دەبێ یانیشی بەجارێک و لەسەر شێوەی تەقینەوە. ڕێگەچارەی پلەبەپلە بەجۆرێک دەبێ کە ئەو کەسە وردە وردە گیروگرفتەکەی نیشان بدرێت و هەنگاو بەهەنگاو بەرەو ئەو هەڵوێستە بچێت کە دەبێتە هۆی نائارامی. (جۆزێف ولبی) پزیشکی ناسراوی دەروونزانی دەڵێ: نیشان دانی پلەبەپلە ئەگەر لەگەڵ ڕێگەچارەی دیکەی وەکو خاوکردنەوەی ماسوولکەکان بەکار بهێنرێت ئەوا دەتوانێ ئەو نائارامییە نەیەڵێ و ئەو مەترسیە نادیارانەشی لەناو ببات کە لەژیاندا تووشی ئەوکەسە دێن.

زانا (لازارۆس) کە لەگەڵ (ولبی) لەنووسینەکاندا بەشداری کردووەو دوایی لێی دابڕا، نیشانی داوە کە نیشانی پلەبەپلە بەتەنیا دەتوانێ ئەنجامی زۆرباشی لێ بکەوێتەوە.

بەڵام کاتێک کە نائارامی لە ئەنجامی هەڵچوونی توندەوە پەیدادەبێ و ماسوولکەکان گرژ دەبن، ئەو کەسە کۆئەندامە دەمارێکی ئەوتۆی هەیە کە خێرا دەوروژێت، لەوکاتەدا چارەسەری پزیشکی بە بەکارهێنانی دەرمانە ئارام بەخشەکان لە هەموو جۆرەکانی دیکەی چارەسەری دەروونی باوترن، چونکە هەندێ دەرمان هەن کە یارمەتی هێورکردنەوەی ئەو وروژانەی ناوەوە دەدەن. بەڵام چارەسازی بەدەرمانە ئارام بەخشەکان زۆر کاری لابەلایی دیکەی خراپیان لێ دەکەوێتەوە، لەوانە: فێرەخۆری (الادمان) و زۆر بەکارهێنان کە لەوانەیە پەرە بسێنێ، بەتایبەتیش ئەگەر لەژێر چاودێری پزیشکدا نەبێت. هەروەها زۆرجار ئەو نائارامییەی بۆ دەگەڕێتەوە کاتێک کەواز لەدەرمانەکان دێنێ، بۆیە ڕێگەچارەی دیکە دەگرینەبەر، لەوانەش: ڕێبازی ڕەفتارکردن کە لەهەموویان باوتر جۆری خاوکردنەوەیە (الاسترخاء).

خاوکردنەوەی ماسوولکەکان بەشێوەیەکی ڕێکوپێک (ماسولکە دوای ماسولکە) ئێستا بووەتە ڕێبازێک بۆچارەسەر کردنی ئەو گرژبوونانەی ماسوولکە کە لەدوای نائارامیدا پەیدا دەبن. زۆر نیشانەی جەستەیی نائارامی لەم ڕێگەیەوە چارە دەکرێ لەوانە سەرئێشە، پشت ئێشە، دڵە کوتێ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن و ئازاری دەست و قاچەکان و گەلێکی دیکەی لەوانە کە لەئەنجامی گرژی ماسوولکەو چالاکییەکی زۆری ئەو ئەندامانەوە پەیدا دەبن. هەر بۆیەشە دەبینین زۆر جار تەنیا حەسانەوەو ڕاکشان لەسەر چوارپایە یان دانیشتنێکی هێدی و لەشوێنێکی هێمن و کەم ڕووناهی و بێ دەنگە دەنگ دەبێتە هۆی زۆر گۆڕانکاری دڵخۆشکەر لەلەشدا.

لەبەر ئەوەی گرژی دەمارو نائارامی کەسێک لە چۆنیەتی بیرکردنەوەی ئەو کەسە جودا ناکرێتەوە، هەروەها ئەو بیرو باوەڕانەیشی کە دەربارەی هەڵوێستێک هەیەتی. بۆیە دەبینین دوو زانای ئەمەریکی بەناوی (ئەلیس) و (پیک) وای دادەنێن کە نائارامی دەمارگرژی بەئەنجامێکی ڕاستەوخۆی ئەو ڕێگەیەوە بەستراوەتەوە کە ئەو کەسە لێیەوە بیرلەخۆی دەکاتەوە، نەک لەو شتەدەرەکیانەی کە دەیترسێن بەتایبەتیش لەوکەسانەی کە بیرکردنەوەکانیان زێدەڕۆیی تێدایەو هەمیشە

**.بۆچارەکردنی نائارامی دەبێ نەخۆش هان بدرێت بۆئەوەی واقیعیانە بیر بکاتەوە چ لەخودی خۆی یان لە هەڵوێستەکان.**

پێشبینی ڕوودانی کارەساتان دەکەن. بەم لایەنەی نائارامی دەووترێ تەوەرەی هزری.

بۆچارەکردنی ئەم تەوەرەیە دەبێ نەخۆش هان بدرێت بۆئەوەی واقیعیانە بیر بکاتەوە، چ لەخودی خۆی یان لە هەڵوێستەکان.

زانا (مایکنپاوم) لە کەنەدا دەڵێ: باشترین ڕێگە بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەو بیروباوەڕانەی نەخۆش ئەوەیە کە لەو بیروباوەڕانەی خۆی واگای بێنین کە لەبەر خۆیەوە دەیان ڵێتەوە. هەر ئەم زانایە دەڵێ: ئەو نائارامییەی کە تووشمان دەبێ لە ئەنجامی هەر هەڵوێستێک بریتییە لە ئەنجامێکی ڕاستەوخۆی ئەو قسانەی کە لەگەڵ خۆمانیدا دەیکەین. بۆیە پێشنیاز دەکا کە ناوەڕۆکی ئەم قسانە بگۆڕین بەپێی ئەم سێ ڕێسایەی خوارەوە:

١- دەبێ باوەڕ بەخۆمان بێنین کە ئەو ترس ولەرزەی تووشمان دەبێ کاتێک کەبیر لەڕوودانی شتێکی خراپ دەکەینەوە زۆر لەوانە خراپ ترن کە بەڕاستی ڕوو دەدەن.

٢- دەبێ بەهەر ڕێگەیەک بێت بەخۆمان بسەلمێنین کە ئەو هەڵوێستەی بوودتە هۆی ترس ولەرز هەر کۆتایی دێت.

٣- دەبێ بەخۆمان بڵێین کە ڕزگار بوون لە هەموو ئەو هەستە تێکدەرو گرژانەی کە بەناتارامییەوە بەستراونەتەوە بەیەکجاری زۆر زەحمەتە، کەوابێ ئەوا دەبێ هەندێک لایەنی ئەو گرژیانە قبووڵ بکەین.

ئەمانەو زۆر ڕێگەی دیکەش هەن لەوانە: لەگەڵ خۆماندا لۆجیکانە بدوێین و ئەو بیروباوەڕانە لەمێشکی خۆمان دوور خەینەوە کە دەبنە هۆی ترس و دەبێ زانیاری تەواو دەربارەی هەڵوێستەکان بەدەست بێنین و هەمیشە بیر لەولایەنە بەهێزانەی خۆمان بکەینەوە لەکاتی بەرەنگاربوونەوەکاندا لەگەڵ گیروگرفتە کۆمەلایەتی و عاتیفییەکان.

هەرچی لەڕووی کۆمەلایەتیەوەیە ئەوا مرۆڤی نائارام بەوە دەناسرێتەوە کە لەنێوان هەردوو جەمسەری مل کەچ کردنێکی زۆرو دوژمنکارییەکی سەختدایەو لەنێوان شەرم و مل لێناندایە یان لە بەرەنگاربوونەوەو هەلاتندایەو لەنێوان ئەو دوو جەمسەرە دێ و دەچێت.

ئەو لایەنانە هەرچەندە بەڕووکەش پێچەوانەی یەکترن بەلام دەتوانین تێیان بگەیەنین لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕفتارە دەمارگرژییانەی کە دەبنە هۆی پەلبەست کردنی هەڵچوونەکانی و نایەڵێ بەسەربەستی و لەخۆیەوە ڕووبەڕووی هەڵوێستە دژ بەیەکەکان بێتەوە.

ئێستا بەڵگەی بەهێز بەدەستەوەیە دەربارەی ڕاهێنانی مرۆڤ لەسەر گوزارشت کردن لە هەست و نەستەکانی بەشێوەیەکی سەربەست لەڕێگەی ڕەفتارکردنە کۆمەلایەتییە گونجاوەکان کە دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی نائارامی بەشێوەیەکی دیار. ئەمە بە بەشێکی گرنگی نووسینە دەروونییەکان دادەنرێ و لەژێر سەردێری جۆراوجۆردا باس دەکرێ وەک: جەختکردن لەسەر خود یان ڕاهێنان لەسەر توانا خودیەکان یان ڕاهێنان لەسەر سەربەستی هەڵچوونەکان.

ئەم ڕێبازە لەسەر بناغەی بەڵگە نەویستێکی زانستی دامەزراوە کە بریتییە لەخولێدانی هەڵوێستە کۆمەلایەتیە ورووژێنەرو ترسێنەرەکان کە پێش وەخت دەزانی چی دەڵێی و چۆن ڕەفتاری لەگەڵدا دەکەیت و دەشزانی ماف و ئەرکەکانی خۆتی تێدا چەندە، بۆیەش زۆر سروشتییە کە بەهێمنی کۆنترۆڵی هەڵچوونەکانی خۆت بکەیت لەکاتی بەرەنگاربوونەوەت لەگەڵ ئەم هەڵوێستانەدا.

دیارە زۆربەی پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان پێویستیان بەیەک گەیشتنێکی چالاک و پۆزەتیڤانە هەیە لەگەڵ کەسانی دیکەدا، بۆیە پەیوەندیە کۆمەلایەتییە نێگەتیڤەکانی تێکەلاوێکن لە هەڵچوونە جۆراوجۆرەکان لەوانەش هەندێ جار توورە بوون و گۆڕینەوەی هەستی خۆشەویستی لەگەڵ هیدیکەداو گلەیی وگازاندەو نیشاندانی سەرسوڕمان و دڵ تەنگی.

ئاشکراشە کە مرۆڤی نائارام توانای گۆڕینەوەی هەست ونەستەکانی لەهەڵوێستە کۆمەلایەتییەکاندا کەم دەبێتەوە چونکە ئەو نائارامیە دەبێتە هۆی پەلبەست کردن و لەکار خستن.

**• وێنەی نائارام توانای گۆڕینەوەی هەست ونەستەکانی لە هەڵوێستە کۆمەلایەتییەکاندا کەم دەبێتەوە چونکە ئەو نائارامییە دەبێتە هۆی پەلبەست کردن و لەکارخستن.**

**سەرچاوە:**

گۆڤاری (العربي - العدد ٣٧٤ - يناير ١٩٩٠)

# ڕێژەی نائاشكرا لەنیازداری و لە گوماندارییدا

د. شێركۆ بابان
پرۆفیسۆری یاریدەدەر

ئێمە لە زۆر جێدا گوتوومانە: بەرامبەر بەهەر ڕستەیەكی ئاشكرا ڕستەیەكی نیازداری هەیە لە هەمان كاتدا ڕستەیەكی گوماندارى هەیە. بەم پێیە دەبێت لە زمانەكەدا سێ گەردانئامە هەبێت بۆ هەر كارێك وەك:(١)
شێوازی ئاشكرا: شیلان ڕۆیشت.
شێوازی نیازداری: با شیلان ڕۆیشتبا.
شێوازی گوماندارى: ڕەنگە شیلان ڕۆیشتبێت.
لە ڕاستیدا، ئەم نەخۆشییە هەر لە زمانی كوردیدا نییە لە گەردانئامەی زمانانی دیكەشدا، هەر بە ئەوچەشنە ڕۆیشتووەو بایەخ نەدراوە بەهەردوو شێوازی نیازداری و گوماندارى. بەم شێوەیە، لەڕێزمانی زمانەكەدا، بەلاساییكردنەوە، چارۆكەیەك كراوەتەوەو ئەو دوو شێوازەی تێكراوە(٢). لەگەڵ ئەوەشدا چەند هۆیەك هەیە كە ئەم كردەوەیە كرابێت و ئەو دوو شێوازە بایەخێكی ئەوتۆیان پێ نەدرابێت وەك شێوازی ئاشكرا، وەك:
**یەكەم:** لە زمانی كوردیدا، لەڕێژەی ڕانەبردوودا، هەردوو شێوازەكە هاوڕووخسارن، وەك:
شێوازی نیازداری: با شیلان بڕواتشظ
شێوازی گوماندارى: ڕەنگە شیلان بڕوات
بە ئاشكرا دیارە كە ڕێژەی (بڕوات) لە هەردوو شێوازەكەدا هاوڕووخسارن بەتەواوی.
**دووەم:** لەزنجیرەی فێربوون و فێركردندا، یان لەزنجیرەی گرنگیدا، شێوازی ئاشكرا سەرەتایەو هەردوو شێوازەكەی دی لەسەر ئەو ڕۆنراون. واتە ئەگەر كەسێك، یان منداڵێك زمان فێربێت لەیەكەم هەنگاودا شێوازی ئاشكرا فێر دەكرێت و پاشان كە ئەو شێوازە ڕەوان بوو، ئەمجارە نۆرەی باری نائاشكرا دەهێت.
**سێیەم:** لەزمانەكەدا، شێوازی ئاشكرا برەوی هەیەو لەئاستی یەكەمدایە. لەبەرامبەردا، لە هەردوو شێوازەكەی دیدا، وەك لە ئاستی دووەمدان، هەموو ڕێژەكان لەبرەودا نین. بۆ نموونە هەرچەندە بەرامبەر بە هەر ڕێژەیەكی ڕابردوو ڕێژەی (نیاز)و ڕێژەی (گومان) هەبێت بە
ڕێزمان، بەڵام مەرجە برەویان هەبێت لەبەكارهێناندا.
**چوارەم:** ڕێژەی نائاشكرای نیازداری و گوماندارى هەندێك لەڕێژەی تایبەتی دادەپۆشێت، وەك ڕێژەی فەرمان. هەر لەبەرئەوە ناتوانین ڕستەیەكی وەك (شیلان بڕۆ) بكەین بە شێوازی نیازداری، یان گوماندارى، تا لە ڕووبەری ڕێژەی فەرمانی ڕاستەوخۆ دەری نەئاژەنین.
**پێنجەم:** لە ڕستەی (نیاز)و لەڕستەی (گومان)دا، هەموو جارێك بەرایچكەیەكی ڕێزمانی هەیە كە (نیاز)و (گومان) بكات بە (مچوڕك)و واتاو ڕوخساری ڕێژەكەی بگۆڕێت. واتە، ڕێژەكە ئاوەژوو بكات بە (نیاز)، یان بە (گومان). ئەو بەرایچكەیە كە ئەو ئەركە جێبەجێ دەكات خۆی لەخۆیدا بریتییە لە ڕێژەیەكی ئاشكرا، یان لە كەرەستەیەكی ڕێزمانی كە ئاسەواری ڕێژەی پێوە دیاربێت (گومان) دەبێ بەكاری دووەم لەڕستەكەدا.
بێگومان، ئەمەش ئاڵۆزییەكی گەورەی پەیدا كردووەو وای كردووە كە ڕێچكەی ڕێزمانی لە ئەو ئاستەدا لێڵ بێت و پێویست بە توێژینەوەی ئەكادیمیانەتر بكات.
بەم چەشنە، دەبینین كە سێ شێواز هەیە بۆ ئاخاوتن و ڕێزمانەكە هەر ڕووی كردووە لە شێوازی ئاشكراو دوو شێوازەكەی دیكە لە لێلایی دا ماونەتەوە. ئەوانەش وای لە ئێمە كردووە كە چارۆكە گەورەكەی ڕستەی (ئینشائی) بكەینەوەو دەست ببەین بۆ ئەو بابەتانەی كە (بقڤە) بوون(٣).
لەڕاستیدا، ئەمە یەكەم جار نییەو ئێمە لەچوار كتێبی بڵاوكراوەدا ئەم نیشەمان كردووە. لە ئەم نووسینەشدا جارێكی دی ڕوو دەكەینەوە لەبابەتەكەو وەك كێشەیەكی سەربەخۆ دەیخەینە بەردەست خوێنەری ئازیز، بە ئەو هیوایەی ئەختێك ڕەوانترو كاریگەرتر سەردێری نووسینەكە گەمارۆ بدەین.
ئەوەش لەیاد نەكەین، كە سەرەتای پەیدابوونی ئەم كێشەیە لەكاری (بوون و هەبوون) دایەو هەر لە ئەو دوو كارەوە، بەزەبری (میكانیزمی ڕۆنان)و میكانیزمی (وەرچەخان)، پەڕیوەتەوە بۆ ڕووبەری ڕابردوو و بۆ ڕێژە تێپەڕەكان(٤). ئەم دیاردەیەش لەبەشەكانی كۆتاییدا لێك دەدرێتەوە.

## نائاشكرایی لە هەنگاوی یەكەمدا

ئێمە لە هەموو جێیەكدا ئەوە دووپات دەكەینەوە كە ڕێژەی ڕانەبردوو بریتییە لە (ڕێژەی بنەڕەت و ڕێژەی ڕابردوو بریتییە

نە (ڕێژەی ڕۆنراو لەسەرچینی بنەڕەتی ڕانەبردوو)(٥). واتە، دەمکاتی ڕانەبردوو بریتییە لەچینی بنەڕەت و دەمکاتی ڕابردوو بریتییە لەچینی ڕۆنراو لەسەر چینی ڕانەبردوو (چینی بنەڕەت). لەگەڵ هەموو ئەوەشدا، ئێمە لە هەموو جێیەک دەڵێین کاری (بوون و هەبوون) گیرفانێک داگیر دەکەن لە چینی ڕانەبردوو (ڕێژەی بنەڕەت) بەناوی (ڕانەبردووی تەواو). لە ڕاستیدا ڕێژەی نیازداری و ڕێژەی گومانداری پڕ بە پڕ یەکسانن بە ڕوخسار، وەک:

بێگومان ئەو (دە)کەوێت
بۆ ئەو (بـ)کەوێت
ڕەنگە ئەو (بـ)کەوێت

بە سەرنجێکی ورد دەردەکەوێت کە ڕستەی دووەم و سێیەم نائاشکران. لەبەرامبەردا، هەردوو ڕێژەکە هاوڕووخسارن. ئەم دیاردەیە هەموو کاری زمانەکە دەگرێتەوە، بەڵام تەنیا دوو کار نەبێت کە بریتین لە (بوون)و لە (هەبوون). لە ئەم رووکارەدا سەرپێچی پەیدا دەبێت و ڕێژەی (گومان) جودا دەبێتەوە لە ڕێژەی (نیاز)، لە ڕانەبردوودا، وەک:

| ڕێژە | بوون | هەبوون |
|---|---|---|
| ئاشکرایی | بێگومان ئەو (ە) | بێگومان ئەو هەیـ(ـە) |
| نیازداری | بریا ئەو (با) | بریا ئەو هە(با) |
| گومانداری | ڕەنگە ئەو (بێت) | ڕەنگە ئەو هە(بێت) |

لە ئێرەدا بە ئاشکرا دیارە کە:

یەکەم: کاری (هەبوون) پڕ بە پڕ یەکسانە بەکاری (بوون) لە رووی ڕێژەی کارەوە لەرستەی ئاشکراو نیازو گوماندا. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە کاری (هەبوون) بریتییە لە دارشتنەیەکی هاوڕێزمان بۆ کاری (بوون).

دووەم: ڕێژەی هەردوو کارەکە لە مۆرفیمی ئێستایی (ـە)ەوە بە زەبری (نیاز) گۆڕا بۆ (با)و بەزەبری (گومان) گۆڕا بۆ (بێت).

لە ئەم ئاستەدا لە هەنگاوی بەراییدا چووزەرەی جوداوازییەکە دەردەکەوێت. لە ئەم هەنگاوەدا، نە میکانیزمی (وەرچەرخان)و نە میکانیزمی (ڕۆنان) هەیە.

نائاشکرایی لە دووەم هەنگاودا:

هەر لە رووبەری ڕانەبردوو و لە گیرفانە بچکۆڵەکەی کاری (بوون و هەبوون)دا، کە ناونراوە (ڕانەبردووی تەواو)، هەردوو کارەکە بەزەبری میکانیزمی وەرچەرخان دەبن بە تێپەڕ. لە ئەم ئاستەدا، دەتوانین ئەو نموونانەی (هەنگاوی بەرایی) وەربگرین و وەریان بچەرخێنین، وەک:

| ڕێژە | بوون | هەبوون |
|---|---|---|
| ئاشکرایی | بێگومان ئەو سەرمایـ(ـەت)ی | بێگومان ئەو هەیـ(ـەت)ی |
| نیازداری | بریا ئەو سەرمای (با) | بریا ئەو هەی(بێت) |
| گومانداری | ڕەنگە ئەو سەرمای(بێت) | ڕەنگە ئەو هەی(بێت) |

لە ئێرەدا، هیچ نەگۆڕاوە لە هەنگاوی یەکەم تەنیا ئەوە نەبێت کە:

- ڕێژەکان کراون بەتێپەڕ
- جێناوی (ی) لە ڕیزە جێناوی (م، ت، ی، مان، تان، یان) وەرگیراوە بۆ ڕۆڵی (بکەر).

سێیەم: مەرج نییە هەر جێناوی (ی) وەربگرین دەتوانین هەر پێنج جێناوەکەی دی بکەین بە (بکەر) وەک:

**ڕێژەی ئاشکرا:**

بێگومان، من سەرمامـ(ـە) : بێگومان من (هەمـ(ـە)
بێگومان، تۆ سەزماتـ(ـە) : بێگومان، تۆ هەتـ(ـە)
بێگومان، ئێمە سەرمامانـ(ـە) : بێگومان، ئێمە هەمانـ(ـە)
بێگومان، ئێوە سەرماتانـ(ـە) : بێگومان، ئێوە هەتانـ(ـە)
بێگومان، ئەوان سەرمایانـ(ـە) : بێگومان، ئەوان هەیانە(ـە)

**ڕێژەی نیازداری**

بریا من سەرمام (با) : بریا من هەم (با)
بریا تۆ سەرمات (با) : بریا تۆ هەت(با)
بریا ئێمە سەرمامان (با) : بریا ئێمە هەمان (با)
بریا ئێوە سەرماتان (با) : بریا ئێوە هەتان (با)
بریا ئەوان سەرمایان (با) : بریا ئەوان هەیان (با)

**ڕێژەی گومانداری:**

ڕەنگە من سەرمام (بێت) : ڕەنگە من هەم (بێت)
ڕەنگە تۆ سەرمات (بێت) : ڕەنگە تۆ هەت (بێت)
ڕەنگە ئێمە سەرمامان (بێت) : ڕەنگە ئێمە هەمان (بێت)
ڕەنگە ئێوە سەرماتان (بێت) : ڕەنگە ئێوە هەتان (بێت)
ڕەنگە ئەوان سەرمایان (بێت) : ڕەنگە ئەوان هەیان (بێت)

لە ئەو نموونانەدا، خوێنەری زیرەک و ڕێزماننووسی ڕەسەن دەتوانێت بەسەرنجی ورد تێبگات لە کونهی زمانەکەو لە ئەو ڕێزمانەی کە بۆ سەدەی داهاتوو پێویستە. بەڵێ، بەسەرنجێکی ورد هەموو خوێنەرێک تێدەگات لەشێوازی ڕێژەی کار. یان، تێدەگات کە بەرامبەر هەر ڕێژەیەکی ئاشکرا، ڕێژەیەکی نیازداری و ڕێژەیەکی گومانداری هەیە. لە هەمان کاتدا، تێدەگات لە (میکانیزمی وەرچەرخان)، یان ئەو میکانیزمەی کە ئەرکی (بکەر)و (بەرکار) لەنێو هەردوو

پۆلە جێناوەکەدا ئاڵوگۆڕ دەکات.

**ئاشکرایی لە سێیەم هەنگاودا:**

ئێمە لە هەموو جێیەکدا دەڵێین کە ڕێژەی ڕابردوو بە ڕێژەی ڕانەبردووی کاری بوون ڕۆدەنرێت. لە ئەم ئاستەدا ڕێژەکانی هەنگاوی یەکەم دەتوانن ڕێژەی ڕابردووی تێنەپەڕ ڕێبنێن، وەک:

ئەو ـــــ ە ـــــ> ئەو (ڕۆیشت)با

ئەو ـــــ با ـــــ> با ئەو (ڕۆیشت)- ڕەنگە

ئەو ـــــ بێت ـــــ> ئەو (ڕۆیشت) بێت

لەو ڕێژانە میکانیزمی ڕۆنانی ڕێژەی ڕابردوو زۆر ئاشکرایە لە ڕستەی ئاشکراو لە ڕستەی نیازو لەرستەی گوماندا.

لەگەڵ ئەوەش چەند سەرنجێک هەیە، وەک:

یەکەم: لە ڕستەی یەکەمدا مۆرفیمی ئێستایی لەناوچووە. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستییەی کە لە ڕابردووی نزیکدا، سیمای ئێستایی نییە.

دووەم: لە هەر سێ ڕێژەکەدا، ئەگەر ڕێژەی (ڕۆیشت) لابەین ئەوا ئەوەی دەمێنێتەوە بریتی دەبێت لە ڕێژەکانی ڕانەبردوو لەکاری (بوون).

**ئاشکرایی لە هەنگاوی چوارەمدا:**

لەسەر ئەندازەی هەنگاوی سێیەم ڕێژەی کاری ڕابردوو تێپەڕ بەڕێژەی وەرچەرخاوی کاری بوون ڕۆدەنرێت. لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین نموونەکانی هەنگاوی دووەم وەربگرین، وەک:

ئەو هەیەت(ی) ـــــ> ئەو نارد(ی)

با ئەو هەی-با ـــــ> با ئەو ناردبا(ی)

لە نموونەی یەکەمدا مۆرفیمی ئێستایی بەڕووخساری ڕەسەنی(ـەت) هەیە، بەڵام لە ڕێژە ڕابردووەکەدا مردووە، چونکە گیانی ئێستایی نییە. لە ڕستەی دووەم و سێیەمدا تەنیا بازەکەی جێناوی (ی) نەماوە. ئەوەش لەبەر ئەوەی ڕێژەی (نارد) یەک پارچەیە.

**گفتوگۆیەک**

لە ئاستی ئەم سستییەی کە وەک نەخۆشییەک چووەتە نێو ڕێزمانی کوردییەوە، بێگومان لە ڕێزمانی زمانانی دیکەوە، ئێمە بیروبۆچوونی خۆمان هەیە. ئەوەش لەنێو نووسینەکەدا تۆمارکراوەو لە ئەم گفتوگۆیەدا ڕوو دەکەینە سەرپاکی بابەتەکەو دەربەست نابین لەدووبارەبوونەوە. لەم ئاستەدا، گرنگ ئەوەیە کە گۆشتاوێک لە گۆشتی بیروبۆچوونەکان بگرین و پێشکەشی بکەین بەخوێنەری ئازیزو بە هەموو ئەوانەی کە بەچاوی ڕێزەوە لە ڕێزمانی زمانەکەیان دەڕوانن.

لە ڕاستیدا، جۆرە بابەتی ئاوها وردو ئاوها ئاسک پێویست بە زۆرتر دەکات، بەڵام بەهەر حاڵ لە ئەم ئاستەدا هەر ئەو هەندە بەسە:

**لە ڕووبەری ڕانەبردوودا:**

لە ڕووبەری ڕانەبردوودا، بەرامبەر بە هەر ڕێژەیەکی ئاشکرا شێوازێکی نیازداری و شێوازێکی گومانداری هەیە، بەم چەشنە:

**یەکەم:** شێوازی ئاشکرا، وەک:

من (دە)کەوم: ئێمە (دە)کەوین

**دووەم:** شێوازی نیازداری، وەک:

با من (ب)کەوم: با ئێمە (ب)کەوین

**سێیەم:** شێوازی گومانداری، وەک:

ڕەنگە من (ب)کەوم: ڕەنگە ئێمە (ب)کەوین

بە ئاشکرا دیارە کە لە ڕانەبردوو ڕێژەی (نیازداری)و ڕێژەی (گومانداری) پڕبەپڕ یەکسانن بەڕووخسار. واتە، تەنیا هەر ڕەگەزی بەردەوامی (دە) بووە بە (ب)، وەک:

ڕەگەزی (دە)+نیازداری ـــــ ڕووخساری (ب)

ڕەگەزی (دە)+گومانداری ـــــ ڕووخساری (ب)

لە ڕاستیدا، ڕەنگە ئەم هاوڕووخسارییە بووبێت بەهۆی ئەوەی کە بەرچاوی ڕێزماننوسان لێڵ ببێت و بە ڕێژەی (ئینشائی) ناوی ببەن.

*** لەڕانەبردووی بوون و هەبووندا:**

کاری (بوون و هەبوون) زۆر بێ خزمەتن لەزمانەوانیدا بەتایبەتی لە زمانی کوردیدا. ئەوەی لە بارەی ئەم بابەتە نووسراوە تەنیا هەر لاسایی کردنەوەی ڕێزمانی زمانانی دیکەیە. لەم ڕووەوە، ڕەنگە نەتوانین هیچ کەڵکێک لە ڕێزمانی نووسراوە وەربگرین، چونکە ڕێژەی (نیازداری)و ڕێژەی (گومانداری) لەکارەکانی دیکەدا هەرس نەکراوە بەجوانی تا لەکاری (بوون و هەبوون)دا هەرس بکرێت.

لە ڕاستیدا کاری (بوون و هەبوون) هەردووکیان دایک و کچن و هەردووکیان لەسەر پاکی کاری زمانەکە جودا دەبنەوە بەمچوڕکی (نیاز)و (گومان)، وەک:

یەکەم: شێوازی ئاشکرا، وەک:

ئەو هەی(ـە)

**دووەم:** شێوازی نیازداری، وەک:

بریا ئەو هە(با)

سێیەم: شێوازی گومانداری، وەک:

ڕەنگە ئەو هە(بێت)

لەم ئاستەدا، دەتوانین بیر بگوشین لە ئاستی ئەو زەرنەقووتەیەدا کە ڕووخساری دەگۆڕێت بەمچوڕکی (نیاز)و (گومان). واتە لەو ڕێژەیەدا مۆرفیمی (ـە) جارێک بە (نیازداری) ڕووخساری گۆڕاوە بۆ (با)، وەک:

ڕێژەی (ـە)+نیازداری ـــــ ڕووخساری (با)

یان هەمان ڕووخساری (ـە) بەمچوڕکی (گومان) ڕووخساری گۆڕاوە بۆ (بێت)، وەک:

رێژەی (ـە)+گومانداری ـــــــ رووخساری (بێت)

*** لە رووبەری رابردوودا**

لە رووبەری رابردوو کێشەکە زۆر زۆر ئاڵۆزەو بەرامبەر بەهەر رێژەیەکی رابردوو رێژەیەکی (نیازداری)و رێژەیەکی (گومانداری) هەیە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە هەر رێژەیەک کە رێزمانەکە درووستی بکات لە زمانەکەدا برەوی هەبێت. بۆ نموونە، لە رابردووی نزیکدا هەردوو شێوازەکە برەویان هەیە، وەک لە رستەی (ئەو دەڕۆیشت)دا دەردەکەوێت:

شێوازی نیازداری: با ئەو رۆیشتبا

شێوازی گومانداری: رەنگە ئەو رۆیشتبێت

رستەی دووەم، رووخسارەکەی پتەوترە، بەڵام رستەی یەکەم زۆر شل و خاوەو دەکرێت (با ئەو بڕۆیشتایە)، یان (با ئەو بڕۆیشتبایە). ئەوەی سەیرە، ئەوەیە کە پارچۆلکەی بەردەوامی (بـ) زیندوو دەبێتەوە کاتێک کە رووخساری (با) دەگۆڕێت بۆ (ایە) یان (بایە) بە ئەم شێوەیە کێشەکە لەبەردەست دایەو دەزگا باڵاکانی زمان دەتوانن بڕیاری گونجاو بدەن لەسەری(٦).

بەردو زمانی نووسین

ئەگەر بمانەوێت خزمەتێکی کاریگەرو جێدار پێشکەش بکەین بەزمانی نووسین دەبێت رێچکەی یەکبوون بگرین و ئەم خاڵانەی خوارەوە جێبەجێ بکەین:

یەکەم: پاراستنی پاشکۆی (با)، نەک کلۆرکردنی بەلابردنی دەنگی (ب)، لەرێژەی نیازداریدا.

دووەم: پاراستنی رووخساری (بێت) لە رێژەی گوماندارییدا، نەک لابردنی دەنگی (ت)، وەک (بێ).

**سێیەم:** سەرکوتکردنی مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە دەرکەوتن لەرێژەی نیازداریدا، وەک (بریا هەبا) لەجیاتی (بریا هەبایە)، یان (بریا رۆیشتبا) لەجیاتی (بریا رۆیشتبایە).

**چوارەم:** رێگرتن لە ئاوێتەبوونی خاڵی یەکەم و سێیەم لە نموونەیەکدا، وەک (بریا رۆیشتبا) لەجیاتی (بریا بڕۆیشتایە).

**پێنجەم:** لە دمکاتی رابردوودا، هاوێرکردنی ئەو جۆرە رابردوودی کە برەوی هەیە، چی لەنیازداو چی لە گوماندا. بەداخەوە، زمانی نووسین زۆر پەرپووتە بە ئەو جۆرە کێشانەوە.

**پەراوێز**

١- لە رووبەری رێژەی رانەبردوودا، شێوازی گومانداری و شێوازی نیازداری یەکسانن بە روخسار. ئەم دیاردەیە لە پاشتردا باس دەکرێت.

٢- ئەو چارۆکەیە بریتییە لە شێوازی (ئینشائی) لە رێزمانی نووسراودا. ناواخنی ئەو چارۆکەیە هەرچەند زۆر فرە بابەتە، بەڵام لە رێژەی (نیازداری)و (گومانداری)دا جێیان دەبێتەوە.

٣- زاراوەی (ئینشائی)، لە زمانی دەرودراوسێ وەرگیراوەو هەروەک خۆی زمانی کوردی پێ پینەکراوە. ئێمە لەگەڵ ئەوەداین کە دەبێت ئەم بابەتە بخرێتە بەر شرۆڤەکاری و بە جوانی یەکلا بکرێتەوە.

٤- بڕوانە، بۆ سەرچاوەکان (٢) بۆ ئەو دوو میکانیزمە گرنگە.

٥- ئەوەی مەبەستی بێت کە لە (رێژەی بنەڕەت)و (رێژەی رۆنراو) تێبگات دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی(٢)

٦- لەم نووسینە، مەبەستی ئێمە بریتییە لە هەژاندنی هەمووان بۆ وازهێنان لەزاراوەی (ئینشائی)و رووکردن لەرێژەی (نیازو گومان). ئەم بابەتە لە ئاستێکی بەرزتردا بەکاردەهێنرێت و زۆر ئاڵۆزە. لەزمانانی دیکەدا، هەمان کێشە هەیەو لەگەردانانامەی کارەکاندا، تەنیا چەند رێژەیەک رێزدەکەن کە برەوی هەبێت لەزماندا، نەک لەرێزماندا (سەرچاوەی ٧ و ٨).

**سەرچاوە**

١- د. شێرکۆ بابان، رستەسازی و شیتەڵکاری زانستی، هەولێر، ١٩٩٦ .

٢- د. شێرکۆ بابان، میکانیزمە بنەڕەتیەکانی رستەسازی، رێزمانی (بوون و هەبوون)، هەولێر ١٩٩٧ .

٣- لیژنەی زمان و زانستەکانی رێزمانی ئاخاوتنی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٦

٤- مەسعود موحەمەد، بیروبۆچوونەکانی مامۆستا لەسەرچاوەی (٣)دا.

٥- د. ئەورەحمانی مارف، رێزمانی کوردی، بەشی دووەم، جێناو، بەغدا ١٩٧٨.

٦- نوری عەلی ئەمین، ئەرک و شوێنی راناوە کەسییەکان لە ئاخاوتنی کوردیدا، بەغدا ١٩٧٨.

**7- Le nouveau Becherelle 1, dictionnaira de 12000 verbs, Paris 1980.**

**8- V.E. Hoopr English verbs, BARONS educational series. U.S.A 1991**

# دەستنووسی فەرهەنگێکی

# کوردی - ئینگلیزی، ئینگلیزی - کوردی

# لەکتێبخانەی «سواس» لەلەندەن

ئەنوەر سوڵتانی-لەندەن

دەستنووسی فەرهەنگێکی کوردی - ئینگلیزی و ئینگلیزی - کوردی لەو قوتابخانەی توێژینەوە ڕۆژهەڵاتییەکانی سەر بەزانستگەی لەندەن (سواس)«١» پارێزراوەو پێناسی ژمارە MS. 380 327ی پێدراوە.

من تەواو بەهەڵکەوت بەهەواڵی دەستنووسەکەم زانی و ئەویش کاتێک بوو کە بەدوای هەندێ دەستاوێژ لەمەڕ ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٥٠ی ناوچەی جوانڕۆدا دەگەڕام و بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیام دەپشکنی، بەڵگەنامەکان نیشاندەری چالاکی خوالێخۆشبوو کامەران بەدرخان و «وەفدی کورد» لەپاریس بوون، بەدرخان لەکاتی هێرشی ناجوامێرانەی ئەرتەشی حەمە ڕەزاشا بۆ سەر جوانڕۆییەکان، بەوپەڕی دڵسۆزی بەرانبەر بەخەڵکی ستەم لێکراوی جوانڕۆوە چەندەها نامەی ئاراستەی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەندامانی شورای ئاسایش کردووەو ڕژێمی ئێرانی لەقاوداوە، ئینجا وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا وەک ئەندامی دایمی شورای ئاسایش کاتێ نامەکانی بەدرخانی پێگەیشتووە، داوای لەباڵوێزخانەکانی خۆی لەتاران و بەغداو دیمەشق و ئانکاراو پاریس و مۆسکۆ کردووە لەسەر بەدرخان و وەفدی کورد زانیاریی بدەنێ«٢».

من ژمارەیەک لەو بەڵگەنامانەم وەرگێڕاونەتە سەر کوردی و لەدوو ژمارەی پێشووی «ڕابوون»دا (١٨-١٩و ٢٠)بڵاوبوونەتەوە، باڵوێزخانەی بەریتانیا لەدیمەشق، لەنامەی حەوتەمی مایسی ١٩٥٦دا، باسی کەسایەتی ناوبراوو براکەی - واتە جەلادەت عالی بەدرخان دەکات و لەپاراگرافی دووهەمی نامەکەدا دەنووسێ:

«جەلادەت عالی بەدرخان چەند ین ساڵ لەسەر فەرهەنگێکی کوردی - ئینگلیزی کاری کردووە، بەڵام نەیتوانیوە پێش مردن، کۆتایی پێ بێنێ، خێزانی جەلادەت عالی نیگەرانی ئەوەیە نەتوانێ کتێبەکە چاپ بکات، دەستنووسی پێنج پیتی یەکەمی فەرهەنگەکە پێشتر لەلایەن ئەفسەری موخابەراتەوە نێرراوە بۆ مەدرەسەی توێژینەوە ڕۆژهەڵاتییەکان، بەڵام تائێستا بڕیاری چاپکردنی نەدراوە، فەرهەنگەکە بەپیتی لاتینی نووسراوە کە کوردی ئێرە وەک سیستەمێکی ئەلف و بێی ئەوتۆ چاوی لێدەکەن لەسیستەمێک کە ئێستا لەلایەن ڕووسەکانەوە پێکهاتووە،.... باشتر بێت، (بەڵگەنامەی ژمارە (FO, 371/120749/377).

دوابەدوای چاوپێکەوتنی بەڵگەنامەکە، مەسەلەی جوانڕۆم بەجێ هێشت کەوتمە سەروسۆراغی دەستنووسی گۆڕین، دوای هاتوچۆو نامەنووسینی زۆر بۆ مەدرەسەی توێژینەوەی ڕۆژهەڵاتی و ئەفریقییەکان (سواس) بەداخەوە گەیشتمە ئەو ئاکامەی کە دەستنووسەکە لەمەدرەسەی ناوبراو نەماوەو هیچ نیشانەیەکیش بەدەستەوە نییە کێ هێنا بێتیە ئەوێ و پاشان کێ بردبێتیە دەرێ«٣».

بەڵام لەڕێگەی نامەنووسین بۆ سواس و بەهۆی یارمەتی دۆستێکەوە بەهەواڵی فەرهەنگێکی دیکەم زانی، کە پێشتر لەسەردانی کتێبخانەکەدا چاوم پێ نەکەوتبوو، دەستنووسی ژمارە MS. 380 327:

دەستنووسەکە، بریتییە لەدوو بەرگی جیاواز: بەرگی یەکەم فەرهەنگی ئینگلیزی بەکوردی و بەرگی دووەم فەرهەنگی کوردی بەئینگلیزی، هەردوو بەرگەکە، بەگوێرەی پیتی ئەلف و بێی ئینگلیزی ڕێک خراون، بۆ هەر پیتەی چوار یاپێنج پەڕە تەرخان کراوەو هەر لاپەڕەی دەوروبەری ٣٠ وشەی تێدایە واتا کراوەتەوە.

بەم پێیە دەتوانین بڵێین سەرجەمی هەردوو بەرگەکە، نزیکەی ٢٠٠٠ وشەی گرتۆتەبەر کە نیوەیان کوردی و نیوەی ئینگلیزین.

نووسراوەکان لەسەر کاغەزی قەوارە A4 تایپ کراون، لەهیچ شوێنێکدا، ناو یا مێژوویەکیان بەسەرەوە نییەو نازانرێ کێ نووسیویەو کەی نووسراوە، بەڵام سێ نیشانەی لاوەکی هەن کە ڕووناکی دەخەنە سەر ئەم

• فەرهەنگی جانسۆن زۆرپێش فەرهەنگەکەی مامۆستا تەوفیق وەهبی و ئەدمۆنز نووسراوە بە شێوە زمانی کرمانجی خواروو نووسراوەو مۆرکی بن لەهجەی سلێمانی بەسەر وشەکانیەوە دیارە.

پرسیارانە:

١- نووسینەکان لەسەر کاغەزی رەسمی دەوڵەتی بەریتانیا نووسراون و مۆری دەوڵەتی بەریتانیایان بەسەردوەیە.

٢- پەڕەی یەکەمی بەرگی یەکەم، یادداشتێکی سی چل دێرییەو ئەویش لەسەر کاغەزێکی رەسمی نووسراوە کە لەلای سەرەوەیدا، ئەم چەند وشەیە بەزمانی ئینگلیزی چاپکراوە:

کاغەزی پێشنووس وەزارەتخانەی هێزی ئاسمانی... ژمارەی فایل... ئەویش نیشاندەری هەمان راستییەکە نووسینەکان پەیوەندییان بەوەزارەتخانەیەکی دەوڵەتی بەریتانیاوە هەیە.

٣- نووسەری یادداشتی سەرلاپەڕەی یەکەم، بەرواڵەت، دەبێ ئەفسەرێکی قوماندانی هێزی ئاسمانی بەریتانیا بێت کە دەقی فەرهەنگەکەی لەلایەن دایرەکەی خۆیەوە پێدراوەو، داوای هەڵسەنگاندنی لێکراوە بۆ ئەوەی بزانرێ ئایا دەکرێ لەچاپ بدرێت، یان نا، ئەفسەرەکە، ئیمزای خۆی خستۆتە کۆتایی یادداشتەکان و خۆی بەم شێوەیە ناساندوە: ج، ب، ر، پێللی، فەرماندەی سکادران (ئاسمانی).

تائێستا تەنیا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە فەرهەنگەکە، بەشێوەیەک پەیوەندیی بەهێزی ئاسمانی بەریتانیاوە هەیە، بەڵام زیاترمان لەخوێندنەوەی درێژەی یادداشتەکە، دەست دەکەوێت، «پێللی» دەنووسێت:

«من سەیری فەرهەنگی کوردیی«جانسۆن»م کردو لام وایە بۆ خوێندکارانی ئەم زمانە، گەلێک بەکەڵکە....»

بەم پێیە، نووسەری دەستنووسەکە ناوی «جانسۆن» بووەو ئەم ناوە: لەنامەی خاتوو «لوئیزە رەی»یارمەتیدەری ئارشیوی کتێبخانەی سواس بۆ من (25/11/96)دا روونتر دەبێتەوە:

«دەستنووس ژمارە MS. 380327 فەرهەنگێکی کوردییە، کاری ج، س، ئ. جانسۆنە و لەساڵی ١٩٨٢دا بەئەمانەت دراوە بەئێمە، «٥» ئەوە هەموو ئەو زانیارییە توانیومە لەسەر نووسەری فەرهەنگەکە کۆی بکەمەوە، ناوی ج. س. ئ. جانسۆن بووە بەگوێرەی ئەوەی کاردکەی دراوە بەقوماندانێکی هێزی ئاسمانی بەریتانیا. دەبێ ئەویش ئەندامێکی هەمان هێز بووبێت.

ئەندامێکی هێزی ئاسمانی بەریتانیاش لەپەیوەندیی بەزمانی کوردی و نووسینی فەرهەنگی کوردییدا، دەبێ کەسێک بووبێت لەبنکەیەکی هێزی ئاسمانی بەریتانیا لەرۆژهەڵاتی ناوەراست ژیابێت و ئەو بنکەیەش زۆر واهەیە بنکەی موسڵ یا کەرکوک بێت.

بەڵام لەمەڕ مێژووی نووسینی فەرهەنگەکە، تەنیا یارمەتیدەرمان، مێژووی نووسرانی یادداشتەکەی «پێللی»یە، پێلی قوماندان، لەکۆتایی یاداشتەکەیدا، رۆژی ٢٣ی مانگی ٦ی ساڵی ١٩٣٧ دیاری دەکات.

ئاشکرایە ئەم مێژووە، مەسەلەی ساڵی نووسرانی فەرهەنگەکەمان بۆ چارەسەر ناکات، بەڵام دەریی دەخات لای کەم لەساڵانی پێش ١٩٣٧دا نووسراوەو نووسەر تا ئەو ساڵەش هەر لەنێشوکاری هێزی ئاسمانی بەریتانیادا ماوەتەوە «پێللی» لە یادداشتەکەیدا دەنووسێ: «ئەگەر جانسۆن کاتی ئەوەی هەبێت، پێویستە هەڵەو پەڵەی نووسینەکانی بگرێت و یارمەتی لەکوردێکیش بخوازێت..»

هەر چۆنێک بێت، فەرهەنگی جانسۆن زۆر پێشی فەرهەنگەکەی مامۆستا تەوفیق وەهبی و ئەدمۆنز نووسراوە، شێوە زمانی کرمانجی خواروو نووسراوەو مۆرکی بن لەهجەی سلێمانی بەسەر وشەکانیەوە دیارە، واتا کردنەوەی وشەکان دوور لەهەڵەنین، بەڵام لەزۆر شوێندا ئالوگۆڕیان تێدا دراوەو دیارە دەبێ بەیارمەتی کەسانێکی دی (کورد؟) ساغ کرابێتەوە، ئەوەش بەنیشانەیەکدا دەردەکەوێت: دەقی سەرەکی فەرهەنگەکە تایپکراوە، بەڵام دواتر بەدەست خەت گەلێک شتی لەسەر نووسراوەو زۆر هەڵەی تێدا ساغکراوەتەوە، بەم پێیە دوورنییە کوردێک یارمەتی جانسۆنی دابێت و ئەو کەسە ئەگەر تائێستا مابێت، دەبێ زانیاریی زیاتری لەسەر فەرهەنگەکەو جانسۆن هەبێت.

بەم شێوەیە، من بەهەڵکەوت شوێنی دەستنووسی فەرهەنگی جانسۆنم هەڵگرت، بەڵام بەداخەوە نەمتوانی هیچ نیشانەیەک لەفەرهەنگی جەلادەت عالی بەدرخان بدۆزمەوە، پەیوەندیم بەئەنستیتۆی کوردی فەرەنسەوە گرت کە زۆربەی دەستنووسەکانی بنەماڵەی بەڕێزی بەدرخان، لەوێ پارێزراون، کاک خانی هەژار، بەرپرسی کتێبخانەی ئەنستیتۆ پێی گوتم فەرهەنگی کوردی - فەرەنسی جەلادەت عالی لەوێ پارێزراوە، بەڵام هیچ هەواڵێک لەفەرهەنگە ئینگلیزییەکەی نازانێت، هیوادارم بەهیمەتی هەموو لایەک ئەم دەستنووسە بەنرخەی کەسایەتییەکی مەزنی وەک جەلادەت عالی بەدرخان بدۆزرێتەوەو دونیای روون ببینێ.

• من بەهەڵکەوت شوێنی دەستنووسی فەرهەنگی جانسۆنم هەڵگرت، بەڵام بەداخەوە نەمتوانی هیچ نیشانەیەک لەفەرهەنگی جەلادەت عالی بەدرخان بدۆزمەوە

## پەراوێزەکان:

1- School of Qrienl and African Studies (S. O. A. S, London.

2- FO. 371/ 82000, 7/9/1950.

٣- لەنامەی رۆژی ٣ی دیسەمبەری کتێبخانەی سواس بۆمندا نووسراوە:

«بەداخەوە نەمتوانی هیچ پێشینەی دەستنووسەکەو ئەوەی درابێتە بەم کتێبخانەیە، روونکەمەوە، بەگوێرەی ئەوەی راپۆرتەکەی دیەشق لەمەڕ ئەوەی دەستنووسەکە بۆ کێ نێردراوە، زۆر روون نییە، بۆی هەیە راستەوخۆ کەوتبێتە دەستی کەسێکی ئاکادیمیک و رێگای نەکەوتبێتە ئەم کتێبخانەیە.

4- Minute Sheet Air Ministry File No.

5- Louise Roay - Assistant Archirist,
The Library. S. O. A. S.

«پرۆفیسۆر ئەحمەد فەرهادی»

# بۆزمانی ستاندارد زۆرشت هەیە پێویستە بیری لێ بکەینەوەو پەلە نەکەین

ئا : ئیسماعیل بەرزنجی



**دکتۆر ئەحمەد فەرهادی لەو پرۆفیسۆرە کوردانەیە کە بەمەق ئاشقە زمانە، چەندان ساڵە لەهەندەران هەر دەست لەملانی زمانەو لەگەڵی دەژی.**

**بەم دواییانە گەڕایەوە کوردستان، لەم دیمانەیەدا بابزانین ئەم ئاشقە زمانە چ دەڵێت؟**

**• گوتەیەک هەیە دەڵێت .گۆڕان لەزماندا لە هەموو پرۆسەیەک دیموکراسیترە، واتە زمان دەگۆڕێت. دەکرێ زیاتر تیشک بخەنە سەر ئەم لایەنە؟**

– زۆرجار خەڵکانی ئێمە دەڵێن «بیبی یەکم خوارد» نەک «خواردەوە»، ئێمە دەزانین «خواردن»و «خواردنەوە» جیاوازیان هەیە، کە لەزمان باسی گۆڕانکاری دەکەین ئێمە باسی ڕۆژێک و هەفتەیەک و مانگێک ناکەین. بەڵکو باسی دەیان ساڵ دەکەین، لەزمانی ئینگلیزی بەچەقۆ دەڵێن **knife** باشە ئەم «**k**»یە لێرە چ دەکات؟ چونکە لەکاتی خۆی بە **knife** «کنایف» دەیانخوێندەوە، کەواتە زمانی قسەکردن زۆر زۆر لەپێشترە لەزمانی نووسین.

**•گۆڕانکاری لەزمان لە هەموو پرۆسەیەک دیموکراسیترە.**

**• کەواتە دەکرێت بەراورد لەنێوان دووزماندا بکرێت، بەنموونە زمانی ئینگلیزی و فەڕەنسی؟**

- فەرەنسییەکان ئەکادیمییەکیان هەیە پێی دەڵێن «ئەکادیمیی فەرەنسی» هەر وشەیەکی سادە بێتە ناو زمانەکەیان پێویستە ئەم ئەکادیمیایە بڕیاری لەسەر بدات، بەڵام زمانی ئینگلیزی لەکۆنەوە دەرگای کراوەتەوە، لەهیند.. ئیسپانیا وەری گرتووە چ جای لاتینی هەر مەپرسەو زۆر شتی هاوبەشی لەگەڵ زمانەکانی دیکەدا هەیە.

**• ئەی کەواتە سەرەتای زمانی ئینگلیزی دەبێ چۆن بووبێت؟**

– نۆرمەندیەکان کە چوون بۆ ئەودورگانەی ئێستا پێیان دەڵێن بەریتانیا بەزمانی فەرەنسی قسەیان دەکرد، زمانی ئینگلیزی زمانی رەمەکی بوو، زمانی ناتێگەیشتووەکان بوو، زمانی روناکبیران نەبوو، لەلایەکی دیکەوە پاشاکانیان بەلاتینی قسەیان دەکردو پێیان شەرم بوو بەزمانی ئینگلیزی بدوێن، چونکە زمانی رەشۆکی بوو،

**• ئەی ئێستا باری زمانی ئینگلیزی چۆنە؟**

– ئێستا زمانی ئینگلیزی گەورەترین زمانە کە وەکو زمانی بێگانە بەکاردێت لەهەموو جیهاندا، ژمارەی ئەوکەسانەی بەزمانی ئینگلیزی قسە دەکەن سێ جار بەقەد ئەو کەسانەیە کە زمانی ئینگلیزی وەک زمانی دایک بەکاردێنن، واتە دانیشتوانی کەنەداو ئەمەریکاو نیوزیلەندەو ئوسترالیا.

پێش چەند ساڵێک وشەی **face** لەزمانی ئینگلیزیدا دەنگەکەی وەک زمانی ئەڵمانی بوو بە

«فاس» دەخوێندرایەوە، یاخود «place – شوێن» بە «پلاس» دەخوێندرایەوە، نەخوێندەوارەکانی بەریتانیا. بەتایبەتی گەڕەکی هەژارنشینەکان ئەوەدەرفەتەیان نەبوو بە «فیس» و «پلیس» دەیانخوێندەوە ئێستا ئێمە وەک مامۆستای ئینگلیزی دەڵێین «فیس وپلیس» ڕاستن. مایکل چایەت دەڵێ: گۆڕانکاری لەزمان لەهەموو پرۆسەیەک دیموکراسیترە.

**• وەکو لای بەڕێزتان ئاشکرایە ئێستا زمانی فەڕەنسی دەیەوێت بەربەرەکانێی زمانی ئینگلیزی بکات. ئێوە وەکو پسپۆڕێک چۆن سەیری ئەمە دەکەن؟**

- فرانسوامیتیران وتویەتی «ئێمە لەسەردەمی ئینتەرنێت ئەگەر نەتوانین بەرهەڵستی زمانی ئینگلیزی بکەین ئەوا ئەم شەڕە دەدۆڕێنین»، فەڕەنسیەکان هەوڵیاندا هەمووشت پەتی وپاک بێت و فەڕەنسی بێت، بەڵام بەتەواوی سەری نەگرت.

باسی ئینتەرنێتم کرد، ئێستا سیستمێکی تازە داهاتووە پێی دەڵێین «یونیکوت» دەتوانێ هەموو زمانێکی جیهان بەکار بێنێ بەزمانی کوردیشەوە تەنیا زمانی بۆرمی نەبێت، چونکە شێوەی نووسینی زۆر بێ سەروبەرە هەروەها زمانی مەنگۆلییش.

**• حەزدەکەین ئاماژە بەچەند زمانێکی دیکەش بکەن؟**

- باوڵاتێکی وەکو هیندستان وەربگرین نەک هەر زمانیان زۆرە، بەڵکو خێزانە زمانەکانشیان هەر زۆرن، ئێستا دووبەشی سەرەکی زمان لەهیندستاندا هەیە، یەکیان پێی دەوترێ «زمانەکانی دراڤیدی» وەکو زمانی تەمیل کە هیچ پەیوەندییەکیان بەزمانی هیندییەوە نیە، گاندی زۆر هەوڵی دا زمانێکی یەکگرتوو بکات بەدروشمی دەوڵەت، بەڵام سەری نەگرت ئێستا ناچارن زمانی ئینگلیزی بەکار دێنن.

جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بەزمانی چینی بکەم کە وەک زمانی کوردی شێوەزاری زۆرە، بەڵام شێوەی ماندەری کە لەپەکین قسەی پێ دەکرێ ئێستا یەک لەوشێوانەیە لەسەرجەم کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بەکاردێت، بەڵام ئەوانەی شاری شەنگهای لەگەڵ ئەوانەی ماندەری بەهیچ جۆرێک تێک ناگەن، هەروەها شێوەی هۆنگ کۆنگ کەپێی دەڵێن

- کانتەنیز – جیاوازییەکی زۆری هەیە.

زمانی چینی وەک زمانی ئێمە نیە کە لەسەر بنچینەی دەنگ دامەزرابێ واتە بزوێن و نەبزوێن، بۆنموونە ئەگەر من بنووسم «م» (ا) بەکوردی و عەرەبی دەبێتە «ما» بەڵام لەزمانی چینی ئەمە بەپێی ئاوازکە کە پێی دەڵێن «تۆن» ئەوا چوار واتا دەبەخشێ

مە: دایک

ما: ئەسپ

مەها: بۆتووڕەبوون

ما: مەریوانە «جۆرە موخەدەراتێکە»

هەروەها زمانی ڤێتنامیش شەش تۆنی هەیە، گەر دوو دەنگ لێکبدرێن لەوانەیە سێ واتای جیاواز بەخشن

**• دکتۆر ئەحمەد دەرچووی بەشی زمانی عەرەبیە. ئاخۆ ئێستا دوای ئەو ئەزموونەتان لەزمانانی دیکە چۆن دەڕواننە زمانی عەرەبی؟**

- زمانی عەرەبی کەپێی دەڵێن زمانی -فصحی- دیاردەیەکی زۆ تایبەتە لەرووی زمانەوانیەوە، چونکە چەندان زمانی کۆن وەک سانسکریتی و لاتینی ئێستا کەس قسەیان پێ ناکات، بەڵام زمانی -فصحی- تا ئێستا بەکار دێت و هەروەها بەپێی چەرخ دەگۆڕێ.

ئەوەی خزمەتی زمانی عەەبی کرد ئاینی ئیسلام بوو، چونکە پەیوەندییەکی ڕۆحی زۆر پتەویان لەنێواندا هەیە، زۆر جار لەقوتابیە مەسیحیەکانم دەپرسم ئینجیلی کۆن کەبە زمانی یۆنانی بوو ئێوە چی لەبارەیەوە دەزانن؟

بێگومان تاکە وشەیەک کە لەئینجیلی کۆنەوە لەبیریان مابێت وشەی «هەلە لویا» کە واتای «الله اکبر» دەبەخشێ، بەڵام قورئان تا ئێستا هەر بەزمانی خۆبەتی بۆیە «فصحی» دیاردەیەکی زۆر تایبەتیە.

ڕۆژئاواییەکان باسی دیاردەیەک دەکەن پێی دەڵێن «دووجۆری» چونکە لەزمانی عەرەبی «فصحی» هیچ کەسێک وەک زمانی دایک بەکاری ناهێنێ، شێخی ئەزهەریش لەماڵی خۆی بەشێوەی میسری قسە دەکات، ئەگەر سەیری زمانی قورئانیش بکەین دەبینین وا سەخت نیە، بەڵام شیعری جاهیلی زۆر زەحمەتەو پێویستی بەفەرهەنگێک هەیە.

**• لێرەدا پرسیارێک سەرهەڵدەدات، ئاخۆ دەتوانین بۆزمانی خۆمان شتێکی وەکو «فصحی» دروست بکەین؟**

- ئەوەی کوردەو بەزمانی کوردی دەدوێ لەماڵی خۆی شێوەیەک لە شێوەکان بەکار دێنێ، بەڵام هیچ عەرەبێک لەماڵەوە بەزمانی -فصحی- قسە ناکات، نووسەرێکی وەک نەجیب مەحفوز ئەگەر بەشێوەزاری میسری بنووسێت ئەوا کتێبەکانی کەم ڕەواج دەبن، بەڵام بەشێوەی -فصحی- هەموو عەرەبێک دەتوانێ بیخوێنێتەوە،

**• کابرایەک وەکو ئەتا تورک کە تورکیای نوێی بنیات ناوە بێگومان بیری لەپەرە پێدانی زمانی تورکیش کردۆتەوە، ئێوە چۆن سەیری ئێستای زمانی تورکی دەکەن؟**

- کە یەکێتی سۆڤیەت هەڵوەشایەوە چەند کۆمارێک جیاواز بوونەوە، کۆمارە ئیسلامیەکان جگە لەتاجیکستان هەموویان بەتورکی قسەدەکەن،



**• بوونی وشەی بێگانە لەهەر زمانێک نەنگی نییە بۆ ئەو زمانە.**

تاجیکستان تەنها کۆماری ئیسلامیە کە بەزمانی تاجیکی قسە دەکەن و وەک زمانی کوردی و فارسی و زمانێکی هیندۆ ئەورووپییە. سەیری دەردەسەری ئەم میللەتانە بکە، پێش ئەوەی ببن بە بەشێک لە یەکێتی سۆڤیەت بە فارسی دەیان نووسی و دواییش بووبە روسی و ئێستاش کراوە بە لاتینی، لەهەر قۆناغێک چەند پشت بوونە نەخوێندەوار، بۆ نموونە ئەگەر بڕیارێک درا لە هەولێر بەزمانی یابانی بنووسرێت ئێمە مانان لەکاتی دەرچوونی بڕیارەکە دەبین بە نەخوێنددوار.

**• باشە ئەی ئەگەر بڕیارماندا بەپیتی لاتینی بنووسین؟**

- ئەمە سوودی زۆر زۆرە، بەڵام پێویستە بیر لەوە بکەینەوە کە ژمارەیەکی زۆریشمان دەبن بە نەخوێندەوار.

بابێینەوە سەر تورکیا، ئیمپراتۆریەتی عوسمانلی ٥٠٠ ساڵی خایاند، ئەو هەموو ئەرشیف و دیکۆمێنتە هاوڵاتی ئەمڕۆی تورکیا هیچی لێ تێناگات، بەڵکو دەبێ زمانی عەرەبی فێر ببێ تا بتوانێ کەلەپوری خۆی بخوێنێتەوە، ئەوانەی دەیانەوێ ببن بەپسپۆڕ دەبێ زمانی فارسیش بزانن، چونکە زمانی عوسمانلی تەنیا عەرەبی تێدا نەبوو، بەڵکو فارسیشی زۆر تێدا بوو، جارێ موراسەلات زۆربەی بەفارسی بوو، کە ئەتاتورک فەرمانی دا بەسێ مانگ گۆڕیان نەک بەچەند ساڵێک. ئەگەر بتەوێ گۆڕانکارییەکی گەورە لەزماندا بکەی نابێ پەلە بکەی بەڵکو هێمنی دەوێت.

**• نووسینی کوردی ئێمە زۆر لە عەربی و فارسی رێک و پێکترە.**

**• ئەگەر سەیری ئێستای زمانی تورکی بکەین دەبینین زۆر وشەی بیانی تێدایە؟**

- بەڵێ زۆر شتیان لە ئەورووپییەکان وەرگرتووە، بوونی وشەی بێگانە لە هەر زمانێک ئەنگی نیە بۆ ئەو زمانە، ئینگلیز هەمیشە دەرگایان بۆ وشەی بێگانە ئاوەڵایەو زمانەکەیان دەوڵەمەند کردووە. پێش ئەوەی بێمەوە بۆ کوردستان دوو هەفتە لە تورکیا مامەوەو بەشداریم لە کۆنفرانسێکی جیهانی کرد بەناونیشانی «ئەندازەی زمان»، یەکێک باسی زمانی ئۆزبەگی کرد، زمانی تورکی لە زمانی هنگاری و فنلەندی نزیکە، چونکە دەتوانی زۆر پاشگری بۆ زیاد بکەی، بەڵام لەزمانی تورکی پێشگر نیە، لەزمانی ئۆزبەگی پێشگر هەیە.

**• بابێینە سەر زمانی ستاندارد کە ئێمەی کورد دەمێکە باسی دەکەین و چەندان بۆچوونی جیاواز لەم بارەیەوە خراونەتە روو. دکتۆر فەرهادی لەم رووەوە چ دەڵێت؟**

- زۆر کەس لەو باوەڕەدان دوو جۆرە ستاندارد هەبێت یەک بۆ شێوەی کرمانجی و ئەوی تریش بۆ شێوەی سۆرانی، بەشێکی دیکەش لەو باوەڕەدان یەک شێوەی ستاندارد هەبێت، باوەڕ ناکەم لەم نێوانەدا وەڵامێکی رەش و سپی هەبێت هەروەکو ئینگلیزیش دەڵێت لەوانەیە لەنێوان رەش و سپیەکەشدا شتی بۆریش هەبێت، بەڕای منەوە بۆ مەسەلەی زمانی ستاندارد زۆر شت هەیە پێویستە بیری لێ بکەینەوە ئەگەر سەیری زمانی کوردی بکەین ٣ شێوەی سەرەکی هەن، شێوەی کرمانجی کە زۆربەی زۆری کورد پێی دەدوێن و شێوەی سۆرانی و شێوەی زازا، بەڵام زازا ناوی زۆرەو سەری لەبێگانان شێواندووەو وا دەزانن پەنجا شێوەی سەرەکیمان هەیە.

زازایەکان خۆیان حەز ناکەن پێیان بڵێن زازاو بەخۆیان دەڵێن «دملی»، دملی لەگەڵ هەورامی کە «گۆران»یشی پێ دەڵێن زۆر لەیەک نزیکن، باشترین نموونەش هەر لەکۆنەوە تەرحیل و تەهجیر هەر هەبووە. ئەگەر سەیری جوگرافیای هەورامان و جوگرافیای کوردستانی تورکیا بکەین دەبینین هیچ شتێکیان لەنێواندا نیە، بەڵام شێوەزاری هەورامی یان گۆرانی یان دملی هەمووی هەریەکە «ئەمە بیروڕای ئەمۆنزە». یەک ستاندارد یان دوو ستاندارد وابزانە ئەگەر لەکوردستان ئەم مەسەلەیە ئەگەر قسەی لەبارەوە بکرێت، من کە تەماشای ئەو کوردانە دەکەم بەتایبەتی ئەوانەی کە دەچن بۆ هەندەران لەسوید فێرە زمانی سویدی دەبن و لەهۆڵەنداش فێرە زمانی هۆڵەندی دەبن، باشە بۆ هەوڵ نادەن فێرە شێوەزارێکی زمانی کوردی ببن؟

**• دوا پرسیارمان دەربارەی رێنووسی کوردییەو حەز دەکەین بۆچوونی خۆتان لەم رووەوە دەرببڕن؟**

- نووسینی کوردی ئێمە لەعەرەبی و فارسی زۆر رێک و پێکترە، بۆ نموونە کە دەنووسی «بەزم» لەدوای دەنگی «ز» دەنگێک هەیە، بەڵام نانووسرێ، کەدەڵێی بەزم و رەزم لێرە مۆرفولۆژی و فۆنۆلۆژی تێکەڵاو دەبن، ئەگەر بەلاتینی بنووسین بەزم دەبێ لەدوای دەنگی «ز» دەنگەکەی دی بنووسرێ.

هەندێک لەو بڕوایەدان ئەم هەموو «حەوت»ە لەسەر «ل»و لەژێر «ر» زۆر تاخیرمان دەکاو ئەگەر بێتوو بەشێوەیەکی دی بینووسین.

مانگی رابوردوو لەکۆنگرەی دیراساتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەشداربووم، ئافرەتێک لەوێ بوو ناوی «پی مار»بوو کەیەکێکە لەپسپۆڕە گەورەکانی وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا، پێموت لەوانەیە لەهاوین سەردانێکی کوردستان بکەم و هیچ ئامۆژگاریەکت هەیە؟ وتی: هەرشتێک لەژێر دەستتانە بیکەن بەدەزگا تا دوارۆژ نەتوانن لێتانی وەربگرنەوە، لام وایە ئەمە زمانیش دەگرێتەوە، ئەگەر ئێستا بمانەوێ شت بگۆڕین و کەموکوڕی زۆر دەبێ، بەڵام وردە وردە دەگەینە مەبەست.

## لەگەڵ هونەرمەندی شێوەکار ڕۆستەم ئاغالە

# شێوەکارە پێشەنگەکان لەلاوەکان نوێخوازترن

هەڤپەیڤین: فەرەیدون سامان



ئاغالەی شێوەکار لەوهونەرمەندە ناسراوانەیە سەبارەت بەکەم تەمەنی، بەڵام زۆر ئەزموونی لەوبوارەدا توانیویەتی ئەسپی داهێنانی هونەری خۆی تاوبدات. بەتایبەتیش بەکەڵک وەرگرتن لەکەلەپووری ڕەسەنی هونەری شێوەکاری میللی کوردەواری و مامەلەیەکی ئیستاتیکانەو نوێخوازانەی لەگەڵدا بکات...

ئاغالە وێرای ئەوەی بەردەوام چالاکی هونەری خۆی لەناوپێشانگاودەرەوەی دا ئەنجام دەدات، زۆر جاریش بەشداری گەرم و گوڕی کۆڕە هونەرییەکان دەکات و یاخی بووانە لەمەڕ ڕەخنەی شێوەکاری ڕاوبۆچوونی جیاوازی خۆی دەردەبڕێ. دیارە هەڤپەیڤین لەمەڕ ئەم هونەرمەندە بەرزەو بەڕاشکاوی قسەکردن لەسەری تێرامان وقووڵ بوونەوەو جارجارەش سەریەشەی گەرەکە، بەڵام ئاغالە شێلگیرانە قسەی خۆی دەکات بەڕێگەی پەرەموچ و هێڵ و ڕەنگەکان وەڵام دەداتەوە، گۆڤاری کاروان بۆ ئەم مەبەستە چەند گورزە پرسیارێکی ئاراستەی ئاغالە کردو هێنایە دووان:

**• سەربەکام ڕێبازی هونەری شێوەکاری، کام لەو ڕێبازە هونەریانەش زێتر پەسەند دەکەی؟بۆچی؟**

– کارەکانی من زیێتر دەخرێنە حەوزی ڕیالیزمەود، بەڵام ڕیالیزمێکی ڕاستەوخۆی ڕیالیزمی سۆشیالیزمی ڕووسی نا... چونکە بۆ نەخشاندن ودامەزراندنی واقیعە کوردەواریەکە هەندێ بنەمای ڕیالیزمی ئەکادیمیانە دەگۆڕم و بۆزەخرەفەو یەکە نەخشە کوردیەکان ئەو ڕێبازەم هەڵنەبژاردووە، بۆ فەرهەنگی ڕیالیزمی کار ناکەم چونکە گەر پارچەو بەش بەشی تابلۆکانم بگری کاری ئەبستراکت و ڕەمزی بێ فۆرم دەبینی. بۆیە هەر ناونیشانی قوتابخانەو ڕێبازە هونەریەکان بەخۆمەوە بخەم باش نیە. چونکە نەخشەم بۆ ئەو کارە نیە بەکورتی بەلامەوە ئاساییە بەهەر ڕێبازێک بمدەنە قەڵەم بەمەرجێ (کوردایەتی وکەسایەتی کوردی) لەکەڤالەکانم دا بەرجەستە بکەم و خۆم لەخۆماڵییەتی دانەشۆرم.

**• هەر لەسەرەتای کارەکانتەوە بایەخی زۆرتان بەکەلەپووری هونەری شێوەکاری کوردەواری داوەو لەنێو تابلۆیەکانیشتدا ئەم هێمایانە بەئاشکرا دیارن وبەرجەستەت کردوون، تاچەند توانیوتە نوێی خوازانە مامەڵە لەگەڵ ئەم کەلەپورە هونەرییە بکەی؟**

– ئەوە ڕاستە، لەساڵی ١٩٩٣وە بێ پسانەوە کاری بۆدەکەم، شتێکی کەمم کردووە، چونکە دەردقەتی ئەو هەموو کەلەپوورە دەوڵەمەندە نایەم، باغ وبێستانی کوردستان هی خۆمن، تەنها بەمن و سەدان کەسی وەک من ناخورێ کەلەپوری هونەری میللی و زەخرەفە کوردیەکانی وەک هونەر وایە کەس پێی تەواو ناکرێ و کەسیش لە هونەرو هاوچەرخیەتی و نەتەوایەتییەکەی ئاگاتە لوتکە، ئەوکەسەی ئاگاتێ واز دەهێنێ، مافی خۆیەتی ماندوو دەبێ و پەکی دەکەوێ و خۆی لەشێتی دەپارێزێ، چونکە کەللەی من بەقەد سەدان مرۆڤی ئاسایی کاردەکا، بۆ بابەت و ڕەنگ و هێڵ کە مرۆڤی ناهونەرمەندو تەنانەت هەندێ هونەرمەندیش بەڕێکەوتیش تووشیان نابێ...

چەندان ساڵ کاری زەخرەفە کوردیەکان لای هەندێ کەس قسەی پووچ بوو، مامەڵەی کەلەپور جێگەی سەرنج نەبوو، بەڵام سەرهەڵدان و گەڕان و تێبینی کردن بۆ زەخرەفە کوردیەکان ئێستاکە بۆتە بابەت و گۆڕەپانی کارکردن.

**• چەندین ساڵ بوو کاری زەخرەفە کوردیەکان لای هەندێ کەس قسەی پووچ بوو، مامەڵەی کەلەپوور جێگەی سەرنج نەبوو .**

**• باشە چۆن دەڕوانیتە شوێنەواری ئەم کەلەپوورە**

**• خـــــــــانووە دێرینەکـانی کۆیێ، کــــۆڵان و دەرگـــاو پەنجـــەرەو خـــان و باڵەکۆنەکـانــە تا سەر ئێسقان بۆ من مـایەی سەرسامی و داهێـنـانی هـونـەری بوون.**

**مـەزنە بەتایبـەتی نەخش و نیگاری سـەر دەرگـاو پەنجـەرەو تاق و دیوارو سـەرلانکەو دەسکی خـەنجـەرو خـانووبـەرە دێرینـەکـان تا چەند سـەرنجی تۆیان راکـێـشـاوەو کـارت بۆ کـردوون و کـەڵکت لەوبوارە هونەرییە وەرگرتووە؟**

- ئەوانەی بەڕێزت ئامـــاژەت پێکردن، بۆمن هەمـــووی جـێـگەی سـەرنج و تێـڕامـانن بەتاک و بەکۆوە، لەتابلۆیەکداو لەچەندان تابلۆدا دامڕشتوون، بۆنمونە خانووە دێرینەکانی کۆیێ بەکۆڵان و دەرگـاو پەنجـەرەو خـان و بالەکـۆنەکـانەوە، تاسـەر ئێـسـقـان بۆمن مـایەی سـەرسامی و داهێنانی هونەری بوون، رەنگ کـاری و مـشـتـەقـاتی رەنگە هارمـۆنیـە کالەکانش لەپالێتی کۆلانەکانی کـۆیێ روو کراوە، کـۆیێ بەو باڵەخـانەو تۆنە رەنگە خەنەییە خـانووە کۆنەکانی بۆمن جوانن، بۆیە خانوو دیوارو پەنجـەرەم لەم شـارەدا خـۆش ویست، من لەکـۆلانەکـانی شـارەکـەمـەوە فـێـر بووم و هەسـتم وەرگـرت و هەڵچوونەکـانم پێـیـان گـرت نەک لەپەنجـەرەکـانی شەناشیلی بەغدا...

بۆ رەنگی جـوانی دیوارو بەرزو کـۆنی خـانووی کۆن لەکۆیە لەسەرووی هەموو شارەکانی عێراقەوەیە نەک هەر کـوردسـتـان. من لەسـەرەتای نەوەتەکـانەوە تاسـاڵی ١٩٩٨ مـاڵم لەکـۆیە بوو، زۆر نیـوەڕۆیـان کە مـاندوو دەبووم لە وێنەکـێشان، یازدەو نیو دوازدە دەچوومە دەرێ وەک سـەگی پێ سووتاوی بەکۆلانان دەگەڕام، باڵەخانە دووقات و سێ قاتەکان خۆشی و زەردەخەنەی دنیـایان پێ دەبەخـشـیم و دەگەڕامەوە سالانی بیست و سی و چلەکانی ئەو شارە کە چەند بەزەوق و شـارسـتـــانی بوون. مــاڵەکـــانی ئەم گـەڕەکـانەی بایزئاغـاو بەفـری قـەندی و قـۆنگرەو مـاڵەکـانیـان هەمـوو قـەوس و پایەی هەیوان تاقی ژوورەکـان شـێـوازێکن لە رۆمـا، ئێـسـتـاش لەسـەر ئەوخـــووە هەر بەردەوامم. بێـگـومـان شـارەکـانی دیکەش کـاریگەریـان بەسـەرمـدا هەیە، هەولێـر بەنەخش و بەرەو مـافـورەکـانی، بەحرکەو گـەردی و دزەیی پاڵـەیی و ناوچەی برادۆست و سـوورچی، بەرەکانیان وەک تابلۆدەبینم، سلێمانی لە ئاسمان و شاخ و پێکهاتەی دەست و دەم وچاوو لە جلوبەرگە هەورامییەکان ئەم هونەرە مەزنە دەبینم.

**• ئەدی ج پەیوەندییـەک دەبینی لە نێـوان بەرهەمی شێوەکـارێکی ئەکادیمی و ئەو هونەرمەندە شێوەکارانەی کە ئەو کەلەپوورە هونەرییە مەزنەیان بەمیرات بۆ بەجێ هێشتووین؟**

- کـارە ئەکادیمیـەکـانی وەک: رێپین و ئەنگەرو داڤـیـدو گـریگۆل و تانک و رۆبنز لەکـەلەپووری



نەتەوەکـەی خـۆیان دانەبڕاون چیـرۆک و داسـتـانە شۆڕشگێڕی و ئەڤیندارییەکانیان وێنە کـێشـاوە، تەنانەت پەلیـان بۆبابەتی دیکەش هاویشـتـووە، کـەسێکی وەک داڤـیدو ئەنگر وێنەکـێشی ناپلیـۆن بوون و کاریان گێڕانەوەی داستانەکانی سەرکەوتنی سـوپای ناپلیـۆن بوون، جلوبەرگی سـوپاو بەرگـە نەتەوایەتی و کـراس ئاڵ و والای ژنی فـەرەنسی کە ئەم هونەرەی خۆشـەویست کـرد ئەو دەسـەڵاتە بووە، بەڵام هونەرو تابلۆی سـالۆن و کـۆشکەکـانیـان بەهێـزترو بەکەسایەتی تر کـرد. ئەوان تابلۆیان کردە هێزی هێرش و سیمای نەتەوایەتی، کەچی زۆرجار (بەهونەر بۆ هونەر تاوانبار دەکرێن، واتە هونەرێکی ئەکـادیمیـای وشکیـان هەیە. لەتابلۆ تەجـریدی و هاوچەرخەکانیش کەلەپوورو فۆلکلۆر وێنە کێشراوە، لەکـاری مـاتێس وڤـان کـوخ و پیکاسـۆ بگرە تا شاگال.

ئەوهونەرمـەندانە هەندێ شکل و زەخـرەفـەی نەتەوەیی غـەیرە خـۆیان لەکـارەکـانیـان بەداهێنان دارشتووەو بەئەفراندنیش بۆیان تۆمارکراوە. کەچی من وەک هەرکـەسێکی دیکە پەلاماری کـەرەسـتـەی کـــەلەپوورو فـــۆلکلۆری نەتەوەکـــەی خـــۆی بدات تاوانبـاری دەکـەن کـە هاوچەرخ نیـەو بێ ئاگـایە لەسەردەمی خۆی...

هونەری هاوچەرخ دژی کـەلەپوورو فـۆلکلۆری نەتەوەی خـۆت و نەتەوەکـانی دیکە ناوەسـتێـتەوە، بەڵکو هەر پەلامـــاری دەوروبەری خـــۆی دەدات،



هونەری شێوەکاری و مۆسیقاو شانۆو سەما وەک مێش هەنگ نووساون بەسەر نەتەوەو ئاینە ئەفریقیەکان هەر لەسەردەمی رامبۆوە تا پیکاسۆ و ئەو هونەرمەندە جیهانیانەی ئێستا رۆژانە لەسەر شاشەکانی تەلەفزیۆنی جیهان دەیانبینین، لەم چەند ساڵەی دواییش کوردستانیش بۆتە جێگەی سەرنج وکەرەستەی کارکردن، بەڵام کاروانی دیکە ماوە لەپاش چەند ساڵێکی دیکە ژیان و گوزەران و رەنگ و پۆرترێت و رووخساری ژن و پیاو بەرەو خانووی لادێیەکانمان و داستان و لاسایی و بیروباوەڕەکانمان بابەتی سەرەکی راپۆرت و دۆزینەوە دەبن، جا هونەرمەند ئەو هونەرمەندیە پێش ئەوان دەستی خۆی بەهونەرێکی کوردیانە رابهێنێ لەماڵە خۆمانەوە بۆ دەشت و شاخ و کۆڵانەکان بابەتی گەورەمان بن. هەتا ئەمڕۆ من لە بابەتەکانی سکێچ راهێنانیان بۆدەکەم وێنەیان بۆ دەکێشم لەماڵی خۆمان و گەڕەک وشارەکەم و زێدەکەم دەست پێدەکەم و کۆتایی پێدەهێنم تەکنیکیش لە هونەرمەندە بلیمەتەکانی جیهانی و بگرە خۆماڵیش وەردەگرم.

ئەوبەرە رۆژهەلاتیانەی (هونەری ژێر پێیە) بۆمن تابلۆی هەڵواسراوە، ئەگەر تۆ مەبەستت شێوەکارانی کورد بێت کە کەلەپورێکی وایان بۆ بەجێ هێشتوبن ئەوا شتێکی زۆر نیە. چونکە گرفتیان نەبووە، لەوسەردەمەدا مامۆستایان موحەمەد عارف و ئازاد شەوقی و بەدیع باباجان کەسێکن بۆ ئەو نمونەیەمان، بەڵام لە هونەرمەندانی جیهان زۆرن و پێشتر ناوم بردن، ئێمەی کورد دەستێکی وردمان هەبووە بەدرێژایی چەندین سەدە لەهونەری شێوەکاریدا، دەبێ هەرشتێ هەبووبێ، بەڵام کوا؟! ئەگەر لەبەردەستمان دا نەبێ درۆیەو قوڕی کوێ بکەین بەسەرمان. ئێستا وا بەوە دەزانین کە شەرەفخانی بەدلیسی مێژوونووسی نیگارکێش بووە، ئەمەش دڵخۆشی کردووم چونکە بۆمێژووی شارستانیەتی من رۆفائیل و دافنشی و واستی، سەدەکانی کلاسیک و ناوەڕاست و سەردتای سەدەی بیستەم بۆمن پردەکاتەوە تا ساڵی ١٩١٠ - ١٩٢٠ کە لێرەو لەوێ لە حەسەن فەلاح تا دانیال قەساب پردێک دەبێ، بەڵام تاکە کەسێک بێ ئەوەی بەچەندان ساڵ و سەدان کەسی دیکە لەسەرکارەکانی لێکۆڵینەوەو خوێندن و وانە وەربگرێ و لاسایی بکرێتەوەو ئەوەش بێ ماڵ و حاڵ و بێ بەختی کوردی دەوار نشینە.

خۆ نەک هەر کورد، عەرەبیش فەرهەنگی جیهانی شێوەکاری کەم کەڵکی لێ وەرگرتووە وەک داهێنەر وەک فەرهەنگی مێژوویی و گۆڕانکاری، دیارە هونەر لەجیهانی ئەمڕۆ لەئەوروپاو لەئەمریکا کاری نەتەوەیی پێوە نابینرێ، کار بۆشتی شازو نەکراو دەکەن، وەزیفەی هونەرمەند دەبێتە گەسک ددرو چاک کەرەوەی ئامێرەکان، فێڵ کردن و ئاودارشتن لەشەقام و وێنەگرتن و تاشینی پەیکەری گوڵ و مۆمیاکردنی ئاژەڵ و پەیکەری زیندەوەران، وێنەکێشانی شتی بچووک و نابابەتی، ئەوەش هەموو لەکۆتایی پراکتیزەکردنی بابەتی وێنەکێشراو دروست بووە، کە هەموویان تاقی کردۆتەوە، شەڕ دەکەن لەناو جوانی و هێزی ئامێرەکاندا.

**• بۆچوونێک هەیە دەڵێ: هێشتا رەخنەی هونەری شێوەکاری لای ئێمە نەگەیشتۆتە ئاستێکی هونەری ئاوا تا رەخنەگر بتوانێ لەنێوان تابلۆکانی هونەرمەندێکدا چاوو هەستی بینەران ئەو پردەی لێک تێگەیشتنە دروست بکات، ئەگەر ئەم پردە هەیە تا چەند رەخنە ئەم رۆڵە گرنگە دەگێڕێ لە برەودان بە بزاڤی هونەری شێوەکاری و ئەزموونی هونەرمەندان و خوێندنەوەی تابلۆکانیان و ئاشناکردنیان بەجەماوەری هونەر؟**

- من سەبارەت بەمە بۆچوونێکی تایبەتی خۆم هەیە بەوە دەست نیشانکردن و بوون ونەبوونی ئەو رەخنەیەم هەیە، کاری رەخنەگرتن و شیکردنەوەی تابلۆی هونەرمەندێک ئاسان نیە، ئەگەر گەنجینەیەکی شێوەکاری دیکەی نەبێ، تۆ ئەگەر ئەسپ و گالیسکەت نەبێ، رێگای تەخت کراوی

**• شێوەکار بیانیەکان پەلیان بۆ کەلەپووری خۆیان هاویشتووە و داهێنانیان تێدا کردووە، بەڵام من وەک هەرکەسێکی دیکەی کورد کە کار لەکەلەپووردەکەم بەوە تاوانبارم دەکەن کە هاوچەرخ و نوێ خوازنیم.**

ناوشاخ و هەڵدێرت لەبەر ددم بێ، تێدەپەڕی و کاروان سەراو بازرگانی و سەردان وکار دەڕوا، بەڵام رێگای شێوەکاریمان نیە، تولە رێمان هەیە هی ئەسپ وبار نیە، ئەو تولە رێیانەش هی سەردەمی ئێستان لەچاخی بیستەمەوە دەرکەوتوون، بۆیە لەجیهانی هونەری رۆمانی ویۆنانی و فیرعەونی و میزۆپۆتامیاو هەندێک مەکسیکی تەنانەت فارسیش هەیە، بەڵام بەناوی کورد هیچ نیە، بەداخەوە هونەرێک نیە ناوی هونەری کوردی بێ، ئێمەش تاکەی خۆمان بەهاوبەشی هونەری میزۆپۆتامیا وفارس و تورک و عەرەبەوە هەڵبواسین هونەر بەناوی کێوە رۆیشت هی ئەوەو کورد هەر لەشەڕو هێرش و راکردن و ماڵ وێرانی و تاڵان کردن و کۆچرەوی دابووە.

**• باشە کاک رۆستەم ئەدی ئەو هەموو شوێنەوارە هونەریانە چین وەک نەخش ونیگارو لەسەر تاقی بێستوون و دەروودیوارو دیمەنگەی ماڵە خانەدانەکان ماونەتەوە. ئەمانە نیشانەی دەست رەنگینی هونەرمەندانی کورد نەبوون لەرابردوو، ئایا ئەم میراتە مەزنە بەڵگەی ئەوەنیە گەلی کوردیش لەوبوارەدا داهێنەر بووە خزمەت بەهونەرو شارستانیەت کردووە؟**

- بەڵێ.. بەڵام ئەمانە خاوەنەکانی دیار نین، کەس نازانێ ئەم هونەرمەندانە لەکوێوە هاتوون ئایا خۆیان خەڵکی کوردستان بوون یان لەشوێنێکی دیکەوە هاتوون. بەهەرحاڵ چەندین سەدەیە ئەم نەتەوەیە نەهاتۆتە سەرخۆی نەیپەرژاوە خۆی بخوێنێتەوە. بۆیە ئەمڕۆ چەندان دەزگای حزبی و حکومی و کەسایەتی و نەتەوەی هەیە خەمیان ئەوەیە رۆشنبیران و هونەرمەندانی کورد بەدوای ناسنامەی خۆیان چالاک بن بەڵێ رەخنەی شێوەکاری هەیە. ناتوانین بڵێین نیە، بەڵام ئەگەر هەبێ بەچی دەچێ ئەگەر بازاڕی ئەو هونەرە لەناوەوەو دەرەوە نەبێتە بازاڕێکی گەورە، کاتێ بازاڕی تابلۆ هەبێ رەخنەگری شێوەکاری لە عەردو ئاسمان دەبارێ قەبارەو دەغلەکە ئەوەندە زۆر نیە تا سەپانی بۆبگیرێ، هەرساتێ دەسەڵات میدالیاو کەسایەتی بەرز بەهونەرمەند بدات بازاڕو ئیرەیی لە دەوڵەمەندەکانەوە دەجوڵێت و بۆ لای هونەرمەندان هەر کاتێ هونەرمەندێ جێگای شانازی و سەرنج و رێزی دەسەڵات بێ، دەوڵەمەندانی وڵاتیش خەون بەدۆستایەتی ئەو هونەرمەندانەوە دەبینن، کەسایەتی هونەرمەند بۆ رێزی دەسەڵات دەگەڕێتەوە، رەخنەگر کەسایەتی و پلەی داهێنان دەسکارێ دەکا بەباش وخراپ. بەڵام ئەمە جێگیر نابێ و یاری دەکاو هونەرمەندی گەورەش ئەوکەسەیە کاری خۆی دەکا نە خەڵک نە رەخنەگر نە دەسەڵات وەک پێویست نابیندرێ، بەڵام رۆژگار وەک بارانی هەورێک دەیبارێنێت، لەگەڵ ئەوەشدا من هیوام بەهەوڵی ئەم بەڕێزانە هەیە کە لەسەر هونەری شێوەکاریان نووسیوە وەک زۆراب و تاریق کارێزی و بەختیار موستەفاو دیاری موحەمەدو فەرهاد پیرباڵ.

**• هونەری هاوچەرخ دژی کەلەپوورو فۆلکلۆری نەتەوەی خۆت و نەتەوەکانی دیکە ناوەستێتەوە.**

**• وەک ئەزموونی هونەرمەندێکی شێوەکار چۆن دەڕوانیتە بزاڤی هونەری شێوەکارانی لاو و چۆنیش دەتوانین ئەزموونی هونەری ئەم توێژە خوێن گەرمە جۆش بکەین و بەرەو پێشەوەی بەرین؟**

- لەراستیدا لەکاری لاواندا زۆری و بۆری هەیە، لەکوێ و لەکام و لەچ سەدەو کام تەمەن دابەش بکەم، پێش ئەوەی وەڵامی ئەوەت بدەمەوە، هونەری شێوەکاری لاوان.لەم سەردەمەدا هەیە کە هەمووی بەناوی هونەری هاوچەرخ بووە هەربۆ هونەری لاوان دەگەڕێتەوە هونەری شێوەکاری ئەگەر بەراوردی بکەین بەهونەری سەدەکانی چواردەو پانزەو کۆتایی نۆزدەهەم هیچ پێش نەکەوتووە، لەچی پێشکەوتووە؟ تەنها لەتێکشکاندن و ناشیرین کردنی شکلەکان بەبیانووی جێگەی کامیان خۆش نەبێت بۆکاری تابلۆ ئەو بۆ وەزیفەو پێویستی و جۆری گۆڕانی جوانی لە چەرخ و وڵات و مرۆڤەکاندا لەگۆڕاندایە، جوانی لەگۆڕاندایەو رێژەییە، بۆیە هونەر واگۆڕاوە، بەڵام هونەر هەر لەهەرەتی شێتی پلەی سفردا خول دەخواتەوە،



تابلۆیەکی (تیتان و داڤنشی و کلاسیکوز) بێنە تەنیشت تابلۆیەکی هاوچەرخی ئەبستراکت یان تەکعیبی پیکاسۆ و کاندنسکی لە بەرهەمی مامۆستایەک و قوتابیەکی ناشارەزاو بێ زەوق دەچێ کەچی سەردەم رەتی ناکاتەوە، بەزۆریش خۆی ئەسەپاندووە بەسەر دیوارو زەوقی خەڵکیدا. بۆیە بەبڕوای من مرۆڤ لەم سەردەمەی ئێمەدا وێڵە، توانەوەدیە، بەدوای شتە ناشیرینەکانی دەگەڕێ. چونکە خۆی باش دەزانی جارانی جوانتر بووە لەسروشت و لەش ولارو جلەکانیشەوە، بەهاڕۆحی رەوشتیەکانەوە. کەواتە لەم سەردەمە لاوی بێ ئەزموون و ناتێگەیشتوو لەپڕێکدا دەبێتە دێوی هونەر (دیلاکروا)ی وڵات، چونکە ئەو سەردەمە گوێ وچاو لە ئەزموونی ناشیرین و ناتەواو نەشیاو ناماقول دەگرێ لەکوردستاندا جورئەت کەمە پیروڵاو لەیەکتر جوێ بکەینەوە ئەو پیرانەی پێشەنگی هونەری ناوچەکەمانن زۆریان ماون و لەگەڵ ئێمەی لاو کار دەکەن بگرە لەئێمە نوێخوازترن بۆیە پۆلین کردنی هونەرمەندان لێرەدا کارێکی نەشیاوە بێ بەرەکەتە سودی نیە قسەی لەسەر بکەین.

**• باشە دەکرێ هونەرمەندێکی کورد بەم وەزعیەتە تایبەتیەی خۆی بگاتە ئاستێکی جیهانی لەهونەردا؟**

– ئەوە پەیوەندی بەرێکەوتەوە هەیە ئەگەر هونەرمەندی کوردی جیهانیمان بەناو لەفەرهەنگی شێوەکاری جیهاندا هەبێ ئەوا وەک نەبوون وایە، چونکە هیچ کاریگەری وناوبانگێکی جیهانیانی نەخستۆتەوەو هەرایەکیان نەناوەتەوە ئەمەش مانای وانیە بۆ هەتا هەتایێ بێ هیوا ببین، بەڵام چۆن چۆنی هەرایەک بنێینەوەو زەوقی شێواو وشازی ئەوروپاو جیهان رابکێشێ ئەوە هەر بۆ ئەزموونی خۆیان باشە، بۆ ئێمە هەر دەست بردنە ناوباغەڵی خۆمان ونامۆیی و سەیرو ماقول و ناماقولی خۆمان بەوان نیشان بدەین. ئایا ؟! هونەرمەندی کورد دەستی بەسەردا گیراوە وەک زیندانیەکی دەست بەسەرداگیراو، لەشارێکی وا چی بکات بۆ وڵاتەکەی نەک نەتەوەکەی، ئێمە سی، چل لاوی تا رادەیەک ناسراو، دوای راپەڕین دێین تا لە سلێمانی لە هەولێر ناسراو بین. بەپێچەوانەوە لەسەر ئاستی بەغدا ناومان هەر لەکولەکەی تەرِشدا نیە!! هەوڵدان و ناردنە دەرەوەی تابلۆمان هەیە، بەڵام ئەوەش جێگای گۆڕان و سەرنجی دروست نەکردووە لەجیهاندا. ئەمەش هەر لەجێگەی نەبووندایە هەر دەڵێن (بکرێتەوە، بفرۆشرێ) سالانە بەچەندان فیستیڤاڵی شێوەکاری جیهانی ونێودەوڵەتی دەکرێتەوە ئێمە لەکوردستان هەر ماوین و نازانین چی هەیەو لەکوێیە!! کوردە عێراقیەکانی دەرەوەی هەرێمیش تەمبەڵ و بێخەمن ئەوەی لە بەرنامەیاندا نەبێ نمایشکاری هونەرمەندانە، هەتا هونەرمەندێ داوەت دەکرێ بۆ دەرەوەی هەرێم چەندان کۆبوونەوەی لەگەڵدا دەکرێ ئەویش بێ شەرمانەو چەندان سوێندو تەلاقی بەدرۆ دەخوا تا بۆ دەرەوە دەچێ و دوایی ناگەڕێتەوە. لەوێ کاردەکاو دەگاتە ئاستێکی جیهانی (دیارە بەگاڵتەوە وا دەڵێم) کە دەگەڕێتەوە پێیان شەرمە بڵێین ئێمە هەین، بۆیە بەو وەزعەوە هونەری شێوەکاری وبەگشتی هونەری کوردی لە ئاستی هەڵاتن و پوکانەوە بۆ دەرەوە لەوێش درۆکردن هەتا هەتایی جارێکی دیکە خۆی لە هونەری بێ حاڵی کوردەکانی ناو هەرێم ناگەیەنێ. من ناوی سێ هونەرمەند دەزانم کە جوولەیەکی وایان هەبێ شایەنی باس بێ ئەمانەش (رێبوار سەعیدو هۆشیاری برای و خالید رەسول)ن.

لێرە لای ئێمە ئەویایەخە بەم هونەرە نادرێ لەوانە تائێستا مۆزەخانەیەکی نیشتمانی (بانکی پاراستنی تابلۆ)مان نیە ئیتر جیهانی چۆن روو لەئێمە دەکا. هەندێک گۆڕان هەیە، بەڵام بەهیچ شتێ پێشکەوتنمان پێوە دیارنیە، دیارە گۆڕان و پێشکەوتنیش زۆر لەیەک جیاوازن تۆچۆن دەتوانی ئەو جەماوەرە والێ بکەیت بەرامبەر تابلۆیەک رابوەستێ.

**• باشە بۆچی شێوەکارانی کورد نەیانتوانیوە سوود لە چەمکە هزری و فەلسەفیەکان تەنانەت خوێندنەوەی چیرۆکێک رۆمانێک یان بابەتێکی درامی یان ئاوازێکی مۆسیقی وەربگرن. مەبەستم ئەوەیە هونەرمەندانی شێوەکاری کورد خوێندنەوەیان کەمە بۆ رابردوو بۆژانرە گرنگەکانی هزرو ئەدەب و هونەر؟**

– ئەو پرسیارە لە گروپی شێوەکارانی هەر نەتەودیەکی دیکە بکرێ بەتەواوی کاری سەرەتاو ناوەڕۆکی هونەرەکە ئەو پەیامە نیە، کاری هونەر جوانی خستنە رووە هونەرکێشە دەنێتەوەو بچووکترین کێشە لەناو جوانیدا رووبەڕووی تابلۆ چارەسەر نەکراوە.

**• ئەدی بەڕای تۆ ئەو هونەرمەندانە کێن کە توانیویانە سەبارەت بەداهێنانی هونەرەکەیان لەئاستێکی باڵادا بەدەر بکەون؟**

- هونەرمەندی باش زۆر بەدەرکەوتوون بەتایبەت لەشاری سلێمانی. هەر کۆڵانەو وێنەکێشێکی تێدایە هەر گەڕەکەو چەند وێنەکێشێکی ناسراوی گۆڕەپانی تێدایە من خۆم ئەو هەقە بەخۆم نادەم ئەو

**• لەم چەند ساڵەی دوایی کوردستانیش بۆتە جێگەی سەرنج و کەرەستەی کارکردنی هونەرمەندە شێوەکارە بیانیەکان.**

ناوانە ڕیز بکەم چونکە ئەگەر ڕۆژێ هونەرمەندێکی تر ئەوپرسیارەی لێ بکرێ و ناوی چەندان هونەرمەندان بدات، من بۆناوی خۆم بگەڕێم نەیهێنابێ، ئەوا نیگەران دەبم بۆیە لەوە شەرم دەکەم ناوی چەند کەسێکی وانەڵێم و گوێبەندێ دروست بکەم بۆخۆم ببوورە لەخۆ دەربازکردنم لەوپرسیارە.

**• کاک ڕۆستەم بۆچی هێندە بایەخ بەڕەنگی سوورو مۆر دەدەی لەتابلۆکانتدا، ئەدی شوێنی ڕەنگەکانی وەک (سپی، ڕەش)چییەو چ ڕەهەندێکی هونەری و مەودایەکیان لای تۆ هەیە؟**

- بایەخ دانم بەڕەنگی سوور زۆرە، بۆ مۆر هەندێ جار، من ڕەنگە کوردی و بەکارهاتوو لەبەرکراوی کوردەواریانەم لاپەسەندترەو بەنزیکتری دەبینم لەخۆم و زاتی کەسایەتیەکانی دەوروبەرم و خەڵکی نیشتمانەکەم و شارەکەم. چ ڕەنگێ زۆر بەهەڵبژاردەی وەک خوێنێکی ڕەسەن دەدا لای من ڕەنگە سەرەکی بەکارهاتووی تابلۆکانم دەبێ.

من ناتوانم ڕەنگەکان لای خەڵک خۆشەویستر بکەم بەڵام دەتوانم پرسیاری ئاوا دروست بکەم چونکە تا پەڕەموچ لەدەستم دابێ، ڕەنگی سوور خوێنی بەردەستمە لەدەرەوەو لەناو لەشمدا.

ئەگەر ماڵەکەم، پالێتەکەم ڕەنگی سووری تێدا نەبێ هەموو ڕەنگەکانی ترم هەبێ ئەوا دەستم ناچێتە وێنەکێشان، ڕەنگی سوور شای ڕەنگەکانە، لەهیچ سەدەیەکدا ڕەنگی سوور بەقەد سەدەی بیست و ئەو سەدەیەش هەر بەردەوام دەبێ، چونکە ڕەنگێکی خێرایە ڕەنگی ڕەش وسپی لای من هەر ئەو واتایە دەبەخشێ کە بیستومانە. گرنگ نیە هەموو شتێ لە دەروونی وێنەکێشانی خۆم بەتۆ بڵێم، یان بەجەماوەر بڵێم، ڕەش پیاوە، سپی ژنە، ڕەش ساردە، سپی گەرمە، ڕەش دەخوا سپی خۆراکە....

**• دواپرسیارم ئەوەیە بەڕای تۆ تا ئەم سەردەمە هونەری شێوەکاری کوردی توانیویەتی ببێتە خاوەن ناسنامەیەکی هونەری سەربەخۆ، ئەگەر نەء چۆن دەکارین ناسنامەیەک بۆ ئەم هونەرە هەڵبژێرین؟**

- نەخێر تا ئێستا نەبۆتە هیچ، هەروەک لەپرسیاری پێشووتر وەڵامم دایەوە، خۆی زەمینەیەکی مێژوویی بەئەزموون، تەمەنی نیە، دەزگاو سیاسەتێکی نەتەوەیی لەپشت نیە، هونەرمەندێکی وەک شاگال و پیکاسۆ و جاکسۆن پۆلۆن، ئابوریەک و هەستێکی کاری جوولەکەیان لەپشت بوو، هەزاران دۆلارو بەملیۆن دۆلار بۆ سەرکەوتن و خۆسەپاندنیان خەرج کراوە. بەڵام کارکردن لەسەر ڕەنگە ڕۆژهەڵاتی و موفرەداتی بەرەو مافور سیمایە کوردیە نەتەوەییەکان تاکە ڕێگای ناسنامەن بۆ ئێمەی لەخەو هەڵساو، کاری هونەر خۆی سەختە تا بتوانێ سەرنجی خەڵک ڕابکێشێ بۆلای خۆت، جا کاری دووەمیش دروست کردنی هەست و مۆرکی نەتەوەیی بێ، هونەر ماندوو بوونە تا نەحەسانەوە، چونکە من بۆی ناچم تازە تا مردن وەک مرۆڤێکی ئاسایی پشوو بدەم و بخەوم، من شەوو ڕۆژ پێنج سەعات دەخەوم کەچی هەروا هەست دەکەم مرۆڤێکی بێ کەڵک و تەمبەڵ ولەپاشم.. نەتەوەی ئێمە لەجوانی قوماش و ڕەنگی بەرەی ژێر پێیان تێناگەن بەهونەری ژێر پێڵاوو قاچیان دەیناسن، لەش و لارو دانیشتن و جل وبەرگی کوردی خۆیان لاخۆشەویست نەبووە لەناو تابلۆدا، بەدبەختی خۆمان لەسەر دەمێک لەخەو ڕابووین خەڵکی مۆزەخانەکانیان پڕکردووە لەتابلۆو شەقامەکان پڕ لەپەیکەر تازە هونەرمەندی کورد وەک مایکل ئەنجیلۆ و ڕێنوار ڤیلاسکونیر و فێرمەر ناتوانێ کاربکات. بەڵام دەبێ لەبابەتی ڕیالی ئەوان شت وەربگرین و تەکنیکی ئەوان بۆبابەتەکانی خۆمان گیرۆدە بکەین و ئەزموونەکانیان دووبارە بکەینەوە، بەڵام نابێ واتێبگەین بێ بازدان لەگەڵ سەردەم دەڕۆین.

**• کاک ڕۆستەم ... سوپاس بۆ وەڵام دانەوەتان.**

- منیش زۆر سوپاستان دەکەم کە لەدوورەوە بەسەرتان کردمەوە.

**هونەرمەندی شێوەکار ڕۆستەم ئاغالە لەچەند دێڕێکدا.**

لەساڵی ١٩٦٩ لەشاری کۆیە لەدایک بووە

لەساڵی ١٩٨٩ پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەشی شێوەکاری لە سلێمانی تەواو کردووە

لەساڵی ١٩٨٩وە تا ئەمڕۆ دەپێشانگەی تایبەتی کردۆتەوە

لەساڵی ١٩٩٥ پێشانگەیەکی تایبەتی لەپاریس هەبووە

لەساڵی ١٩٩٣ - ١٩٩٤ لە وڵاتی کوێت ونەمسا نمایشی سلایدی بۆ تابلۆکانی کراوە.

لەساڵی ١٩٩٧ - ٢٠٠٠ بەشداری پێشانگەی هاوبەشی شێوەکارانی کردووە لە بەریتانیاو هۆڵندا

لەساڵی ١٩٩٩ خەڵاتی دووەمی لەپێشانگەی خاچی سوری نێودەوڵەتی پێ بەخشراوە

لەساڵی ٢٠٠٠ چەند تابلۆیەکی هەڵبژێردراوە لەپێشانگەی یۆنسکۆدا

بەرپرسی گەلەری زاموایە لە شاری سلێمانی.

**• هەرکاتێک دەسەڵات ڕێزی لە هونەرمەندان ناو میدالیای ڕێزگرتنی پێ بەخشی ئەوسا دەوڵەمەندەکانیش حەز دەکەن دۆستایەتی هونەرمەند بکەن و تابلۆکانیان لێ بکرن.**

# بیرو بۆچوونەکانی «ئیدوارد ئالبی» سەبارەت بە شانۆی ئەمریکا

کورت کردنەوەو وەرگێرانی:
شاخەوان عەزیزی

«ئیدوارد ئالبی» یەکێک لە دیارترین شانۆنامە نووسانی گەورەی ئەمریکاییە، کە یەکەمین شانۆنامەی (چیرۆکی باغی وەحش)ە. کە نیشانەی شارەزایی تایبەتی ناوبراوە، ناوی ناسراوترین بەرهەمی کتێبی (کێ لە ڤێرجینیاوۆلف دەترسێ)یە. ئەم مەتڵەبەی خوارەوە وەرگێڕاوی وتووێژی شانۆنامە نووسێکە لەگەڵ ئالبی دایە. کە لە راستیدا دەتوانین بڵێین هەڤپەیڤینی نێوان دوو هاوکارە.

(١)

*** شانۆنامەکانی ئالبی لە بەشێکی زۆر لە وڵاتانی جیهاندا، وەک: فەرانسە، ئەمریکا، ئەڵمانیا، چیکۆسلۆڤاکیا، بریتانیاو نزیک بەتەواوی هەموو ئەورووپا پیشان دراون، ئالبی سەبارەت بەرابردووی خۆی و هۆی ئەوە کە بۆچی لقی شانۆتان لەنێوان لقەکانی دیکەی دەربڕیندا هەڵبژارد، دەکرێ بۆمان بدوێی؟**

- دەبێ سەرەتا ئەوە بڵێم زۆر جێگای خۆشحاڵیمە کە شانۆنامەنووسێکی ئەمریکایی سەبارەت بەشانۆی ئەمەریکا لەگەڵمدا باس و راوێژ دەکات. لەروانگەی شانۆنامەنووسێکەوە دەبێ بڵێم کە یەکێک لە گرفتەکانی شانۆی ئەمەریکا ئەوەیە کە بە رواڵەت شانۆ تەنیا تێکەڵاوێک لە هەندێک بناغەی شانۆیی و هەندێ ئامادەکارو بینەرەو زۆر بەکەمی باسی شانۆ نامە نووسەکان دەکرێ. ئەوەی کەمنی بەرەو بەشی شانۆ راکێشاو بوو بەهۆی بەربەستێک لەسەر رێگای چوونم بۆ ناو لقەکانی دیکەی هونەری، هەر ئەوشتەیە کە ئێوە دەتانەوێ بیزانن دەبێ بگەڕێینەوە بۆ دەورانی شەش ساڵیم کە بڕیارم دا ببم بەنووسەرو دەستم بەدانانی شیعر کردو... نزیکەی یازدە ساڵان بووم کە بڕیارم دا نووسەریی وەلا بنێم و ببم بە ئاواز دانەر. ئەم پەیوەندیەش تەنیا شەش مانگ درێژەی کێشا، من پێم وایە بۆیە لەشەش ساڵاندا بڕیارم دا ببم بەنووسەر چونکە پێم وابوولەئیش کردن ساناترە! بەڵام پاشان بۆم دەرکەوت کەوانییە. لەتەمەنی بیست وشەش ساڵاندا زۆر باشتر لەشەش ساڵیم شیعرم دادەنا، بەڵام ئەم غەزەلانەم لەباری چۆنایەتی و کەمایەتییەوە لە پلەیەکی ئەوتۆدا نەبوون کە خۆم بە نووسەرێک دابنێم. لە پازدە ساڵیمدا یەکەم چیرۆکم نووسی و لە حەڤدەساڵیشدا دووەمیان. رەنگە ئەم دوو چیرۆکانە لەو خراپ ترین چیرۆکانە بن کە تائێستا لە ئەمریکادا نووسراون. (ئاگاداری شوێنی دیکە نیم) ئەگەر بەگاڵتەش خۆم بە نووسەرێکی شارەزا دانێم هەڵبەتە پێم وانییە وابێ چونکە ناتوانم بابەتێکیش بنووسم.. دەبێ بڵێم کە لەتەمەنی سی ساڵیداکە لەباری پێگەیشتن و تێگەیشتنەوە لاوێک بایەخی تایبەتی هەیەو لەراستیدا کۆتایی دەورانی لاوێتیەتی، دەستم دایە چیرۆک نووسین و کاتێک دیتم هیچ شتێکم بۆ نەماوەتەوە لەبارەیەوە بنووسم رووم لە شانۆنامەنووسین کرد، رەنگە هۆی ساغ بوونەوە لەسەر ئەم بڕیارە چۆنییەتی دەورانی منداڵی و وەزعی بنەماڵەییم بێت، چونکە منیان دەناردە شانۆ، مەسەلەی دیکە ئەوەیە کە لەتەمەنی یازدەو دوازدە ساڵیدا بنەماڵەکەم لەناو کاری شانۆدا بوون و خەریکی هونەری شانۆبوون و لەتەمەنی پێنج ساڵیدا، دەستم بەخوێندنی

> **پێم وانییە قەت بکرێ بە فێرکردن کەسێک بکرێتە شانۆنامەنووس.**

شانۆنامە کردو بەداخەوە ئەمە شتێکە کە زۆربەی خەڵکی رووی تێناکەن. ئەوە کە ئایا بەڕاستی نەمدەتوانی کاری دیکە بەڕێوەبەرم، رووم لە شانۆنامەنووسی کرد یان هۆی دیکە هەبوون، بۆخۆشم نازانم.

(٢)

*** ئایا بەبڕوای ئێوە سەیرنییە کە یەکەمین شانۆنامەتان سەرەتا لەجیاتی ئەوەی لەئەمەریکادا پیشان بدرێ، لەئاڵمانیای رۆژئاوادا پیشان دراو پاشان لە ئەمەریکا؟**

- رەنگە ئەم مەسەلەیە بۆمن سەیربێت، بەڵام کاتێک کە شانۆنامەکەم دەنووسی بەهیچ چەشنێک بیرم لەوە نەدەکردەوە کە چارەنووسەکەی چی دەبێت. هیچ پێشبینییەکیشم لەسەر رووداوەسیاسیەکانی دوایی نەبوو کە ئەم شانۆنامە لەجیهانی شانۆ سەبارەت بە مەسەلە هونەریەکان چ چارەنووسێکی دەبێت. پاشان کە لە بێرلینی رۆژئاوادا بۆخۆم چوومە سەیری «چیرۆکی باغی وەحش» سەرم سوڕنەما ، بەڵام بۆمن ئەزموونێکی گەورەبوو. بەتایبەتی لەم روانگەوە کە شاهیدی بەڕێوەچوونی یەکەم شانۆنامەم بووم کە بۆ یەکەمین جار بەڕێوەدەچوو، لەمەودوا پێم وابوو کە شانۆنامەکانم بەزمانەکانی جیا لە ئینگلیزی، چوارچێوەو ماناى ئاوالەو بەربلاو تریان دەبێت.

*** ئایا ئیمکانی دۆزینەوەی بینەری تازە لەدەرەوەی نیویۆرکدا هەیە؟**

- بەڵێ ئەوە ئیمکانی هەیە، بەڵام دەکرێ زۆر بە ئاسانیش بینەرانی تازە بێزار بکرێن و هەر ئەو شتە بێ ماناییانەی کە لە نیویۆرکدا دەرخواردی بینەران دەدرێ دەکرێ لە شوێنی تریش دەرخواردیان بدرێ.

*** ئایا بەبڕوای ئێوە کۆلێژو زانستگاکان لەم بوارەدا دەتوانن کارێک بکەن و بەم پرۆگرامەی کە لەبواری فێرکردنی شانۆدا بۆ قوتابیانی زانستگاو بینەران ئامادەکراون تێدا سەرکەوتووبن؟**

- بەڵێ، زۆر بەر لە ئێستا کەمن دەچوومە کۆلێژو لە ماوەی ئەو یەک ساڵ و نیوەدا کە من لە کۆلێژ بووم بەدەست پێکردنی کاردکانی (بیرنارد شۆ) دەورانی شانۆی ئەدەبی مۆدێرن کۆتایی پێدەهات، بەڵام وەکو بڵێی ئێستا هەلومەرجەکە لەبارتر بووە، بەرهەمی شانۆنامەنووسانی وەک: «ساموایل بیکت»و «ژان ژنە» دەخوێندرێن و ئەمانەش بوونەتە بەشێک لە بەرنامەی دەرسی بەشی شانۆ کە زۆر جێگای گرینگی پێدانە. بەڕاستی من لە رۆڵی پەروەردەو فێرکردن و زانستگا لە بارهێنانی شانۆگەردا بێ ئاگام و پێم وانییە کە قەت بکرێ بەفێرکردن کەسێک بکرێتە شانۆنامەنووس هەڵبەتە لێرەدا زۆر وێنەش هەیە کە پێچەوانەی وتەی من دەردەخەن. بەبڕوای من گرینگترین بایەخ کە زانستگاو خوێندنی (ئاکادیمی) هەیەتی ئەوەیە کە زەبرێکی کاریگەریی لەسەلیقەی بینەری ئێستای شانۆی داوە کە بینەر چاوەڕوانی زیاتری لە شانۆی ئەمڕۆمان هەیە ئەمە ئاکامێکی گرینگ و سەرنج راکێشە، بەم مانایە کە دواتر بینەران چاوەڕوانی زیاتریان لە شانۆ دەبێت، بەواتایەکی دیکە بینەر دێتەوە سەرهۆش و ئەمە دەتوانێ گرنگترین بایەخی فێرکردنی زانستگایی هەبێت، دەبێ ئەوە بڵێم کە زۆربەی قوتابیانی ئێستا دوای پێنج ساڵ، یانی دوای تەواوکردنی خوێندنی زانستگایی لە روانگەی روحی و دەروونییەوە دەخەوێن. رەنگە باشتر بێت کەوا بیر بکەینەوە، ئەم چاوەڕوانییەی کە باسمان کرد، لەو رەگەزەی هەیانە کەوا لەحاڵی فێربووندان، بەڵام دوای لەخەو رابوونیان (کە چاوەڕوانی دیتنی شانۆی باشتریان هەیە) چاوەڕوانی دیکەیان هەبێت. رەنگە خوازیاری بابەتی گرینگتری شانۆیی بن، بەڕاستی دژوارە خەڵک لەو رێگایە بگێڕینەوە کە گرتوویانەتە پێش و لەبەردەمیانە، بەڵام دەکرێ ئەم زەبرە کاریگەرە زۆر بەسانایی لە کۆلێژ بدرێ.

(٣)

*** ئاگاداری ئەوەم کە ئێوە لەگەڵ چەند کەس لەشانۆنامەنووسە گەنجەکان کاردەکەن، ئایا دەکرێ زیاتر لەسەر ئەو شانۆ هاوڕێتنە بدوێن کە ئێوەو بەڕێز «بار»و بەڕێز «وایلدەر» خەریکی بەرهەمهێنانین؟**

- بەڵێ ئەمە لەراستیدا کارێکی ئاسانە. وادەهاتە بەرچاو کە مەسەلەی رەخنە لێ گرتن لەم وڵاتەدا زۆر ئاڵۆزە بەوڕادەیە کە زۆربەی رەخنەگرانی هونەریمان هیچ دڵیان بەشانۆی «پڕ رووداو» خۆش نییە. بەم پێیە بۆمان دەردەکەوت

**بەبێ رەخساندنی هەل و مەرجی تەواو ئەگەر بمانەوێ شانۆیەکی نوێ وهەست بزوێن پیشانی چەند کەسێکی ناحاڵی بدەین ئەوا ئەمە شتێکی پڕ مەترسییە.**

ئەگەر بەبێ رەخساندنی هەل و مەرجی تەواو بمانەوێ شانۆی نوێ و هەست بزوێن زوو پیشانی چەند کەسێکی ناحاڵی بدەین زۆر شتێکی پڕ مەترسیە! هەر بۆیە هاتین کارگەیەکمان لەژێر ناوی «لقی شانۆنامەنووسان» لەشانۆیەکی دەرەوەی شانۆی «برادۆی» بنیات نا کە دووسەد کورسی هەیە. لەم بەشەدا نزیکەی سی و پێنج شانۆنامەنووسی لاو، دەبیندرێ کە رادەیان لەسی تا چل کەسی بەردەوام لەگۆڕاندایە ئەوان دەتوانن سەربەستانە لەشانۆکان کەڵک وەربگرن و ئەگەر بیانەوێ ئێمە شانۆگەرو ئامادەکارو بینەریشیان دەخەینە بەردەست، پاشان دەتوانن شانۆنامەکانیان بەبەشداری ئەو بینەرانەی کە بانگهێشت کراون پیشان بدەن، هەڵبەتە ئەگەر بینەریان بوێت و خەیاڵ ئاڵۆز نەبن لەوە کە لەئاست رەخنەگران غافڵگیر دەبن! وەکو دەبیندرێ تا ئێستا ناکامێکی باش بەدەست هاتووە.

*** بۆچی وتت ئەگەر بینەریان بوێت؟ بەبڕوای من هیچ شانۆنامەنووسێک نییە کە بینەری نەوێت؟**

- بەڵێ رەنگە شانۆنامەنووسێک بیەوێت بەبێ بوونی بینەر کارەکەی هەڵبسەنگێنێ و بزانێ چۆنە؟ ئایا سەرکەوتنی هەبووە یان نا؟ ئایا لەرێگایەکی راستدا هەنگاو دەنێ؟ شانۆکەی بەتەواوی و بەبێ کەم و کوڕی پیشاندراوە یان نا؟ ئەوەیە کە لەم بارەوە پێویستی بەبینەر نییە. بەواتایەکی روونتر ئەم جێیە تاقیگایەکە بۆ شانۆنامەنووس کە بەدوور لەگوشاری (شانۆی بازاڕی)و تیجاری کار بکات.

*** کام یەک لە شانۆنامەنووسان کاریگەری تایبەتی لەسەرت هەبووە؟ بەڵێ پێم وایە..... مەبەستم لەسەرەتای کارکردنتانە؟**

- هەر شانۆنامەنووسێک کە بەرهەمی شانۆنامەنووسانی تری خوێندبێتەوە بێگومان بەجۆرێک کاری تێدەکات، چونکوو مەبەست لە کاریگەری و کارتێکردن دیاری کردن و قبوڵ کردنەو من پێم وایە کە کەوتوومە ژێر کاریگەری زۆر شانۆنامەنووس کە کارەکانیانم بەدڵ نییەو هەروەها ئەو شانۆنامەنووسانەی کە کارەکانیانم بەدڵە بەتایبەتی پێم وایە کە زۆر لەژێر کاریگەری «بیکێت»و «ئونیل»ی کۆچ کردوودا بووبم وئەم کاریگەریەش ئەوەدەمە بوو کە شیعردانان و چیرۆک نووسینم وەلانا.

*** ئایا مەبەستتان لە بەرهەمەکانی «ئونیل»ی کۆچ کردوو «حەرەکەتی دوورو درێژی رۆژ لەناو جەرگەی شەو»دایە؟**

- بەڵێ شانۆنامەی «پیاوە بەفرینەکە دێ»و هەروەها هەندێک شانۆنامەی دیکەی کە لەکاتی نووسینی شانۆنامە باشەکانی دەیخولقاندن.

(٤)

*** پێم وایە تەواوی شانۆنامەکانت لە ئەوروپاو ئاسیادا پیشان دراون. ئایا وانییە؟**

- لە ولاتی ژاپۆن دڵنیام، بەڵام سەبارەت بە ولاتانی دیکەی ئاسیایی ئاگادار نیم، بەڵام ئەوە دەزانم کە لەتەواوی ئەوروپادا شانۆنامەکانم پیشان دراون.

*** ئایا تا ئێستا هەوڵت داوە فیلم نامەیەک بنووسی؟**

- نەخێر، بەڵام بیرم لێ کردۆتەوە، ئەگەر نوسیم پێم خۆشە هەر خۆم بەڕێوەبردنەکەی وە ئەستۆ بگرم.

*** ئێستا بۆم دەرکەوت کە لە ئامادەکردنی فیلمی «ڤیرجینیا رۆڵف»دا بەشداریت نەکردووە؟**

- ماوەی ساڵ و نیوێک هەوڵمدا کە بەشداری تێدا بکەم و فیلمەکە لەسەر بنەڕەتی فکری من ئامادە بکرێت، بەڵام بێ سوود بوو. هەر بۆیە دەستم لێ هەڵگرت.

*** چۆن بەرگەی ئەوە دەگری کە کۆرپەکەت بۆ بار بێنن؟!**

- بە بەخۆسەلماندنی ئەوە کە فیلمەکان دوور لە راستین.

*** بەدوور لە راستی؟!**

- بەدوور لە راستی و نەبوو، کە وابوو لە دەروونداا زۆر بیریان لێ ناکەمەوەو زۆر گرانە کە بمانەوێ فیلمەکانی ئەمریکایی بە جیددی سەیر بکەین.

**تێبینی: ئەم بابەتە وتو وێژێکی دوورو درێژە کە شانۆنامەنووسێک لەگەڵ شانۆنامەنووسی بەناوبانگی ئەمریکایی (ئێدوارد ئالبی) سازی داوە. بۆ ئەوەی زۆر لەلاپەڕەکانی گۆڤار داگیر نەکات پوختەیەکی باشمان لێ وەرگێڕاوەو هیچ لە ناوەرۆکەکەی ناگۆرێ.**

**سەرچاوە:**

**رادستان) ژ-٢١**

**هەر شانۆنامەنووسێک ئەگەر بەرهەمی تر بخوێنێتەوە ئەوا بێگومان دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو خوێندنەوەیە.**

# سەفەرنامە

## ئاسمانی نێوان ئەمستردام - بیروت

عەبدولقادر سەعید - سلێمانی

خۆشەویستم...
تۆ سەیرکە هێشتاکە قولەپێ خوێناویەکانمان لەسەر ئەو زەمینە
هەڵنەگرتووە کە دەمێکە لاشەی برینداری بەسەدا کێش ئەکەین
کەچی باڵی خەیاڵ ئەمانخاتە سەر دووڕیانی سەفەرێکی نوێ
سەفەرێک غەرقی گریان، غەرقی بزەو عەشق و ژیان.
خۆشەویستم حەز دەکەم بپرسم تۆ ناترسی لەکەمینەکانی چارەنووس،
لەئایندەی رەنگ پەمەیی لەمێژووە هەلا هەلاکەت لەبزە
سەر براوەکانت؟ لەمنی عەوداڵی خەیاڵی ژیان خەیاڵی فڕین
بەسەر دنیایەکی:
دەست لەئێخەی مەرگ گیرکەر
دەست لەئێخەی کینەو رق و تۆڵە گیرکەر
دەست لەئێخەی چەوسانەوەو مەرگی رەشی مرۆڤ گیرکەر؟
خۆشەویستم...
من ئێستاکە لەدوورەوە لەژوور هەورە لۆکەییەکانی ئاسماندا
دوور لەمرۆڤ نزیکتر لەتریفەی مانگەشەو لەئاسمانی ولاتێکی
رەنگاورەنگ بۆت ئەنوسم. خەیاڵ لەگەڵ وشە بەسۆزەکانی
شەوانی پێشومدا ئەمبا چاوەڕوانم چەند ساتێکی دی فڕۆکەکەم
بمخاتە سەر زەوی مرۆڤ، مرۆڤی شەڕانی و هاوڕێی
دڕندەکانی ناو جەنگەڵستانەکانی سەر زەوی ئەو مرۆڤانەی رەنج و
خوێنی هەژاران وەک چڵپاوی دوا شوشتنی جەستە گوناهبارەکانیان
ئەڕێژن، ئەو زەمینەی تۆم تیا ناسی و تۆم تیا خۆشویست.
خۆشەویستم حەز دەکەم هەر ئێستاکە بەم ئاسمانەوە گڕ بگرم و
جارێکی تر نەکەومەوە سەر زەوی، ئا ئەو زەوی یەی
مرۆڤەکان تیایا ئازاریان دام و دڵیان شکاندم.
بەئارەزوو شیعرەکانیان ژەنگاوی کردم پێیان وتم کاکە ئەوین

مەلێکی نامۆیە بەتۆی شاعیر دەستەمۆ ناکرێ و چیی‌دی
خەیاڵ لەقەفەزی زێڕین مەکەرەوە بۆ ئەوین.
خۆشەویستم...
چەند ساتێکی دی دەکەومە سەر زەوی دەکەومە باوەشی
ئەو باهۆزەی وشە بەسۆزەکانی تۆم تیاناسی، ئەکەومە
سەر ئەو زەوییەی جگە لەسنورەکانی جوگرافیا نیشتمانێکی
تری تیایە، تەنیا لەوێ لەسەر باسکی ئەو لەئامێزی ئەودا
لەبەر بریسکەی چاوە گەشەکانی‌دا هەست بەگوناهە گەورەکان
ئەکەم، نیشتمانی من ئێستا لەم خەیاڵە بەدرکەزی و تەڵبەند تەنراوەدا.
ئافرەتێکی گەنمڕەنگە پرچەکانی داستانە درێژەکانی مێژووی
ئەنفال کراومەو پەنجەکانیشی هەناسەم.
خۆشەویستم.. لەنیوە شەوی تاریکی ئەم ئاسمانە بەرینەدا بەرەو
رووت دێم گوێم لێ بگرە، دوور لەمرۆڤ دوور لەئاوەدانی ئەم
وشانە ئەخەمە سەر باڵی گوڵە ئەستێرەکانی ئاسمان پێش ئەوەی
دەستم بگاتە پەنجە زێڕینەکانی، پێش ئەوەی هەناسەی دوکەڵاویم
گوڵاڵەی سۆز بژاکێنی، بەرەو رووت دێم دڵ بەخەم، هەناسە
سوار بەڵکو لەروحەوە قاسیدێ بێت بڵێ ئەوە
تیشکێ لەچرای هەڵگیرساوی ئەم دڵە تاریکەی زەمەنێکە چاوەڕوانی سەفەرێکی ئەبەدییە.
خۆشەویستم..
بەرەو رووت دێم و پەنجەم لەقژی هەورەکان و خەیاڵم لەجوانی
کۆلکە زێڕینەی ئەوینتا گیرکردووە وەک ئەو
کەسەی لەبیابانێکی بەریندا چنگ لەسەر شانە ماندوو شەکەت
لە شوێن سەرابا رائەکات، بەرەو رووت دێم خۆزگە ئەمزانی
سبەینێ ئەمە پەلەوەڕە لانەوازە غەریبە لەسەر کام چڵ کام ترۆپکی
سوتاکی ئەم نیشتمانە داگیرکراوە ئەنیشێتەوە.
خۆشەویستم.. تۆ بڕوانە من ئێستاکە لەبەر ئەشکەوتێکی دێرین کە
ئەفسانەی تیا هەڵئەسوڕێ ئەشکەوتێکی بەتەونی مرۆڤی
جاڵجاڵۆکە تەنراو بەرەو لات دێم دڵ بەخەم و چاو بەفرمێسک
هەلا هەلاو تاسەر ئێسقان ئازاراوی ئەوەی تەنها شکی ئەبەم
دڵێکی پڕ لەئارەزوو بەئەوینی هەژاران و ئەو ئەوینەی چەند شەوێکە
نیوە شەوان خەوم ئەزڕێنی و بانگم ئەکات فریشتەیەک چاوەڕێتە چاو
بەشەونم، گوێ بەسەمفۆنیای ئەوین و دەم بەهاواری پێکەنین.

من لەخەوی کابووساوی.
رائەچڵەکێم دەم ئەنێم بەدوا چۆڕی ئەو سۆزەوە کە تۆ
چۆڕ چۆڕ ئەتڕژانە کانی بەرینی خەیاڵم، دەست ئەخەمە
سەرشانی ئەو فریشتەیەی بەناهەق ئەڵقەی دەمیان کلیلدا باس
لەجوانی و عەشق بکات، بەناهەق ئەڵقەی هاوسەریان لە
پەنجەی بلوریدا هێشتبوو بەناهەق جانتای سەفەری مەرگیان
دابەکۆڵدا.
خۆشەویستم تۆ نازانی مرۆڤی تەنها چەند قووڵ دەڕوانێ، مرۆڤی
تەنها بیر لەمەزنی ناوەوەی خەڵکانی تر ئەوینی دی دەکاتەوە
مرۆڤی تەنها سەر ئەخاتە سەر مەچەکی و بەقەڵەمی رەنگاوڕەنگی
خەیاڵاوی دنیایەکی جوانتر لەئێستەو مەزنتر لەدوێنێی
ژەنگاوی و رەنگاڵە تر لەسبەینێ بنیات دەنێ.
خۆشەویستم..... چەند ساتێکی تر فرۆکەکەم باڵی ئارەزوودا ئەگرێ و
دائەبەزێتە سەر زەوی ئەو کەسانەی بۆ چەند ساتێک لێم ئەڕوانن و
نامە ناسن بەرەو ماڵێ، بەرەو ئامێزێکی گەرم هەنگاوی بەپەلەو
درشت ئەنێن، منی تەنهاش لەبەردەم خەیاڵێکی ئاڵۆزکاوی
شەکەت دراو بەنهێنیەکانی سبەینێ بەرەو رووت دێم بەرەو
نێزگزە جاڕی ئەو چاوانەی نەم بینیوون و لەناو دڵما ئەجریوێنین.
بەرەو لای ئەو وشانە کە هێشتاکە نەمم بیستوون و وەکو رووبار
لەدەروونما هاژە ئەکەن.
خۆشەویستم بەرەو رووت دێم بەهەنگاوی بەپەلە، هەناسە سوار
وەک پەنجەی لەرزۆکی ئەو غەوارەیەی بەترسەوە لەدەرگای
دڵی ئێوارانی خەڵکی ئەدا.
بەرەو رووت دێم دڵ بەهیواو چاو بەیاقوتی فرمێسک.
باسکی خەیاڵ ئەکەمەوە بۆ پرشنگی هەڵڕژاوی ئەو ئەستێرە
ئاڵتونیانەی لەم گەردوونە گەورەیەدا بەسەر هەموو سنورەکاندا
رائەکەن دەریاکان ئەدەن بەیەکاو شەپۆلەکان لەدەریا
یاخی ئەکەن و ئۆقیانوسەکان لێک ئەدەن و دڵی زامداری کیشوەرەکان سارێژ ئەکەن،
لەناو کراسی شیفۆنی ئاو دامانی ئاسمان و ئەم ئێوارە غەمگینە سەما لەگەڵ ئەم
ئەوین و ئەم خەیاڵ و ئەم کۆچە نوێیەی من ئەکەن.

# نامەی بەفرانبار

چەپکێ شسیعری
«فاتیمە حوسێن پەناهی»
کوردستانی ئێران - سنە



**«رۆژ»**

قژەکانت بەشانەی کازێوە دابهێنە
خوا نەخواستە،
ئەگەر رۆژێ تۆ نەمێنی
کێ چیرۆکی بەیانم بۆ بگێڕێتەوە؟

٢٧ / ٦ / ١٩٩٥ سنە

**«تەریب»**

من زەوی بەردەڵانیم و؛
تۆش چۆم.
بەسەر دڵمدا رەت دەبی و،
قەت ناگەی بەمن.

٢٩ / ١٠ / ١٩٩٥

**«بۆ کۆتایی»**

دوایین سێبەرێک
کە بەشوێنمانەوە ونە
شەقامە شیعرێکە؛
گەڵارێزانی وشە داپۆشیوە؟!

١٥ / ١ / ١٩٩٦

**«بۆ تۆ»**

شەوێ نەبوو
بەیادی تۆوە تێکەڵی خولیا نەبم
ئەم ساتانە
قات و قڕی رازێکی پڕ لەنازن -
- بێ ورتەی ئەوین

٧ / ٩ / ١٩٩٦

**«ئاگرێکی بەپەلە»**

بەبێ وەختایی بروسکەکانەوە؛
بزەکان لێوەکانمیان پڕکرد، پیرکرد.
دوایین چۆڕی عەشقم-
هەڵمێک بوو!!!
بۆیە لەسروودی سێڵاواندا خۆم تۆمار کرد.
گەرمای گیانم گیایەکی دەم باهێزە.
تەناف بەسەر رۆحیشمدا هەڵنەخەی
دڵنیابە خۆڵەمێشی دەبی!..

**«یاداشتێکی کۆن»**

نەدار هەناری ناو باخچە،
لەنەنەرێکی بۆ هەڵواسیت
نەلەم گەڵا رێزانەدا،
هەنسکەکانت بیری بارانێکی -
- شاعیرانەیان خستیتەوە...

١٧ / ١١ / ١٩٩٥




**«نامەی بەفرانبار»**

لەپای دەوەنێکدا دڵم داوەری و،
بەفر...
بەباوەشی بڵندی شاخی دادام.
دەستم بەداوێنت چارەنووس؛
تەرزەیەکی ورد.
تان وپۆی لەشی کوتاوم.
گەر چرایەکت داگیرساند؛
بۆ دایکمی بنێرە...

**«خەمێکی ئاوەدان»**

چەپکێ گیام،
لەگوڵشەنی پشت مێژووەوە،
مشتێ بەفریش.
بای عەشقت هەڵیگرتم،
هەموو وەرزەکان!
بەهێمنی روخان...

٣٠ / ١١ / ١٩٩٩

**«نزایەک بۆ ساڵی ٢٠٠٠»**

جاران
کەرێت دەکەوتە سەر رێی شیعرم؛
شۆخ وشەنگترین کچە شاعیری دونیا بووم.
بەخەونەکان لەش ولارم دادەپۆشی،
منیش رووت و قووت.
شیعر سەمای شاری دەکرد.
ئێستاکە؛
شیعر شیوەن دەکاو،
بۆنی بۆکروزم دەناسمەوە.
لق و پۆپە سوتاوەکان لەخۆم دەکەمەوەو
لێوەکانم بۆ نمەبارانێکی سەوز
بەجێ دێڵم..!!

# ئارەزووەکانی ماسیگرێکی ڕێکپۆش

بۆتان جەلال



ناخ دەڤەری ئەفسانە و میوەجاتی ئۆخژنێکە
نیواران ژنان دێنە بن کەپر و
لای منداڵی پەژموودە
نهێنی شەوی بەزاوا بوونی مێردەکانیان دەدرەخشێن
-با- پەرتەوازەی سێبەری ژێرانە
-باران- هێورکردنەوەی سۆزە هەڵچووەکانی
پانتایی قۆپچەی کچێکە
کەهێشتا خۆی نەناسیوە
حەزم دەکرد لەدەریایێ ببمە پیاو
ماسی گژوگیای نەمریی بۆ گلگامش
لەژێر وردە بەردان شاردبێتەوە
وابزانم لەجەهەننە میش جێگام نابێتەوە مادامەکێ
هەقیقەت
لەناو گیرفانی چەپی دڵمدا کێ برکێیەتی
بەپێبلکانەی دەنگە مۆسیقیەکان هەڵزنێ
تەرتیلی ئەو قەسیدە ڤەهێڵەی بنیادەم
لەنەغمەیەکدا بئاوازێنە
هەموومانی پێی سەرمەست کات
هەمووومان حەزمان لێیە

لەناسکترین ساتەوەختی گریانمدا
زریزەی ژانە متبووەکان
بەدەم ڕۆندکە شەرابیەکانی خەفەت والاکەین
پەنچەکانی دەستی چەپم خوارن
تیری ئارەزوو هەرچەند ئاراستەی سەوزە خەونێک دەکەم
ناپێکی
واباشە بەدەبدەبە چرچەکانی کوڕەکەم یاری بکەم
یان داشی دامە
لەزنارە بەسالاچووەکانی چیای سپی قژی سەرم
بۆ پیرەمێردەکانی گەڕەکەکەمان بتاشم
وەک تامەزرۆی تەمەنێکی ئاڵ و مەرمەڕیم
خولیای جوانیی ژن و شیعرو خەونیشم
لەمەملەکەتی بەردبارین سەیوانێک
هەمیشە لەپەیڤ و رستەی هەوری پڕ ئاو
دەخەمە سەرسەرم
ماسیگرە ڕێکپۆشەکە
لەخوێنی لەق لەقێ خەڵتان بوو
هێشتا کۆچی گەرمیان و کوێستانی دەست پێنەکردبوو
کچە هەڵەشەکەش.
بۆنی بن هەنگڵی
متوربەی تامی لێوە هەنگوینییەکانی دەکات
بەیانیان تا درەنگە شەوانێ
رووبەری خەونی مێردمنداڵانی گەڕەک ئاڵۆز دەکات
ڕێگام بدە توێکڵی پیرە دار گوێزێکت بۆ بکەم بەبێشکە
یان لەگڵە هەڵوژەیەک قردێلەیەکت بۆ دروست کەم
جغارەکەم سوتاند.
بێ ئەوەی ڕەنگی-تۆ- ی لێ مۆمیا بێ
باشترە موچڕکێکی گەرم بەڵام زۆر گەرم
بەهەموو عومرم بکڕم و خۆمی لێ بەزاوا بکەم
لەئەتڵەسی جەستە سفت و سپییە جوانەکەت
ئاماژەیەکی بەرەونەق بنێرە
نەبادا بەرلەوەی بروسکەی هەوەسە بەتینەکانم
تیلم تیلم بێت
کورتێنێتیم لەدەست چێ
تاسەر ئێسقان بەرەچەڵەک بەنەرمی سێکوشەکانتان
ناسراون
کەوتومەتە گێژەنێک بەو درەنگە وەختە
نازانم لەکوێ کەف و کوڵی جووتبوون شریخە دەدات

لەززەتەکانم لەکام زەبنەقە چرکەیەکدا
جاویدانە رەگاژوو بوونی عەشقبازیەتی ئێوە بانگەواز دەکا
ناشزانم لەکوێ رەشمالی یەکجاریت هەڵدەدەیت و
لەناو کام رەشە مێرگێکی سێ گۆشەیی گەورە دەبیت
گەورە بە تا دەتوانی گەورەبە
دەترسم بچووک بوونەوەت ئافاتێکی بەدواوە بێت
من جوایەز لەوانەی دڵیان شەکرە سێوە
ئارەزووی مژینی گوێ مانگم
پتر لەگەرمی ترپەی ژێر پێشیان
درەنگە شەوان دزەم بۆ ژێر لێفەی ژنەکەم کردووە
چەند گوناهین ئێمە
مومارەسەی تێکەڵ بوونی ئاساییمان
بەهاترین نرخی لەسەرە
یاقووتی خەیاڵە ئاڵۆسکاوەکانی مەل
دەستووری چ ئایینێک لێمانی قەدەغە کردووە
کەقەشەنگترین هەناسە دەگمەنەکانی مەراقە وڕێنەییەکانمان
تیایدا بەرەنگی شەرابێکی قورمزی دەشۆرێتەوە
ئای خانمە بچکۆڵە ناز مەرجانیەکەم
چەند پێوستم بەشیلەی لێوەکانت هەیە
مەراقمە بێ ژاڵەژاڵە شەوان
لەژوورێکی پڕ لەئاگردان و سوراحیەی شەراب
تێکەڵ بەیەکتری ببین
تاریکستانی پێدزی رێنماییە حواییەکان
وەک نەوردسێکی سەر ئاو
دەمارو باڵەکانمان خامۆش بکات
لەمەراقی تێکەڵبوونی ئێوە هەزار پرسیار لەدایک دەبێت

پرسیاریش گوناهێکە
ئێمە دەستمان لەدروست کردنی نییە
چلووکی سێبەرە سنۆبەرەکانی باڵا کافوورییەکەت
بەئاستەم بۆنی رێواسی لێدێ
کەهەوردەکان رەنگە لێڵەکانی چاو بزر دەکەن
ئەو کات یەکپارچە جەستە سپییە راز یانەکەت
وەڵامی ماچە پرسیاراوکانی ئەزەڵ
لەبێشکەیەکی تا بڵێی نەرم ونیان و نەڤیناویدا دەخەوێنێ




سەرم بەسینگە زیوەریەکەت نەکەم
چوزانم سبەی رێگای ماڵەکەمان لەکوێیەوە دەست پێدەکات
هێندە کۆڵەوارم و تەنافی عەشقی تۆش
زیاتر وەک بایەکی جلەو کراو
دەمهێنێ و دەمهەژێنێ
بێ راوێژ سەرم دەخاتە ژێر قاچە بێ رەحمەکانت
نازانم سۆمای چاوەکانمە وا قەمبوور بووە
یان باڵای ماینێکە لەشەڕدا تێکشکاوە
چاو وماین و شەڕە درێژخایەنەکانی نادەم
لەپای چی لەپێناو هەوەسێکی هێشوویدا
هێندە سارد و گەرم هەنسک دەدەن
کەخۆشیان نازانن بۆچی شەڕ ئەنرێدایە..

# ئەم دناڤ پارزینکێ خەمێن حێشترانیدا

ئەسکەندەر سەلیم مزیری

جارەکێ مەلا مەشهور لسەر مینبەرێ گۆت
سوپاس ژ خو دێ بکەن کۆ حیشترا پەڕ پێڤەنینە
نەکۆ دا بانێن خانییێن هنگۆ هەر فیێن
هـ.هـ.هـ
هـ.هـ.هـ
هـ.هـ.هـ

(خەمائێکێ)
تە دگەل خۆ هەلناگرم
تو هەمی رۆژێ خۆ دناڤ پارزینکێ خەمادا
بکەڤلەکێ جەلاتینی
بسمیل دکەی
دگەل من نەگەرێی
لسەر شەپۆلێن خۆ چرڤە ئینانە کاسار
دا خەلک تە نیاس نەکەن
رەهێن لەشێ تە یێن بێنی
بۆ بهارەکا نی نەبەن
هێسترێن چاڤێن تە
گولەکا هەلوەریایی پێ گەش نابیتەڤە
دەما تو دێ هێی
خەم چەند بارە دبنەڤە
گریان دبیتەکەنی
کەنی دبیتە گریان
کەس لڤان هژمارا ناگەهت
ئەڤێن تە
ل پۆلا دوو هزارا فەنا بوونێ د گۆتنەڤە
هەمیا تلێن گو هێ خۆ نای
دا هژمارێن خەما نە رێسیەڤە.

کەس گوهێن خۆ ڤە ناکەت
کووتو خۆ دناڤ-هەژمارادا نوقۆم بکەی
هەمی کەس دزانن
١+١ دکەتن دوو
(خەما دوێ)
ژ کەڤلێ خۆ دەرنەکەڤە
بەلەتیفک داخۆ نەکوژن
ل ناڤ خینێ نەگەڤزن
پاش ماڤێن تە گۆڤەندەکێ گرێدەن
خەلک پێن خۆ دناسنەڤە
پێلاڤ و بنکراس و مەچێتر و جەنتا دبلۆماس
دڤیستیڤالا ناسینێ دا
دێ خۆ دناڤدا با دەن
سەکران دبن
خوها لەشێ وان خەمە
بۆ ولاتێ ئەزمانێ سۆرکا دباریێن
ل بەر هەمی دەرگەها دسەکنت
دقوتیت
تەق
تەق
تەق

تەق
کەس دەرگەهی بۆ ڤەنەکەت
خۆ د دەرزێن دیوارێن حەمبارێن شانی د
هەلکێشیتن
دێ نەچە ژۆر
دا دناڤ لحیفۆکا خەم گرتیدا
سەرێ خۆ دناهلینکێدا شۆڕ نەکەن
تلێن تە ز ڤستانا درێژ دبنە بەفر
ل هاڤینێ دبنە ئاگر
زارۆیێن وان بخەلەتی دەستێن خۆ لتەوەر دکەن
دێ نە چەژۆر
د مەراسیما چاڤ زلکانێ دا
ستینێن خانیێ خۆ
ئێخسیری کەنالەکا دی نەکەن
ژ وەلاتێ حێشترا
ل کەنالا حێشترا
ئێرە دەنگێ حێشترێن بپەڕە
ئێرە دەنگی حوشترە بەباڵەکانە
بۆ ئاگاداری خەڵکینە نەنڤن
ل دوو هزارو سێزدێ
رۆژ و مەهێن دوێ
دوو پەڕ ب حێشترا ڤە دهێن
دو ژان دێ هێنە مە
دوجا دێ مرین
دوو کفنا دێ کەینە بەر خو
دو
دوو
دووو
دووو....
بەسە
دا دناڤ دویا دەرکەڤین
پەڕ و خۆ و درۆیا
ژێک واوێر کەین



بۆیە بەنیشت ب ئەنیا مەڤە
کەس ئاڤریێن خۆ بۆ ڤەنەدەت
بهێن نەکەنێ
ئەم بێن ناکەینەتە
بێهنا پاخلا دایکا ژتە ناهێت
ماسی پەیکەرێ تە بۆ دلێ خۆ چێناکەت
دەما دروێن تە دبینن
رۆندک ژچاڤا نابارن
ز ڤیێن وان
ژ هیڤیا خەتا جۆتی ماینە
بێ جوتیارن
(رابە جۆتیار دێ هلۆڕابە بچینە عەردێ چۆل و
بەیار)*
تو لە ز بکە زەڤیکا خۆ بکێلە
پەڕاوێن باغێ تە پڕ بێزارن دێ ژ زەڤیکاتە

باركەن
رێژنە رۆندكێن بارانی ناباریێن
جلێن شاهیانێ ژ بەرخوٚکەن
بهێن ناکەنە گولێن سوٚر
هەمی رەنگا دێ ژ خوٚ ڤەکەن
هەردوو پەرێن خوٚ
دکەنە دوو هوٚزانێن پرێن بها
خێن میرانی خوٚ گوٚری کرن تێدا
دا ببینن ئاتەشێن پەرێن دروٚیاڤە
موٚرا موختاری بال بن پێێن ماسیا
پاشێ کێشکێنی خوٚ دفرینن
دێ بێژنێ پشتا خوٚ بکەنە روٚژێ
(خەماسێ یێ)
ل لەرزینا خوٚ یا هێدیڕا
دەستێن خوٚ بلن بکە
خەلک هەمی هایدار بوو
خوٚ دگەل تە نالەرزینن
دێ رامینن لچاڤێن تە
قوی نکێن جگارێن تە و
ددانێن تە یێن سوٚر
خیچکێن دەستێ تە هەژمێرن
کەس دیڤ تە ناکەڤیت
ماسی خوٚ ژ بهارا ناکەن
مێزیک جلێن تە ناکەنە بەرخوٚ
هوٚگریاتە ناکەن
پیلاڤێن خوٚ ناسپێرنە گەلە رێزانەکادی
دەستێن خوٚ گرێدە
بوٚ دناڤ خەرندەکانی پێنگاڤێن خوٚ بهاڤێرە
دناڤدا هەر بمینە
گەر تو نەهاتیە دەر
پایتەختا بێجامێن شین
کەرەسیا ستێرا ناکوژن
چەپەرێ بێ نڤێژ بوٚ ماچێن سپی و شینا

چێنابیت
تو نەهێ دەر دیڤە لانکێن تە هەمی مرن
کەس نییە بوٚ تە بکەت گری
بخوٚ بکەنە
جیهانا خوٚ لسرێ خوٚدا هەرفینە
بەحەشتا تە
بو جهەنەمەکا گەلەک یا کویر
ستیێ بازنێ ل دەستێ خوٚ دێ هاڤێتێ
پاشێ دێ کەتەگری
بوٚ ڤێ ژینا دگەل تەبری
ل رێز بوونا ماچی کرنا دەستێ ستیێ
دار، پەر، سەر، هەمی سرێ دگرن
ئەز دێ دەستێ کراسێ خوٚ ماچ کەم
سوپاسیا ستیێ کەم
توژی لهیڤیا نەمانێ بە
مرنێ بە
هنگی دێ تو تێر نڤی
بخوٚ بنڤە
ئەری خەلک تزبیێن خوٚ هەلگرن
ئەرێ ئەرێ ئەرێ بخوٚ بنڤە
(خەما چارێ)
دنکێن تزبیا بوونە سەرێن حێشترا
پێن حێشترا کوٚمکێن خینێ چێکرن
بوٚ دەڤەرەکا بێ روٚژ
خەم لێرە چار بارە بوونەڤە
میلێن دمی دەم هژمێرا خوٚ هێلا
ستێر بئاڤا بێ نڤێژ خوٚ دشوٚن
بەلەتیفک لسەر دەستێن خوٚ رێڤە دچن
زاروٚک دیڤ دایکا خوٚرا
ناکەن گری
مروٚڤ وەستیان
ئەز دێ کەنم
نە ء دێ کەمەگری

هەتا حێشتر دفڕن
فرۆیێ گای دگەهیتێ
ل من گەڕیێن ئەز دێ کەنم
نە نە نە دێ کەمە گری
وەرن دا چاڤێن حێشترا ب سمین
گوهێت وان کۆرەکەین
پایتەختا وان تێک بشێلین
خانیکا لێ بکەین
خانێن دەوارێن خۆ
ئەڤێن خانی بۆ چێکری شەرمەزار دبن
چ جارا پەرێن وان کاتا نادەنە ڤە
بمن نەکەنن
ئەز نەیێ شێتم
نەترسن لڤێ دنێ کەسێ شێت نییە
کەس س کەس شێت کەسێ شێت نییە
حێشترێن شێت هاتن
چپ
چپ
چپ
چپ
ئەزێ دترسم
ددانێت من لسەر ئێک ناڕاڤستن
دێ بخۆ کە مەگری
ئەڤ گۆتنە بوونە ڕاست
(خەما پێنجێ)
وەرن دا پەرێن حێشترا داکەین
بلا سەر داریتا بەر دەرگەهامە نەرێن
زارۆک تیا دێ ڤێ دەن
ئای چەند خۆش بوو مەژی تی ڤێ ددان
مەتی دخارن
هەکە تەکا تیێ هندی چاڤێن حێشترا بوو
هە بەلگەک هندی پەرێن حێشترا بوو
حێشتر نۆکە بانا دئێخن

درۆیا دکۆمپیوتەرێ دا دنڤیسن
پەرا ل مۆزەخانا د هەلاڤیسن
ئەم پەرا دێ هاڤێینە ڤێ دارتیێ
ب هەڤرا را ئازاد ببین
بێهنامە دێ هێتەڤە
وەناکەین ل دەرزێن دیوارا را بچێتە ژۆر
ل بەر دەرگەها راوەستیێن
ژیان لێ دبیتە تاریستان
پەراو هێلینێن خۆ دێ داننەڤە
بەلە تیڤک چاڤێن ماسیا ماچی دکەنەڤە
ئەژی دێ کەمە گری
بەسە بەسە بەسە کەس بلا نەکەنیت
دا سیڤاندۆک نەفڕن
ئەڤە دیا هیا خەمایە
دیاهیا پەرێن درۆیایە
ئەلندە لە هەلات
دێ خودێن خۆ سەر تێشتەکا سحاریدا خۆین
مە ئەڤ نەڤێن
بێهنا خینێ یا ل خمخمکێن درۆیا دێ هێتنە دەر
تو پەرێن خۆ ژێ کڤە نەکە
لیبیدویا خۆ زێ دەنەکە
توو و سنگ بونە هەڤال
کی دێ هەڤساری تە بەر دەت
پێ نڤیسێ من کەڤالێ ڤێ جارێ
لە پێن دەستێ تە دێ چێ کەت
دلێ مە دێ ژ خەما ڤەبیت
ڤیان نڤێژا رۆژ هەلاتێ دێ تێداکەت
تۆژی حێشترا پەرین خۆ پسپێرە ئاخێ
کەس ئاڤێ دديڤ تەرا نا هاڤێتن
خەم هەمی دديڤ تەرا دێ هێن
شەڤ درەنگە
بەسە دێ سەرێ خۆ دانم
خەوا منا تێت دێ نڤم

* فۆلکلۆرییە.

# بیـــــــابان

## فەرهاد پیربال

خوشکە چکۆڵەکەی «حاشووش» لەناکاو خۆی کوتایە ژوورەوە، بە پەلەپرووزێ و هەناسە بڕکێوە وتی:

– دایە، دایە.. سبەینێ دیسان ماڵە کوردەکان رادەگوێزنەوە.

لەوەدەمەدا من و حاشووش بەرامبەر یەکتر دانیشتبووین، دامەمان دەکرد. حاشووش کە گوێی لە هەواڵەکە بوو، یەکسەر، دەستی لەبەردی دامەکە سارد بووە، تەمی خەفەتێکی لەناکاو کەوتە سەر رووی.

دایکیشی، بەدیار سەماوەرەکە مات ما؛ بە غەمگینی و بەچاوێکی پڕ بەزەییەوە نیگایەکی کردم. من کە ئەو وەختە منداڵ بووم و زمانی عەرەبیم باش نەدەزانی، لەسەرەتادا لەو عەرەبییە جلفییەی خوشکەکەی «حاشووش» حاڵی نەبووم، بەتایبەتیش لەبەر ئەوەی زۆر بەهەشتاوی هەواڵەکەی پێمان راگەیاند.

باوکی حاشووش، کە دیار بوو ئەویش، ئەم هەواڵەی زۆر لەسەر دڵ گران دەهات، رووی کردە کچەکەی:

– کێ وای پێ وتی؟

کچۆڵەکە، بەشڵەژاوییەوە سەیرێکی منی کرد؛ ئنجا رووی کردەوە باوکی:

– ماڵی سەعدیەی دراوسێمان.

– وتیان چی؟

– ئەبوو سەعدیە وتی.

– وتی چی؟

– وتی: «سبەینێ ماڵە کوردەکان رادەگوێزنەوە».

دایکی حاشووش بەخەفەتبارییەکی پڕ لەگازندەوە، وەک ئەوەی بە نهێنی قسەبکا، رووی کردە باوکی حاشووش:

– راست دەکا. «ئەبو سەعدیە» پۆلیسە؛ دەزانێ.

باوکی حاشووش لەبەر خۆیەوە گوتی:

– ئاخر؛ لەشیمالەوە بۆ جنوب، لەجنووبەوە بەرەو کوێ؟ سەیرە!



من یەکسەر تێگەیشتم، زانیم کە ئیدی ئەمجارەیان بەیەکجارەکی رامانەگوێزنەوە بەرەو ئێران، یانیش بەرەو بیابانەکانی سەر سنووری «ئوردن». خەریک بوو لەپرمەی گریان بدەم. زۆر لەمێژ بوو باوکم باسی ئەمەی بۆ دەکردین. چیتر خۆم پێ نەگیرا؛ بەدیار فایبەری دامەکەوە، سەرم نوشتاندەوە سەرسنگم، وەک منداڵێکی لەتەمەنی ئەوسام زۆر بچووکتر، لەحەژمەت دەردەسەری و سوگواریی خۆماندا دەستم کردە گریان: من ئەمدەزانی بۆچی و تاکەی ئەفی کراوبووینە ئەم بیابانە گەرمە سێرەی باشووری عێراق.

بۆبەیانییەکەی، کاتێ لە ژوورە زیندان ئاسا تاریکەکەدا، دیمەنی شەوی دوێنێ و چۆنیەتی راگەیاندنی هەواڵەکە و پەشۆکانی ماڵی حاشووشم بیر دەهاتەوە؛ دڵم زیاتر تەنگ دەبوو. لەسەر تەنەکەیەکی قوپاوی ژەنگاوی دانیشتبووم، هەنسکم دەدا و لەبەر خۆمەوە هۆن هۆن دەگریام. لەدڵی خۆمدا دەمگوت:

– خەتای خۆم بوو. بۆچی شەو لەماڵی حاشووش مامەوە؟

یازدە مانگی رەبەق بوو (من و دایک و باوک و خوشکێکی بچکۆلانەم) لەو بیابانەی باشووری عێراقدا دەژیاین. چل پەنجا ماڵێک دەبووین لەوێ. بیابانی روممادی؛ بیابانێکی هەتا چاوبڕدەکا چۆڵەوانی و وشکایی بوو!

من، کە بەدرێژایی ئەو نۆسالەی رابردووی منداڵیم، هەمیشە لەکوێستان و لەناو شاخ وباخی رەنگیندا دەژیام؛ ژیان و گوزەرانی ئەو بیابانەم زۆر لەسەر دڵ گران دەهات. هەموو سپێدەیەک، کە لەخەو هەڵدەستامەوە، لەجیاتی فێنکایی شنەباو شەونمی ناوباغ: هەستم بەگەرد و گەرمای سووتێن دەکرد؛ لەجیاتی ئەوەی سمۆرەو قازو کارژۆڵەکانم لە نزارە سەوزەکەی بەرانبەرماڵمان ببینم؛ غوبارێکی زەرد، توێژێک توزی سووتاوی پێمدا دەپژاند. بۆ دایک و باوک و خوشکەکەیشم، هەمان سەغڵەتی و بەدبەختی بوو. بەدرێژایی هەموو ئەو یازدە مانگەی لەو بیابانەدا بووین، تەنیا ماڵی

حاشووش و ماڵە عەرەبێکی دیکە هاموشۆیان دەکردین و جاربەجار یارمەتییان دەداین.

باوکم بۆ ئەوەی بتوانێ بەخێومان بکات، هەر سێ چوار ڕۆژ جارێک، بەگەڵ باوکی حاشوش دەکەوت؛ دەچوون، نازانم لەکام گوندی نزیک ئاواییەکە، تووریان دەکڕی و دەهاتنەوە لە ئاواییەکە دەیانفرۆشتەوە.

منیش، هەموو بەیانییەک، لەگەڵ حاشووش، دەچووین لە زەلکاوێکی پیسی دووره دەستی ئاواییەکەدا، کە هەمیشە پڕ بوو لەمێش و مەگەز، ماسی جۆرپەجۆرمان دەگرت، دەهاتینەوەو لە ئاواییەکەدا دەمان فرۆشتنەوە. ئێوارانیش، لەگەڵ حاشووش و منداڵە عەرەبەکانی دیکەی ئاوایی، دەچووین لەنزیک ماڵی حاشووش، لە چۆڵەوانییەکی وشک و برینگدا، کە تەنیا چەند بڕکە خورمایەکی لێ بوو وشەوان حوشترەکانیان لەژێر دەبەستنەوە؛ یاریی فوتبۆڵێنمان دەکرد.

من زۆر حەزم لە فوتبۆڵێن دەکرد. هەمیشە نەخشەیەکی یاریکردنی فوتبۆڵێنم لەباخەڵ بوو. ناوی هەموو منداڵە یاریکەرەکانم لەسەر نووسیبوو؛ شوێن و ڕۆڵی هەر یەکێکیانم بەهێماو هێڵی جۆراو جۆرەوە، لەسەر تیکەی کاغەزێک دەستنیشان کردبوو: «هجوم»، «دیفاع»، «هەدەف». گەلێک ئێواران، کاتێ لەفوتبۆڵێن شەکەت دەبووین و شەوباڵی تاریکی خۆی بەسەر بیابانەکەدا رادەکێشا، ئیتر لەگەڵ حاشووش بەیەکەوە دەچووینەوە ماڵی حاشووش. گەلێک شەوانیش هەر لەماڵی ئەوان دەمامەوە و دەخەوتم.

دایکم پێی خۆش بوو کە من لەگەڵ منداڵە عەرەبەکانی ئەوێ یاریی فوتبۆڵێن دەکەم. دەیگوت:

- بەڵکو لەگەڵ منداڵە عارەبەکان فێری عارەبی دەبێ.

بەڵام باوکم، جارێکیان - بەم دواییە- خۆی لێ توورە کردم، وتی:

- بەناخێری گیانت کە لە فوتبۆڵێن تەواو دەبی، شەوان بۆخەوتن وەرەوە کاولبووەکەی خۆت؛ مەچۆرە ماڵە عارەبان!

- بابە، ئاخر، کە تاریک دادێ، دەترسێم بەو بیابانەدا بگەڕێمەوە ماڵەوە.

- چاوت دەردەهات. دەکەواتە واز لە فوتبۆڵێن بێنە!

«باوکم راستی دەکرد! ئەگەر ئەو ئێوارەیە، لەدوای فوتبۆڵێن بگەڕامایەوە ماڵی خۆمان و شەو لەماڵی حاشووش نەنووستمایە، ئێستر لە دایک و باوکم دانەدەبڕام؛ تووشی ئەم چورتەو ئەم بەدبەختییەی ئێستا نەدەهاتم! خەتای خۆم بوو. ئا». لەژوورە شێدارو تاریکەکەدا، دڵم خەریک بوو شەقی دەبرد. لە درزێکی دەرگاکەوە تەماشای دەرەوەم دەکرد، بیرم لە دایکم دەکردەوە، لە خوشکە بچکۆڵە خنجیلانەکەم. دەترسام لەم ماوەیەی ئێستادا، کە من لە ژوورە زیندان ئاسایەدا ڕاگیراوم، ماڵەوەمان سواری زیلی عەسکەری بکەن و رایانپێچن بەرەو ئێران یان بەرەو سنوورەکانی نوردن؛ ئیدی جارێکی دیکە، هەرگیزاو هەرگیز نەیانبینمەوە!

ئەو ژوورە زیندان ئاسایەی کە منیان تێدا ڕاگرتبوو؛ سەیتەرەیەکی پۆلیس بوو، پاێزگاری ئەو ناوچەیەی بیابانەکەی دەکرد. تەنیا نیو سەعاتێک لە ماڵی خۆمانەوە دوور بوو. ژوورێکی فراوانی شەش پاڵوویی بوو: تاریک، شێدار، گەرم، بۆنی مێزو باینجانی لێدەهات؛ دیوارەکانی بە بلۆک و بەرد «هەندێ شوێنیشی بە تەنەکەو بەرمیل» دروستکرابوون. ئەو بەیانییە، خۆر تازە خەریک بوو گزنگی دەدا. من زوو ماڵی حاشووشم بەجێ هێشت. بەناخێری گیانم، وتم «با ڕێگاکە قەدبڕ ببڕم و بەلای سەیتەرەکەدا بگەڕێمەوە». کەچی کە گەیشتمە لای سەیتەرەکە، پۆلیسە عارەبەکە لەوبەردەوە، هەر کە چاوی بەمن کەوت «وەک ئەوەی بەدرێژایی هەموو ژیانی، هەرگیز لەو بیابانەدا هیچ بەیانییەک چاوی بەشەڕ نەکەوتبێ» تفەنگەکەی سوار کردو لە دوورەوە لوولەی تفەنگەکەی ئاراستە کردم؛ هاواری کرد:

«ئۆگەف!».

«ئاخرر چیم کردووە؟». «سەیرە!». «وا دووسەعات زیاترە»؛ «بۆچی منیان لەو ژوورەدا ڕاگرتووە؟!، تاوانم چییە؟». لەوە زیاتر خۆم پێ ڕانەگیرا، دەرگاکەم لاداو چوومە دەرەوە؛ کە گەیشتمە بەردەرگاکە، پۆلیسەکە یەکسەر تفەنگەکەی لەشیان کردەوەو ڕووبەڕووم هات. خۆی لێم گیف کردەوە، بە عارەبییەکی جلفی شیراندی:

- هەتیو، پێت دەڵێم بچۆ ژوورەوە!».

لە شیراندنەکەی نەترسام، بەڵام لەحەژمەتی غەمی ماڵەوەمان، ئازارێکی سەخت بە ڕۆحمدا دەگەڕا؛ زمانی قڵیشاندم:

- دایک و باوکم. ماڵەوەمان!

- ماڵەوەتان چی؟

- دەڕۆن، بەجێم دێڵن.

وەک ئەوەی گاڵتەم پێ بکا، لاساییمی کردەوە:

- بۆکوێ دەڕۆن؟

- ڕاماندەگوێزنەوە؟

بەهەمان شێواز:

کێ ڕاتاندەگوێزێتەوە؟

دەستم بەگریان کرد:

- حوکمەت. حوکمەت ڕاماندەگوێزێتەوە؟

- بەرەو کوێ؟

- بۆ ئێران.

- درۆ دەکەی، پێشتریش ئەمەت گوت.

- درۆ ناکەم، بەخوا ڕاماندەگوێزنەوە. نازانم بەرەو کوێ!

بەبێباکییەوە وتی:

- بچۆرە ژوورەوە، چاوەڕێ کە!

دەمزانی کە دیسان مەبەستی ئەوەبوو چاوەڕێی «رەئیس» بکەم. «رەئیسیش لە ژوورەوە خەوتبوو»، دەبووایە چاوەڕێ بکەم

تا لەخەو هەڵدەستێ و بۆخۆی لێم دەپرسێتەوە! لەبەردەم دەرگای ژوورەکەدا، دیسان رووم کردەوە پۆلیسەکە، بەچاو داوام لێی کرد بەزەیی پێمدا بێتەوە، دەستم بۆ ژوورەوە درێژکرد، وتم:

- خەوتووە.

وتی: کێ خەوتووە؟

وتم: «رەئیس».

وتی: چاوەڕێ کە، تا خەبەری دەبێتەوە!

وتم: هەڵی بستێنم؟

تەنگاو بوو:

- نەء. نەکەی! خۆی خەبەری دەبێتەوە.

لالامەوە:

- ئاخر، خەبەری نابێتەوە.

تووڕە بوو هاواری کرد:

- دەڵێم «بچۆرە ژوورەوە!»، کەرباب.

لەودەمەدا، پۆلیسێکی دیکە، کە من پێشتر نەمبینیبوو (دیار بوو تازە هاتبووە لای ئەو پۆلیسەی هاوڕێی) دیتم: لەسەر چیچکان، تفەنگەکەی لەنێوان قاچەکانیدا راگرتبوو، پشتی بەدیوار دابوو؛ هەڵسایەوەو بەرەو لای دەرگاکە هات؛ رووی کردە من:

- باشە ئێوە نەفی نەکراونەتە ئێرە؟

بەقسەی ئەوپۆلیسە دڵم خۆش داهات، وتم:

- با.

وتی:

- ئەدی چۆن دەڵێی رامان دەگوێزنەوە.

دیسان رامانده‌گوێزنەوە.

- ئێوە بەئەسڵ خەڵکی کوێن؟

- مێرگەسوور.

- راتان دەگوێزنەوە بەرەو کوێ؟

گریام، وتم:

- نازانم..!

لەناکاو ئەویش تووڕە بوو، وتی:

- ئەدی بەم بەیانییە زووە لە کوێ بووی؟ خەڵک بەم سبەینەی ساڵحان لەو سەحرایە چی دەکا!

بواری وەڵامدانەوەی نەدامێ. دەم و دەست کاغەزێکی بۆری گرمۆڵەوەبووی لە باخەڵی خۆی دەرهێنا. دیتم، کاغەزەکەی خۆم بوو «ئەو کاغەزەی نەخشەی یاریکردنی فوتبۆڵێنم لەسەر دروست کردبوو، پۆلیسەکەی پێشوو لێی سەندبووم و دابووی بە ئەو». کاغەزەکەی پیشان دام و بەدەنگێکی تووڕەی ناقۆڵاوە وتی:

- ئەم کاغەزە چییە پێت؟ ها!

پاشان تفەنگەکەی شانی هەڵخزاندە پشتییەوەو توند قۆڵی گرتم، وتی:

- تۆ جاسووسیت.

رایکێشامە لای خۆی. دانوشتایەوە سەرم، کاغەزەکەی لە رووم نزیک کردەوە. پەنجە زۆر درێژە قەڵشتاوییەکانی خستە سەر هەندێ شوێنی ناو «نەخشەکە»، بە پەشۆکانێکی لە رادەبەدەرەوە وتی:

- تەماشای ئەم کاغەزەی خۆت بکە! هجوم، دیفاع، هەدەف...ئەم شتانە چین لێرە نووسیوتن، ها!

من بیرم دەکردەوە، بەلامەوە زۆر سەیر بوو، دەمگوت:

- ئەم دوو پۆلیسە خۆ عارەبیشن، بەلام بۆچی لەوە تێ ناگەن کە ئەم وشانە زاراوەی یاریکردنی فوتبۆڵن!

توند گوێچکەی گرتم و سەرمی لەگەڵ بادا، سمێڵی گیف، چاویشی لێم زەق کردەوە:

- ئەم نەخشەیە چیە پێت، قسە بکە!

من گریام. ئەو وتی:

- هی تەخریباتە؟

منیش لەتاو ئازاری گوێچکەم، زۆر بەڕوونی و فراوانی وەلامم دایەوە:

- نەخشەی یاریکردنی فوتبۆڵێنە، ناوی برادەرە یاریکەرەکانمی لەسەر تۆمار کراوە.

گوێچکەی توندتر بادام، دووجاران سەرمی لەگەڵ راوەشاند:

- هەمیشە ئەم قسە نەعلەتییە دووبارە دەکەیتەوە! هجوم، هەدەف، دیفاع.. ئەمانە چین؟ هجووم بۆسەرکوێ؟ کام هەدەف؟ ئەم هەمو نیشارەتە سەیرانە چین؟ قسە بکە، تۆ جاسوسیت! ئەم هەموو ناوانە کێن کە لێرە نووسیوتن؟

منیش نەمدەزانی بڵێم چی، چاش مابووم. لەتاو بەدبەختی و ئازاری خۆم، هەر هەنسکم دەداو دەناورامەوە. لە کۆتاییدا گوێچکەمی بەردا، شانی وەرسوڕاند، پاڵێکی بەرەو ژوورەوە پێوە نام، وتی:

- بچۆ ژوورەوە، دەی؛ تا «رەئیس» خەبەری دەبێتەوە!

منیش هەر دەلالامەوە:

- ماڵەوەمان، دەڕۆن. بەجێم دێڵن.

لەژوورەوە، ناچار، بەدەم هەنسکەوە، چووم لەسەر تەنەکە ژەنگاوییە قوپاوەکە دانیشتمەوە. چارەسەری دیکەم نەبوو؛ دەبوایە چاوەڕێی ئەو پیاوە نووستووە بکەم، کە ئەوان ناویان لێ نابوو «رەئیس»: تا لەخەو هەڵدەستێ و ئەو خۆی تەحقیقم لەگەڵ بکات.

ئەم چاوەڕێکردنە درێژە بێهوودەیەم لەو زیندانە تاریکە بۆن میزاوییەدا، بەڕاستی، وردە وردە، وای لێکردم هەست بکەم کە ئەم پیاوە نووستووە «رەئیس» تاقە ئومێدو هیوایەکە بۆ ئازاد بوونی من: چونکە، کە بیرم دەکردەوە؛ دڵم خۆش دادەهات، دەمگوت: «رەئیس» لەوانەیە کابرایەکی دنیادیدەو چاو کراوەبێ، سەری لە فوتبۆڵ دەربچێت و بزانێ کە ئەم نەخشەیە، نەخشەی جاسووسی و تەخریبات نیە، بەڵکو پلانی فوتبۆڵێنە. ئەمە خوایە بەشکو بەرم بدەن و بگەمەوە ماڵ، لای دایک و باوکم!

لەژوورەکەدا سیچەنم نەدەگرت، هەر بیرم دەکردەوەو چاوم بە دەوری خۆمدا دەگێرا. ژوورەکەش هێندە تاریک بوو، هیچ شتێکم بۆ نەدەبینرا. تەنیا سێ قەرەوێڵەی کۆن (کە یەکێکیان کابرای رەئیس لەسەری نووستبوو)، ئەوانی تریش کۆمەڵێک جلوبەرگ و قایش و پۆستاڵی عەسکەرییان لەسەر فڕێدرابوو. هەروەها دوو مێزی خواری لەق کە یەکێکیان پانکەیەکی شکاوی لەسەر دانرابوو، ئەوەی دیکەشیان زەمبیلێک (وابزانم، خورمای تێدا بوو، مشک و سیسرکە تەراتێنیان بەدەوریدا دەکرد). بەخۆم دەگوت:

– سەیرە لەکازێوەی ئەم بەیانییەوە منیان لێرە راگرتووە، ئەم هەموو دەنگە دەنگە، ئەو هەموو ناڵەو فیغان و گریانەی من؛ چۆن کابرای رەئیس گوێی لە هیچ نەبووە؟ چۆن بەو هەموو دەنگە دەنگە هەر خەبەری نابێتەوە! لەسەر تەنەکە ژەنگاوییە قوپاوەکە دانیشتبووم و سەرنجی پیاوە نووستووکەم دەدا. بەتانییەکی بەخۆدا دابوو، تەنیا سمێڵ و سەرو سەکوتی بەدەرەوە بوو: بێدەنگ، بێ ئەوەی هیچ مرخەیەک یان هیچ جووڵەیەک بکا، تەنانەت هیچ نیشانەیەکی نەماندوویی، نەخەوبینین، هیچ شتێکی ژیانی بەسەر روخسارییەوە دیار نەبوو. دڵم کەوتە ختوورە، بەخۆمم گوت:

دەترسێم ئەم پیاوە لە هەردوو پۆلیسەکەی دیکەش مەندە بۆرترو کەللەڕەقتر بێت؛ چونکە رەئیسانە. خۆ لەوانەشە رەئیسی هەموو ئەم بیابانە بێت. رەئیس هەموو شتێکی لەدەست دێ، هەرچی بیەوێ دەیکا. زۆر لەوە دەترسام کە ئیتر، ئەگەر وابێت، نەک تەنیا دایک و باوکم بەجێم دێڵن و تازە ئیتر بیرای ببڕ لە ژیانمدا نەیانبینمەوە، بەڵکو تەنانەت لەکۆتاییدا سەبارەت بەم پارچە کاغەزە نەگبەتە، گوللەبارانیشم بکەن! چارەگە سەعاتێکی دیکەش هەر بەدەم ئەم دڵەراوکێ و نیگەرانییەوە کاتم بردەسەر. لەوماوەیەدا، سێ جاران دەنگی گرەگری ئۆتۆمبێلم لە دەرەوە کەوتە بەرگوێ (کە زیاتریش لە دەنگی کامیۆن و زیلی عەسکەری دەچوو)، لە دوورەوە، لەسەرەخۆ، رەت دەبوون و تێکەڵ بەدەنگی سەگوەڕێک دەبوون دەبوون. هەموو جارێک، لەگەڵ گرەگری هەر کامیۆنێکدا، دەمگوت: «ئەوەماڵی ئێمەیە»، «دایک و باوک و خوشکە بچکۆلانەکەی منە»، «رایاندەگوێزنەوە!» نەمدەزانی ئاخۆ بەرەو کوێ، بەرەو چ مەڵبەندێک، چ هەوارێک؟

تۆتکەم لێ بڕابوو، خۆم پێ رانەدەگیرا. لەناکاو، دیسان، رەپێ بوومەوە، دەرگاکەم کردەوەو چوومە دەرەوە. لەپێش دەرگاکە، تەماشام کرد: پێش دەرگاکە کەسی لێ نەبوو، چاوم بەملاو بەولای خۆمدا گێڕا، هیچ کەسێکی لێ نەمابوو. ئەو ناوە، هەر بەتەواوەتی چۆڵ وهۆڵ بوو. سێرەم گرتە دوور، دیتم: کۆمەڵێک حوشتر، لەژێر برکە خورمایەکدا بەسترابوونەوە. لەودەمەدا، لەناکاو، لەوچۆڵی و بێدەنگییە سامناکەی ئەو بیابانەی سڵەماوە؛ هەستم بەتەنیایی و نامۆبەکی کوشندە دەکرد. هات بەخەیاڵما کە رابکەم و خۆم رزگار بکەم، بەڵام بەلامەوە کارێکی پەسەندو جوان نەبوو: دەمویست هەموویان، بە رەئیسیشەوە، دڵنیا بن کە من «هیچ تاوانێکم نەکردووە» ومافی خۆمە «ئازاد» ببم. بێ ئەوەی خۆم بمەوێ، بە نائاگاییەوە «وەک ئەوەی هۆگری و کۆنە پەیوەندییەکی زۆر بەتین بەرەو لای کابرای رەئیس کێشم بکات»؛ گەڕامەوە ژوورە زندانەکەم.

چوومەوە نزیک قەرەوێڵەکەی، راوەستام. سەیری سەرو پۆتاڵاکیم دەکرد. دەستم درێژکرد، بێدەنگ، قۆڵی رەئیسم گرت و راوەشاند، وتم:

– جەنابی رەئیس!

رەئیس هیچ جووڵەیەکی لێوە نەدەهات.

جارێکی دیکەش قۆڵیم راوەشاندو بانگیم کرد:

– رەئیس، رەئیس!

کەچی، دیسانەوە هیچ جووڵەو وەڵامێکی نەبوو.

ئەمجارەیان، بەتانییەکەم لەسەری لاداو دەستیم بەرز کردەوە. کە دەستیم بەردا، بێ جووڵە، بێ گیان، بەسەر لەشیدا کەوتە خوارەوە. زانیم کە ئیتر «رەئیس» مردووە!

بەدیار مەیتەکەوە، لەو ژوورە خامۆش و تاریکەدا، خەریک بوو زەندەقم دەچوو. ویستم لە زیرە بدەم و هاوار بکەم، بەڵام نەء؛ یەکسەر رام کردە دەرەوە.

لەپێش دەرگاکەدا، دیتم لەناکاو، گەمارۆ درام: چوار پۆلیس، چوارشانە، کەتەی ڕەش؛ لەملاو لەولا، خۆیان لێم گیڤ کردبۆوە، شڵەژاو، لەسەز ئەوە بوون تەقەم لێ بکەن؛ بەەو رووم دەهاتن؛ رووی تفەنگەکانیان لەسەر سنگم بوو.من زارەترەک ببووم، بەحەپەساوییەوە سەیرم دەکردن.

ئەفەندییەکە، سەرچەناگە کوتراو، لەناوەڕاستی پۆلیسەکانەوە، کە قەرەوێتێکی شینی بەستبوو، دەم وچاو خوریکاوی، رووبەڕووم دەهات. یەکێک لەدوو پۆلیسەکانی پێشوو بەچوار پۆلیسەکەی گوت:

– بیگرن!

ئەفەندییە قەرەوێت شینەکە، گوێیەکی بڕابوو پاشماوەی برینێکی قوولیش بەنێوچەوانی چەپیەوە بوو (لە پیاوێکی منداڵبازی خوێڕی دەچوو، کە شەوێک لە خەونێکی ناخۆشدا دیبووم)، بەمۆڕەکردنێکی دوژمنانەوە، وردە، وردە، لێم دەهاتە پێشەوە. لە پۆلیسەکەی پرسی:

– خۆیەتی؟

پۆلیسەکەش گوتی:

بەڵێ، خۆیەتی.

لەودەمەدا گوێم لێ بوو، دەنگی گرەگری زیلێکی عەسکەری، هێور هێور، ئاواییەکەی بەجێ هێشت؛ دوورترو دوورتر دەکەوتەوە.

منیش، زارەترەک، گوناح؛ نەمدەتوانی تەنانەت هاواریش بکەم...

پاریس زستانی ١٩٨٩

# میوانێکی سەیر

مەریوان فەتحی کەریم



تاوێکی باش بەچاوی گـاکـرپنیـەوە لـە(کـــافـکـا)ی ورد بـۆوە، هـێـنـد بنێـسابوو..بنیادەم قرچەی بۆ لە هەناوی هەڵدەستـا، پێش ئێستـا باش نەیدەناسی، بەڵام بەو ئـەنـدێـشـی بزۆز و فــــزولی شـاعـــیـرانەی خــۆی لەنێــوان هەر وشێکی(مەسخ و قەڵا)کەیدا... هەرجاردێ بەلەونێکی وێنەی دەکـێـشـــا، واهەبوو چاوێک لەســینگی دەردەبوو و گـوێکانـی دەهاتنە سەر شانەکانی و لوتیشی دەنیشتە سـەر چەناگـەیی و سـەرە کـەچەڵەکـەشی دەستێکی ناسکی ژنانەی لێ دەڕوا... جارجارێکیش لەوی وابوو دەئەشکەوتێکی قوڵ کـەوتووە و جـووتە سـمێڵێکی لەمەڕ (سلفادۆر دالی )ی لەپشتە ملی رواون و هەرچوار پەل و تەماشا و هەناسەشیان سندم کـردوون و شمشێرەکەی (دێمـوکلێت)یشـیـــان بەتەڵێکی کلکی هێـســتـــرە عـەنکەبوتیەکەی میـرەکەی (شێخ رەزا)ی بەسەر سـەریەوە هەڵاواسیوە...

دەحاڵێکی پەرێشاندایە و ئەگبەتەی دەشڵێی بەرازە، نە هاواردەکـا ونەدەشپـارێتەوە، حـەوتەێکی خشت بەولەونەی دەمـــاوە، ئەنانی دەخـــوارد نەزاری هـێـــشـک دەبوو، وەک رەشمارانیش ئیشتیای نەدەچووە مشک و کەرسەکە گڵان، دوای حەوتێکی ئێشێکی سەیری دەتیرەغەی پشتێ دەگەڕا، لەتاوان بەرچاوی تاریک دادەهات و تەپڵــە ســەریشی بریسـکی ژانێی تێدەگـەڕا، کـەچی بەرازەی هێـشـتـاش وەک جـوانەگـای نیـرۆئامـور لەئەسـتـۆی نێـوگـۆلە مـەردزەی نەیدە بۆڕاند...هەر پسـتـێـکیـشی لێنەدەهات، لەنکاو دەبووە شەوگەرد و بڵقەددرە و کرمە لیقە و بەماتی خۆی بەلچکی پیـرە رەگـێکی بن قـولێنچکێکی ئەشکەوتێود خپ دەکـردو سندمەکانیشی هەرپێودبوون...

* * *

هێند باریک و بنێس بوو، دەتگوت نۆکـەرێکی خوێـڕیەو ئەریابەکـەی تێـر بەزگی خـۆی نانی نەداوەتێ، هەناسـەی سـوار... پێت وابوو کەروێشکێکی دەشتـیـەو حەوت تاژی رەســەن بەحـــەفت ســەعـــاتان بۆین نەگـــیـراوە، چاوە تۆقیوەکانیشی خێل ببوون نەتدەزانی لەچ تـرسـون؟ تۆ بڵێی بەزیندویی گۆڕە و شاریان دابێ؟، پێشدەچێ کەتنێکی کردبێ و عـالەمێک بەدوایەوە بن، نەکـا ژنێکی هەڵگرتبێ و شـوێن پێـیـان هەڵگرتبێ و بەستەزمانەی لێی بەجێمابێ!، ئەگـەر ئەسپێکی کەحێلی دەبوو...ژنەی لێ سواردەکردو بۆ خۆشی لەپێشەوە بەقەلەغاران وەک بای دەفڕی، چەند بەد بەختە...وێستێ بەو حـالـی شـپـرزەی... بەونیـوە شـەوەی لەدەرگـای نەدەدای.. خراپی لێ قـەوماوە!!، نەتۆش بەو مـــیــوانە ناوەخت و ناتەواوەی تەواو هێـڕ ببـوویت و (فـ ـسرۆ)ت لەسـەر زمانی رەش بۆوە...

تاوێکی باش تێـتـەوە رامـا، لەکـڵاشـە رزیوەکـانتـەوە تا چۆغـە پیناویەکـەت و جـەمـەدانیـە پرزۆڵ پرزۆڵەکـەت، لەژێر نەرمـە روناکـایی مـانگیش ئاورێکی سـەرخـۆشـانەی لە داروبەردوی خـانووە روخێنراوەکـەت دایەوە، تێگەیشت هەر تاقە وتاغێکت پێ دروست کراوەتەوە، کچۆڵەکەشت لێکدا لێکدا لە پاش تۆوە سـەرە دیقـانێـیـەکی دەکـردو توند خۆی بەپاش رانتەوە دەنوساندەوە... (کافکا)لەسەرەخۆ داهاتەوە تا مـاچێکی بکا، بەڵام ئەو سرک بوو و لەهەمـوو غـەریبـەیەک دەترسا نە خاسمە لەمیوانێکی درەنگ وەختەی ناو تاریکایی شەوێکی بەسامی پڕ لەخێو و ئایشە گوێ درێژ...

مــیــوان زۆر بەئەســپــایی کـۆڵەکـەی دانا، بەدەســتــە لەرزۆکـەکـانی باقـە کـتـێـبـێکی دەرهێناو لەبەر دەرکـەی رۆی نان، داهاتمەوەو بەزمانی بێگانان بەپیتی درشت چوار وشەی لێ نوسرابوو، دواتر پارچە قـاقـەزێکی سـیـمـینی دەرهێنا کە بەقردێلەیەکی شین لولدرابوو، بەشێنەیی ئەویشی خستە تەک باقــەکــە.. نەرمـــە خــــەندێکی لێکردم و نەمـــزانی کـێوەچوو!...رۆیشت و زمانم نەبوو فەرمووی قومە ئاوێک، پاروەنانێک، دیشلەمێکی لێ بکەم!، ئەمن بۆ خۆم پێم وابوو باقەکە چاپی تازەی دووهەزاری سەرجەمی دانراوەکانی بووبێ و لولدراوەکەش کـەرەشـەباکـە دواترفرانديە ناو کـەلاوەکـان رەنگبێ بەڵگەنامـەی نۆبڵـەکـەی بووبێ ... ئاخـر سـەر لە بەیانی ئەو شـەوەش داکی منداڵەکـان ئاگـری بە باقـەکـە کردبۆوەو دەگەڵ کۆڵە چیلکەکەی دوێنێ ناوساجیەکی بەتامی بۆ قاوەڵتی پێ کردبوون...

# جاڵجاڵۆکە نەفرەتدارەکان

ن: محەمەد محەمەدی و: قاسم محەمەد مستەفا

تاوەکو ئێستا جاڵجاڵۆکەیەکمان لە ماڵەکەمان نەدیبوو دایکی خوالێخۆشبوومان دەیوت جاڵجاڵۆکە بوونی لە ماڵدا مایەی هەژاری و دەردەسەرییە. ئێمە پێنج خوشک بووین، کە دووگیان دەبوو، ئەو جادووانەی کە دایکم بەکاری دەهێنان- لە پێناوی ئەوەی کوڕێکی ببێت و چیتر باوکم سەرکۆنەی نەکات- هیچ سودێکی نەبوو. باوکم هەمیشە بێزار دەبوو و بە دایکمی دەوت: (نامەوێت کاروباری بازرگانیم بۆ دەستێکی بێگانە بەجێبهێڵم) چەندەها جار ئەم قسەیەی دووبارە دەکردەوەو لە دواییدا ژنێکی دی هێنا. لەو رۆژەوە دایکم بەو ژنهێنانەی زانیبوو بەهۆی خەمخواردنێکی زۆرەوە نەخۆشکەوت و ملی ئەستوور بوو، رۆژ لە دوای رۆژ خراپتر دەبوو.

رۆژانی یەکەمی نەخۆشی، هەندێ چالاکی پێوە دیار بوو، هەوڵی ئەوەی دەدا نەهێڵێت نەخۆشییەکەی پێوە دیار بێت، ناچاری دەکردین رۆژانە دووجار ماڵ پاک بکەینەوەو خۆی لە بەهاراندا گوڵەکانی دەچاند. ئەو گوڵە(جیراندۆم)ەی لە باخچەکەدا چاندبووی بابەتی باسی دراوسێکانمان بوو. ناو ماڵی بە گوڵ و گوڵدان رازاندبۆوە. ڕێڕەوێکی تەسکی بە هەڵچنینی گوڵدانەکان بۆ هەموو لایەکی ماڵەکە دروست کرد بوو، هەر لە سەر بانێژەکەوە کە دەچۆوە ژووری دیوەخانەکە یا ڕێڕەوەکەی دەچۆوە لای هۆڵەکە.



لە مانگەکانی پێش ژنهێنانەکەی، باوکم ئەو ڕێڕەوەی بەکار دەهێنا کە دەچۆوە سەر دیوە خانەکە. هەر لەوێ نانی دەخوارد و شەویشی بەڕێ دەکرد. من- کە کچی گەورەی بووم-خواردنی نیوەڕۆ و ئێوارەم بۆ ئامادە دەکرد و لەسەر خوانێک بۆم پێشکەش دەکرد. دایکم مافی ئەوەی نەبوو سەر بەم ژوورەدا بکات. دوای ئەوەی باوکم ژنی هێنایەوە، ئیتر بەشەو نەدەهاتەوە لامان. هەر چەندە رۆژی جارێک دەرگاکەی دەکردەوەو دەچووە ژووری دیوەخانەکە، تەنانەت سەری بەناو ماڵەکەدا نەدەکرد. هەر لەوێوە بانگی دەکردم:

-کچەکەم لە چیتان کەمە؟

منیش هەرچی پێویستیەکمان هەبوایە پێم ڕادەگەیاند. لەم رۆژەدا یا بۆ رۆژی دووەم بە کۆڵهەڵگر پێویستیەکانمان بۆ دەهات. باوکم هەمیشە دەرگاکەی دادەخست. نەکەس دەیتوانی سەردانمان بکات و نە ئێمەش دەمانتوانی بچینە دەرەوە. گەر دایکم بۆ کارێکی گرنگ بیویستبا بچێتە دەرەوە لەسەربانەوە دەپەڕیەوە سەربانی ماڵی دراوسێکەمان ئینجا دەردەچووە دەرەوە، هەندێ جار یەکێکمانی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. بەڵام هیچ یەکێکمان بە تەنیا بێ دایکمان ئەم کارەمان نەدەکرد، چونکە ئەویش- وەک باوکم- زۆر پارێزگار بوو هەمیشە دەیگوت (شیاو نییە کچ بە تەنیا بەناو کوچەو کۆڵاندا گوزەر بکات). بەهۆی ئەوەی کە دایکمان زۆر لا خۆشەویست بوو مل کەچی فەرمانی بووین و لە ماڵ دەرنەدەچووین.

لە رۆژێکی زستانی کە بۆنی بەفر دەهات دایکم لە ئەنجامی خۆ خواردنەوەیدا مرد.

ئەمە یەکەمجارمان بوو ئەم پێنج خوشکە لە نزیکەوە کەسێکمان لا بمرێت. لە دەوری دایکمان کۆبوینەوەو هەر پێنجمان گریاین. ترس دایگرتین، لەترسی مردن نەبوو، بەڵکو بەهۆی نەمانی دایکمان بوو لێک جیابوونەوەمان زۆر گران بوو، چونکە زۆر هۆگری بووین. خوشکەکانم چاوەڕوانی ئەوە بوون شتێک بڵێم. منیش هیچم لانەبوو بیڵێم، ئەو شەوە بەسەر چوو. بۆ بەیانی باوکم هات و هەروەکو جاران لە ژووری دیوەخان زیاتر هەنگاوی نەهاویشت.

- کچەکەم چ پێویستیەکتان هەیە؟

ویستم پێی رابگەیەنم کە دایکمان مرد بەڵام هەر چەندە هەوڵمدا نەمتوانی.

- نەخێر.

باوکم رۆیشت و دەرگاکەی داخست. لە لاشەی دایکم دوور نەکەوتینەوە. شەو بێ دەنگییەکەم شکاند و بەخوشکەکانم وت: (دایکم لە باخچەکە دەشارینەوە).

بێڵ و دوو دەوەکەمان لە ژێر زەمینەکە دۆزییەوە. رۆناکییەکەی دەرەوەمان کوژاندەوەو لە بەختەوەریمان بوو شارەکە کش و مات بوو. یەک

لەدوای یەک دەستمان بەگۆڕ هەڵکەندن کرد. کە گۆڕەکە ئامادەبوو دایکمان هاویشتە ناوی و خۆڵەکەمان بەسەریدا کرد و گەڕاینەوە ژوورەکەمان، خوشکەکانم لە ترسان دەلەرزین.

وتم: (بۆ دەلەرزن؟)

- گەر باوکم پێبزانێت بە لێدان دەمانکوژێت!

هەوڵی ئەوەمدا هێوریان بکەمەوە، وتم: (مەترسن بە هیچ شێوەیەک نازانێت). بەڵام باوەڕیان نەکرد. خوشکە بچووکەکەم لە هەموویان زیاتر دەترسا گوتی: (باوکم کە بەیانی هات پێی رادەگەیەنم. دەبێ بزانێت کە چ کارەساتێکمان بەسەر هاتووە).

باوکم کە دەیویست لێمان بدات قامچییەکی لە سندوقێک دەردەهێنا کە کلیلەکەی لای خۆی بوو. رۆژێکیان کە هاتە ژووری دیوەخانەکە کلیلی سندوقەکەی پێدام و گوتی: (گەر دایکت ویستی سزاتان بدات ئەوە کلیلی سندوقەکەیە!).

هەرگیز کلیلەکەم بەدایکم نەداو لە شوێنێکم شاردەوە. چووم کلیلەکەم هێنا. سندوقەکەم کردەوەو قامچییەکەم هێناو بە قامچییەکە کەوتمە سەر لەشی خوشکەکەم.

پشتی خوشکەکەم قامچی ڕێژ کرد تاوەکو لە هۆش خۆی چوو. بەڵام خوشکەکانی دیکەم وانەیەکی چاکیان وەرگرت. ئەم شەو بەفرێکی زۆر کەوت و رووبەری باخچەکەی پۆشی. بۆ ماوەی هەفتەیەک باوکم نەهاتەوە لامان. کە هاتە لامان وەک هەمیشە لە ژووری دیوەخانەکە زیاتر هەڵنەکشاو هیچ وشەیەکی لە جاران زیاتر نەوت:

-کچم هیچ پێویستیەکتان هەیە؟

- سووتەمەنیمان نییە و خۆراکیشمان نییە.

لە ترسان هەڵدەلەرزیم. بەڵام کە لە ژوورە تاریکەکەی دیوەخانەکە وەستابوو ئەوەی تێبینی نەکرد.

بەم شێوەیە لەگەڵ خوشکەکانم لەسەر ئەم بارە راهاتین. من گەورەی ماڵەوە بووم و خوشکەکانم توانای ئەوەیان نەبوو بێ رەزامەندی من هیچ کارێک ئەنجام بدەن. هەر رۆژێک بیانویەکم دەدۆزیەوە تا لە یەکێکیان بدەم. کەس نازانێت چەند تامم لەم لێدانە وەردەگرت. هەستم بە پشوویەک دەکرد. تۆڵەم دەستاندەوە. هەمان ئەو کارەم دەکرد کە جاران باوکم لەگەڵ منی ئەنجام دەدا. خوشکەکانم مل کەچ بوون. تەنیا جیاوازیەکیان هەبوو لەگەڵ جاران ئەویش ئەوە بوو کە وەکو جاران لەگەڵم نەئاخاوتن. وەڵامی هەر پرسیارێکم یا بەڵێ یا نەخێر بوو، بۆ ئەوان بووم بە باوک. بەشەو لە ژوورەکەی باوکم دەخەوتم.

زستان کۆتایی هات، لەسەری ساڵدا باوکم هاتەلامان. ژووری دیوەخانی هەڵبڕی و هاتە ناوماڵەکە. گوڵی گوڵدانەکان وشک هەڵگەڕابوون.

-کچم ئەوە بۆ گوڵەکان وشک هەڵگەڕاون؟

-سەرما وشکی کردوون!

- ئەوە بۆ دایکتان لە ژووری گوڵەکانی نەپاراستوون؟

- نەیتوانی چونکە نەخۆش بوو.

- پێویست بوو یارمەتی بدەن و گوڵەکان بۆ ژووری گوڵان بگوازنەوە.

-داوای ئەوەی لێ نەکردبووین.

بەبانیژەکەدا هەڵگەڕاو چووە ژووری دایکم، چوار خوشکەکەم لە ژوورەکە بوون.

- ئەی کوا دایکتان؟

- خوشکەکانم وەڵامیان نەدایەوەو باوکم گەڕایەوە و رووی لێکردم.

-دایکم رۆیشت.

بە دەنگێکی نزم ورتەی لێوەهات و زانیم کە تێمنەگەیشتووە.

- وتی.. ئەو ژنە بۆ چی گۆڕستانێک چووە؟

- ئەمجارە بە دەنگێکی بەرز وەڵامم دایەوە!.

-(خاڵم هات و لەگەڵ خۆی بردی).

-کەی؟

- پێش چەند رۆژێک.

دەستی بەجنێودان کرد بە دایکم و نەفرەتی لێکرد. بێگومان لای سەیرنەبوو کە دەرچووە، چونکە دەیزانی کە هەندێ جار لەماڵی دراوسێکەمانەوە دەردەچوو.

- بۆ جەهەننەم. با بچێت بۆ هەر کوێ چووە.ئەو ژنەی بێ رێدانی مێردەکەی دەردەچێت ئیتر ژن نییە و بەژن ناژمێردرێت، نابێ بچێت. دوای ئەوەی تۆزێ هاتەوە سەرخۆ گوتی: (هیچی لەگەڵ خۆیدا نەبرد؟)

-نەخێر!

-دڵنیایت؟

-بەڵێ.

بڕوای بەقسەکانم نەکرد و خۆی لەماڵەکە گەڕاو دوای ئەوەی کە دڵنیا بوو دایکم هیچی لەگەڵ خۆیدا نەبردووە گوتی:

- گەر دایکتان گەڕایەوە ماڵەوە رێگای پێنەدەن تاوەکو خۆم کاری لەگەڵدا دەبڕێنمەوە!. وەڵامم نەدایەوەو کە ویستی ماڵەکە بەجێبهێڵێت. گوتی:

- ئاگاداری خوشکەکانت بە، ئەو قامچییەی کە لە سندوقەکەدایە خۆت خاوەنیت وگەر لە فەرمانت دەرچوون بەم قامچییە دەماریان دەربێنە. نەیدەزانی کە من خۆم کاتێکی زۆرە ئەم کارە دەکەم، بەڵام لەو شەوەی کە بەراشکاوی ئەم کارەم پێسپێردراوە زیاترم بەکار دەهێنا.

رێگام بە خوشکەکانم نەدەدا ماڵەکە پاک بکەنەوە یاخود باخچەکە ئاو بدەن. گەسکەکانم سوتاند و خۆڵەمێشەکەم لەبیرەکەدا هاویشت. شێوەی ماڵەکەمان رووی لە گۆڕان کرد. جاڵجاڵۆکە یەک لەدوای یەک روویان لە دەرکەوتن کرد. کە

پێشتر بە هیچ شێوەیەک نەدیترابوون، ماڵەکەمان پڕ بوو لە جاڵجاڵۆکە، لە چێشتخانەکەی نزیک ژێرزەمینەکە... لە ژووری زەخیرە کە لەتەنیشت ژووری دایکم بوو.. جاڵجاڵۆکەکان داوەکانیان دەتەنیەوەو لە زیادبووندا بوون. خوشکەکانم هیچ کارێکیان نەبوو تەنیا سەیرکردنی جاڵجاڵۆکەکان نەبێت و تێرامانیان، لە ڕۆژهەڵاتەوە تاوەکو ڕۆژئاوا بەم کارەوە خەریک بوون، دەمدیت بە گوێی یەکتریاندا دەچرپاند بەڵام هەرکە دیاردەکەوتم بێدەنگیان لێ دەکرد. نەمدەزانی باسی چی دەکەن بەڵام وابزانم باسی منیان دەکرد، ئیتر قسەکردنم لێ قەدەغەکردن و نەیاندەویترا چیتر قسە بکەن. ماڵەکە کرو بێ دەنگ بوو، تەنانەت لەگەڵ هیچ گۆڕستانێکدا جیاوازی نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێت کە قامچییەکەم بەرز دەکردەوە و بەسەر لەشیاندا دەباراند بۆ ماوەیەکی کەم دەنگی قامچییەکەو هاواری ئەوان دەبیسترا. تاوەکو ڕۆژێک لەکاتی نانخواردنی بەیانیدا تێبینی ئەوەم دەکرد خوشکە بچکۆلەکەم دیار نییە.

- کوا لە کوێیە؟

هیچ یەک لەسێ خوشکەکەم وەڵامیان نەدامەوە قامچییەکەم دەستدایەو کەوتمە لێدانیان بۆ ماوەی زیاتر لە نیو کاتژمێر. یەکێکیان دەستی بۆ ژێر زەمینەکە درێژ کرد، چووم بۆ ئەوێ خوشکە بچکۆلەکەم بەدی نەکرد بەڵام جاڵجاڵۆکەیەکی قەڵەو لە ساپیتەکەوە هەڵواسرابوو و پارچە پەڕۆیەکی جلی خوشکە بچوکەکەمی بە دەمەوە بوو و بەپەلە هەڵی دەپاچی. ویستم بە قامچییەکە بکەومە گیانی جاڵجاڵۆکەکە، بەڵام دەستم بۆی نەچوو... نازانم بۆچی.

بۆ ژووری باوکم گەڕامەوە. جل و بەرگی باوکم پۆشی و کڵاوەکەیم لەسەر ناو بەرگەکانی خۆم سوتاند و خۆڵەمێشەکەیم لە ژێر خۆڵەکە شاردەوە.

بۆ ڕۆژی دووەم خوشکێکی دیم ون بوو. لە دووانەکەی دیم نەدا. یەکسەر بەرەو ژێر زەمینەکە چووم و سەیرم کرد جاڵجاڵۆکەکەی دی لەتەک جاڵجاڵۆکەکەی پێشوو دوا پارچە پەڕۆی جل و بەرگی خۆی هەڵدەپاچی.

لە ڕۆژی چوارەمدا خوشکی چوارەمم ون بوو. لە ژێر زەمینەکە چوار جاڵجاڵۆکە داوەکانیان دەتەنیەوە. ساڵێک تێپەڕی باوکم بەدیار نەکەوت تاوەکو پرسیارێکمان لێبکات. بەڵام شاگردە پیرەکەی هەفتەی جارێک لە ژووری دیوەخانەکە دەوەستاو پێداویستییەکانی ماڵی بەبارهەڵگرێکەوە بۆ دەهێناین و دەڕۆیشت. لەسەری ساڵدا باوکم پەیدابوو. لە دیوەخانەکە ڕەت بوو هاتە ناوماڵەکەو سەیری کرد جل و بەرگەکانی ئەوم پۆشیوە سەروسیمای تێک چوو و توڕە بوو.

- کچم ئەوە بۆ جل و بەرگی منت پۆشیوە؟

- چونکە هیچ نەبوو بیپۆشم.

- باشە دەبوایە ئاگادارم بکەیتەوە تاوەکو جل و بەرگتان بۆ بکڕم و بۆتان بنێرم.



بەسەر بانێژەکە کەوت، دەرگای ژوورەکەی کردەوە، خوشکەکانی نەدیت.

- ئەی خوشکەکانت لە کوێن؟

- لەژێر زەمینەکەن!.

باوکم بەدوای خوشکەکانم دا چووە ژێر زەمینەکە. چوار جاڵجاڵۆکەکەم نیشاندا، لە تەنگیدا دەم و چاوی شین هەڵگەڕا.

- ئا بەم شێوەیە خوشکەکانت دەپارێزیت؟

- خۆیان ویستیان ببن بە جاڵجاڵۆکە.

دەبوایە ڕێیان پێنەدەیت، تۆ لێپرسراویان بوویت ئێستا تۆ بچۆ، قامچییەکەم بۆ هێناو فڕێمدایە ژێر پێیەکانی.

دەستی دا قامچییەکەو دەستی بە لێدانیم کرد تاوەکو جل و بەرگەکانی بەرم شەقار بە شەقار بوون. ئینجا کە تەواو بوو قامچییەکەی پێچایەوە لەنێو گیرفانیناو ماڵەکەی جێهێشت. هەڵسام بە ئاڵاندنی پارچە پەڕۆیەک بەدەوری خۆمدا چوومە ژێر زەمینەکەو لە سەرخۆ دەستم بە هەڵپاچینی پارچە پەڕۆیەکە کرد تاوەکو وەک ئەوانی دیم لێهات. نەفرەتیان لە خۆیان دەکرد چونکە کچ بوون و نەفرەتیان لەمن دەکرد چونکە کردبوومنە جاڵجاڵۆکە و منیش نەفرەتم لێدەکردن چونکە من خوشکی گەورەیان بووم.

**سەرچاوە:**

**گۆڤاری (العربي) ژ: ٤٨٢ ساڵی ١٩٩٩**

# فەزای بەتاڵ لە «شانۆی پیرۆن»

پیتر بروک/ناسر حوسێنی    و: جەواد مستەفا ستۆپەی



پێش هەر شتێک شانۆ ژیانە لەسەر ئەم بنچینەیە ئیدی هیچ شتێکی دی جێگەی گرنگی پێدانمان نیە بێجگە لەوەی کە بلێین شانۆ بەشێکە لەژیان، ئەمەیش لە فراوانترین چەمکی ئەم زاراوەیەدا.

شانۆ ژیانە، بەڵام لە هەمان کاتدا ناتوانین بلێین جیاوازی لەنێوان شانۆ و ژیان دا نیە.

مرۆڤ بۆ سەر لەنوێ دەست پێکردنەوەی ژیان بەرەو شانۆ دەڕۆن، بەڵام ئەگەر جیاوازی لەنێوان ژیان لە دەرەوەی شانۆ و ناوەوەی شانۆدا نەبێت ئەوا هونەری شانۆ بێ مانایەو پێویست بە خۆ پێوەخەریک کردن ناکات، بەڵام ئەگەر پەسەندی کەین کە ژیان لە شانۆدا زیاتر شیاوی بینین و خوێندنەوەیە وەک لە دەرەوەی شانۆدا لە ئەنجامدا پەی پێ دەبەین کە لە ڕاستیدا هەمان شت (ژیان)ە، بەڵام کەمێک جیاوازترە.

لەم قۆناغە بەدواوە دەتوانین خاڵی وردتر بژمێرین. یەکەم ئەوەیە ئەم ژیانە لە شانۆدا پوختەو بەرجەستەترە، چونکە جێگیر (متمرکز)ترە واتە کەمکردنی کارو کەمی فەزای شانۆ و کەڵەکەبوون و دڵۆپاندنی کات دەبێتە هۆی دروستبوونی ئەم جۆرە تەرکیزانە.

بۆ تاقیکردنەوە: ئایا دوو کەس لە ئێوە دەتوانن بێنە سەر شانۆ «ڕۆژباش» لە یەکتری بکەن؟ (لەنێو تەماشاکەران ژنێک و پیاوێک هەڵدەستنەوەو بەرەو ڕووی شانۆ دەڕۆن)

ژن: ڕۆژباش!

پیاو: ڕۆژباش!

بروک: تکایە جارێکی دی ئەنجامی بدەنەوە.

ژن: ڕۆژباش!

پیاو: ڕۆژباش!

بروک: زۆر جوان و دڵخۆشکەر بوو! (تەماشاکەران پێکەنین)، بەڵام ئایا دەتوانین بلێین کە ئەم پێنج چرکەیە پڕبوون لە جوانی و پوختەیی و پڕ لە چۆنایەتی و قەشەنگی کە هەر ساتێکی لەبیرنەکراو بچێنێت؟ ئەگەر لەوەڵام دا بلێین بەڵێ لە هەمان کاتدا دەڵێین ئاسایی بوو بەم شێوەیە کاری ئەنجام دراو دەگوازرێت بۆ شوێنەوارو ڕووداوێکی شانۆیی.

جیاوازی لە نێوان شانۆ و نا شانۆ نێوان ژیان لەڕووی شانۆ و ژیانی ڕۆژانەو ئەو پاڵەپەستۆیەو سنووردارکردنی شوێنی (شانۆ)و کات، لە وزەیەکی بەهێزو کاریگەرەوە سەرچاوە دەگرێت.

**یەکێک لە تایبەتمەندیە زۆر پێویستیەکانی فەزای بەتاڵ نەبوونی دیکۆرە**

هەمان توانایە کە پەیوەندی ئەلقەی لەگەڵ تەماشاکەر دێنێتە ئاراوە بۆ بەدەستهێنانی نوێیاتی، داهێنان، جوان،و بەهێزی و پێویستی بە بوونی توانایەکی هەمیشەیی و رادەبەدەری مرۆڤە.

ئەمەش چرکە لە دوای چرکەیە. ئەگەر بمانەوێت شوێنەوارێکی قوڵ و بەنرخ داهێنین لەپێش هەر شتێک دەبێت (شانۆیەکی بەتاڵ) ئامادەبکەین.

شانۆی بەتاڵ هاوکاریمان دەکات تا دیاردەیەکی نوێ بەرهەم بێنین. ئەگەر ئێوە بە وردی سەرنجی لایەنە جیاجیاکانی نمایشێکتان دابێت واتە بە هەموو ئەو شتانەی کە دەبەسترێنەوە بە ناوەڕۆک و (سوز)و جۆری هزرکردن و روونکردنەوەو چۆنیەتی قسەکردن، مۆسیقا، جوڵەکانی لەش، بیرەوەریەکان، هەڵسوکەوتەکان، یاداشتەکان و کاریگەریە دڵتەزێنەکان.. پەی پێ دەبەن کە ئایا بۆ جێبەجێکردن و بردنەپێشەوە یان تاقیکردنەوەو ئەزموونی تازەو نوێ بەپێی پێویست ئەنجام دراوە یاخود نە؟ هیچ تاقیکردنەوەو ئەزموونێکی نوێ و تازە سەر هەڵنادات مەگەر ئەوەی پێشتر فەزای بەتاڵ و پوختەو دەست لێ نەدراو ئامادەکرابێت.

یەکێک لە تایبەتمەندیە زۆر پێویستەکانی فەزای بەتاڵ نەبوونی دیکۆرە. لێرەدا باسەکە لەسەر زیاتر وە یا کەمتر یا باشتربوونیان نیە.

بێگومان من بە هیچ شێوەیەک نیازی حوکمدان و دادوەری کردنی کۆتاییم نیە، بەڵام بۆ کەمی زەمینە خۆشکردن جەخت لەسەر ئەوە دەکەم کە ئەگەر فەزاکە بەتاڵە، ئیدی دیکۆر لە ئارادا نیەو ئەگەر دیکۆر لە ئارادایە لەو شێوەیەدا ئیدی فەزا بەتاڵ نیە. هەروەک دیکۆر کارێکی دەست و پێ گیرە.

تەنانەت ئەگەر رەگەزەکان لەرادەبەدەر جوان بن کە لەم حاڵەتەدا هزروگیانی تەماشاکەر بەوەوە خەریک دەکات و رایدەکێشێت. نەبوونی دیکۆر مەرجی شوێنی گونجاوە بۆ فراوانکردنی پانتایی هزرکردن. ئامادەبوونی پسپۆڕانی هونەر لە شانۆیەکی بەتاڵدا جۆرە وەستانێکە لەبارودۆخێکی وەک ئەمە کە تاقیکردنەوەیەک

**ئامادەبوونی پسپۆڕانی هونەر لە شانۆیەکی بەتاڵدا جۆرە وەستانێکە لە بارودۆخێکی وەک ئەوە کە تاقیکردنەوەیەک ئەنجام بدرێ**

لەتاقیگەدا ئەنجام بدرێت. پشکنین و هەوڵ و بەدواداگەڕانی شتێک لەژیان و بوونیان لەژێر رووناکییەکی زۆرو گەشاوە بەمەبەستی باشتر بینینیان. کاتێ لەپێش چەند چرکەیەک بۆ دووکەس پێشنیارمان کرد کە بێن (رۆژباش) بەیەکتر بڵێین.

پانتایی هزری ئێوە بەتەواوی ئازاد بوو و ئێستا ئەگەر یەکێک لەمانە دەیگوت «رۆژباش... لیونیگستون» هزری ئێوە بەبێ درەنگ بۆ ئەفریقیاو دارستانەکانی دەفڕی...

لەلایەکی دیکەوە ئەگەر کەسی دووەم وەڵامی دەدا «رۆژباش.. میترو لە کوێیە؟». هزری ئێوە بەلایەکی دیکەوە دڕۆیشت.

مەگەر ئەوە کەسی یەکەم وەڵامی نەدابایەوە کە « میترو؟ ئێرە؟ لە جەرگەی ئەفریقیایە؟» کە بەڕاستی هەموو شت لەوانەبوو بێتەپۆش، واتە هزری ئێوە رێ بەخۆدەدا کە یەکێک لەم دوو کەسانە بە شێت بزانن.

بۆ بەرقەراربوونی پەیوەندی لەگەڵ تەماشاکەرو هاوکاریکردنی ئەو لەپانتایی فراوانبوونی جیهانێک بەڕوویدا کە پەیوەندیمان لەگەڵیان بەرقەرارە- جیهانێکی دەوڵەمەندتر، قوڵتر، دەرونیترو شاراوەتر لە ژیانی رۆژانەماندا.

دوو شێواز هەن یەکەم شێواز لەسەر رێسای «جوانی»یە بەشێکی گەورەی شانۆیەکانی رۆژهەڵات لەسەر هەمان بنچینە بونیات نراون، گەیشتن بە هزرێک لە لوتکەی گەشانەوەو سەرسامیدا. لە رێگای بەدواداچوون و بەکارهێنانی هەموو رەگەزە دیاریکراوەکانی «جوان» واقیعی. بۆ نمونە لە «کابوکی» یاخود لە «کاناکالی» لەو کاتەی کە تەماشای بەدواچونێک لە رازاندنەوەو گریەکەم دەکەی با دوا تێکۆشان کە لەبەکارهێنانی کەمترین هۆکاری شانۆوە دەبێت. ئەمانە هەموویان بەڵگەن کە «ستاتیک» دوو ئەوەندە دەکەن. ئەوان دەیانەوێت بە رێگای هەمان هەوڵ و تێکۆشانی بێ کۆتایی پوختەو بێگەرد بۆ دوور دەستیان، واتە رێگا بدات بۆ نێو سنووری «پیرۆزی»و لە ئاراستەی «جوانی»یە کە بۆ هەموو شتێک چ بە دیکۆرو چ بە مۆسیقاو چ بە

جلوبەرگ.. فۆرم و شێوە دەبەخشن و بچووکترین ئەرک و جوڵەی ئەکتەری دەبێتە (ئەتود)و تاقیکردنەوە تا جوڵەکان لە بێ نرخی و ناشرینی رووت ببنەوە.

دووەمین میتۆد کە تەواو لە خاڵی بەرامبەر میتۆدی یەکەم دایە بەم شێوەیە کە ئەکتەری ئامادە بۆ تواناکان تایبەتمەندییە لەرادە بەدەرەکان. ئەو توانایەی هەیە تا لە داهێنانەکەیدا کاتی بەستنی پەیوەندی نێوان هزرە داهێنەرانەکەی خۆی و هزری بەتوانای تەماشاکەر ئەو شتانەی دەکەونە پێش بگۆڕێت بۆ شتە ئەفسوناوی و جادوگەرانە، هزر وەک ماسولکەیەکە، بە یاریە نمایشیەکان هەڵوەشێتەوە. بۆ نمونە من ئەم مەتارە پلاستیکیە بە تاوەر (برج)ی «پیزا» گریمان دەکەم، لە گەڵیدا گەمە دەکەم کە دەیبزوێنم. بە ئارامی خواریشی دەکەمەوە، وەریدەگێڕم تا لە کۆتاییدا دەکەوێتە سەر زەوی و خراپ دەبێت..

دەتوانی هەمان فەزا لە شانۆ یاخود ئۆپێرا تەسەور بکەی و هەروەها پەسەندی بکەی کە مەتارەیەکی پلاستیکی دەتوانێت رۆڵێک بە شێوازی بەهێزترو قوڵتر لەو وێنانەی لە سینەمادا لەژێر پێ دەکەون ئەوانیش بە شێوازی جۆراوجۆرو تایبەت یاری بکات. لە سینەمادا بۆ بورجێکی واقیعی و لەرزینێکی زەوی ئاسایی و جگە لە رێگای دووبارە دروستکردنەوەی ساختمان دووبارەو دووبارەکردنەوەی چەندین جاریش دێتە ئاراوە، کە هزری ئەم ماسولکەیە کەمتر رازی دەبێت.

ئێستا تەماشا بکەین «هەم یاری کردنی تەماشاکەر» هاوتایە لەگەڵ دەرخستنە جسمانیەکەی، تێپەڕبوون بەسەر شانۆ و بەشداربوونی راستەوخۆی لەیاری گروپی هونەرمەندان. ئامادەن ک هەموو شتێک شیاوی بەدەستهێنان و توانادا بێت و ئەم شێوەیەش لە جێبەجێکردنی هەندێ جار زۆر سەرنج راکێشە، بەڵام «هاوگەمەبوون» شتێکی دیکەیە، ئەوەش بریتییە لە رێکەوتن و باوەڕبوون بەوشتەی کە لە شانۆدا تێپەڕ دەبێت و پەسەندکردنی ئەوەی کە «مەتارەی پلاستیکی» دەگۆڕێت بۆ تاوەری «پیزا». هزری ئەو جۆرە رێگاو یارییە نمایشیانە بە حەزی خۆی ئەنجامی دەدات. بە مەرجێک کە گۆڕەپانی هەستی مرۆڤ بەدوای شوێنەوە دەبێت.

خاڵی سەرەکی باسەکەمان لەوەدایە کە ئێمە (نامرئی) دەکەین بە (مرئی) هەموو شانۆیە هاوچەرخەکان لەگەڵ ئەو گریمانە گەورەیەی فرۆید ناشنان کە لەپاش هەر جوڵەیەکی سەرهەڵدراو هەر وتەیەکی گوتراو دەستەڵاتێکی بەددر لە بینین هەیە.

کە تێیدا هۆکارو هێزی بزوێنەری (من: ego)وە (منی بالا: Super ego) (بەخۆداچوونەوە)، (ویژدانی نەستی) لەلایەکی دیکەوە لەپاش هەرکرداریک و گرفتێک دەستەڵاتێکی دیکەش هەیە کە زۆر دیتن و دوورتر لە شێوازێک کە ئێمە توانای درک و کۆنترۆڵکردنمان هەیە. بۆیە هەموو ژێدەرو سەرچاوە دەوڵەمەندەکانی وزە دەگرێتەوە، کە ئێمە بەرەو (چۆنیەتی) کە ئێمە بەنادیارو بێ ئەزموون ناو دەنێین لە ژێدەرێک سەرچاوەی گرتووە کە هیچ زانیاریەک لە سروشتی دەروونیەکەیەوە لەبەر دەست نیە، بەڵام هەموومان باش لەتوانامانداية کاتێ کە ئەو لە کارەکانی خۆمان وەیا خەڵکی دی دەردەکەوێت بدۆزینەوەو دەستنیشانی بکەین، ئەویش نەک بەشێوەی «رەنگ و دەنگ»، بەڵکو بە رێگای «بێ دەنگی» دەخرێنەروو ئەگەر بمانەوێت ناوێکی لێ بنێین دەبێت بەناوێکی پیرۆزی ناوبنێین.

ئەگەر بەدوای پیرۆزیدا دەگەڕێی بڕیارو ئەزموونێکی تەواو کەسایەتییە بەو واتایەی کە ناوە بە ناوە ناکرێت ئەو یا لە هەموو ساتێک هەیە. یا بە هیچ جۆرێک بوونی نیە. واتە ئەگەر «نامرئی» ناچارو ئەرکپێدراو بە خستنەڕوو و دەرخستن نەبێت، دەتوانرێ ئەو لەهەر شوێنێ لە هەر ساتێک و بە هۆی هەر کەسێکەوە پیشان بدرێت بە بەڵگەی ئەوەی کە مەرجەکانی دەستەبەر بێت.

دڵنیابە کە ئەگەر کەسێک لێرە لەبارودۆخێکی تایبەتیداو هەروەها بوونی ئامادەباشی، پەسەندکردنێکی قوڵ و داهێنانی سەیر، لەتوانادایە ئەم مەتارەیەی ئاو لەشێوەی چۆنیەتی بگۆڕێت بۆ شتێکی «پیرۆز» ئەو شتەی کە لەبنەڕەت و سەرەتادا پیرۆز نەبووە. شانۆ بەو پەیوەندی و ناوەڕۆکەی لەنێوان مرۆڤەکاندا بەرقەراره شێوازی هەیە، وەک بە پێویست ئەم پەیوەندی و تایبەتمەندییە بەجیهانی مرۆڤایەتییەوە پەیوەندی و پسپۆری هەیە پیرۆز نیە.

جان لام لە شانۆدا ئەم رووداوە دەئافرێنێت:

دەرخستنی نامەرئی لە رێگەی مەرئیەوە کە ئەویش ژیانی مرۆڤەکانە.

**تێبینی:**

**ئەوە دەقی وتەی دەرهێنەری شانۆی بەناوبانگی ئینگلیزی «پیتر بروک»ە کە لە رۆژانی ٩-١٠ی ئاداری ١٩٩١ لە پاریس پێشکەش بەمامۆستاو بەرپرسانی هونەری (Theatre-A3) کرد وەرگێڕی فارسی ئاسری حوسێنی دەڵێت (پیتربروک) رەگەزێکی تایبەتی لە شانۆی رۆژهەڵاتی دا پەیداکردووە کە ئێمەی رۆژهەڵاتییەکان لێی بێ خەبەرین لەبەر ئەو گرنگییە ئەو بابەتەم وەرگێڕایە سەر زمانی فارسی.**

**- ژێدەر: مجله گردون شماره ٣٥-٣٦ .**

# بەردوفەنتازیا

# سێ تێڕوانینی جیا بۆ سروشت

سیروان شەریف/سلێمانی

سروشت ئەو جیهانە پڕ لەفەنتازیایەیە کە ئەفراندنی زۆرێک لەهونەرمەندانی لێوە بەرجەستە دەبێت، تاڵە ڕێگەیەوە پەی بەهەموو ئەو نهێنیانە بەرن کەستاتیکای سروشتی پێکهێناوە، پێکهاتەی ڕووی هەر بەردێک کەبەشێک لەچیایەک دروست دەکات ئاماژەیە بۆ بوونی فەلسەفەیەک لەپشتیەوە، ڕوونتربڵێین هەرکوتلەیەک لەچیایەک وەرگرین دونیایەک لەتەکنیکمان پێ دەبەخشێت. ئیدی لێرەوە بەشێوەیەکی هارمۆنی خاڵی هاوبەش لەنێوان مرۆڤ و سروشتدا گەشەدەکات. بۆ ئاستی تێکەڵ بوون لەیەکدا، تا دەگاتە ئاستی تواندنەوە. بەمانایەکی تر هونەرمەند کاتێک لەگەڵ سروشتدا ئاوێتەی یەکتردەبن بەئەستەم دەتوانێت خۆی بناسێتەوە، تادواجار ڕەنگی ڕۆحی خۆی بەڕۆحی ئەو درەختانە بناسێت کەئەبنە سەرچاوەی ئیلهامی وەک شاعیری مەزن سهراب دەڵێت «ڕەنگە نەسەبی من بچێتەوە سەرگیایەک لەهندستان» ئیدی لێرەوە شاعیر خۆی بەڕەگەزی گیایەک پۆلێن دەکات، کەمەبەست ئەوەنییە گیایەک یان درەختێک ببێتە باوان بۆ شاعیر بەڵکو ئەو تێکەڵ بوونەیە کە گەشتۆتە ئاستی تەسەوفەوە، ئەستەمە لای بتوانێت خۆی لەسروشت جیابکاتەوە وەک چۆن ئەستەمە قەرەچێک بیەوێ خێڵەکەی جێ بهێڵێ. بەدرێژایی مێژوو ئەو پەیوەندییە لەنێوان سروشت و مرۆڤدا(ئامادەیی هەبووە گەر لەزەمەنێکیشدا دابڕانێک بەدی کرابێت دواجار بووەتە سمبولێک بۆ کارکردن بەشێوەیەکی نوێ تر لەسروشتدا. لەمێژووی هونەریشدا هەر لەمرۆڤە سەرەتاییەکانەوە تا دروست بوونی ڕێبازە هونەرییە جۆربەجۆرەکان سروشت(طبیعة) ئامادەیی بەرچاوی هەبووە لەتابلۆکاندا، تادواجار لەسەردەمی ئینتباعیەکاندا(ئیمپریشن) زۆر بەزەقی سروشتی مۆنۆپۆلی تابلۆکانی کرد، وەڕەنگەکان ڕاستەوخۆ ئەو ڕەنگانە بوون کەلەسروشت وەرگیرابوون. ئیدی لێرە بەدواوە دووری (بعدی) سێیەم لەتابلۆکاندا تێکشکان. دەروازەی لەسەر بینین و چوونە ناوەوە بۆ دونیای دەربڕین داخست هەموو بەهاکان خۆیان لەلایەنی ستاتیکادا بینیەوە و ڕەنگەکان خۆیان لەبری ناوەڕۆک نمایش کرد.

ئەمڕۆش لەپانتایی هونەری شێوەکارانی کوردیدا زۆرن ئەو هونەرمەندانەی تاریکی کارەکانیان لەبەر تیشکی کڵاو ڕۆژانەی سروشتدا ڕووناک دەکەنەوە. لەم ڕۆژانەی دوایدا لەهۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی پێشانگایەکی هاوبەشی سێ هونەرمەند نمایش کرا.

پێشانگایەکی هاوبەشی هەرسێ هونەرمەند «ئیسماعیل خەیات، ڕێبوار سعید، دارۆ ڕەسوڵ»ی کۆکردبوویەوە هەرچەندە هەریەک لەهونەرمەندان بەستایلێکی تایبەت و بەتەکنیک و بەکارهێنانی کەرەستەی جیاوازەوە توانیبوویان تایبەت مەندی خۆیان بپارێزن دواتر خۆیان کردبوو بەیەک جەستەو هەریەک لەگۆشە نیگایەکەوەکە جیاواز لەوەی دی وێنەی سروشتیان کێشا بوو. لێرەدا دەمەوێت بەقەد بچووکی بینینی خۆم بۆ پێشانگا کە لێی بدوێم. لەکاردکانی هونەرمەند ئیسماعیل خەیاتەوە دەست پێ دەکەم. کەبەچەند کارێکی قەبارە جیاواز گۆشەیەکی گرنگی هۆڵەکەی ڕازاندبوویەوە، بابەتی کاردکانی لەو بینینانەوە سەرچاوەی گرتبوو کە لەڕێگەی قزقاپان دیدی هونەرمەند خۆی یان بۆ خۆیان کەمەندکێش کردبوو، لێرەدا ڕاستەوخۆ هونەرمەند تێکەڵ بەڕۆحی سروشت دەکات هەروەک لەناوی

**• لەمێژووی هونەردا هەر لەمرۆڤە سەرەتاییەکانەوە تا دروست بوونی ڕێبازە هونەرییە جۆربەجۆرەکانی سروشت ئامادەیی بەرچاوی لەتابلۆکاندا هەبووە.**

تابلۆکـانیـدا ئامـاژەی پێ کـردووە وەک یەکـێـک لەتابلۆ گرنگەکانی کەناسراوە بە«فرمێسکی سەربەرد» کەهونەرمەند هێندە شەفاف دەبێت تاناستی تێکەڵ بوون بەسروشت. لێرەدا ئیـسماعیل خەیات دەیەوێت کار لەو چەمکەدا بکات کەسۆزی خـۆی بۆ سروشت بەجۆرێ بەرجەسـتە بکات، کـەئیـدی ئەو هەست بەوناسکی و نەرمییە دەکات کەلەبەردێکدا هەیە وەک چۆن ئەمـە لەواقع دا وجـودی نیـەو تەنهـا هەسـتـێکی میتافیزیکی دەتوانێت پەی پێ بەرێت. وە رەنگە ئەمە گریانی هونەرمـەندبێت بۆ ئەو بەردانەی کـەبەشـێکن لەجـەسـتـەی چیایەک و بەهۆی یەکـێک لەرووداوە سـروشـتـیـیـەکـان یان مـرۆییـەکـانەوە لەیەک دابڕابن. چونکە هونەرمـەند کـاتێک دەگاتە ئاسـتی شوشـەیی بوون ئیـدی دەبێـتە ئۆرگـانیـزمـێک کـەتادوا پلە تێکەڵ بەڕۆحی شـتـەکـان دەبێت و دەچێـتـە نێـو تەسـەوفـەوە. یەکـێکی تر لەتابلۆکـانی بەناوی «روخـسـارێک لەخۆڵەمێش»بوو ئاشکرایە هەمیـشە خۆڵەمێش ئامـاژەیە بۆ پاشمـاوەی سـوتانی دارێک لەڕابردوودا کە هەتا دوا ئاسـتی سـوتان سـوتێنرابێت چونکە خـۆڵەمـێـش واتە پاشـمـاوەی خـەڵوزیش نەک دار لێـرەدا هونەرمـەند دەیەوێ سـزێک پێشکەش بەو دارانەبکات کە لە زستانێکی تەڕوتوشدا خۆیان کردە قوربانی ئاگر هەتا سەرما منداڵانی ئەم نیشتمانە ڕەق نەکاتەوە.

«پۆرتریتی شوانێک» یەکێکی ترە لەتابلۆکان رەنگە شوان لای هونەرمـەند ئەو مـرۆڤـەبێت کـەلەهەمـوکـەس زیاتر لەسـروشـتـەوە نزیکە، دواتر ئەو دەنگەی لەگـەرووی شمشاڵەکەیەوە دێتە دەرێ دەبێەخشێتە درەختەکان چونکە شمشاڵەکەی دەستیشی بەشێکە لەو درەختانە.ئەوەی بەگرنگی دەزانم ئاماژەی پێبکەم کەهەریەکە لەتابلۆکان ئەدمۆسفێرێکی تایبـەت بەخـۆی هەیە کـەتاکـە رەنگێـک خـۆی بڵاوکـردۆتەوە بەسـەر پانتایی تابلۆکـەدا. لەم چەشنەکارکردنەدا هونەرمەند دەیەوێت خێـراتر ئەو (اجـوایە) ئەدمۆسـفێـرە دروست بکات کەلای خۆی بەرجەستە بووە. وەئەو کەرەستانەی بەکاریهێناون وەک «باستیلی وشک، باستیلی چەور، زەیت، قەڵەم رەنگ» بەسـود وەرگـرتن لەبەکـارهێنانی ئەم کـەرەسـتـانە بەشـێک لەتابلۆکە و جۆرێک لەتەکنیک بخوڵقێنن.

گـەر بەخـێـراتر چاوبگێـرین تابلۆیەکی تر دەبینین بەناوی«قەدی درەختێک» کە چوارچێوەی تابلۆکە لەشێوەی قەدی درەختێکی خاوەن ئەزموون دەچێت، قەدی درەختێک کەدەم و چاوی لەسەرە ئیدی هونەرمەند زۆر بەروونی دەیەوێ پێمان بڵێت کەدارەکانیش ڕۆحیـان هەیەو دەمان بینن لەو هەموو تاوانە خۆش نابن کە دەرهەقیان دەکرێت، روونتربڵێت رەنگە ئەم تێـروانینەی هونەرمـەند لەو ئەفـسـانەیەوە هاتبێ«کاکەییـەکان لایان وایە درەختەکـان ڕۆحیـان هەیە و دەیانبینن و بەردەوام تەماشایان دەکەن».



هەریەک لەو تابلۆیانەی ئامـاژەمـان پێکرد رەنگە لەچوارچێوەی کۆمـەڵێک خاڵی هاوبەشدا بسوڕێنەوە. بەڵام هونەرمـەند لێـرە بەدواوە نیگامـان لەسـەر دیوارەکـانەوە دەگوێزێتەوە بۆ زەویەکەی بەردەمان کە لەم کارەیدا هونەرمەند ئیـسمـاعیل خەیات توانیویەتی تەجاوزی کارەکانی دیکەی بکات تابلۆی «شمشێرێکی کۆن» خۆیان پێ ئاشنادەکات، شمشێر ئەوکەرەستەیەیە جگە لەوەی لەجەنگدا بەکـارهێنراوە هەمـیـشـە لەدونیـای راوشکاریدا ئامـادەیی هەبووە.

رەنگە لەو سـەردەمـەدا بایەخدارترین کـەرەسـتـە بووبێت کەهەمیشە لەمرۆڤ جیانەبۆتەوە هونەرمەند دەیەوێ لەئێـستای دونیای تەکنەلۆژیادا جارێکی دی نرخ بداتەوە بەوکەرەستەیە. شمشێرێکی کۆن کەلەتەنەکەی کۆن پێکهاتووەو بەدەوریدا خەڵوزو بەرد دانراوە، بەکارهێنانی خەڵوز لەم کارەدا ئاماژەیە بۆ مـێژوو بۆ زەمـەنێکی دوور کـەدابڕانە لەدونیـای ئێـستـە. دواجـار بەرد رەنگە لای هونەرمـەند وەک شـێـوازێکی تحدی مـانەوەی شـتـە کـۆنەکـانمان بۆ بسـەلمێنێ یان وەک خـاڵێکی پەیوەندی لەنێـوان ئەم کـارەوکـارەکـانی دیکەدا. ئیـدی لێـرەوە کـارەکانی ئیـسمـاعیل خـەیات بەجێ دەهێڵین و نیگامـان ئاراستەی گۆشـەیەکی دیکەی هۆڵەکە دەکەین کەبەتابلۆکانی



هونەرمەند ڕێبوار سعیدی نەخشێنرابوو کەردنگی گەش و سەرنج ڕاکێش خاڵی ناسینەوەی کارەکانی ئەو بوون، هونەرمەند بەدەر لەشێوازە تەقلیدییەکان لەسەز قەدی داردکان کاری کردبوو، بۆ ئەوەی زیاتر لەگەڵ رۆحی رابردوودا بکەوێتە دایەلۆگ، راستەوخۆ داردکان دەهێنێتە مۆزەخانەود گەر بەگشتی نیگامان ئاڕاستەی قەدی داردکان بکەین کەودک تابلۆ نەخێشێنراون بەشێوەیەکی ستوونی لەدارستانێکی پڕ لەداستان دەچێت فیگەری ناوتابلۆکان ددبنە کاراکتەری نێو ئەو جەنگەڵە. روونتر بڵێین گواستنەوەی ئەدمۆسفێری سروشتە بۆ نێو مۆزدخانەود بەکارهێنانی ئەو ردنگانەی ددبنە سمبول بۆ بنیات نانی کاردکانی. دواتر ئاشکرا کردنی چەمکی پێکەود بەستنەوەی فیگەر بەسروشتەود، رەنگە لای ڕێبوار بەتەنها ردهایی ددستەبەر ناکات بەڵکو هاوکات فیگەریش ئەو وەزیفەیە لەئەستۆ دەگرێت. ئەمە پێچەوانەی کارەکانی هونەرمەند دارۆ ردسوڵە کەفیگەر وەکو پێویست ئامادەییە بگرە (ابستراکت) روتبونەود دەبێتە شوناسی کاردکانی، رووتبوونەود بەو مانایە نایەت کە دابڕان بێت لەرۆحی بابەتەکان بەڵکو هەموو ردهاییەک دەگەرێتەوە بۆ ردنگ و بەکارهێنانی تەکنیک کە دارۆ گرنگی بەم چەمکەیان ددات. ملمسی زبر لەتابلۆکاندا هەمان پێناسەمان بۆ دەکات کەلەسەر روی بەردێک دەیخوێنینەود، دەکرێت بڵێین دارۆ ردسوڵ ئیلهامی لەبەرد وەرگرتوود بۆ کاردکانی هەرودک چۆن ئیسماعیل خەیات فرمێسکی سەربەرددکان ددبینێ ردنگە هەموکاردکانی دارۆ بەشێک لەچیایەک دروست بکەن لەهەمان کاتدا هەرتابلۆیەک جیهانێکی لەئەفراندن خوڵقاندبێت. لەکارەکانیدا ردنگی ردش و سپی زۆر زدق دەکاتەوە وەک ئەوەی بیەوێ لەدوو چەمکی زۆر دژوار بدوێ، نێگەتیڤ و پۆزەتیڤ دواتر دوورنییە ردنگ دانەودی ئەو کەلتوورەبێت کەدارۆی تێدادژی لەگەڵ بەستنەودی بەکەلتوری کوردی کەردنگە لەبەراوردکاریدا زۆر دژ بەیەک دەربچن. هەروەک لەناوی کارەکانیدا ئاماژەی پێدەکات «کۆچی چاوەڕوان نەکراو» واتازانم کەئەم ناود بەم ردهەندە قوڵەوە تەنها مەبەست لەو گەشتەی قزقاپان بێت، بەڵکو ئەمە کۆچی مرۆڤی گەلی کوردەو خۆدانە ددست قەدەر کۆچی عەقڵی رۆشنبیرو هونەرمەندە بەرەو نادیار هەرودک لەفیگەردکانی ڕێبواردا دەردەکەوێت. لەدوایدا بەم جیاوازی کارکردنەوە هەرسێ هونەرمەند یەک دەگرنەودو ددبنەوە بەیەک جەستە کەلەتابلۆیەکی هاوبەشدا دەردەکەوێت، ئیدی لەتابلۆیەکدا سێ هەست و سێ شێوازی کارکردنی جیاواز ئاوێتەی یەکتر دەبن. وەکردنەودی وەهاپێشانگایەک لەهۆڵ مۆزەخانە لەهەمان کاتدا دەبێتە خاڵی کۆتایی پڕۆژدیی قزقاپان چونکە پەیوەندییەک هەیە لەنێوان قزقاپان تاهۆڵی مۆزەخانە ئەویش ئەو بینینانەیەکە لەو نێوەندەدا نیگای هونەرمەندیان کۆکردۆتەود ئیدی لێردود پێویستە ئاماژە بەودبکەین کەهەرسێ هونەرمەند هەریەک لەروئیایەکی جیاوازەود بەئەفراندنێکی دڵخۆشکەردود کاریان لەسروشتدا کردەوە. دواجار بێشکەیەکی ردنگین خەونی هەرسێ هونەرمەندی لەخۆگرتوود...!

**• بابەتی کارەکانی ئیسماعیل خەیات لەو بینینانەوە سەرچاوە دەگرێ کە لەڕێگەی قزقاپان دیدی هونەرمەندیان بۆ خۆیان کەمەند کێش کردووە.**



# ئۆرسۆن وێلزی ئەفسونبازی سینەما

و/سالار سامان



**وێلز ئەو داهێنەرە مەزنە بوو کەوا زۆربەی سینەماکاران بەشێوەیەکی بەرچاو پێی سەرسام ببوون. تەنانەت خواستەکانی لەپرۆسەی ئەفراندندا ببووە مایەی وروژاندنی ترس و پرسین. بەرهەم هێنەرەکان بەوپەڕی ڕێزەوە لەبارەی ڕابردووی ئەوبلیمەتە دەدوان.**

ئەو هونەرمەندە داهێنەرە جارێ لەتەمەنی پازدە سالیدا لای ئەدابوو کەچی دەیتوانی کارەکانی شکسپیر نمایش بکات. هەروا تەمەنی بیست سالان بوو، بووە بەرهەمهێنەری بەرنامەی ئێستگەیەک کەوا ئەندێشەکانی ڕەهەندێکی ریالیزمیان پێ دەبەخشی. لەتەمەنی ٢٦ سالیدا زۆر سەرکەوتوانە چووە ناو سینەمای ئەمریکی بەفلیمی «کین، هاونیشتمانیەکە». ئەو مرۆیانەی کە بەبلیمەت دانراون زۆر دەگمەنن، وێلز یەکێکە لەوانە کە ئەوسەرکەوتنەی بەدەستهێناوە. هەرچەندە ئەو ئەفسونبازە بەهەردارە ژیانی بەرهەمهێنانی فیلمە پروپاگەندەییە بچروکەکان کۆتایی پێهات. هەروا چەند فلیمێکی ناتەواوی بۆ بەجێهێشترین کەوا هەرگیز روناکی نابینن. لەمیانی ئەمانەدا فلیمی «دۆن کیشۆت» کە لەتەمەنی ٢٧سالیدا دەستی کردبوو بەوێنەگرتنی.

ئۆرسۆن وێلزی بلیمەت کەوا بوونی خۆی سەپاندبووە سەر هۆلیۆد، بەومەبەستە چووە ناو جیهانی سینەما کە سیمایەکی شۆڕشگێڕانەی بخاتەسەر. لەکاتی یەکەم ئەفراندنیەوە پێش وێنەگرتنی «کین، هاونیشتمانیەکە» چەند ڕۆژێک لەیەکێک لەهۆلەکانی نمایشکردندا بۆبینینی کارە جوانەکانی سینەمای بێ دەنگ خۆی کەنارگیر کردبوو. ئەوشانۆکارە هەلسا بەتۆمار کردنی موجیزەکانی کامێرا بەمەبەستی دووپاتکردنەوەی کارپێکردنی لەفیلمەکاندا «کین هاونیشتمانیەکە» و «وەرشەی بنەمالەی ئەمبرسۆن» مۆرکێکی وایان بەخۆوە گرتبوو کە زۆر ئەستەمە جەماوەر لەقۆناغێکی زوودا لێی بگات، بەڵام لەدوایدا گۆڕانکاریەکی تەواو لەشێوازەکانی بینرا. چونکە تیۆرەکانی لەوێنەگرتنی بەرەوژوور «لەخوارەوە بۆسەرەوە» وبەکارهێنانی بۆوێنەگرتنی هاوێنەیی خەست وێنەکانی زۆر بەڕوونی دەردەخست.

ئەوگرتە یەک لەدوای یەکانەی کە جولانەوەی کامێرا بەبێ پەنابردن بۆ مونتاژ دەیهێنێتە ئاراوە، فرە چەشنکردنی مەزنمان لەگۆشەکانا بۆدابین دەکات. هەموو ئەو نوێکاریەش دەتوانرێ بەشۆڕشێک دابنرێ بەڕادەیەک هەموو دەرهێنەرەکانی دوای وێلز خوویان پێوەگرتبوو. ئەوەش بۆ ئاردزووە سەرەتاییەکانی ئەکتەرە شکسپیریەکەی جاران دەگەڕێتەوە.

لەگەڵ فیلمی «گەوجایەتی» کە بەپێی ئاردزووەکانی خۆی ئەخشەی بۆکێشابوو.

ئەو فیلمە باسی چیرۆکی گاڵتەجاڕێکی بلیمەتی هاوڕێی یەکێک لەپاشاکان دەکات. کە پاشایەکە خیانەت لەگەڵ هاوڕێیەکەی دەکات وەک چۆن نێوەندەکانی سینەما خیانەتیان لەگەڵ وێلز کرد. گەورەترین خەونی ئەوەبوو وێنەی «پاشالیر» بکێشێ کە ئەوەش شانۆنامەیەکی تردو تەنیایی و شێتبوون دەنوێنێ.

ژیانی منداڵیتی ئەم سینەماکارە مەزنە زۆر سەیروسەمەرە بوو. ئەویش کە لەتەمەنی سێ سالیدا دەیتوانی هەندێ لەبڕگەکانی شانۆنامەی «خەونی شەوێکی هاوین» بخوێنێتەوە هەر لەوسالەشدا بووە پەرۆشی شانۆ. لەبەر ئەوەی باوک ودایکی یەکێک بوون لەوانەی کە شارەزای ناودارانی نێوەندی هونەری بوون وەک: ستراڤنسکی وئەرفیل، هەر بۆیە منداڵەکانی خۆیان هان دەدا بۆئەوەی توانای هونەریان پێشکەوێت. زۆر دەگمەن منداڵەکانیان

**وێلزی بلیمەت بوونی خۆی سەپاندبووە سەر هۆلیۆد، بەو مەبەستە چووە ناو بەهای سینەما کە سیمایەکی شۆڕشگێڕانەی بخاتەسەر.**

**وێڵز کە وازی لە خوێندن هێنا. زۆرشت فێربوو دەیتوانی پارچەیەکی تەواو لە نووسینەکانی (مونتێنی) لەبەر بخوێنێتەوە.**

دەنارده قوتابخانه چونکه پێیان باشتربوو لەبریتی ئەوە وانەکانی هونەری نیگارکێشی وپیانۆو کەمانچەیان پێ بدەن. هەروا لەلای خێزانەکەیان شتێکی ئاشکرابوو کە ئەو منداڵەبچووکە دەبێتە بلیمەت. لەلایەکی تردوە ئەو منداڵە زۆر لەدەست دیاردەی نەخۆشی دەیناڵاند لەمیانی ئەمانەدا تووشی نەخۆشی تەنگەهەناسەبوو. ئەو سنبەرەی باڵی بەسە منداڵیتی وێلز کێشابوو زۆر لەوە دەچوو کە مۆزارت پێی گیرۆدە ببوو. تەنانەت پیاتریسی دایکیشی تووشی نەخۆشیەک دەبێت کە ئەو منداڵە بچکۆلانەیە گومانی ئەوەی دەکرد کە ئەم تاوە یا تاوێکی تر لێی ون دەبێت. بەڵێ ئەوشتەی کەلێی دەترسا روویدا ئەوکاتەش تەمەنی دەساڵان بوو کەوا دایکی بەیەکجاری ماڵئاوایی لێکرد. (دەک)ی باوکی بۆگەشتێکی جیهانی لەگەڵ خۆیدابردی، چوون بۆ ئەوروپاو دوورگەی ئەنتیل و ئاسیاو شنگهای لە وڵاتی چین.. لە پاریسدا «هۆدینی» دەبینێ کە گەورەترین جادووکەری ئەوچەرخەبوو. لەکاتی گەڕانەوەیدا لەتەمەنی ١٣ ساڵیدا «دادابرنشتین»ی کۆنە یاری پیاتریسی دایکی ئەرکی رۆشنبیرکردن وتۆمارکردنی لەقوتابخانەی «تود»ی گرتە ئەستۆی خۆی کە سەرکەوتنێکی شانۆیی تێدا بەدیهێنا، لەوێدا چاپی یەکەمی لەچاپکراوەکانی کە تایبەتە بەشانۆی شکسپیرەوە دەرچواند بەناوی «شکسپیر بۆهەموانە» توانی بیست هەزاردانە لەوچاپکراوە بفرۆشێت. ئەوەش بەڕاستی سەرکەوتنێکی درەوشاوەبوو، یەکەمین هەنگاوی پەیژەی سەرکەوتنەکانی بوو، ئەوکاتەی ئۆرسۆن وێلز وازی لەخوێندن هێنا فێرە زۆر شت ببوو. بۆنموونە.. دەیتوانی پارچەیەکی تەواو لەنووسینەکانی نووسەری بەناوبانگی فەرەنسی «مونتێنی» لەبەر بخوێنێتەوە. یان هەڵسێت بەدەرهێنانی گرتەی سینەمایی ئەفسووناوی لەکۆمەڵێک شانۆگەریدا چەند



رۆڵێک ببینێت. هەروا توانای نەخشەکێشانی دیکۆری شانۆیی هەبوو، لەکۆتاییدا لەمیانی ئەم هەموو تایبەتمەندیانەدا شانۆی هەڵبژارد. کەگەیشتە تەمەنی بیست ساڵانەوە بووە ئەستێرەیەک لەشانۆی کۆرنیل. لە٢١ ساڵیدا لەشانۆی لافاییت نمایشی «ماکیشە»ی کرد وەک بەندەی قوڵەڕەشەکان بێت. کە ئەو نمایشە دەستەیەک لەئەستێرە رەش پێستەکان پێشکەشیان کرد. دوای ساڵێک تیپەشانۆییەتایبەتیەکەی لەشانۆی میرکوری پێکهێنا، هەروا کەسایەتیەکی نوێی بۆ«یۆلیۆس قەیسەر» داهێنا ئەویش شێوەی مۆسۆلینی فاشیستی ئیتالی خستەسەر. ئەوکاتەی تەمەنی گەیشتە ٢٢ ساڵ دەنگدانەوەی گەیشتە پلەیەک گەورەترین ئێسگەی پەخشی ئەمریکی پێشبڕکێی ئەوە بکەن بۆخۆیان رایبکێشن، هەروا لێرەدا توانی زۆرشت بکات، بەرنامەیەکی تایبەتی بۆمنداڵانی پێشکەشکرد، زنجیرەی پۆلیسی پڕ لەڕووداوو ڕووبەڕوو بوونەوەو سەرنج راکێشەری دەرهێنا.

هەرچەندە سەرکەوتنە زۆر درەوشاوەکان لەلای ئێسگەی (A.B.C) و (N.B.C)ی ئەمریکی بوون کەتوانی بەهۆی ئەوتوانایەی سەرکەوتنەکان لەئامادەکردنی کارە جوانەکانی وێژەی جیهانی بەدەستبهێنێ. دوای «بێ نەوایەکان» لە ٣٠ / ١٠ / ١٩٣٨ نووسراوە بەناوبانگەکەی «جەنگی جیهانەکان» - «H.Gwells» ی نووسەری دەرهێنا. هەرئەوەش بوو وای لەهۆلیوود کرد خۆیداتە دەست توانایە مەزنەکەی و لەگەڵیدا کاربکات.

«ریتا هیوارس» هەر لەوکاتەی رۆڵی «لەجیلدا»دا بینی، جوانی وخرۆشانی زایەندی بەرجەستەکردەوە. بەڵام وێلز لەدوای فلیمی «کین، هاونیشتمانیەکە» پیاوێکی زۆر زیرەک بوو لەسینەمای ئەمریکیدا..زەمەن وای ئارەزووکرد کەوا ئۆرسۆن وێلز ریتا هیوارس بکاتە هاوسەری خۆی ئەویش لەئەنجامی ئەوگرەوەی لەنێوان «جیف کرنون»ی هاوڕێ ئەکتەرەکەی کە پەیمانی ئەوەی دابوو هەرکاتێ توانی لەجوانترین کچی جیهان نزیک بێتەوەو بیکاتە هاوسەری خۆی هەزار دۆلاری پێ بدات.. وادەکەی بەتەواوی بەجێهێنا کاتێ «ریتا»ی لەیەکێک لە نمایشە ئەفسووناوییەکانی بەناوی «میرکۆری وندشو» بوو بینی، توانی بۆلای خۆی راکێشێ لە ٧ / ٩ / ١٩٤٣ کردیە هاوسەری خۆی، هەرچەندە ژیانی هاوسەریان زۆری نەخایەند.

وێڕای لەدایک بوونی «ریکا»ی کچۆڵەیان. هەوڵیان دا سەر لەنوێ بگەڕێنەوە بۆمانگی هەنگوین کەوا لەمەکسیکۆسیتی بەتەواوی کۆتایی پێهات. ریتا هیوارس دەیگوت «مرۆڤ ناتوانێت لەگەڵ بلیمەتاندا بژیت».. بەپێی ئەوشتەی کە پەیوەستە بەفلیمی «خانمی شنگهای» لەنۆژەنەوە ئۆرسۆن وێلز خۆی بەجوانناس دانایەوە. ئەوکەسانەی هەڵبژاردبوون کە رۆڵی «ئلزا» ببینن بوونە بەشێک لەڕێبازی

هۆلیۆد. ریتاهیوارس لەوساتەدا لەڕیزی یەکەمینی خانمە ئەکتەرە سەرنج ڕاکێشەرەکان بوو. سەرباری ئەوەی کە ئۆرسۆن وێلز هەوڵی ئەوەی دەدا ریتاهیوارس ببێتە سەنتەرێک بۆجەمسەرگرتن لەفلیمەکانیدا.

هەرلەوکاتەشدا هەوڵی دەدا کەسایەتیەکەی بخاتە بەروتوێژ لەئەندێشەی بینەراندا کە لەبینینی دەورە لەیەکچووەکانی لێراهاتبوون. وێلز دەیگوت: «بەهێزی کەسایەتیەکەی شتێکی گرنگ بوو بۆپێشکەوتنی وەکو ئەکتەرێک. جەماوەر لەوکاتەدا لێی نەدەگەیشت کەببووە مایەی ئەوەی ئاگری تووڕەبوونی بخاتەسەرم». وێلز ریتاهێوارسی بەوە تاوانبار دەکرد کەوا بووەتەمایەی ڕووخاندنی هەروا «خانمی شنگهای» فلیمێکی سەرکەوتوونەبوو لەڕووی بازرگانیەوە. واچاوەڕوانی ئەوئەنجامە دەکرا کەوا ئەوەدوو ناودارە بەرەو ئاشتبوونەوە بیبات کەچی بەپێچەوانەوە بووەهۆی دابڕانێکی تەواوی نێوانیان.

ئۆرسۆن وێلز وەک دۆن جوان هەوەسباز بوو. ئەوپیاوە دەیتوانی ژمارەیەکی زۆر لەدڵبەرەکانی کۆبکاتەوە. تەنیا سیانی کردە هاوسەری خۆی ولەهەریەکێکیان کچێکی هەبوو. وێلز زۆر ڕێزی ئافرەتانی دەگرت بەتایبەتی ئەوانەی کەوای لێیان کردبوو ببنە ئەستێرەیەکی درەوشاوە. وێلز دەڵێ: «من دژی یەکسانی نێوان ئەم دوو ڕەگەزەم تەنیا بۆساتێکیش باوەڕ بەوە ناهێنم. چونکە ئافرەت هەمیشە لەهەموو چەرخێکدا لەسەرووی پیاوبووە. هەمیشە توانای بەدەستهێنانی ئەوەی هەبووە کە دەیەوێت. تەنیا ئەوشتەش دەپارێزێت کە دەبێتە مایەی بایەخ پێدانی». چەشنێکی زۆر دیاری کراو لە ئافرەتان سەرنجی وێلزیان ڕادەکێشا. لای گرنگ نەبوو کەوا کیژۆڵەیەکی تازەپێگەیشتووی شۆخ وشەنگ بێت، بەڵکو دەیویست بیرێکی کراوەی هەبێت. لەنێوان ئەوئافرەتانە «تنبری [illegible] مارلین [illegible] وجان مورو خانمە ئەکتەری [illegible] باکسینر کە لەفلیمی [illegible] ١٩٥٦ [illegible] تایبەتی [illegible] ئەکتەری [illegible] ئەوەی بەوە ڕازی بوو کەوا [illegible] [illegible] بیبینێت ئازناویشی [illegible] [illegible] بوو. زۆر ڕێزی لویز فیلمراسی دەگرت ئەوەی کەوا هەندێک جار لەماڵیدا [illegible] لەگەڵیدا دەژیا. لەساڵی ١٩٥٤ لە [illegible] ئیتالیا [illegible] حیرو ڤالکوی [illegible] کرد. [illegible] کردە سینەما [illegible] ناوەکەی گۆڕی بۆ [illegible] یەکەم ئافرەت بوو بەشێوەیەکی [illegible] ئەوەی زیاتر ئۆرسۆن وێلزی ئازار دەدا [illegible] ڕێڕەوی ئەندێشە بەپیتەکەی بوو. زۆر [illegible] وێنەگرتنی فیلم وپێداچوونەوەی ولێکدانەوەی بوو.

هەروەها دەبووە هۆی وروژاندنی پرسیارکردن لەبارەی ئەوفیلمە بەشێوەیەکی زۆرسەیر ڕقی لەتەواوبونی فیلم دەبووە حەزی نەدەکرد فیلم کۆتایی هەبێت. بێگومان کەس نەیدەتوانی ئەو دەرهێنانەی دوایی فلیمەکانی ببینێت. .«دوالایەنی هەواداریەکەشی دوای دووساڵ لەوێنەگرتن وحەوت مانگ لەمۆنتاژکردن، بەرهەمهێنەرەکە هەڕەشەی ئەوەی لێکرد کە پێویستە بەزووترین کات کۆتایی بەفیلمەکە بێنێ، بەڵام ئۆرسۆن وێلز ئامادە نەبوو گوێ بداتە ئەو گەفەو بەوشتەی ڕازی بێت، ناچار فیلمەکەی هەڵگرت وبەرەو شوێنێکی نادیار ڕۆیشت. .چیرۆکی ئەوفیلمەی کەوا روناکی نەبینیووە لەبارەی کۆنە دەرهێنەرێکی فەرامۆشکراوە کە پیشەسازی سینەما دوا ماوەی پێدابوو. لەرۆژی دوایی وێنەگرتن بەبۆنەی ئەوەی بەسەرکەوتوویی هاتۆتەوە سینەما ئاهەنگێکی پێشوازیان لەسەر شەرەفی سازدا. کاتێ بەمەستی هاتەدەرەوە بەرڕوداوێکی ترومبێل گیانی لەدەست دەدات. بەڕاستی ئەوە ڕێکەوتنێکی ترسناک بوو هەروا بووەمایەی ئاوێتەبوونی ئەوبەراوردەسەیرەی لەنێوان کۆتایی فیلمەکەو کۆتایی ژیانی بوو کە لەناو مێشکی وێلزدا دەخولایەوە. واپێدەچوو لەبەر ئەو تارسایی مردنەی کە ڕاویدەنا ئەو فیلمەی پێ تەواونەکرابێ. بەمجۆرە وێلز دوای ١٣ ساڵ لەوێنەگرتنی ئەم فیلمە ماڵئاوایی کردو هەتاهەتایە لەگەڵ فیلمەکەیدا چووەژێر خاک.

**وێلز وەک دۆن جوان هەوەسباز بوو. ئەوپیاوەی دەیتوانی ژمارەیەکی زۆر لە دڵبەرەکانی کۆبکاتەوە.**

**سەرچاوە:**

الثقافة الاجنبية السنة السادسة العدد (٣) ١٩٨٦ص١٣٨

ئۆرسۆن وێلز ساحر السینما

ترجمة: رعد اسكندر



# جیهانگەرایی مێژووی کۆمەڵگەی مەدەنی

مەسعود پەرێشان



زۆر پێناسە بۆ چەمکی کۆمەڵگەی مەدەنی کراوەو زۆرتریش ناکۆکی لەسەر ئەو پێناسانە لە ئارادان. لەلایەکەوە ئەگەر زۆربەی رۆشنبیران لەسەر ئەوە کۆکن کەوا کۆمەڵگەی مەدەنی بریتییە لە کۆمەڵگەی دامودەزگای دیموکراتی و ئازادی بە واتای سەربەخۆبوونی لە دەسەڵاتی دەوڵەتی، ئەوە لەلاکەی دیکەوە خەڵکی دی لەو بڕوایەدان کە دەوڵەت بەو حسێبەی دەزگایەکی هەڵبژێردراوی دیموکراتییە واتە بەشێکە لە پێکهاتەی کۆمەڵگەی مەدەنی و بە پارێزەری ئەو جۆرە کۆمەڵگایەش دەژمێردرێ.

ئێستا دەبێ بپرسین لە رۆژگاری ئەمڕۆی سیستەمی تازەدا دەبێ سیماکانی کۆمەڵگای مەدەنی چی بن لەو چەرخەی کە دەیان جۆرە پێناسە تێکەڵ بووینە و هەموشیان پێویستیان بە پێداچوونەوە هەیە، یان هەر هیچ نەبێ سەر لەنوێ بە دوای ناسنامەکانی کۆمەڵگە و دەوڵەت و ناسنامەی نیشتمانی و...تاد. بگەڕێین و لەو نێوەندەدا چەمکی راستەقینەی کۆمەڵگەی مەدەنی دەستنیشان بکەین بۆ گەیشتنە ئەو مەبەست و ئامانجەش لە پێشەکییەی مایکل وۆلزەرمان چێتر نەدۆزیەوە کە هەموو دەستەواژەکان روون کاتەوەو ئاماژەیەکی ئەوتۆ بەخشێتە مەبەست، ئەوەی خوارەوەش دەقەکەیەتی،

ئامەوێ لێرەدا شتێک زیاد کەمە سەر ئەو ناکۆکیانەی کە لە بنەڕەتدا هەن و واشی بۆ دەچم کە ئەوەندە بەسە بڵێین کە کۆمەڵگەی مەدەنی کۆمەڵێک پەیوەندی و ناسنامە دەگرێتەوە خۆی کە لەدەرەوەی یا ناوەوەی وڵات و هاووڵاتییەدا دروستی دەکەین. گومانیش لەوەدا نییە کەئەو بابەتە گرنگییەکی زۆری لە خۆدا گرتووە بە تایبەتیش ئێستا کە بۆچوونی باوی ئەمڕۆ لەسەر ئەو واتایەدا بنیات نراوە کە دەڵێ بۆ سەپاندنی دیموکراسییەت پێویستە کۆمەڵگایەکی مەدەنی و بەهێز و تێر لە هەموو روەکەوە دروست بێت کە دەبێتە هۆکاری سەرەکی پەرەپێدان و سەقامگیربوونی دیموکراسییەت. هەر بەپێی ئەو بۆچوونەش هاووڵاتیانی وڵاتێکی دیموکراسی مەرج نییە بوونەوەرێک بن لە هەموو روێکەوە تێر بن، بەڵکو دەبێ ئەندامی هەندێ جێگابن کە کراوەتر بن و زۆر پێویستیان بە داواکردن نەبێت و کەمتریش مەترسیداربن لە وڵاتێکی تازەدا. هەر تەنها لەو جێگایانەشدا ئەگەر دەستە و دامەزراوبن یا هەر رێکخراوێکی دیکە، تاکەکان دەتوانن زیاتر توانای سیاسییان بەهێز بکەن و فێری ژمێرباری زەرەرو قازانج بن و لە یەکسانی و هاوتەریبی بگەن و دۆست و هەڤاڵ بۆ خۆ چی کەن و هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەملاو ئەولا ببەستن و هزری پێچەوانەش دەستەبەر بکەن. رەنگە بۆ حکومەتی دیموکراسی باش نەبێ کە دەسەڵاتی خۆی بەسەر هەموو لایەنێکدا زاڵ و بکات و هەڵەیەکی مەترسیداریشە ئەگەر پەیوەندییەکان و کۆمەڵە جێگرەوەکان و پاراستنی دەڤەرە کۆمەڵایەتییە کە زامن نەکرابێ، چونکە هەمیشە خەڵکەکە بە دوای کونجێکی ئارامبەخشەدا دەگەڕێن کە لەگەڕدەلاوژەو ماندوو بوونی سیاسەت بەدووریان بگرێ. ماوەیەک بیانحەسێنێتەوە سەرباری هەندێ کاتی دیکەش بۆسارێژ بوونی زامەکانی و وەبەر جەستە هێنانەوەی هێز و توانای تازەو پێویست بۆ سەر لەنوێ تێهەڵچوونەوەی ململانێیەکانی ئایندە.

کۆمەڵگەی مەدەنی پێگەیێکی تازە نییە چ لە بواری کردنی و چ لە بواری چەمکەکانیدا، لەسەرەتای سەردەمی رێنیسانیشدا لە سەدەی هەژدەم لە ئوسکوتلەندا وتووێژ لەو بابەتە کراوە و یەکەم کەسیش کە توانیبێتی لەو بواردا بکۆڵێتەوەو لە تیۆرە تازەکاندا بدوێ (ئادەم فێرگسۆن)ە دواتریش ئەو بیرۆکەیە لەلای (هیگل)یش گرنگی خۆی پێدراوە کە هەمیشە لە کارەکانی خۆیدا بەو جۆرە وەسفی کۆمەڵگەی مەدەنی کردووە: ماوەو مەیدانێکە بۆ ململانێ و هەڵوەشانەوە، هەر لەو روانگەیەشەوە بەرژەوەندییە ئابوورییەکان و بیروبۆچوونە ئایینییەکان و هەتا بگرە هاریکاری رەگەزیش دەبنە شتی رێکخەر بۆ ئەوەی بکارێ را دەربڕی و بەرامبەریشیان بوەستێ دەشتوانین سەرنجمان بۆ ئەوە بچێ کە دەوڵەت بە گوێرەی فەلسەفەی هیگڵ پارچەیەکی یەکگرتووی باڵایە بەڵام ئەو یەکگرتووییە رای جیاوازیشی تێدایە لە پانتاییەکی ئازاددا کە هیچ بەربەستێک لە خۆ راناگرێ. هەر بۆیە دەتوانین بڵێین تەنها لەو ئەزموونەی رای جیاوازدا مرۆڤەکان دەتوانن یەکێتییەکی دیموکراتی دروست بکەن.

بیرۆکەی کۆمەڵگای مەدەنی لە ماوەی خەباتکردن دژی رژێمە دیکتاتۆرییەکانی هەر دوو ناوچەی ناوەڕاست و رۆژهەڵاتی ئەوروپا هاتە مەیدانی دایەلۆگی سیاسییەوە. سروشتی بیرۆکەی کۆمەڵگای مەدەنی لە ژیانی سیاسی هاوچەرخدا لە دوو رووگەدا خۆی دەنوێنی. کە یەکەمیان بریتییە لە گرنگی ناسنامەی نیشتمانی و رێبازی و رەگەزی ئایینی. دووەمیشیان دەتوانێ کورتی کەینەوە لە هێز و پابەند بوونی نا ئاسایی بزوتنەوە کۆمەڵایەتییە تازەکان بە تایبەتیش بزوتنەوەی لایەنگرانی کۆمەڵگا و بزوتنەوەی ئافرەتان.

**. کۆمەڵگەی مەدەنی کۆمەڵێک پەیوەندی و ناسنامە دەگرێتە خۆی کە لە دەرەوە یا ناوەوەی وڵات و هاووڵاتیدا دروستە دەکرێت.**

ئەم بزوتنەوانە ئەوانەش دەگرێتەوە کەگرنگی بەیەک تاکە کێشەی دیاریکراو دەدەن وەکو لە باربردنی منداڵ و رێکخستنی بوونی چەک و هەڵگرتن و داماڵینی لەلایەن تاک و کۆمەڵەوەو هەروەها هەندێ کاری دیکەی وەکو نوێژکردن لە قوتابخانەکان و سزای لە سێدارەدان و..تاد، لێرەدا سەیردەکەی دەدران کەچی ئێستا بوونەتە ئەندامی زۆر چالاکی ئەم جۆرە بزوتنەوانە.

ئەوەی زیاتریش سەرنجمان بۆ خۆی رادەکێشێ بریتییە لەوەی کە ئەو بزوتنەوانە هەموو جۆرە چین و توێژێکی کۆمەڵایەتی دەگرێتە خۆی کەچی دەوری رێکخستنەکانی لەوەوپێش بەرەو کزی و لاواز بوون دەچن بە تایبەتیش سەندیکاکانی کرێکاران و هەوبەندە مەدەنییەکان و پارتە سیاسییەکان و لە جێی ئەوان چین دەبێتە فاکتەری سەرەکی رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان و چالاکییەکانیان هەتا ئەگەر کاردانەوەی بەسەر لایەنی رەگەزیشەوە نەبێت.

ئەو کتێبەی کە ئێمە ئەم پێشەکییەمان بۆی نووسیوە، لەبەشی یەکەمیدا باسی لایەنە خێرمەندەکانی ئەو بوارە دەکات بە تایبەتیش ئەوەی کەکۆمەڵگەی سیاسی دروستی کرد وەکو هەستکردنی هاوبەش بەیەک ئایندەیی و یەک چارەنووسی خێری گشتی بەتایبەتیش ئەو لایەنە هاوبەشانەی کەهەرتەنها لەکۆمەڵگەی مەدەنیدا دەردەکەون. بەشی دووەمی کتێبەکەش لەبارەی ئەو پەیڕەوە کۆمەڵیانە دەدوێ کەبەرامبەر ئەوتەنگژانە دەوەستن کەدەرهاوێشتەی تایبەتمەندی مەدەنییەت و دژە مەدەنییەتیش.

هیچ کۆمەڵێک و خێروبێرێکی هاوبەش دروست نابن ئەگەر دادوەری کۆمەڵایەتی بەرقەرارنەبێ بۆیە دەبێ لەناوهەردەستە و تاقم و کۆمەڵێکدا هاوبەندی و پابەندبوون و پشتگیرییەک هەبێت بەرامبەر کەسایەتییە لاوازەکانی نێو ئەو دەستە و تاقم و کۆمەڵەدا، پشتگیرییەکەش بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا بێت کەهەڵوێستی ئەوکەسایەتییە لاوازانە بەهێز بکات لێرەدا دەگەینە ئەوئەنجامەی کەدەڵێ: ئەگەر کۆمەڵگەی مەدەنی لەهەروڵاتێکدا بەهێز بوو ئەوا وڵاتەکە ئاچار دەکات کە پابەندی هەموو هەڵوێستێکی بێت کەبەڵێنی داوەو بەراستیش دەبێ هەموو بڕیارێک جێبەجێ بکات. بەڵام ئەگەر کۆمەڵگەی مەدەنی بەلاوازی هاتەپێش. ئەوا پابەندبوونی دەوڵەت بەبڕیارەکانی خۆی و جێبەجێ کردنیشیانی سەد دەر سەد پێچەوانە دەکەوێتەوە.

ئەوەی کەتێبینی دەکرێ و بەپێویستیش دەزانین کە لێرەدا باسی لێوەبکەین ئەوەیە کە وڵاتە دیموکراتییە راستەقینەکان کەبەراستی دیکراسیەت تیایدا رەگ و ریشەی داکوتاوە هەمیشە لەهەوڵی ئەوەدایە کەپەیوەندییەکان رێک بخات و بەردەوام بیبووژێنێتەوە و پشتگیری لێ بکات کەبەوەش دیەوێ ئەو راستییە بیسەلمێنێ کەوا وڵاتەکە هەمیشە لەهەوڵی دابەشکردنی دادوەرانەی رێکەوتەکانی کارکردن و کاروخزمەتگوزارییە کۆمەڵاتییەکاندایە، کەدیارە بەشی سێیەمی کتێبەکە لەولایەنە دەدوێ.

زۆرکەس لەوهزروانانەی کەبیر لەکۆمەڵگەی مەدەنی دەکەنەوە وای باس دەکەن کە ئەوکۆمەڵگایە لەچوارچێوەی خودی وڵاتەکەیە بەپاراستنی سنوورە سیاسییەکانی ئەو کۆمەڵگەیەو واش تێبینی دەکرێ کەپەیوەندییە کۆن و تازەکانیش دەیانەوێ لەو سنوورەدا بەیەک بگەن.

بزوتنەوە جوتیارییەکان و رێبازی کلێسا دێرینەکان و لایەنگرانی ژینگە و بزوتنەوەکانی ئافرەتان هەڤاڵ و دۆست و لایەنگریان لەجێگای زۆر دووریش هەیە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەکۆمەڵگایەکی مەدەنی نێو دەوڵەتی هەیەو بوونی ئەو جۆرە کۆمەڵگەیەش کۆمەڵێک پرسیار دەوروژێنێ لەبارەی مانەوەو نەمانەوەی دەوڵەت بەوسیستەمەی کەئێستا هەیە.

هەروەها دەتوانین لێرەدا ئەوەش باس بکەین کەئێستا هەندێ رێکخراوو بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی تازە توانیویانە ببنە کەناڵی سنووربەزێن، وەکو: هێلسنکی دۆتش و رێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتی رێکخراوەکانی دیکەی سەربەنەتەوەیەکگرتووەکان و دادگای نێودەوڵەتی: کەبەوپێیەش دەکارێن بێژین کۆمەڵگەی مەدنی هیچ سنوورێکی لەبەردەمدا نییە، یا هەموو سنوورێک دەبەزێنێ. بۆیە بەئەندامی بوونیش لەو جۆرەرێکخراوانە هەرچەندی مەرجدار بێ و قورس بێ، دەرفەتی ئەو لەپێشە کەکۆمەڵە وتاقمی تازە دروست ببن. بەهاوڵاتی بوون شێوەی جیاوازە لەگەڵ بەمەدەنی بوون. کەدەکرێ بەپێی بڕیارێکی سیاسی هەرجەمییەکان ئەتوانێ دروست بکرێ. کە ئەوەش بۆتە بەشی چوارەمی کتێبەکەو حاڵەتەکان بەوردی شیکراونەتەوە.

ئەمەو بزوتنەوە سوسیالیزمییەکانیش لەچوارچێوەی هاریکاری ناوەخۆو دادوەری کۆمەیەڵایەتی و هەوڵەکانی وڵات بەرەو هاوبەندییە نێو دەوڵەتییەکان بەلەبەرچاوگرتنی لەبارنەچوونی پەیوەندییەکان باسکراوەکە بەرێک و پێکی بێت، ئەگەر چی ئەو رێک و پێکییە دوای لەناوچوونی رژێمە سۆسیالیزمە دەسەلاتدارەکان ئەویش لەبارچوو. دواتر لەبەشی پێنجەمدا باسی تازەبوونەوەی سۆسیالیزمی دیموکراتی (سوشیال دیمکرات) دەکات و بەرگریشی لێ دەکات.

لەکۆتاییدا دەتوانین بڵێین پەیوەندییەکی روون و ئاشکرا و پێگەیشتوو لەنێوان دیموکراسیەتی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگەی مەدەنیدا هەیە. کەیەکەمیان واتە دیموکراسیەتی کۆمەڵایەتی رێنوێنی خۆی دەکات واتە رێنوێنی ئەندامەکانی کۆمەڵگە خۆیان بۆ خۆیان دووەمیشیان کەکۆمەڵگەی مەدەنییە ئەو مەیدانە دەستەبەر دەکات کەتاکەکان ئەو رێنوێنیانە بۆ خۆیان دەستەبەر دەکات. کەگومان لەوەدا نییە ئەو مەیدانەش لەلایەن وڵاتی بەراستی دیموکراسییەوە دەپارێزرێ.



**. یەکەم کەس کەتوانیویەتی لەوبوارە بکۆڵێتەوە و لێی بدوێ (ئادەم فیرگسۆن)ە، دواتریش لای (هیگل) گرنگی پێ دراوە.**

# دەروازەیەک لەزانستی پزیشکی و نەشتەرگەری

دکتۆر عادل عەبدوڵڵا

## هەرزەکاری پردی وەرچەرخان

### وشەی هەرزەکاری (Adolescence)

واتە پێگەیشتن یان باڵقبون، ئەو ماوەیەیە کەمرۆڤ تیایدا بەگەشەیەکی گشتی جەستەیی و دەروونیدا دەڕوات ، هەرزەکاری دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، وەرچەرخانێکی گەورەیە لە باری دەروونیدا . شەش هۆکاری زەق کاریگەریان لە سەر ڕێڕەوەی گەشەی هەرزەکاریدا هەیە:

**١- هۆکارە جەستەییەکان.**
**٢- خێزان.**
**٣- قوتابخانە.**
**٤- باری کۆمەڵایەتی ودەروپشت.**
**٥- باری دەروونی خودی هەرزەکار.**
**٦- ڕێژەی زیرەکی هەرزەکار.**

جا ئەگەر ئەم هۆکارانە بەیەکەوە بەباشی بشکێنەوە لەسەر هەرزەکاردا ئەوا دەبێتە خاوەن گەشەیەکی گشتی تەواو دروست، ئەگینا دوچاری ململانێ وگرفتی زۆر دەبێتەوە، چونکە هەرزەکاری خۆی لەخۆیدا قۆناغێکە بۆ هێنانەدی سەربەخۆیی کەسی وتوانای بەرپرسیارێتی ژیان، هەروەها هۆکاری کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی تارادەیەکی زۆر کاریگەرن لەسەر هەرزەکاریدا بۆ نموونە: خێزان، هاوڕێ هاوتەمەنەکان، جیهانی خەڵکانی پێگەشتوو (بەتەمەنەکان). هەرزەکار بە نێوان سێ جیهانی جیاوازدا دەژی. جیهانی منداڵی و خێزان، جیهانی هەرزەکاری، جیهانی پێگەیشتووەکان (گەورەکان). بۆیە تاڕادەیەک ئەم قۆناغە بەگرانیی لەسەری دەوەستێت. چونکە هەر سێ جیهان بە بەردەوامی لە گۆڕاندان ، ئەمەش هەرزەکار ڕووبەڕووی زنجیرەیەک قەیرانی بچوک و گەورە دەکاتەوە وەکو:

**١- قەیرانی گەشەی جەستەیی.**
**٢- قەیرانی دەروونی سێکسی.**
**٣- قەیرانی چەسپاندنی کەسێتی سەربەخۆ (کەسێتی ئازاد).**
**٤- قەیرانی خۆگونجاندن لەگەڵ کۆمەڵ بەهەموو داب و نەریت و بەهاکانیەوە.**

گەشەی سێکسی لە قۆناغی هەرزەکاری دا زۆر گرنگە، بەڵام مەسەلەیەکی بنەڕەتی نیە لە گەشەی گشتی هەرزەکاریدا، بە مانایەکی دی وانەبێ هەرزەکاری تەنیا قەیرانێکی سێکسی بێ و چیدی کە، گەلێک زانای دەروونناسی وای بۆ دەچوون، بەڵکو هەرزەکاری قەیرانێکە بۆ دەستنیشانکردنی ناسنامە یان




قەیرانێکە بۆ بوونی جیهانێکی ئاوا بەدڵنیاییەوە هەرزەکار لەباوەش بگرێ. کەواتە هەرزەکاری وەرچەرخانێکی جەستەیی و دەروونی وکۆمەڵایەتیە کە هەموویان بەیەکەوە لە کەسێتی هەرزەکاردا بەدی دەکرێن و لە یەکتر جیانابنەوە.

بەم دواییە زانایانی دەروونناسی گرنگیەکی زۆریان بەقەیرانی ناسنامە یان کەسێتی سەربەخۆ و ئازادی هەرزەکارەکان (وەکو یەک مەسەلە) داوە نەک جیاکردنەوەی قەیرانەکانی خێزان، کۆمەڵایەتی، جەستەیی، سێکسی...هتد. واباشترە کە بایەخ بە قەیرانی ناسنامە و کەسێتی هەرزەکار بدرێ بەرامبەر بە ململانێیەکانی ژیان و کۆمەڵ. هەرزەکارەکان زۆر بەڕوون وئاشکرا هەست بەم ململانێیانە دەکەن بۆ نمونە: گەشەی جەستەیی و فسیولۆژی، خوێندن، پیشە، هەوڵدان بۆ دوارۆژ. هەرزەکار زۆرجار لەخۆی دەپرسێ و دەڵی «چۆن بتوانم خۆم لەگەڵ کۆمەڵگاکەمدا بگونجێنم؟» خەڵکانی دی چیم پێ دەڵێن؟ چۆن سەیرم دەکەن؟ ئایا ئێستا ڕۆڵم لە کۆمەڵەکەمدا چیە و لەدوارۆژدا چۆن دەبێ؟. ئەم پرسیارانە تەوەری کەسێتی سەربەخۆی زۆربەی هەرزەکارانن، جا هەرکاتێک هەرزەکار بیەوێ لەم ڕواڵەت و ململانێیە رابکات ئەوا بەئاڕاستەی گۆشەگیری و دەربەدەری و توندوتیژی هەنگاو دەنێ ، بەتایبەتی ئەگەر جیهانی

پێگەیشتووەکان بە بارێکی قورس لەسەر خۆی لەقەڵەم بدات وهەست بەوەبکات؟ کەناتوانێ خۆی لەگەڵیدا بگونجێنێ.

**دەربەدەری لە هەرزەکاریدا**

هەرزەکار بەردەوام دەیەوێ بە هێزو تواناو سەربەخۆبێ، دەخوازێ رەها بێ لەو پەیوەندییە دێرینەی کە بەدایک و باوکی دەیبەستێتەوە، دەیەوێ ناسنامەو کەسێتی سەربەخۆی هەبێ تاکو وەلامی ئەم پرسیارە بداتەوە کە دەڵێ «من کێم و دەبم بەکێ؟» بۆیە هەر خێزانێک ئەگەر بەباشی لە قۆناغی هەرزەکاری منداڵانی نەگەیشتبێ و زانستیانە رەفتاریان لەگەڵدا نەکا ئەوا بەرەو هەڵدێرو ونبوون و جیهانی توندوتیژیان دەبات، گرنگ لێردا ئەوەیە کە بەهاوکاری خێزان و قوتابخانەو کۆمەڵ هەرزدکار ئامادەبێ بۆ پێشوازی کردن لە ژیان بەهەموو ژان و خۆشی و ناخۆشیەکانیەوە، چونکە ئەو کەسەی کە لە ناخۆشی و بەرپرسیارێتی ژیان بترسێ هەرگیز ناتوانێ کەسێتیەکی پێگەیشتوو و بەهێز بۆ خۆی بچەسپێنێ ، بۆیە زیاتر رووبەرووی جیهانی ونبوون و گۆشەگیری و توندوتیژی دەبێتەوە ، کەواتە دەبێ خزمەتێکی دەروونی لە قوتابخانەدا پێشکەش بە هەرزەکارەکان بکرێ تا بەرە بەرە بتوانن کەسێتی سەربەخۆ بۆ خۆیان بنیات بنێن کە بناغەی تەمەنی پێگەیشتنە و مانای هەستی دەروونی و کۆمەلایەتی تەواو و دروست دەگەیەنێ، سەرەڕای بیرکردنەوەی ڕاست و دیاریکردنی هیواو ئامانجەکان، هەرزەکار پاش سەرکەوتنی لە چەسپاندنی کەسێتیەکی سەربەخۆ و ئازاد هەست بە دلنیای پتر دەکات لەناو کۆمەڵگادا و هەرگیز نامۆ نابێ لە کۆمەڵ و دەزانێ کەچی دەوێ و چی دەکات و چۆن باوەڕی زیاتر بەخۆی پەیدا دەکات. هەروەها دزانێ کە چۆن رەفتار لەگەڵ کۆمەڵدا بکات. پاشان کەزیاتر پێگەیشت ئەوا رێگا لە پێشی ئاسانتر دەبێ بۆ هەڵبژاردنی پیشەو پایەی کۆمەلایەتی خۆی و دروستکردنی پەیوەندی خێزانی تایبەت بەخۆی.

## وەرزش پاش تەمەنی (٥٠) سالی

**لە کۆتایی گفتوگۆیەکدا لەگەل د. (ریتشارد دۆل)دا لێیان پرسی: چ هیواو خولستت ماوە ؟ لە وەلامدا وتی «دەمەوێ بۆ درێژترین تەمەن بە گەنجی بمێنمەوە».**

نابێ وەرزش تەنها لەکاتی پێشبرکێ و ئۆلۆمپیاد و مۆندیالەکاندا بێتە یاد، بەلکو ڕاست و زانستیانەیە کە وەرزش وەکو چالاکیەکی کۆمەلایەتی سەیر بکرێت و چێژی لێ وەربگیرێ بە تایبەتی کە وەرزش بە کۆمەڵ ئەنجام دەدرێ. ناکرێ تۆمارکردنەکان و ژمارەکانی ئۆلۆمپی بشکێنرێت، بەلام لە هەمان کاتیشدا نابێ باری قورس بەسەر دلێکدا (کە بەتەمەندا چووبێ) بسەپێندرێ، ئەمەش هەرگیز پێویست بەبێزاری و دلّ تەنگی ناکات. لەکۆنگرەی دوانزدەهەمی نەخۆشیەکانی دلدا کە لە واشینتۆن بەسترا. بەشداربووان جەختیان لەسەر چەند پرۆگرامێکی وەرزشی و ئامادە باشی لەش بۆ وەرزش کردوە،



هەروەها باسیان لە چۆنیەتی خۆپاراستن و ژیانی ئاسایی بۆ نەخۆشیەکانی دلّ کرد.

لەلایەنی فسیۆلۆژیەوە جوولە و وەرزش زۆر گرنگن لە بیناکردنی ماسولکەکانی لەش، یان بەلای کەم هێشتنەوەی قەبارەو هێزی ماسولکەکان نەک تەنها لە گەنجەکاندا بەلکو لە بەساڵاچووەکانیشدا چ خاوەن تەندروستی باش بن یانیش لە پاش چاکبوونەوەیان لە نەخۆشیەکەدا. ئەم راستییە فسیۆلۆژیە بۆ ماسولکەکانی دلیش راستیەکی چەسپاوو سەلمێنراوە هەروەکو ماسولکەکانی دیکەی لەش.

بە ساڵاچوون و بەرە بەرە پیربوون خۆی لەخۆیدا دەبێتە هۆی بەرە بەرە ون کردن یان پووکانەوە و بچووک بوونەوەی ماسولکەکان ئینجا بێ هێز بوونیان، بەلام دەتواندرێ بە وەرزش ناوی ئەم کردارە فسیۆلۆژیە بۆ ماوەی (١٠-٢٠) ساڵ کەم و لەسەرخۆ بکرێتەوە. لە کاتی بوونی نەخۆشی درێژخایەنیشدا ددکرێ وەرزش ئەنجام بدرێ با سنووردارێش بێ، بەپێی ئەو راستییە فسیۆلۆژییەی کە باسمان کرد وەرزش سوود بەخشە بۆ لەش بە پشت بەستن بەوەی کە ماسولکەکانی لەش و ماسولکەی دلّ دەکرێ بەردەوام مەشقیان پێ بکرێ. لەو کاتەی کە مەشق کردن سنووردارێ، توانای لەش بۆ ئەنجامدانی کارێکی زیاتر لە پێویست لە ئاستی رێژەیەکی نزمی لێدانی دلداو لە هەموو تەمەنێکدا توانایەکی باشە، ئەمەش تارادەیەکی زۆر سوود بەخشە بۆ بە ساڵاچووەکان. هەمان ئەو راستیانەی سەرەوە بەسەر

ئێسقانەکانی لەشیشدا دەسەپێن، بە تایبەتی لە ئافرەتە بەساڵاچووەکاندا (پاش تەمەنی نائومێدی) واتە پاش وەستانی خوێنبینی مانگانە، ئێسقانەکان تادێ کانزای کالسیۆم ون دەکەن، بۆیە بێ هێز دەبن و بە ئاسانی دووچاری شکان دەبن و کەمتر بەرگەی جوولەی ماسولکەکان (کە پێیانەوە لکاون) دەگرن. وەرزش ئەم کردارەی لاواز بوونی ئێسقان لە ئافرەت و پیاوی بە ساڵاچوودا دوا دەخات، وایان لێ دەکات کە هەست بە تەندروستی باش بکەن، بەمەشەوە دەتوانن بۆ ماوەیەکی درێژتر لەسەر وەرزشدا بەردەوام بن.

لەئافرەتی بەساڵاچوودا چارەسەی هۆرمۆنیش دەوری هەیە بۆ زیاتر ئامادەباشی ئافرەت بۆ وەرزش.

رۆیشتن بەپێ، مەلە، ولێخوڕینی دووچەرخە (پایسکل)، وەرزشی پەسندکراون لەلایەن بەساڵاچووەکاندا تەنها ئەوانەی کە نەخۆشی لەکارکەوتنی دڵیان هەیە دەبێ هۆشیار بن لەوەرزشکردندا، هەرچەندە گەلێک نەخۆش سوودیان لەوەرزش وەرگرتووە، بەڵام لەژێر چاودێری نزیکی پزیشکیدا.

لەو کاتەی کە بەساڵاچوویێک هیوابڕاو دەبێ لەوەرزش، باشترین رێنمایی پزیشکی ئەم بەساڵاچووانە دەڵێ: هیوا بڕاو مەبن، بەڵام ئاگاداربن، بەرەبەرە دەست بەوەرزش بکەن»

## هۆرمۆنی گەشە بۆ چارەسەرکردنی باڵاکورتی

هۆرمۆنی گەشە (Growth Hormoe) لەبەشی پێشەوە گلاندی پتیوتەری (Pitutary) ژێر مێشکەوە راستەوخۆ دەردەدرێتە ناو خوێن و بەرپرسیارە لەگەشەی ئێسقان (واتە درێژبوونی باڵا)، دەردانی ئەم هۆرمۆنە لەکوڕەکاندا تا تەمەنی (١٨) ساڵی و لەکچەکاندا تا تەمەنی (١٦) ساڵی بەردەوام دەبێت، واتە مرۆڤ زۆر بەدەگمەن پاش ئەم تەمەنە باڵای درێژ دەبێت.

لەساڵی (١٩٨٨)دا هۆرمۆنی گەشەی دەستکرد (بەرێگای ئەندازەی بۆماوەییەوە) لەتاقیگەدا سەرکەوتووانە کەوتە بەردەست، ئەمە (١١)ساڵە کەوتۆتە دەرمانخانەکانی ئەوروپاو ولاتانی ئەمەریکا، بەڵام نرخەکەی تارادەیەک گرانە، ئەمەش هیوایەکی زۆری بەو منداڵانەدا کە باڵایان لەچاو تەمەنیان کورتە، ئەم هۆرمۆنە دەبێ تەنها بۆ ئەو منداڵە کورتە باڵایانە بەکاربهێنرێ کە کەموکوریان هەیە لەدەردانی هۆرمۆنی گەشە لەگلاندی پیتۆتەری ژێر مێشکەوە (پاش پشکنین و دەستنیشانکردنیان لەلایەن پزیشکی پسپۆر بەگلاندە کوێرەکانەوە).

هەرچەندە بەکارهێنانی ئەم هۆرمۆنە بۆ هاندانی گەشەی جەستەیی و درێژکردنی باڵا بۆتە تەوەری گفتوگۆی زاناو نێوەندەکانی دیکەی کە گومانیان لەم رێگا چارەیە هەیەو دەڵێن کە هێشتا لێکۆڵینەوەی دیکەی چڕوپڕی پێویستە بۆ بەدەست هێنانی ئەنجامی باشتر لەچارەسەرکردنی باڵاکورتیدا.

لەرابردوودا ئەم هۆرمۆنە پوختە یان ئامادە دەکرد لەگلاندی پیتۆتەری مرۆڤە تازە مردووەکانەوە کە بەکارەسات گیانیان لەدەست دەدا.

بۆ بەدەستهێنانی بڕێکی کەمی هۆرمۆنی گەشە پێویستیمان بەژمارەیەکی زۆری گلاندی پیتۆتەری دەبوو بۆیە نرخی ئەم هۆرمۆنە ئەوکاتە رۆزگران بوو وەبەزەحمەت دەست دەکەوت لەساڵانی شەستەکان هۆرمۆنی گەشە بەم شێوەیە وەدەست دەهات و بۆ چارەسەرکردنی باڵاکورتی بەکاردەهێنرا، لەیەک گلاندی پیتۆتەری تازە مردوویێکدا دەتوانرێ تەنها (٤-٦) میلیگرام هۆرمۆنی گەشە دەربهێنرێ و ئامادە بکرێ بۆ بەکارهێنان بەشێوەی دەرزی و کۆرسێکی تەواو بۆ چارەسەرکردنی منداڵێکی کورتەباڵا پێویستی بەنزیکەی (٣٠٠) گلاندی پیتۆتەری دەبێ کە لەتازە مردووەکاندا وەربگیرێ.

بەواتایەکی دیکە پێویستی بەنزیکەی (٨٠٠-١٠٠٠) میلیگرام لە هۆرمۆنی گەشەوە دەبێ تاکو باڵای بەشێوەیەکی رێکوپێک و ئاسایی گەشە بکات و درێژبێت.

نرخی هۆرمۆنی گەشەی دەستکرد زۆر هەرزانتر دەوەستێ و ئەنجامی باشی هەیە لەچارەسەرکردنی باڵاکورتی (لەومنداڵ و گەنجانەی هێشتا لەساڵانی گەشەکردندان). بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە کە هەتا زووتر (لەتەمەنێکی بچووکدا) ئەم هۆرمۆنە بەکاربهێنرێ بۆ حاڵەتی پێویست ئەوا ئەنجامی باشتر و مسۆگەری دەبێ لەدرێژکردنی باڵا لەو منداڵانەی لەلایەن پزیشکەوە دەستنیشانکراون کە پێویستیان بەم هۆرمۆنەوە هەیە، ئەوەش ماوە بڵێین ئەم هۆرمۆنە (هەفتەی دووجار بەشێوەی دەرزی لەران دەدرێت) دەبێ لەژێر چاودێری نزیکی پزیشکی پسپۆرەوە بەکاربهێنرێ.

## هەوکردنی ڤایرۆسی ماسولکەی دڵ

هەوکردنی ماسولکەی دڵ بە ڤایرۆسی کۆکساکی (coxackie) زۆر باوە لەنێو پێگەیشتووەکاندا، لە منداڵاندا هەوکردنی ڤایرۆسی ماسولکەی دڵ زۆر جار ترسناکەو زیان دەخاتە مەترسیەوە چونکە دەبێتە هۆی پەککەوتنی (لەکارکەوتنی) دڵ. زۆرجار مردنی کتوپڕ لە ئەنجامی یان لەکاتی پەتای ئەنفلونزادا روودەدات لەبەر هەوکردنی ڤایرۆسی سیەکانەوە، بەڵام لەڕاستیدا زۆربەی ئەم حاڵەتانە تووشی هەوکردنی ڤایرۆسی ماسولکەی دڵ دەبن (چونکە پاش مردن لە توێکاری بە زەرەبینی ئەلیکترۆنی ڤایرۆس لەناو ماسولکەی دڵدا بەدی کراوە).

ژانە ماسولکە بەگشتی پاش هەوکردنی ڤایرۆسی لەوانەیە بەڵگەیەک بێ بۆ تووشبوونی دڵ بە هەوکردنی ڤایرۆسی، بۆیە لە کاتی بوونی هەوکردنی ڤایرۆسی و ژانی ماسولکەکانی لەش گۆڕان لە نەخشی کارەبای دڵدا (Ecg) روودەدات. لە پەتایەکی ئەنفلەونزا لەزستانی ساڵی (١٩٦٩- ١٩٧٠) لە بێدفۆردا (BCG ford) پزیشکەکان گۆڕانی بەرچاویان لە نەخشەی کارەبای دڵدا بەدی کرد لە تووشبووەکان بە ئەنفلەونزا بە تایبەتی لە وانەی کە تووشی ژانی ماسولکەکانی لەش بووبوون، ئینجا پێش

چاک بوونەوەیان ئەم گۆڕانە لەنەخشەی کارەبای دڵدا نەما، واباشە ئەوکەسانەی کە تووشی ماسولکەکانی لەش دەبن لە ئەنجامی تووشبوون بە هەوکردنێکی ڤایرۆسی بۆ ماوەی هەفتەیەک لە نێو جێگادا بحەسێنەوە، بە تایبەتی ئەگەر ژانی ماسولکەکان توندو بەردەوام بوو کە مانای هەوکردنی ڤایرۆسی ماسولکەی دڵ دەگەیەنێ. هەوکردنی ڤایرۆسی ماسولکەی دڵ لەوانەیە ببێتە ئەگەری مردنێکی کتوپڕ و چاوەڕوان نەکراو.

گۆڕان لە نەخشەی کارەبایی دڵ تایبەت نیە تەنها بەهەوکردنی ڤایرۆسی ماسولکەی دڵەوە، چونکە لە گەلێک نەخۆشی دڵدا ڕوودەدات.

وەرزش و خستنەکاری ماسولکە خۆویستەکان لە ماوەی سەرەتای تووشبوون بە هەوکردنە ڤایرۆسیەکان (بۆ نموونە ڤایرۆسی ئیفلیجی منداڵان Polio virus) لەوانەیە نەخۆشیەکە سەختتر بکات و ئەگەری تووشبوون بە هەوکرنی ڤایرۆسی دڵی کوشندە زیادبکات.

زانا(سوتۆن Sutton) و هاوکاردکانی ساڵی (١٩٦٧) لە حاڵەتی پیاوێکی قەڵەوی تەمەن (٤٢) ساڵیان کۆڵیەوە کە تووشی ژانە ماسولکەو هەناسە ڕاوکێ دەبوو. هۆی ئەمەیان خستە پاڵ قەڵەوییەکەی، بەڵام پاش ئەوەی دەستی بەوەرزش و مەلەکردن کرد بە مەبەستی لاواز بوونەوە لەپڕێکەوە دڵی لەکار وەستاو گیانی لەدەستدا، پاش مردنی ئەم زانایەو هاوکارانی کە دڵیان لە تاقیگەدا پشکنی ڤایرۆسی جۆری (Coxackie B4) یان لە ناو ماسولکەکانی دڵیدا بەدی کرد. کەلێک زاناو پزیشکی دی ئەم ڕاستیەیان دوپاتکردۆتەوە و سەلماندویانە.

نزیکەی (٢٠٪)ی ئەو نەخۆشانەی کە تووشی سورێژەی ئەڵمانی (Rubella) دەبن تووشی هەوکردنی ڤایرۆسی دڵ دەبن، کەچی (٤٠ ـ ٩٠٪)ی حاڵاتی سەختی ئیفلیجی منداڵان دوچاری هەوکردنی ڤایرۆسی ماسولکەی دڵ دەبن بە هەمان ڤایرۆسی ئیفلیجی منداڵان. کەواتە ئەنفلونزا، نەخۆشی هاری سەگ، هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی و گەلێک هەوکردنی ڤایرۆسی دیکە کە تووشی مرۆڤ دەبن لەوانەیە دڵیش تووشی هەوکردنی بە هەمان ڤایرۆس بکەن. بەڵام نیشانەی هەوکردنی ڤایرۆسی ماسولکەی دڵ بریتییە لە زیاد لێدانی دڵ بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو.

ئایا ئەوانەی تووشی هەوکردنی ڤایرۆسی ماسولکەی دڵ دەبن چاک دەبنەوە؟

بەڵێ، زۆربەی حاڵەتەکانی هەوکردنی ڤایرۆسی ماسولکەی دڵ (ئەگەر زۆر سەخت و توند نەبن) یان دوچاری مردن نەبن چاک دەبنەوەو نابنە هۆی پەیداکردنی نەخۆشی یان ناڕێکیەکی بەردەوام لە ماسولکەکانی دڵ یان لە پەردەی (ناوپۆشی) دڵدا (Endo-cardium).

## (نەشتەرگەری بۆ چارەسەکردنی قژڕووتانەوە)

وانەبێ قژڕووتانەوە تەنها لەمرۆڤدا ڕوویدا بەڵکو گیانەوەدرە شیردەرە بەرزدکانی وەکو شەمبانزیشی گرتۆتەوە، لەباری ئاساییدا (٩٦٪)ی کورەکان مووی لای پێشەوەی سەریان هەڵدەوەرێ پاش تەمەنی باڵقبوون، وە لە (٨٠٪)ی ئافرەتاندا پاش ئەم تەمەنە جۆرێک لەقژڕووتانەوە لایان ڕوودەدات.

قژهەڵوەرین چوار قۆناغی هەیە:

- قۆناغی یەکەم: ڕووتانەوەی تەنیشتەکانی لای پێشەوەی سەر.
- قۆناغی دووەم: ڕووتانەوەی تەنیشتەکانی پێشەوەی سەرو تەنک بوونی تۆقی سەر.
- قۆناغی سێیەم: ڕووتانەوەی تەنیشتەکانی پێشەوەی سەرو ڕووتانەوەی تۆقی سەر.
- قۆناغی چوارەم: ڕووتانەوەی گشتی تەنها بەشێکی خوارەوەی پشتەسەر و پشت گوێیەکان نابێ کە بەدەگمەن قژ لەم ناوچانەدا دەڕووێتەوە.

لەشێوەیەکی گشتی (٨٠٪)ی پیاوان پاش تەمەنی (٧٠)ساڵی دوچاری قۆناغی جیاجیای قژڕووتانەوە دەبن، کە نزیکەی (١٥٪) لەقۆناغی چوارەم (دواقۆناغی ڕووتانەوە) دان، لەئافرەتدا تەنها (٢٥٪) پاش تەمەنی (٤٠) ساڵی دووچاری قۆناغی یەکەمی قژڕووتانەوە دەبن، لەگەڵ ئەمەشدا چڕی موو لەبەشەکانی دیکەی لەشدا زیاد دەکات.

چارەسەرکردنی قژڕووتانەوە

هەرکە ناو یان ڕێکلامی دەرمانێکی نوێ بۆ چارەسەرکردنی قژڕووتانەوە دەنگ دەداتەوە، هەزاران کەس بەئومێدی چاکبوونەوە روو لەدەرمانخانەو بازاڕەکان دەکەن.

لەڕاستیدا تائێستا دەرمانێکی ئاوا لەبەردەستدانییە کە ئەنجامی مسۆگەری هەبێ، بۆ نموونە دەرمانی مینۆکسیدیل (Mnioxdil) کە بەشێوەی گیراوەی (٢٪) ڕۆژانە دوو جار لەپێستی دەدرێ لەوانەیە پاش چەند مانگێک لەبەکارهێنانی کەمێک قژ لەهەندێک کەسدا ببوژێنێتەوەو سەرلەنوێ گەشە بکەنەوە، بەڵام پاش وازهێنان لە بەکارهێنانی ئەم دەرمانە ئەوا جارێکی ترقژ لەهەمان شوێندا دەڕووێتەوە، دەرمانی ئەندرۆجین (واتە دژی هۆرمۆنی نێرینە) کە سودی زۆریان هەیە لەڕاگرتنی قژڕووتانەوە لە ئاستێکدا، یان دووبارە گەشەکردنەوەی قژ، کار دەکەنە سەرژیانی سێکسی و منداڵبوون کە بەخەساندنی داروویی ناودەبرێت، کەچی دەکرێ ئەم جۆرە دەرمانانە بۆ نموونە سیپرۆتیرۆن (Cyproterone)سەرکەوتووانە لەئافرەتدا بەکاردەهێنرێت و ئەنجامی باش و مسۆگەریان دەبێ بێ ئەوەی هیچ ئاکامێکی خراپیان لێ بکەوێتەوە.

نەشتەرگەری

پاش هەرەس هێنانی دەرمان و ئامێری کارەبایی و ڕێگای دیکەی چارەسەرکردنی قژڕووتانەوەو نەشتەرگەری

پاش هەرەس هێنانی دەرمان و ئامێری کارەبایی و ڕێگای دیکەی چارەسەرکردنی قژڕووتانەوە، نەشتەرگەری جوانکاری بەتاکە ڕێگای چارەسەرکردن دەمێنێتەوە، نەشتەرگەری بۆ چارەسەکردنی قژڕووتانەوە پشت بەو قژە دەبەستێ کە لەتەنی

(شت گوێیەکان) و لای پشتەوەو خوارەوەی سەر ماونەتەوە و زۆر بەدەگمەن هەڵدەوەرێن (هۆی ئەمەش تائێستا بەتەواوی نەزانراوە)، دووبارە قژ لەو شوێنانەی قژیان لێ‌ڕووتانەوە دەچێنرێتەوە (دەگوازرێتەوە) بەمەرجێک پزیشکی نەشتەرگەری جوانکاری کارامەو لێهاتوو هەبێ.

شەش ڕێگای نەشتەرگەری جوانکاری هەیە بۆ چارەسەرکردنی قژڕووتانەوە::

١- پاچە گرافت (Punch Grafts)

کۆنترین و بڵاوترین ڕێگایە، مێژووی بۆ ساڵی (١٩٥٩) دەگەڕێتەوە لەسەر دەستی زانا ئۆریتێنزایخ (Oricitreich) و بریتییە لەگواستنەوەی پارچە پێستی بازنەیی لەپشت گوێیەکان و چاندنیان لەشوێنی مەبەست، تیرەی هەر پارچەیەک لەنێوان (٣-٥) میلیمەتر دایە (کە ٨-٢٥ دانە قژ هەڵدەگرێ). لەهەر سەردانێکی پزیشکدا دەکرێ (١٠-٦٠) پارچە بچێنرێ، پاش (٣) مانگ قژ بەتەواوی لەشوێنی مەبەست گەشە دەکات. ئەم نەشتەرگەرییە ئاسانە، بەڵام وردەکاری زۆری دەوێ لەلایەن پزیشکی نەشتەرگەری جوانکارییەوە.

٢- گواستنەوە بەشێوەی شریت (Flaps) لە پشت گوێیەکان بۆ ئەو شوێنەی دوچاری ڕووتانەوە بووە، بەگواستنەوەی پارچەیی شریتی جیاجیاو یەک لەدوای یەک (بەقۆناغ) کە ڕووبەرەکەیان بەگوێرەی نەرم و سستی پێستی سەر لەنێوان (٢-٥) سانتیمەتر دووجا دایە، ئەم نەشتەرگەرییە خێرایە و ئەنجامی باشی هەیە.

٣- بچووک کردنەوەی ڕووبەری پێستی سەر (Reductio) لەو شوێنانەی دوچاری ڕووتانەوە بووینە، ئەم نەشتەرگەرییە ئاسانەو وردەکاری زۆری ناوێ.

٤- کشاندنی شانەکان (Tissue Expansion):

ئەم ڕێگایە بەشێوەیەکی لەجیهانی نەشتەرگەری جوانکاریدا لەقەڵەم دەدرێ، بریتییە لەزیاتر سستکردن و نەرم کردنی بنێسەی (درێژخایەن) پێستی سەر بەچاندنی چەند باڵۆنێکی تایبەت لەژێر پێستی سەردا (ئەو شوێنانەی قژیان نەڕووتاوەتەوە) و پڕکردنی ئەم باڵۆنانە بەمادەی تایبەت و لەکاتی جیاوازدا تاکو سستبوونەکە دەگاتە قەبارەیەکی دیاریکراو کە (٣ هەفتە - ٣ مانگ) دەخایەنێ، ئینجا باڵۆنەکان لادەبرێن و شوێنە ڕووتاوەکانیش لادەبرێن، پاشان پێستە کشاوەکە دەخشێنرێتە پێشەوەو شوێنی ڕووتانەکە دادەپۆشێ، ئەم نەشتەرگەرییە ئەنجامی باشی هەیە، بەڵام بەنرخێکی گران ئەنجام دەدرێ.

٥- کوتانی پزیشکی (Medical):

واتە کوتان و ڕەنگ کردنی ئەو شوێنانەی پێستی سەر کە بەهۆی برین یان سووتانەوە دوچاری قژڕووتانەوە بووینە، بەشێوەی دروستکردنی هێڵی ڕەنگکراو لەنێوان مووەکاندا تاکو قژڕووتانەوە بشارێتەوە (واتە کوتان بەبۆیەی تایبەت کە بێ زیانە بۆ پێست)، ئەم ڕێگایە بەتەنیا یان لەگەڵ ڕێگاکانی دیکەی نەشتەرگەری جوانکاری ئەنجام دەدرێ بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی نێوان قژە چاندراوەکان.

٦- قژی دەستکرد (Synthetic hair):

لەژاپۆندا بۆ یەکەم جار قژی دەستکرد لەمادەی پۆلیستەر (Polyester) دروستکراو بەشێوەو ڕەنگی جیاواز، ئەمە لەلایەن لیژنەی خۆراک و دەرمانی ئەمەریکی (FDA) پەسندکراوە، قژی دەستکرد لەوکاتەدا بەکاردەهێنرێ کە پێستی سەر هیچ نەخۆشیەکی نەبێ (وەکو هەوکردن، تووێژاڵ و توێشکە، خورشت)، ئەم قژانە دانە دانە بەدەرزی تایبەت و تەکنیکی تایبەتەوە لەپێستدا دەچێنرێت، بەڵام ئەگەری ڕەتکردنەوە لەئارادایە (چونکە لەشی مرۆڤ خۆی لەخۆیدا هەموو تەنێکی یان ئەندامێکی بیانی ڕەت دەکاتەوە)، بۆیە لەسەرەتادا تەنها (٦٠) دانە لەقژی دەستکرد دەچێنرێت و چاودێری دەکرێن بۆ ماوەی (٦) مانگ، ئەگەر سەرکەوتووبوو ئەوا دەکرێ (٣٠٠٠)دانە قژی دەستکرد لەقۆناغی یەکەمی چارەسەرکردندا بچێنرێن، لەوانەیە یەکێک پێویستی بە (١٠)هەزار دانە قژی دەستکرد بێت، پاشان چاودێری تایبەتی پێویستە لەکاتی شوشتن و شانەکردندا و دەبێ بەگیراوەی تایبەت مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ.

**دەزگای کارەبایی بوژاندنەوەی قژ**

ڕۆژانە لەسەرتاسەری جیهاندا هەزاران کەس سەر لە مەکتەبی پزیشکانی پێست و نەشتەرگەری جوانکاری دەدەن بەمەبەستی چارەسەرکردنی بێهێزبوونی قژ، قژ هەڵوەرین تا دەگاتە ڕووتانەوەی (قۆناغی چوارەم) زۆربەی قژی سەر زۆر لەپیاوان هێندە گوێ بەم مەسەلەیە نادەن، بەڵام کەسانی دی بەدەست قژ ڕووتانەوە دەناڵێنن و ڕاستەوخۆ کاردەکاتە سەر سەرکەوتنیان لەکارەکانیاندا و ڕێڕەوی ژیانیان، بەهەرحاڵ بۆ هەموو ئەوانەی گرفتی قژیان هەیە دەرفەتێکی نوێ هاتۆتە ئارا بۆ دووبارە گەشەکردنەوەی قژ لەپێستی سەریاندا.

بەم دواییە کۆمپانیایەکی ئینگلیزی دەزگایەکی بەرهەم هێناوە بەناوی (دەزگای کارەبایی بوژاندنەوەی قژ) کە زۆر لەدەزگای وشکردنەوە و ستایلکردنی قژ دەچێ کە لەساڵۆنی ئارایشگای ئافرەتاندا بەکاردەهێنرێ، بەڵام ئەم دەزگایە نوێیەو باگەیەکی کارەبایی تایبەت دەخاتە سەرپێستی سەر (هەفتانە بۆ ماوەی (١٢) خولەک)، پاش چەند هەفتەیەک قژە مانەکان دووبارە گەشە دەکەنەوە و دەڕوێنەوە (لەو کەسانەی دووچاری قژڕووتانەوە بووینە، بەڵام ڕەگی قژیان نەمردوون بەڵکو بێهێز و ماتن)، ئەم دەزگایە تائێستا ئەنجامی باشی هەیە بۆ دووبارە چالاککردنەوەی ڕەگی قژە وەریوەکان.

لێکۆڵینەوەکان لەزانکۆی کۆلۆمبیای بەریتانی لەڤانکۆڤەردا پشتگیری لەم دەزگایە دەکەن و ڕێژەی سەرکەوتنیان بە (٩٦٪) خەمڵاندووە بۆ چارەسەرکردنی زۆربەی حاڵەتەکانی قژڕووتانەوە.

**سەرچاوەکان**

Psychiatry by David A. Tomb چاپی سێ یەم
Clinical Psychiatry by Russel Baton چاپی دیەم
American Medicaei Journal No. 11 Vol. 118
British Meidical Journal No. 469 Vol. 288. 1999
British Medical Journal Vol 37 - No 987.

# گوزارشتی مۆسیقا

ن/د. فوئاد زەکریا
و: حەمە کەریم عارف

## پێشەکی

ئەمڕۆکە مشت و مڕێکی ئەدەبی دەربارەی سروشتی هونەرو ئامانجەکانی هونەر لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکانماندا دەبینرێ، کە ئاخۆ دەبێ هونەر پەیامدار بێ یا هەر هونەر لەپێناوی هونەردابێ. هەرچەندە ئەم مشت و مڕە ناوی زۆری کێشاوەو ماوەیەکی زۆری خایاندووە، بەڵام لایەنگرانی هیچ لایەنێک لەو دوو لایەنە هەوڵیان نەداوە لەیەکدی نزیک ببنەوەو لەگۆشەنیگای یەکدی تێبگەن، کەچی ئاشکرایە کە کرۆکی ئەرکی لێکۆڵەرەوە لەمەڕ هونەرێک لەهونەرەکان، ئەگەر بیەوێ باس و لێکۆڵینەوەکەی پابەند بێ بەکێشە فیکرییەکانی سەردەمی خۆیەوە، ئەگەر بیەوێ هەڵوێستی خۆی لەمەڕ ئەو کێشانەوە دەربڕێ و واتا جۆراجۆرەکانی بخاتە بەر وردەبینی لێکۆڵینەوەوە، ئەگەر بیەوێ لەنزیکەوە ئەو کێشانە موناقەشە بکات، ئەوا نابێ خۆی لەو مشت و مڕانە دوورەپەرێز بگرێ.

- یەکەم شتێک کە دەمەوێ ئاماژەی بۆ بکەم ئەوەیە کە، کێشەی هونەری پەیامدارو هونەر لەپێناوی هونەردا وای لێهاتووە لەلای زۆربەی ئەوانەی خۆیانی لێدەدەن مانای خۆی لەدەستداوە، ئەو مەسەلەیەی کە لایەنگرانی بیرۆکەی هونەر لەپێناوی هونەردا داکۆکی لێدەکەن بریتییە لەمەسەلەی خۆبەخۆیی هونەرمەندو مەبەست لەوەیە کە نابێ چ ئامانجێک لەدەرێ را بەسەر هونەرمەندا بسەپێنرێ، بەڵکو دەبێ وازی لێ بهێنرێ تا گوزارشت لەو شتە بکات کە خۆی هەستی پێدەکات.

ئەو هەڵەیە کە زۆربەی لایەنگرانی بیرۆکەی هونەری پەیامدار (گوناحم دەگا ئەگەر بڵێم هەر هەموویان) تێی دەکەون ئەوەیە کە بەجۆرێ بانگەوازەکەیان دەخەنەڕوو وەک بڵێی ئامانجێکی دیاریکراو بەسەر هونەرمەند بسەپێنێ و دەبێ هونەرمەند هونەرەکەی بۆ خزمەتی ئەو ئامانجە تەرخان بکات، دیارە ئەم هەڵەیە گەورەترین هەڕەشە لەمەسەلەکەیان دەکات و خەنیمەکانیان لەئاسمانێ را دەیقۆزنەوەو بەقازانجی خۆیان و دژ بەوان بەکاری دەهێنن، چونکە گومان لەوەدا نییە کە ئازادی ئەفراندن و خۆبەخۆیی داهێنان مەرجێکی بنەڕەتی هەموو بەرهەمێکی هونەری بێ خەوشەو ئەگەر ئەم مەرجە نەمێنێ ئەوا کارە هونەرییەکە دەبێ بەشتێکی دەستکردو بێ گیان.

هەروەها بانگەوازی هونەر لەپێناوی هونەریشدا خاڵێکی لاوازی ئەوەندە زەقی تێدایە لەوانەیە ڕێبازی لایەنگرەکانی لەبناغەوە هەڵتەکێنێ- ئەویش جڵەوشۆڕکردنە بۆ بیرۆکەو ئازادی و خۆبەخۆیی تا ئەو ڕادەیەی واز لەهونەرمەند دێنن بەئارەزووی خۆی بەرهەم بخاتەڕوو تەنانەت ئەگەر بەرهەمەکەشی ڕووخێنەرو دژ بە بنەما مرۆڤایەتیەکان یا ئەو کۆمەڵە بێ کە هونەرمەندەکە تێیدا دەژی، تەنانەت ئەگەر بەرهەمەکەشی گیانی سەرشۆڕی و داوەشێن لەنێو کۆمەڵدا بڵاوبکاتەوەو کێشە ڕاستەقینەکانی ئەو کۆمەڵە پشتگوێ بخات. بێ چەندوچون هونەر مەسئولیەتێکی گەورەیەو هەرکە هونەرمەند ڕێی بەخۆیدا هونەرەکەی لەنێو خەڵکی بڵاوبکاتەوەو هەر بەوەندەوە نەوەستا کە هونەرەکەی هەر بۆ خودی خۆی و سەرگەرمی خۆی تەرخان بکات، مانای ئەوەیە چووەتە ژێر باری ئەم مەسئولیەتە گەورەیە، بۆیە پێویستە لەسەر ئەو شوێنەوارەی کە کارە هونەرییەکانی لەسەر کۆمەڵ جێ دێڵێ موحاسەبە بکرێ.

کەواتە هەڵوێستی هەردوو لایەنەکە خاڵی لاوازی تێدا هەیەو پێویستە بژاربکرێن، هەروەها هەڵوێستی هەردوو لایەنەکە هەلاوێردەی (میزە) خۆیان هەیەو دەبێ بپارێزرێن. یانی حاڵ و وەزعی ئاسایی هونەر ئەوەیە کە ئازادو خۆبەخۆ بێ و لە هەمان کاتدا فاکتەرێک بێ لەفاکتەرەکانی پێشخستنی کۆمەڵ بەرەو ئایندەیەکی پرشنگدارو ڕووناک.

**. بانگەوازی هونەر لە پێناو هونەریشدا خاڵێکی لاوازی ئەوەندە زەقی تێدایە لەوانەیە ڕێبازی لایەنگرەکانی لە بناغەوە هەڵتەکێنێ- ئەویش جڵە و شۆڕکردنە بۆ بیرۆکە و ئازادی خۆبەخۆیی.**

باشە چۆن ئەم دوو مەرجە بەڕواڵەت ناکۆک و ناتەبایە پێکەوە بگونجێنێ؟ گومانم لەوەدا نیە کە هونەرمەندی راستەقینە ئەگەر وازی لێ بهێنرێ و چ شتێکی لەدەرێ را بەسەر نەسەپێنرێ ئەوا خۆبەخۆ هونەرێکی پەیامدار بەرهەم دێنێ، بێگومان کۆمەڵێک بێتە سەر بەراورد لەنێوان هونەرمەندێکدا کە بەپیرییەوە بێ و هونەرمەندێکدا کە خۆی لەگیروگرفتەکانی ئەو کۆمەڵە کەڕ بکات و دەورە پەرێز بوەستێ ئەوا تای هونەرمەندی یەکەم دەگرێ نەک دووەم، بەڵکو رەخنەگری شارەزاش دەبێ تای یەکەم بگرێ، چونکە کۆڵەکەی هونەر بەر لەهەموو شتێک هەستی تیژو ناسکە، جا هونەرمەندێک هەستی جام ببێ و بگاتە ئەو رادەیەی هەست بەگیروگرفتی کۆمەڵەکەی و دەورووبەرو خۆی نەکات- بۆ نموونە هەموو گیروگرفتەکان لەتامەزرۆیی سێکسیدا ببینێ و لەکاتێکا کۆمەڵگاکەی پڕ بێ لەگیروگرفتی زیندووی ئەوتۆ کە چارەسەر کردنیان بۆ دابینکردنی ژیانی رۆڵەکانی ئەو کۆمەڵگایە پێویست بن- دیارە ئەم چەشنە هونەرمەندە ناوەکەشی لێ خەسارە، هەر ئەم پێوەرو عەیاری بەراوردکارییە واتە ناسکی هەست و تیژی سەرنجە کە وامان لێدەکات ئەو هونەرمەندەمان بەلاوە پەسەندتر بێ کە بەشداری گیروگرفتەکانی کۆمەڵگاکەی دەکات و یارمەتی دەدات لە چارەسەرکردنیاندا.. لەو هونەرمەندەی کەخۆی دوورەپەرێز ددگرێ و گیروگرفتە زاتییەکانی خۆی ددکاتە مەزدی سەرگەرم کردنی خەڵکی.

کەواتە خۆبەخۆیی و پەیامداری هونەر بەهیچ جۆرێ ناکوک و ناتەبانین، بێگومانم لەوەی ئەگەر مەسەلەکە بەمجۆرە تەماشا بکرێ لەگەڵێ گفتوگۆ و مشتومڕی نا پێویست دوورمان دەخاتەوە، ئەو گفتوگۆو مشتومڕانەی هەر لایەنێک لەدوو لایەنەکە پێی لەسەر دادەکرێ بێ ئەودی هەوڵ بدات لەڕاو بۆچوونی لایەنەکەی دی حاڵی ببێ، بۆچوونی دەستەی هونەر بۆ هونەر ئەوەیە وادەزانن خەنیمەکانیان هەوڵدەدن سنوری سەربەستی هونەرمەند تەنگ بکەنەوەو بابەتی دیاریکراو بەسەردا بسەپێنن، (ئەگەر قسەی هەندێک لەجاڕدەرانی هونەری پەیامدار شی بکەینەوە دەبینین جاڕدەرانی هونەر بۆ هونەر لەم قسەیەیاندا هەندێ بیانووی خۆیان هەیە، کەچی راوبۆچوونی دەستەی هونەری پەیامدار ئەوەیە کە ئازادی و خۆبەخۆیی بێ قەیدوشەرت لەگەڵ گۆشەگیری و تاک رەویدا یەک دەگرێتەوە)، (ئەمانیش لەم بۆچوونەیاندا هەندێ بیانووی خۆیان هەیە) خۆ ئەگەر هەر دەستەیەک لەم دوو دەستەیە، هەڵوێستی دەستەکەی دی شی بکاتەوە ئەوا بەئاشکرا دەردەکەوێ کە چ ناکۆکی و ناتەبایییەکیان لەنێواندا نیە! ئەگەر شیکردنەوە بێ بناغەکان لە هەردوو هەڵوێستەکەدا بژاربکرێ.

> . بۆچوونی دەستەی هونەر ئەوەیە وا دەزانن خەنیمەکانیان هەوڵدەدەن سنوری سەربەستی هونەرمەند تەنگ بکەنەوەو بابەتی دیاریکراوی بەسەردا بسەپێنن.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەدوورودرێژ باسی یەکێک لەو کێشانە دەکەین کە لەکۆمەڵگاکەماندا هەیەو چارەسەرکردنی بەکارێکی پێویست دەزانین، ئەویش گیروگرفت و کێشەی گوزارشتی مۆسیقایە، ئەو دوا چارەسەرەش کە لەکۆتایی کتێبەکەدا دەیخەینەڕوو بەرجەستەکردنی ئەو قسەیەیە کە گوتمان، وەزع و حاڵی کۆمەڵگا کاردەکاتە سەر هونەرمەندو شەقڵی تایبەتی خۆی دەخاتە سەرکارە هونەرییەکانی و دەبێ واز لەم رەنگدانەوەیە بهێڵرێ تا خۆ بەخۆو ئازادانە دەربکەوێ بێ ئەوەی چ هێزێکی دەرەکی بەسەر هونەرمەندیا بسەپێنێ، تەنیا بەم رێگایە هونەری مۆسیقامان دەگاتە ئەو ئاستەی کە هونەری مۆسیقای جیهانی پێگەییوەو ئەوساکە دەتوانین بەئەرخایەنیەوە بڵێین کە مۆسیقایەکی بەپێزو دەربڕمان هەیە. تەموزی ١٩٥٦ فوئاد زەکەریا

-١-

## خەسڵەت و رەگەزەکانی هونەری مۆسیقا

## تەبیعەت و هونەری مۆسیقا...

ئەو پایە بەرزو ناسکەی ئەوڕۆکە مۆسیقا هەیەتی زادەی ئەو پەرەسەندنە تازانە نیە کە ئەم هونەرە پێیدا رەتبووە پێشینان باوەڕیان وابووە کە کاریگەری مۆسیقا لەسەر ناخ و دەروون لەکاریگەری سەرلەبەری هونەرەکانی دی پتر بووە، بەڵگەی ئەوەش ئەو چیرۆک و حەکایەت و داستانە زۆرانەیە کە توانای لەڕادە بەدەری داوەتە پاڵ مۆسیقاو گوایە کار لەسروشت دەکات، بۆ وێنە کێو دەبزوێنێ یا کار لەسەر دەروونی ئادەمیزاد دەکات و وای لێدەکات دوای ئیغرای پەریانی دەریا بکەوێ گەرچی ئەم دواکەوتنە سەرگی ئادەمیزادەکەشی لەدوایە، لەدنیای باوەڕی ئایینیشدا مۆسیقا بایەخێکی گەورەی هەبوودو بەهەردوو باری چاکەو خراپەدا خۆی نواندووە، هەندێ لەباوەڕەکان پەنایان بردووەتە بەر مۆسیقا بۆ چەسپاندنی ئیمان لەدڵ و دەروونی خەڵکیدا، چاکترین بەڵگەی ئەوەش ئەوەیە کە مۆسیقای رۆژئاوایی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە تەواوی وا بەستەی کڵێسابوو، بگرە هەندێ لە نهێنیەکانی مۆسیقا تایبەت بوو بەپیاوانی

ئایینەوەو پشتاوپشت بۆیان دەمایەوەو بێ ئەوەی هیچ یەکێکیان هەوڵی درکاندنی ئەو نهێنیانە بدات، خۆ هەندێ لە باوەڕەکان مۆسیقایان حەرام دەکرد یا بەحەڵاڵێکی ناحەزیان دەژماردو ئەمە خۆی لە خۆیدا دان پێدانانێکی پەنامەکی بوو بەڕۆڵی مۆسیقا لەسەر دەروون، جا با ئەم ڕۆڵەی ئێرد بەخەتەرێکی رەوشتی زانرابێ و خۆ لێ دوور خستنەوەی پێویست بووبێ.

مێژوو لەخەرمانی بیری دێرینەدا بەرهەمێکی بۆ پارا ستووین کە رەنگە یەکەم بەڵگەنامەیەک بێ کە کێشەی کارتێکردنی رەوشتی و کۆمەڵایەتی گشت هونەرەکان بەگشتی و هونەری مۆسیقا بەتایبەتی تێدا ورووژێنرابێ، مەبەستم لەکۆمارەکەی ئەفلاتوونە کە تیایدا داوای بایەخ دان بەفێربوونی مۆسیقا دەکات و بەفاکتەرێکی بنەڕەتی پەروەردەکردنی نەوەکانی دادەنێ، هەروەها داوای دوورخستنەوەی هەندێ مەقاماتی مۆسیقی دیاری کراو دەکات گوایە کاریگەری رەوشتی و دەروونی خراپیان هەیە

بەڵام ئایا هەڵوێستی شارستانیەتی نوێ دەربارەی مۆسیقا، پاش ئەوەی شوێنەواری سیحرو ئەفسوون لەمێشکاندا سڕایەوەو دیدگایەکی جیا لەباوەڕی کردە زەڕەبینی و روانین بۆ هونەر بەشێوەیەکی گشتی گۆڕا؟ ئەلهەقی پایەی مۆسیقا لەناو سەرلەبەری هونەرەکانی دیدا نەگۆڕا، ئەوەی لەم بوارەدا روویدا هەر ئەوە بوو پاش ئەوەی ئەو هۆیانە کەشف بوون کە لەسەرەتادا بەشێوەیەکی مەیلەو سۆفیانەی پەنامەکی و ئەفسوناوی دەڕوانرایە مۆسیقا، نرخاندنی مۆسیقا بوو بەکارێکی هۆشیارانە.

مۆسیقا بەتەبیعەت لەگشت هونەرەکانی دی سەربەخۆترە، مۆسیقا هونەری وێنەگرتن یا نیگارکێشانی هەندێ بابەتی ئەوتۆ نیە کە بکرێ ئاماژەیان بۆ بکرێ، هەروەها هونەرێک نیە کە رەگەزەکانی خۆی راستەوخۆ لەواقیعی خارجییەوە هەڵگوێزێ، بەوەش تێی ناگەیت کە وەربگێڕدرێتە سەر هۆیەکی دی لەهۆیەکانی گوزارشت کردن، دەبا باسی هەر یەکێک لەم خەسڵەتانە بەجیا بکەین:

مۆسیقا بەوە لەگشت هونەرەکانی دی جیادەکرێتەوە کە وێنەی شتێک ناگرێ یا لاسایی شتێک ناکاتەوە، کەچی سەیر دەکەین رەسم هونەرێکی وێنەگرتنە، نەحت لەڕێگای هەر سێ مەوداکەیەوە پێوەندی بەوێنەگرتنی واقیعی خارجییەوە هەیە.

ئەدەبیات لەڕێگای هێما زمانەوانیەکانەوە واقیع دەخوێنێ، بەڵام مۆسیقا نە لاسایی چ شتێک دەکاتەوەو نە تەمسیلی چ شتێک دەکات، بۆیە لەم بوارەدا هونەرێکی سەربەخۆیە بۆ خۆی، بەڵام ئەم قسەیەمان- ئەگەر بمانەوێ وردبین - پتر قۆناغە کۆنەکانی هونەرەکان دەگرێتەوە تا قۆناغی ئەمڕۆیان، چونکە رەسم و نەحت - بگرە هەندێ قوتابخانەی ئەدەبیش - لەڕێبازی تازەیاندا بەرەو ئەوە دەچن دەستبەرداری وێنەگرتن و لاسایی کردنەوە بن و بەوەندە وازبێنن کە ئاماژە بۆ هەندێ واتای دیاریکراو بکەن بێ ئەوەی پێوەندییەکی لاسایی کردنەوەی راستەوخۆ لەنێوان کارە هونەرییەکەو ئەو واقیعەدا ببینین کە کارە هونەرییەکە تەمسیلی دەکات، دەتوانین بڵێین ئەم ڕێبازە خۆی لەخۆیدا نزیک خستنەوەی مۆسیقاو سەرلەبەری هونەرەکانی دییە لەیەکدی لەکاتێکا سەیر دەکەین کە ئەمە ئەنجامی پەرەسەندنی تازەیە لە هونەرەکاندا، بەڵام لەمۆسیقادا سروشتێکی بنچینەییەو هەر لەهەوەڵەوە لەگەڵیا بووە، بەڵام ئەگەر گوترا کە مۆسیقا هەندێ جار هەوڵ دەدا لاسایی دەنگەکانی سروشت بکاتەوە ئەوا دەتوانین بەرپەرچی ئەو قسەیە بدەینەوەو بڵێین، ئەو لاسایی کردنەوەیە وەکو لەگەڵێ پارچە مۆسیقای بابەتدارا وێنەی باهۆز یا با دەگیرێ لەراستیا ئیشارەتە بۆ ئەو رەگەزانەی سروشت و لاسایی کردنەوەیان نیە، چونکە وەکو ئاشکرایە دەنگەکانی سروشت مۆسیقایی نین، چونکە لەرەکانی (ذبذبات) رێکوپێک نیە، بۆیە مەحاڵە مۆسیقا راستەوخۆ لاسایی بکاتەوە، بەڵکو مۆسیقا دێت ئەو دەنگانە مشت و ماڵ دەکات و پاشان لەدوورەوە ئاماژەی، بۆ دەکات. مۆسیقا تەنیا لەهەندێ حاڵەتی دەگمەندا لاسایی هەندێ دەنگی سادەی سروشت دەکاتەوە وەکو ئەمە بزاڤی (حرکة) دووەمی سەمفۆنیای شەشەمی بیتهۆڤندا، دەبینرێ کە لاسایی دەنگی هەندێ باڵندان بۆ جوانی دەکاتەوە نەک لەپێناوی لاسایی کردنەوەی راستەوخۆدا.

ئەم مەسەلەیە بەرەو خەسڵەتی دووەمی مۆسیقامان رادەکێشێت وەکو گوتمان لەرەی دەنگەکانی سروشت ناڕێک و پێکەو بەم پێودانگە ناگەنە دەنگی مۆسیقایی. ئەوەش مانای ئەوەیە کە ئەو کەرەستەیەی هونەری مۆسیقا بەکاری دەهێنێ و ساختمانە ئاڵۆزەکانی خۆی لەسەر بینا دەنێ واتە دەنگە مۆسیقایی و ئەوا هەڵاوێردەکانی لەسەر بینا دەنێ راستەوخۆ لەسروشتەوە هەڵی ناگوێزێ، بەڵکو کەرەستەیەکە پێویستی بەهۆی دروستکراو هەیە کە

**. مۆسیقا بەوە لە گشت هونەرەکانی دی جیا دەکرێتەوە کە وێنەی شتێک ناگرێ ، یا لاسایی شتێک ناکاتەوە.**

**. مۆسیقا بە پێچەوانەی گشت هونەرەکانەوە بریتی نییە لە لاسایی کردنەوەی دیاردەکان یا دروستتر بڵێین بریتی نییە لە لاسایی کردنەوەی رواڵەتە بابەتییەکانی ویست.**

بریتییە لەو ئامێرە مۆسیقاییانەی دەنگەکان مشت وماڵ دەکەن و لەرەی دەنگەکان رێکدەخەن، یا بریتییە لەو گۆرانییە مەشق لەسەر کراوانەی کە زۆر جیان لەدەنگەکانی ئاخاوتن، یا هاواری ئاسایی. بۆ زیاتر روون بوونەوەی ئەو بیرۆکەیە پێویستە ئاماژە، بۆ ئەوە بکەین کە مەحاڵە ئامێرە مۆسیقایەکانی لاسایی دەنگەکانی ئینسان بکەنەوە؛ چونکە رێکوپێکی لەرەی ئەو دەنگانەی لەم ئامێرە مۆسیقاییانەوە دەردەچن بواری ئەو لاسایی کردنەوەیە نادەن.

ئا لەم سیفەتەدا مۆسیقا بەعالەم ئاشکرا لە گشت هونەردکانی دی جیاوازە، رەسم کەرەسەی خۆی کە رەنگ و هێڵە، راستەوخۆ لەسروشتەوە وەردەگێ، یا شتێکی لەبابەتی ئەو کەرەستەیە لەسروشتدا دەبینێ هەروەها بەنیسبەت ئەو تۆپەڵانەوە کە هونەری نەحت بەکاریان دێنێ و ئەو وشانەی ئەدەب لە ئاخاوتنی ئاسایی ئادەمیزادەوە هەڵیان دەگوێزێ.

مادامەکی کەرەستەی هونەری مۆسیقا راستەوخۆ لەهیچ سەرچاوەیەکەوە هەڵ ناهێنجرێ تەنیا لەو هۆیانەوە نەبێ کە بۆ گوزارشتکردن لەم هونەرە ئامادەکراون. واتە لەئامێرەکانەوە یا گۆرانی مەشق لەسەر کراوەوە، هەڵێنجراوە بۆیە سەیر دەکەین ئەم هونەرە گەییوەتە رادەی سەربەخۆییەکی ئەوتۆ کە قەوارەی تایبەتی خۆی هەبێ و مەحاڵە بخرێتە پاڵ چ شتێکی دی، بۆ وێنە سەیر دەکەین شیعر- بەلای کەمەوە لەرووی واتاوە. ئەگەر تەرجەمەی زمانێکی دی بکرێ قابیلی تێگەیشتنە، هونەرە لاسایی کەرەوەکان بەگەرانەوە بۆ ئەو سەرچاوانەی لاساییان کردونەتەوە قابیلی تێگەیشتنن، بەڵام سەیر دەکەین مۆسیقا مەحاڵە وەربگێردرێتە سەر هیچ زمانێکی دی.

ئەزمونی مۆسیقا ئەزموونێکی بێ هاوتایەو زەوق لێ بینینی تەنیا لەرێگای پرۆسەیەکی تایبەتەوە دابین دەکرێ، ئەو سۆزو گودازەی مۆسیقا دروستی دەکات مەحاڵە بەزمانێکی دی گوزارشتی لێبکرێ یا بەهۆیەکی دی لەهۆیەکانی دەربرین گوزارشتی لێبکرێ، هەروەها تەنیا لەرێگای ژنەوتنی خودی مۆسیقاکەوە دەتوانرێ بهێنرێتە بەرچاو، هەر لەبەر ئەمەیە کە گوتراوە مۆسیقا زمانێکی سەربەخۆیە بۆ خۆی.

بەڵام ئایا سەربەخۆیی تاکە سیفەتی هەڵاوێردەی هونەری مۆسیقایە؟ ئەلهەقی مۆسیقا بەدوو سیفەتی بنچینەیی لەگشت هونەردکانی دی جیا دەکرێتەوە، ئەویش بریتییە لە سیفەتی گشتێتی (صفة العمومية)و سیفەتی زاتی (صفة الذاتية) سیفەتی گشتییەکە دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە: هونەری مۆسیقا هونەرێکی سەربەخۆی تەواوە مادامەکی زمانی مۆسیقا پێوەندییەکی راستەوخۆی بەبابەتەکانیەوە نیە، مادامەکی رەگەزەکانی راستەوخۆ لەسروشتەوە هەڵناگوێزێ.

بەڵکو- لەبوارە تایبەتییەکەی خۆیدا دای دەهێنێ، بۆیە مەحاڵە مۆسیقا وەسفێکی راستەوخۆی هەر بابەتێکی تایبەتی پێشکەش بکات، بەڵکو هەمیشە هەڵچوون و هەستە گشتییەکان وێنە دەگرێ، پیاو هەرچەندە هەوڵ بدات پێوەندی نێوان دانراوە مۆسیقاییەکان و بابەتی دیاریکراو دەست نیشان بکات هەر دەبێ دان بەوەدا بنێ کە مۆسیقا لایەنە وردەکانی ئەو بابەتە ناگرێ بەڵکو گوزارشت لەلایەنە درشت و گشتییەکانی دەکات، بێگومان هونەرەکانی دی لەمۆسیقا بەدەسەڵاتر لەوێنەگرتنی تایبەتێتی و شتە وردەکاندا، ئەگەر کاری هونەری دروست، جا چ چامە یا تابلۆ یا پەیکەرسازی بێ ئەو توانایەیان دەبێ لەبابەتە وردە راستەوخۆکەیەوە بمانبات بۆ بابەتە گشتییەکەی کە هەموو شتە وردەکان لەسایەیدا جێگیر هەبێ ئەوە بێگومان ئەم بردن و گواستنەوەیە لەرێگای زەوق وەرگرتنێکی تایبەتییەوە ئەنجام دەدرێ، کە تەنیا لەلای ئەو کەسانە هەیە کە ئەزموون و تێگەیشتنی قوڵیان لەمەڕ سروشتکاری هونەری لا گەڵاڵە بووە. بەڵام بەنیسبەت مۆسیقاوە کارتێکردنی راستەوخۆی بریتییە لە هەستە گشتییەکان کاتێ کە گوێ لەپارچە مۆسیقایەک دەگری و واتای خەمێک یا حەماسەتێکت لەلا دەوروژێنێ مەحاڵە بتوانی بڵێی ئەمە خەمی کەسێکی دیاری کراوە یا حەماسە بۆ کارێکی دیاریکراوە بەڵکو راستەوخۆ هەستێکی گشتیمان سەبارەت بەخەمەکە یا حەماسەکە لەلا دروست دەبێ کە لەدواییداو بەهۆو رێگای دەستکردەوە بۆمان دەردەکەوێ.

بەڵام خەسڵەتی خودی (الذاتية) دەگەرێتەوە بۆ پێوەندی بەتینی نێوان مۆسیقا و زەمان، چونکە هونەری وەک: نەحت و نیگارکێشان، هونەری مەکان هەندێکیشان لەدوو مەودا وەک، نیگارکێشان، هەندێکیان لەسێ مەودادا وەک، نەحت بەرجەستە دەبن و لەرووی مەکانیشەوە زەوقیان لێ وەردەگیرێ، مەبەستم ئەمەیە کە ئەم

کاره هونەرییانە لەیەکەم نیگاو سەرەنجا زەوقیان لێوەردەگیرێ، زەمان چ رۆڵێکی لە دەرک کردنیاندا نیە. تەنیا ئەوە نەبێ کە هەندێ لایەنی پۆشراو و ئاڵۆزی ئەو یەکەم دەرک کردنە روون دەکاتەوە، بەلام هونەری مۆسیقا بەراستی هونەری زەمانیە: مەبەستم ئەمەیە کە ئەداکەی بە جۆرێکی زەمانی یەک لە دوای یەک ئەنجام دەدرێ، ئاوازو ریتم و پارچە هارمۆنیەکانی وەکو ئەڵقەی یەک زنجیر بەدوای یەکدا دێن. بەوتەیەکی دی مۆسیقا هێڵێکی شاقولی زەمانی هەیە، بەلام هونەری نیگار کێشان و نەحت هێڵێکی مەکانی ئاسۆیی هەیە. بێگومان ئەم جیاوازیە دەگەرێتەوە بۆ سروشتی ئەو هۆیە هەستیانەی کە ئەم هونەرانەی پێ نەقل دەکرێ. مۆسیقا لە رێگای گوێچکەوە نەقل دەکرێ کە یەکێکە لەو هەستانەی پشت بە دووی یەکا هاتنی زەمان دەبەستێ ، بەلام هونەری نیگارو نەحت لە رێگای چاوەوە نەقل دەکرێن کە لە هەستە مەکانیەکان و یەکراست مەوداکانی دەرەوە دەبینێ و راستەو خۆ دەرکی پێ دەکات.

فەیلەسوفەکان لە کۆنەوە زەمان و زاتیەتیان پێکەوە گرێ داوە، چونکە ئەو هەستانەمان کە دەچنە قالبی مەکانیەوە وەک ئەوشتانەی دەبینرێن و بەدەست و لەش هەستیان پێ دەکەین بریتین لە هەستی بابەتی راستەوخۆ وەکو شت گەلێکی جیا لە خۆمان دەرکیان پێ دەکەین، بەلکو ئەو هەستانە بناغەی باوەرمانن بەبوونی جیهانی دەرەوەی خۆمان، بەلام ئەو هەستانەی کە دەچنە قالبی زەمانیەوە وەک ئەوشتانەی دەبیسترێت بەتەبیعەتی خۆیان زاتین. مەبەستم ئەمەیە کە پشت بەو زاتە دەبەستێ کە دەیقۆزێتەوەو هەستێکی وامان لەلا دەوروژێنێ کە لەناخی ناخمانەوە هەڵقولابێ. چاکترین بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە بیرکردنەوە پرۆسەیەکی تەواو باطنیە، دەچێتە قالبی زەمانەوە کە بریتیە لە بەدوایەکاهاتنی بیرەکان، مەحاڵە بچێتە قالبی مەکانەوە، واتە بیرەکان لە دەرەوە را ببینرێ! بەم پێوانگە مۆسیقا لە هەرهەموو هونەرەکانی دی پتر پابەندە بەزاتی ئینسانەوە.

هەر لەبەر ئەم خەسڵەتە دەگمەنانە بووە کە مۆسیقا پایەیەکی تایبەتی لەلای زاناو فەیلەسوفەکان هەبووەو هەندێکیان وایان لەقەڵەم داوە کە فاکتەرێکی گەورەی تێگەیشتنی بووە لە گەردوون. ئەوەی سەروسەختی لەگەڵ فەلسەفەدا هەبووبێ هەرگیز ئەو رایە کۆنەی لەیاد ناچێت کە بەتەواوی ئەم قسەیەی ئێمە دەسەلمێنێ. مەبەستم لە رای فیتاغورسییەکانە کە گەردونیان بە ژمارەو نەوا (نغمة) لە قەڵەم داو لێک دایەوە. خۆ ئەگەر ئەم گوتەیەیان گوتەیەکی مەجازی بێ و بەوە لێک بدرێتەوە کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی گەردوون دوو لایەنی هەیە، لایەنی چەندی کە بریتیە لەژمارەو لایەنی چۆنی کە بریتیە لە نەوا، ئەوا نابێ ئەوەمان لەیاد بچێ کە بەکارهێنانی خودی ئەو ئاماژەو هێمایە، خۆی لە خۆیدا دەلالەتێکی قوڵی هەیەو گوزارشت کردنیان لە گشت جیاوازیە گەورە چۆنیەکانی ناو گەردوون بەوشەی نەوا نیشانەی رادەی بەرینی چەمکی نەوایە لەلای وان و نیشانەی رادەی پێوەندی نەوایە بەسروشتی گشتیی گەردوون لە روانگەی وانەوە.

ئەگەر بمانەوێ لەم بارەیەوە سەرنجی قسەی فەیلەسوفێک بدەین، ئەوا گرینگترین کەسێک لەم مەیدانەیا شوپنهاوەرە، با هەندێ لە وتە قوڵانە وەربگرین کە شوپنهاوەر لەبەشی یەکەمی کتێبەکەیدا (العالم بوصفه ارادە وتمثلا) دەربارەی سروشتی مۆسیقا گوتویەتی: (گشت ئەو کەڵکەڵەو خولیاو ئارەزووانەی تووشی ویست دەبێ و هەر هەموو ئەو شتانەی لەناخی مرۆڤدا روو دەدەن و ئەقڵ و ژیری ناوێکی خاڵیسەی لێ دەنێ کە بریتیە لە (هەست)، هەر هەموو ئەوانە زۆر بەچاکی لەئاوازە (لحن) لەبن نەهاتووەکاندا تەعبیریان لێدەکرێ، بەلام ئەو تەعبیر لێکردنە لەبارە گشتیەکەیەوە تەواو لەو وێنە خاڵیسەیە دەچێت کە لەهەموو مادەو کەرەستەیەک دابڕابێ، گوزارشت لەخودی شتەکە دەکات نەک تەنها لەدیاردەکان، بەپێی ئەو پێوەندیە کۆکەی نێوان مۆسیقاو کرۆکو جەوهەری راستەقینەی هەر شتێک ئەوەمان بۆ ساغ دەبێتەوە کە ئەگەر مۆسیقا گوزارشتێکی هەمواری لەدیمەنێک یا رووداوێک یا جەوێک کرد، ئەوا هەر هەموو ئەو شتانەمان بەروونی بۆ دەردەکەوێ، مانا پەنامەکیەکانیانمان لەبەر چاو روون دەبێتەوە، بەو جۆرە مۆسیقا دەبێ بەچاکترین شیکەرەوە و لێکۆڵەرەوەیان - هەروەها ئەو کەسەی لەگەڵ کاریگەری سیمفۆنیایەکدا تێکەڵ دەبێ ئەوا گشت رووداوەکانی ژیان و جیهان لەخودی خۆیاندا دەبینێ، وێرای ئەوەی کە ئەگەر هەندێ بەهێمنی لەشتەکە تێفکرێ ئەوا چ لێکچوونێک لەنێوان دەنگی ئاوازەکان و ئەوشتانەی دەوریان داوە نابینێ، چونکە مۆسیقا بەپێچەوانەی گشت هونەرەکانەوە بریتی نیە لەلاسایی کردنەوەی دیاردەکان یا دروستتر بڵێین بریتی نیە لەلاسایی کردنەوەی رواڵەتە بابەتیەکانی

**. مۆسیقا هەمیشە بەر لە گشت شتێک هونەرێکی ئینسانیە، مەبەستم ئەوەیە کە هونەرێکی پەیوەستە بە ژیانی واقیعی و کێشە و ململانێکانی ناو ئەم ژیانە.**

ویست، بەڵکو وێنەیەکی ڕاستەوخۆی خودی ویستە، مانای میتافیزیکی هەر هەموو شتێکی تەبیعی لەم جیهانەدا دەخاتەڕوو، ئەودیوی گشت دیاردەیەک روون دەکاتەوە. بەو پێیە وەکو چۆن دەکرێ جیهان ناوبنرێ ویستێکی بەرجەستە، دەشکرێ ناو بنرێ مۆسیقایەکی بەرجەستە وەکو لەو دەقەی سەرێ را دەرکەوت چ فەیلەسوفێک نابینین بەئەندازەی شوپنهاوەر دڵبەندی شەقڵە دەگمەنەکەی مۆسیقا بووبێ، کەواتە هەقی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ئەم فەیلەسوفەی هەموو گەردونی بەدیاردەی ویستزانی نەیتوانی ڕاستەوخۆ پەی بەو ویستە بەرێ، بەڵکو لەڕێگای مۆسیقاوە پەی پێ برد، ئەو مۆسیقایەی کە لاسایی بابەتی دەرەوە ناکات و هەستە دەروونیەکان بەڕێگای ناڕاستەوخۆ نەقڵ ناکات، بەڵکو ڕاستەوخۆ گوزارشت لەگشت لایەنەکانی ویست دەکات، هەر بۆیەش پێی وابوو مۆسیقا فاکتەرێکی هەند گرنگە بۆ تێگەیشتنی سروشتی شاراوەی خودی جیهان کە خۆی لەخۆیدا ویست بەرجەستە دەکات یا حەز دەکەی بڵێ مۆسیقا بەرجەستە دەکا.

ئامانەوێ درێژە بەباسی ئەم دیدە سۆفیستانەیە بۆ مۆسیقا بدەین، بەڵکو ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە؟ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە شەقڵی تایبەتی هونەری مۆسیقا بوو بەئیلهام بەخش و سەرچاوەی ئەم چەمک و روانگەیە بۆ مۆسیقا.

ئەوەی شایانی باسە مۆسیقا هەمیشەو بەر لەگشت شتێک هونەرێکی ئینسانیە، مەبەستم ئەوەیە کە هونەرێکی پەیوەستە بەژیانی واقیعی و کێشەو ململانێکانی ناو ئەم ژیانەوە.

پاش ئەوەی زۆرمان لەمەڕ (خۆیی بوون) و گشتێتی و زاتیەتی مۆسیقا گوت، لەوەیە ئەو رایەمان هەندێ غەریب و سەیر بێتە بەرچاو، لەوە مرۆڤ لەم خەسڵەتانەوە وا تێبگات کە مۆسیقا هونەرێکی جیا بێ لەو واقیعە زیندووەی کە خەڵکی تیایدا دەژی. خەسڵەتە گشتییەکەی وای لێبکات لەگشت دیدێکی تایبەتی بۆ ژیان و کۆمەڵ دوور بکەوێتەوەو تاقە هێزی داهێنانی مۆسیقا بریتی بێ لەو هەستە زاتی و زروفە فەردیەی کە دانەری مۆسیقاکە پێیدا رەت دەبێ، دیارە ئەم چەشنە تێگەیشتن و دەرکە ئاسمان و ڕێسمانە لەگەڵ مەبەستی ئێمەدا، هەر هەموو ئەو خەسڵەتانەی ئاماژەمان بۆ کردن پەیوەستن بەهۆیەکانی داهێنانی مۆسیقاوە، نەک بەو هێزەوە کە هاندەری داهێنانە یا

**. ئەوەی دەتوانین پێی لەسەر دابگرین ئەوەیە کە جیاوازی بەینی مۆسیقای موجەرد و مۆسیقای بابەتدار تەنیا لە پلەدایە.**

بەو ئامانجەوە کە هونەرمەند لەبەرچاوی دەگرێ، چونکە ناسکی هونەرمەندی راستگۆ وای لێدەکات لەهەموو کەس پتر بکەوێتە ژێر کاریگەری وەزع و حاڵی ژیانی دەوروبەری خۆیەوەو مۆسیقاکەی دەبێت بەرەنگدانەوەیەکی گەش و زیندووی ئەو حاڵ و وەزعانە، هەرچەندە هۆی داهێنانە هونەرییەکەی زاتییە. ڕاستە واتاکانی مۆسیقا گشتین، بەڵام بێگومان سۆزو گودازێکی ئەوتۆ دەوروژێنێ کە لەگەڵ بیرو هەستی هزری هونەرمەنددا دەگونجێ، ڕاستە مۆسیقا دەستەوسانە بەرانبەر بەگوزارشت لە بیرۆکەیەکی تایبەتی یا هەستێکی دیاری کراو یا وردە ڕووداوێک، بەڵام بێ چەندوچۆن ئەو جەوە عەکس دەکاتەوە کە هونەرمەند کەوتووەتە ژێر کاریگەرییەوە، هەستێکی وا لەدەروونی گوێگرانیدا دروست دەکات کە شان بەشانی هەستی هونەرمەندەکە لە دەمی دانانی مۆسیقاکەدا بڕوات، خۆیی بوونی مۆسیقا بەهیچ جۆرێ ئەوە ناگەیەنێ کە لەواقیعەکەی دەوروبەری دابڕاوە، بەڵکو جیاوازی دوا وێنەی مۆسیقاو ئەم بابەتە پێوەندی لاسایی کردنەوەو کاوێژکردنەوەو وێنەگرتنی ڕاستەوخۆ نیە، بەڵکوپەیوەندیەکە ئیجابیە کە مۆسیقا لە دەروندا دەی وروژێنێ و هەستێکی گشتی وا دروست دەکات کە لەگەڵ سروشتی ئەو بابەتەدا دەگونجێ هەرچەندە ڕاستەوخۆ لاسایی ناکاتەوە.

مەبەستم ئەوەنیە کە هەر مۆسیقایەک ئەم خەسڵەتانەی تێدا بوو و گوزارشتی لەو واقیعە زیندووەی دەوروبەری کرد ئەمانە خەسڵەتی مۆسیقان، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە کە نموونەی باڵای مۆسیقا دەبێ ئەو خەسڵەتانەی تێدا بێ، هەندێ ژینگەی مۆسیقایی تایبەتی هەیە کە لە نموونەی باڵا نزیک بووەتەوەو بەگشت تواناوە هەوڵی بۆ بەدیهاتنی داوە، ئەویش ژینگە مۆسیقاییەکانی ڕۆژئاوایە کە لەم بەشەی لێکۆڵینەوەکەماندا باسی لێوە دەکەین.

### - ٢ -
### زمانی مۆسیقا

هەموو هونەرێک دوو لایەنی هەیەو لایەنی تەرکیبی و لایەنی تەحلیلی، تەرکیبیەکە بریتییە لەدوا شێوەی کارە هونەرییەکە، هەڵوێستمان سەبارەت بەم لایەنە ئەوەیە کە نرخە ئیستاتیکییەکەی دیاری بکەین بەپێوانەی تایبەتی ئەو هونەرە بی پێوین، بەڵام لایەنی شیکردنەوە وەکو

لەناوەکەیدا دیارە بریتییە لە شیکردنەوەیەکی زانستانەی وردی ئەو ئامرازانەی کە هونەرمەند بەکاریان دەهێنێ، شیکردنەوەی ئەو شێوازە جیاوازانەی کە هونەرمەند دەکەوێتە ژێر کاریگەرییان، شیکردنەوەی ئەو تازە گەرییانە کە هونەرمەند دایان دەهێنێ، هەموو هونەرێکی پوخت دەبێ ئەو دوولایەنەی پێکەوەو لەیەک کاتدا تێدابێ، ئەگەر لەگەڵ لەناو بردنی وشەی هونەردا یەکەم کەرەت لایەنی یەکەم بێتە بیرو خەیاڵ، ئەوا بێگومان لایەنی شیکردنەوە ئەو بناغە زانستییەمان دەداتە دەست کە دەبێ هەر هونەرێک پشتی پێ ببەستێ، راستە لەوەیە گەلێک لەو شیکردنەوانەی کە لەبواری شیکردنەوەی زانستیانەماندا بۆ هونەر دەیان گەینێ بەبیرو هزری هونەرمەندا نەهاتبن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا بۆ وەچەکانی داهاتوو پێویستە تا ژیانی هونەری خۆیان لەسەر بناغەی تێگەیشتنێکی زانستیانەی تەواوی پەرەسەندنەکانی رابردووی مەیدانە تایبەتییەکەی هونەر بینا بکەن..تا بتوانن لەسەر بناغەیەکی دروست درێژە بەرێگا بدەن، ئەو راو و بۆچوونانەی تەنیا پێ لەسەر رەگەزی (بەهرەی خۆرسک)و ئامادەیی ئاسایی دادەگرن و رەگەزی زانستانەی شیکردنەوە فەرامۆش دەکەن بێگومان راو بۆچوونی بێ سەروبەرن و لەدنیای ئەو رۆماندا جێیان نەماوە.

یەکەم شتێک کە دەبێ لەشیکردنەوەی زانستیانەی مۆسیقادا ئاوڕی لێ بدرێتەوەو بخرێتە بەر ورد بینی لێکۆڵینەوەوە بریتیە لە رەگەزەکانی زمانی مۆسیقا، چونکە مۆسیقا زمانێکی تایبەتی خۆی هەیە، ئەم زمانەش کۆمەڵێ رەگەزی هەن کە بەتەنیا رۆڵی خۆ نابینن، بەڵکو گشت رەگەزەکان یەکدەگرن و تێکەڵ دەبن و تێکڕا دانراوە مۆسیقاییەکە پێکدێنن، رەگەزەکانیش بریتین لە ریتم، (الایقاع) ئاواز (اللحن) هارمۆنی دەنگ (التوافق) فۆرم (القالب). ریتم، لایەنی تایبەتی بزوتنەوە مۆسیقاییە یەک لەدوای یەکەکانە لە بواری زەماندا، واتە سیستەمی کێشی بزوتنەوەی یەک لە دوای یەکی نەواکانە (الانغام) رەگەزی گونجان و رێکخستن بەسەر ریتمدا زاڵ دەبێ، چونکە ریتم بریتییە لە دووبارە بوونەوەی زەربەیەک یان کۆمەڵە زەربەیەک، بەشێوەیەکی رێکوپێکی ئەوتۆ کە گوێچکە لەگەڵ هەر جارێکا پێشبینی بکات، کەواتە ریتم چ شتێکی تازە ناخاتە سەر ئاواز، بەڵکو رێکخستنی زەمەنی بزوتنەوەی ئاوازە، بەمەرجێ لە بواری ئەم بزوتنەوەیەدا رەگەزی (التاکید المتوتر) دوا بەدوای یەکدی بێت، هەروەها بەرزبوونەوەو نزم بوونەوەی ئەم (توتر)ش دوا بەدوای یەکدی بێت و.......هتد لێکۆڵەرەوەکان دەرکیان بەوە کردووە کە پەیوەندییەکی توند لە نێوان ریتمی مۆسیقاو ئەو سیستەمەدا هەیە کە بزوتنەوەی لەش و بزوتنەوەی تەبیعەت لەسە دەڕۆن، لەش بزوتنەوەی ریتمی خێرای هەیە وەکو هەناسە وەرگرتن و هەناسە دانەوە، هەروەها ریتمی تا رادەیەک هێواشی هەیە وەکو بەدوای یەکدا هاتنی برسێتی و تێربوون، نووستن و هەستان، لە سروشتا ریتمی دووانی هەیە وەکو بەدوای یەکدا هاتنی شەوو رۆژ، هەروەها ریتمی، چواری هەیە وەکو بەدوای یەکدا هاتنی وەرزەکانی ساڵ، هەر بۆیە گەلێک لە لێکۆڵەرەوەکان گوتویانە کە مۆسیقا بنەمایەکی ئورگانی یا سروشتی هەیە، مادامێکی بزوتنەوە ریتمییەکانی دووبارە کردنەوەی بزوتنەوە، هاوجۆرەکانی خۆیەتی لە لەشی ئینساندا یا لە سروشتدا، کە ئەمە دەبێتە مایەی دروست بوونی ئەو شتەی کە دەتوانرێ ناوبنرێ بەهەستی ریتم لەلای ئینسان باشترین بەڵگەش بۆ ئەمە، ئەوەیە کە یەکەم بە پیرەوە چوونی منداڵ یان کەسانی سادەو سەرەتایی بۆ مۆسیقا بە پیرەوە چوونێکی ریتمییە کە لەجۆرە خۆلارکردنەوە یا سەمایەکی سادەدا لەگەڵ ریتمی نەواکاندا خۆی دەنوێنێ، هەروەها دیاردە سەرەتاییەکانی مۆسیقا زۆرجار بریتییە لە ریتمێکی پەتی رووت - واتە هەر ریتمی رووت بەبێ دەنگی مۆسیقایی - وەکو چۆن ئەمە لەلای گەلێ لەتیرە سەرەتاییەکاندا دەبینرێ، ئەو تیرانەی کە گشت ژیانی مۆسیقاییان تەنیا تەپڵ لێدانەو بەس.

بەڵام ئاواز هەر بەوەوە ناوەستێ کە زەربە مۆسیقاییەکان بەگوێرەی توندی یا هێواشی ئەو زەربانە، رێک بخات، بەڵکو رەگەزێکی نوێ دەخاتە سەر ریتم ئەویش بەرزی یا نزمی دەنگەکانە بێگومان بەکارهێنانی هەردوو وشەی بەرزو نزم لێرەدا بەکارهێنانی مەجازی رووتە، چونکە هیچ چەشنە پێوەندیەکی مەکانی لەم بابەتە، لەنێو دەنگەکاندا نییە، بەڵکە مەبەست لە دەنگی بەرز ئەو دەنگەیە کە خێرایی لەرەکانی زیاد دەبێ، بەڵام دەنگی نزم یا پان ئەوەیە کە بزاڤی لەرەکانی کەم دەبێ، دەنگی مۆسیقا بەشێوەیەکی گشتی بەرێکوپێکی و چەسپاوی لەرەکانیا دەناسرێتەوە، بەڵام ژمارەیەکی یەکجار زۆری لەرە هەیە لەنێوان دەنگێک و ئەو دەنگەی لە پاشییەوە دێت، جا ئەم دەنگە بەرزبێ یا نزم، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دەنگەکانی مۆسیقا بەجۆرێ بەدوای یەکدا دێن کە گوێچکە لە هەندێ شوێندا لە بەینی ژمارەیەکی زۆر لەو لەرانەدا دەوەستێ، ئەو لەرانەی کە بەجۆرێ بەدوای یەکدا دێن کە گوێچکە لە خۆیەوە ناتوانێ جیایان بکاتەوە، کۆی ئەو شوێنە دیاری کراوانەی کە گوێچکە لە ئاستیاندا دەوەستێ شتێک پێک دێنێ کە پێی دەگوترێ پەیژەی مۆسیقا (السلم الموسیقی).

ئاشکرایە ئەم پەیژەیە لەسیستەمە ئاوازێکەوە بۆ سیستەمێکی دی دەگۆڕێ پەیژە لە مۆسیقای رۆژئاوادا ئەوە نیە کە لەمۆسیقای رۆژهەڵاتدا هەیە هەروەها ئەوەش نیە کە لەمۆسیقای سەرەتاییدا هەیە، ئەگەر خەڵکی هەندێ جار تەنیا کەیفیان بەو ئاوازانە بێ کە بەپەیژە باوەکەی لای خۆیان دارێژراوەو پێیان وابێ ئاوازەکانی دی - بەشێوەیەکی گشتی - بەگوێی هەموو مرۆڤایەتی بێگانەو ناپەسەندە؛ دیارە ئەمە تەنیا کاری راهاتنە، ئەو راهاتنەی کە هەستی هونەرییان بەگوێرەی سیستەمە دەنگە باوەکەی خۆیان دەسازێنێ، لە ئاوازە دەنگەکان چ بەرزو چ نزم، دوابەدوای یەکدی دێن، هەڵبەتە دانەری مۆسیقا سەربەستە لە گواستنەوەی دەنگەکان، بەڵام ئەم سەربەستییە رەها نییە، بەڵکو چەند مەرجێکی هەیە، بۆ نموونە ئەو دەنگەی دەکەوێتە جەواب یا قەراری پەیژەکە لە دەنگە هەرە گرینگەکانەو ئاوازەکە بۆ ئەو

دەگەڕێتەوە تا ئەوساکە گوێچکە هەست دەکات کە ئاوازەکە بەشێوەی ئاسایی خۆی تەواو بووە.

ئەگەر بچینە سەر هارمۆنی (التوافق الصوتی) سەیر دەکەین ئەم رەگەزە هەر چەندە لە مۆسیقای رۆژهەلاتیمانا ناباوە، بەلام رۆژبەرۆژ بایەخی پتر لە دنیای مۆسیقادا پەیدا دەکا، ئەوەی موتابەعەی رەوتی مۆسیقای رۆژئاوا بکات دەبینێ لەکاتێکا مۆسیقا لە سەدەی هەژدەو نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا گەورە ترین بایەخی بە ئاواز دەدا، پاشان وردە وردە رووی کردە هارمۆنی، تا وای لێهات لە ئاخرو ئۆخری سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستدا گەلێک لە دانەرەکانی گوێیان بەوە نەداوە کە مۆسیقاکانیان مۆسیقای دیبوسییە (Debussy).

بناغەی هارمۆنیش بریتییە لە دروستکردنی گونجاوی دوو دەنگ یا زیاتر لەیەک کاتدا، بەلام ئاواز کۆمەلە دەنگێکی گونجاوی دوابەدوای یەکە، لەگەل ئەوەشا لێکۆلینەوەی هارمۆنی تەنیا بە پەیوەندییەکانی نێوان ئەو کۆمەلە دەنگەوە ناوەستێ کە لەیەک کاتدا لێدەدرێن، بەلکو پێویستەو دەبێ بایەخ بە پەیوەندییەکانی نێوان ئەو کۆمەلە دەنگانەو پێوەندی ئەمیان لەگەل ئەوی دیکەیاندا بدات و چۆنێتی گواستنەوە لەیەکێکیانەوە بۆ یەکێکی دیکەیان رێک بخات تا ئاوازەکە بۆ نموونە بەهارمۆنیەک کۆتایی نەیەت کە هەستی پێشبینی کردن یا چاوەڕوانی ببزوێنێ، بەلکو ئەم هارمۆنیە زەمینیە بۆ هارمۆنیەکی دیکەی ئەوتۆ خۆش بکات کە هەستی ئۆخەی و ئاسوودەیی ببزوێنێ، لەگەل ئەوەشدا هەر هەمو ئەو دەستورانەی تەحەکوم لە هارمۆنی دەکەن قابیلی گۆڕانن، پەرەسەندنی مۆسیقا هەمیشە شتی نوێی دەخاتە سەرو بگرە هەندێ جار هەولدەدا سیستەمە کۆنەکانی هارمۆنی لە بناغەوە هەلتەکێنێ و بیڕووخێنێ.

بەلام فۆرم (الصورة او القالب) ئەمەشیان رەگەزێکە مۆسیقای رۆژهەلات نای ناسێ یا نایزانێ، فۆرم پێوەندی بەینی بەشەکانی ئاواز لە کاری هونەری درێژدا رێکدەخات و یەکێتی بەینی هەموو بەشەکانی پارچە مۆسیقاکە دەستەبەر دەکات، هەر هەمو ئەمانە لەو گیروگرفتانەن کە مۆسیقای رۆژهەلات پێویستی بە رووبەڕوو بوونەوەیان نیە گیروگرفتی فۆرمی مۆسیقا یەکجار ئالۆزەو ناتوانین لەم بوارەدا بەتێرو تەسەلی ئامـاژەی بکەینێ، هەر ئەوەندەمان پێ دەکرێ بلێین دەکرێ لە پارچە مۆسیقا درێژەکاندا تیمەی سەرەکی ئاواز جیا بکرێتەوە، دانەر سیستەمێکی دیاریکراو بۆ ئەم تیمە ئاواز دارانە (موضوعات لحنية) دادەنێ و بەپێی قەریحەی خۆی گەلێ گۆڕان و ئیزافاتی تیادا دەکا، دیارە لە هەمو ئەم کارەیدا بابەتی سەرەکی و وردو درشتەکانی ئەو بابەتە سەرەکییە موعالەجە دەکا کە مۆسیقاو رەسمی مۆسیقا لەسەر رۆییبوە، هەر چەندە لە هەمو وەزع و حالێکدا گۆڕانە بچووکەکان مومکینە. لەداڕشتنی تیمە ئاوازە سەرەکییەکاندا لەسەری دەڕوا، هەروەها شیکردنەوەی گواستنەوە لەداڕشتنەکەوە بۆ ئەو ئیزافاتانەی بۆی کردووە، بەجۆرێکی ئەوتۆ کە هەمە رەنگیەکی زیندوو بۆ کارە هونەریەکەی مسۆگەر بکات و لەهەمان کاتا یەکێتییە هەمە لایەنەکەی کارەکەی بپارێزێ لێکۆلینەوەی رەگەزو توخمەکانی زمانی مۆسیقا وامان لێدەکات رووبکەینە شیکردنەوەی ئەو رێبازەی کە ئەم زمانە بەکاری دەهێنێ. رێبازی بەکارهێنانی زمانی مۆسیقا بایەخێکی تایبەتی بەنیسبەت هونەری مۆسیقاوە هەیە. لە هونەرەکانی دیدا کاری هونەری راستەوخۆ لە داهێنەرەوە بۆ وەرگری هونەرەکە دەچێ. واتە پەیوەندیەکی دوو لایەنی لە ئارادایە. بەلام لە مۆسیقادا پەیوەندییەکە. پەیوەندییەکی دوو لایەنی راستەوخۆ نیە. بەلکو پەیوەندییەکی سێ لایەنیە. خاوەن ئەداکە (چ عازف بێ چ گۆرانی بێژ) دەبێ بە پێناو (وسیط) لە نێوان دانەرو گوێگردا. بۆیە پێویستە هەلوەستەیەک لە ئاستی رۆلی هەر لایەنێک لەم پەیوەندییە سێ لایەنیە لە گواستنەوەی زمانی مۆسیقادا بکەین.

دانەر، ئەنجامی ئەفراندنی هونەری خۆی بەنووسین تۆمار دەکات، بێگومان مۆسیقاش وەکو هەر زمانێکی دی کەلکێکی زۆری لە نووسین وەرگرتووە؛ یارمەتی پاراستنی دانراوە مۆسیقاییەکانی داوە بێ ئەوەی دووچاری ئەو شێواندنە ببێ (دانراوە مۆسیقاییەکان) کە ئەگەر تەنیا بەبیستن نەقل کرانایە تووشی دەبوون، بێگومان هێماکانی نووسینی مۆسیقا بەردەوام وردترو دەولەمەندتر بووە، بەرادەیەک لەو ئاخروئۆخرانەدا توانای ئەوەی پەیدا کرد کە هەموو وردو درشت و جۆرێکی پارچەکە تۆمار بکات، وای لێبکات کە ئەگەر ئەداکەی وردبێ، پارچەکە تەواو بەو شێوەیەی کە دانەرەکەی ویستویەتی و بێ هیچ رێ نوێنیەکی خودی، دانەرەکەی ئەدا بکرێ - هەلبەتە لە کۆندا وانەبووە، دانراوە مۆسیقاییەکان زۆر شتیان بە تەقدیری خاوەن ئەداکە دەسپارد، هەر بە هونەری نووسینەوە توانرا ئەم پەرە سەندنە جۆراوجۆرانە لە مۆسیقادا بێنەدی کە بەردەوام قوولی پێ بەخشیوە؛ نووسین، دانەر لە ئیرتجالیەت و خۆبەخۆیی دەپارێزێ، دەرفەتی ئەوەی بۆ دەڕەخسێنێ کە کەرەستە مۆسیقاییەکەی بەکارامەترین شێوە مشت ومال بکات و مەودای تازەی بۆ ئیزافە بکاو دەولەمەندی و قوولی پتری پێ ببەخشێ.

بەم تۆمار کراوانە کاری خاوەن ئەدا دەست پێ دەکا، ئەرکەکەی ئەوەیە کە وەکو پێناوێک (و سیط) واتاو هەستەکانی دانەر وەکو چۆن لە تۆمارکراوەکەی خۆیدا تۆماری کردووە، بەگوێگران بگەیەنێ، روونترین و سادەترین مەرجی خاوەن ئەدا ئەوەیە کە وردو ئەمین بێ، بەلام ئەم مەرجە هەندێ ئالۆزی لەگەل خۆدا دێنێ کە چارەسەرکردنی کارێکی ئاسان نیە، دەبێ ئەنجامدەر (مۆدی) تا چ رادەیەک وردو ئەمین بێ؟ رای جیاواز لەسەر وەلامی ئەم پرسیارە هەن رایەک هەیە ئەوە بەسەر ئەنجامدەردا دەسەپێنێ کە خۆی لە گشت ئارەزوویەکی شەخسی دوور بخاتەوەو تەنها نەقل کردنی وردو بەدیقەت بکا بەخەم، بەلام ئەو ئیرادەی لەم رایە دەگیرێ ئەوەیە کە ئەنجامدەر دەکا بەشتێکی تەواو سەلبی و ئامێر ئاسا، لەگشت رەفتارێکی هۆشیارانە دای دەبڕێ، بۆیە زۆر کەس بانگەوازی ئەوە دەکەن کە ئەنجام دەر بەگوێرەی فەهم و زەوقی

خۆی ڕەفتار بکات بەمەرجی نەشێواندان و دەستکاری نەکردنی ئەو شتەی کە نەقلی دەکا، ڕەچاو بکا، لە ڕاستیا شەخسیەتی کەلە عازف و گۆرانی بێژان بەئاشکرا لە جۆری ئەدایان دەردەکەوێ، سەیر دەکەی وەختێ ئاوازێ دەژنەوی تەواو عەقلی ئەنجامدەرەکەی پێوە دیارەو ڕەنگە ئەم شەقلە تا ڕادەیەکی زۆریش شەخسی بێ، دەمەوێ ئەوە بڵێم کە هەر چەند گوێم لە (کونچرتو) بووبێ یەکسەر کەمانچەژەنی مەزن (جوزیف ریجیتی)م بیر کەوتووەتەوە هەستم کردووە ئەداکە شێوازی شەخسی هونەرمەندەکەی گرتۆتە خۆ، ئەو شێوازەی کە گوێچکەی شارەزاو ڕاهاتوو هەر لەیەکەم جاردا هەستی پێدەکات و دەیناسێتەوە، سەیر دەکەی شێوازەکە جیایە لەگشت شێوە ئەداکانی دی و کارێکی وای کردووە کە پارچەکە وابێتە بەرچاو کە گیانێکی یەکجار تازەی بەبەرا کراوە - هەر هەموو ئەمانە کراوە بێ ئەوەی کەمو زۆر دەستکاری ئەسڵەکە کرابێ، ئەلهەقی ئەوە سیفەتی ئەدای داهێنەرانەیە کە ئەقلی شەخسیەتی ئەنجامدەر وەر بگرێ و بەرۆحی ئەو پاراوبێ بێ ئەوەی ئەمە چ جۆرە دەستکاری و لادانی بەسەر ئەو شتەدا بێنێ کە دانەر لە تۆمار کراوەکانیدا تۆماری کردووە.

بەڵام ڕۆڵی گوێگر بریتییە لە قۆزتنەوەو وەرگرتنی ئەو چەمک و واتاو هەستانەی کە دانەر تۆماری کردوون و ئەنجامدەر بۆی نەقڵ کردووە، من وای بۆ دەچم کە گوێگرتن هونەرێکە بۆخۆی و مەشقکردنێکی دوورو درێژی دەوێ تا مرۆڤ بگاتە ڕادەی ئەوەی بەدروستی مومارەسەی گوێگرتن بکات، چونکە گوێگرتن پلەو قۆناغی جیاوازی هەیە: لە قۆناغەکانی یەکەما مرۆڤ توانای تەنیا بەسەر تێگەیشتنی مۆسیقای سووکی ئاشکرای وەکو هەموو چەشنە مۆسیقاکانی سەمادا دەشکێ، چونکە ئەم مۆسیقایە قووڵ نیەو سام و ویقارێکی ئەوتۆی نیە، بۆیە بەزۆری گوێگرتن لەم چەشنە مۆسیقایە ڕەفتاری دی تێکەڵ دەبێ: بۆ وێنەگرتن و قسەکردن لەیەک کاتدا - مەحاڵە لەم قۆناغەدا گوێگرتنی خەست و قووڵ پەروەردە ببێ، لە قۆناغی دوایی دیکەدا شێوەی گوێگرتن پڕ ئەزموونتر دەبێ و مرۆڤ دەتوانێ زەوق لە پارچە مۆسیقای قوڵتر وەربگرێ، بەڵام ناتوانێ هەمووی حەزف بکا یا لەواتای بەشە ئاڵۆزەکانی تێبگا، بۆیە دەبینین گوێگر لەم قۆناغەدا زۆر بەهەندێ بەشی دیار کراوی ئەو پارچە مۆسیقایانەی کە گوێی لێ دەگرێ سەغڵەت دەبێ، ڕەنگە بێ ئەوەی گوێگرتنەکەی تەواو بکا هەستێ و بڕوا، من وەکو ئەزموونی خۆم - ئەوەم لە بیرە کە لەم قۆناغەدا نەمدەتوانی زەوقی تەواو لەو پارچە مۆسیقا ڕۆژئاواییانە وەربگرم کە بەپیانۆ لێدەدران یا گۆرانی بێژان دەیانچڕێ، چونکە پیانۆ لە مۆسیقای ڕۆژئاوادا ئەو بۆشاییە زەمەنیەی نێوان ئەم نیشانە مۆسیقاییەو ئەو نیشانە مۆسیقاییە پڕ ناکاتەوە، بەڵکو بۆ ئەو دەنگدانەوەی بەجێ دێڵێ کە یەکەم زەربە دروستی دەکا، بۆیە پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە بۆ گوێچکەیەک کە بەژنەوتنی عەزفی ڕۆژهەڵاتی ڕاهاتبێ زەحمەتە، بۆیە وادەهاتە بەرچاو کە پارچەکە کۆمەڵە دەنگێکی لێکدابڕاوبێ و هزر نەتوانێ یەکێتییەکیان لە نێواندا دروست بکات، هەروەها ئەو بزاڤە دەنگیانەی کە گۆرانی ڕۆژئاوایی جیا دەکاتەوە سەنتەرە سەرەکیەکەی ئاوازەکە دەسڕێتەوەو مرۆڤ ناتوانێ موتابەعەی بکا، لەو کۆسپانەی کە لەم قۆناغەدا دێتەڕێی مرۆڤ، ئەوەیە کە مرۆڤ زۆر جار پەنا دەباتە بەر لێکچوونی شیعری و ئاوازەکەی تێوە دەپێچێ تا لێی - لە ئاوازەکە - تێبگات، بەڵام سوور بوون و بەردەوامی لەسەر گوێگرتن باشترین زامنە تا مرۆڤ وا لێبکا بەسەر ئەم کۆسپانەدا زاڵبێ، وای لێبکا لەزەت لە هەموو جۆرە دانراو و ئەدایەک وەر بگرێ، لە دوا قۆناغدا مرۆڤ توانای زەوق وەرگرتنی تەواوو هونەری لە مۆسیقا پەیدا دەکا، وای لێدێ ئیدی بتوانێ بابەتە سەرەکییەکانی مۆسیقا کەشف بکات، هەست بەو گۆڕانانە بکات کە بەسەریا دێ، هەر بە ڕواڵەتی دەرەوەی پارچە ئاوازەکەوە ناوەستێ، بەڵکو دەچێتە قوڵایی شتەکانی ناوەوەی و سەنتەرە شاراوەکانیەوە، هەست بە یەکێتی شاراوەی دیوی پشتەوەی ئەم هەموو دەنگە ئاڵۆزانە دەکا، ئەمە قۆناغی گوێگرتنی کارامەیە، ئەو گوێگرتنەی وەرزبوون توخنی ناکەوێ و وردترین شتی لەکیس ناچێ، هەڵبەتە ئەم گوێگرتنە تەرکیزێکی یەکجار زۆری دەوێ، بەڵام ئەزموون و ڕاهاتن ئەوە دەستەبەر دەکەن کە ئەم تەرکیزە کارێکی دژوار نابێ، ڕادەی وریایی مرۆڤ زیاد دەکەن و لە لەزەت وەرگرتنی ئەستاتیکی ئاوازەکان کەم ناکەنەوە.

بەو چەشنە قۆناغەکانی گوێگرتن بەپێی ئەزموون و ڕادەی قووڵی ئەزموونەکانی گوێگرو ماوەی خۆ ڕاهێنانەکەی دەگۆڕێ و دەگاتە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە بەدەم گوێگرتنەوە خۆی بۆ تێگەیشتنی هەموو وردو درشتێکی مۆسیقا تەرخان بکات، ڕەنگە ئەوە ڕوون بووبێتەوە کە بۆچی گوتمان گوێگرتن لەمۆسیقا خۆی بۆ خۆی هونەرە، چونکە گوێگرتن لە قۆناغە باڵاکەیدا بریتی نیە لەکارێکی سەلبی وەکو زۆر کەس بۆی دەچن، بەڵکو کارێکی ئیجابی تەواوە بەهەموو مانای وشەی ئیجابی، وریایی و تەرکیزێکی وای دەوێ کە تەنیا بەخۆڕاهێنانی دوورو درێژ بەدەست دێ، هەروەها لەپاڵ هەستی هەڵچوو و ڕاچەنیودا، هزری هۆشیاری دەوێ، واتە کارێکە ژیری و هەست بەشداری تێدا دەکەن، لەپاڵ چێژ وەرگرتنی ویژدانیەوە شیکردنەوەو بیرکردنەوەو بەراوردی دەوێ.

## -٣-

## (واتا لە مۆسیقادا)

بۆ ماوەیەکی زۆر دوورو درێژ مانای هونەر بەوە لێکدەدرایەوە کە گوایە بریتیە لە لەزەت و شادی بەخشین، وا باویوو کە ئامانجی گشت جۆرەکانی هونەر ئەوەیە لەزەت یا شادی لە ئینساندا ببزوێنێ، هەڵبەتە ئەگەر مەسەلەکە هەر ئەم دیاریکردنە گشتییە بووایە ئەوا هیچ کێشەیەک نەدەهاتە گۆڕێ، بەڵکو کێشەکە ئەوکاتە سەر هەڵدەدا ئەگەر بمانەوێ مەبەستی هەردوو لەزەت و شادی دیار بکەین و ڕوون بکەینەوە، چونکە هەندێ کەس بەشێوەیەکی سەلبی لە لەزەت تێدەگەن، حاڵەتێ دێتە کایەوە کە

ئینسان دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەکی دەردکی و زۆر بەخاوی بەرەو پیری دەچێ و رادەی هەرەکەمی چالاکیی پێویست بۆ تێگەیشتنێکی سادە بەکار دەهێنێ، دیارە ئەم چەمک و تێگەیشتنە لە بارەی لەزەتی هونەری لەگشت بوارەکانی هونەردا نارەزایی لەسەرە، لێرەدا هەر ئەوەندەمان لەدەست دێ ئاماژە بۆ ئەو نارەزاییانە بکەین کە لەبواری مۆسیقادا ئاراستەی دەکرێ.

لەزەتی سەلبی لەبواری مۆسیقادا ئەوەیە کە پێی دەوترێ (الطرب) ئەم وشەیە لەو ئاخروئۆخرانەدا لە رۆژنامەکانی میسردا مشت و مڕێکی زۆری لەسەر کرا، بەلاّم ئەوەی گومانی تێدا نیە ئەوەیە کە شەقلی کاتێکردن و هەلّچوونی سەلبی بەسەردا زالە، ئامانجی (طرب) ئەگەر وەکو ئامانجێک بۆ کارتێکردنی مۆسیقا وەربگیرێ ئەوەیە کە هەلّچوونێک لە ئینساندا دروست بکات جا چ هەلّچوونێکی ئارام بێ و ئەعسابی ئینسانەکە هێور بکاتەوەو گێرمەو کێشەکانی ژیانی لێبرەوێنێتەوە یا هەلّچوونێکی ئەوەندە توند بێ کە گیرو گرفتە واقیعیەکانی لەبیر بەرێتەوەو وای مژول بکا کە کەم و زۆر بەلای کاروبارە جدییەکانی ژیاندا نەچێ، ئەلهەقی زۆر کەس پێیان وایە ئەمە ئەرکی راستەقینەی مۆسیقایەو ئەرکەکەی تەنیا سەرگەرم کردنە.

خۆ ئەگەر ئەمە ئەرکی راستەقینەی مۆسیقابێ ئەوا بۆمان نیە باسی چ مانایەکی ئەم هونەرە بکەین، چونکە بوارو مەیدانی واتاکان بالاّترە لە بوارو مەیدانی ئەو هەلّچوون و دەچوونە سەلبیانەی کە بەشێوەیەکی یەکجار کەم بەهرە هۆشیارەکان تێیدا رادەبێ، باشە بەڕاستی مۆسیقا خالّییە لە هەموو مانایەک؟ دیارە ئەم جۆرە هەلّەیە دەربارەی تێگەیشتن لە مۆسیقا دەگەڕێتەوە بۆ راهاتن لەسەر جۆرە مۆسیقایەکی تایبەتی کەوا لەمرۆڤ دەکا پێی وابێ ئەرکی مۆسیقا تەنیا ئەوەیە بەجۆرێکی سەلبی کەیفمان پێ ببەخشێت، ئەگەر ئەزموونی مۆسیقای مرۆڤ دەولەمەند بێ و جۆرە ناسک و بەرزەکانی مۆسیقا تێبگات، ئەوا بۆی دەردەکەوێ کە مۆسیقا بەڕاستی مانای خۆی هەیەو مانایەکی تەواو ئیجابی هەیە، هەر بەوەندە ناوەستێ هەستی مرۆڤ ببزوێنێ و سۆزو گودازەکانی بوروژێنێ، بەلّکو وێڕای ئەمانە لەڕێگای هەستەکانەوە ئەقلّ بێدار دەکاتەوەو هەست و بەهرە هۆشیارەکان وەئاگا دێنێتەوەو هەندێ حەقیقەتی نوێ کەشف دەکات کە دەروون لەوەوبەر بێ خەبەر بوود، ئەلهەقی ئەرکی بالاّو پیرۆزی هونەر ئەوەیە کە هەر بەوەوە نەوەستێ کاری سەلبیمان تێبکا، بەلّکو شتێکی ئیجابیمان پێشکەش بکاو پتر لەژیانی خۆمان ئاشنامان بکاو زانیاریمان دەربارەی ژیان زیاد بکات، هەلّبەتە هەر هونەرێک بەشێوازی خۆی ئەو شێوازەی کە جیایە لە شێوازی فێرکردن و تەلقین دانانی ئەقلّی راستەوخۆ، دەبێ مۆسیقا تەنیا بەم مانایە وەربگرین و لێی تێبگەین.

ئەرکی ئێستامان ئەوەیە کە لەشێوازە تایبەتییەکانی گوزارشتی مۆسیقا بکۆلّینەوە، ئەگەر پێشتر بەشێوەیەکی تەحلیلی لە رەگەزەکانی زمانی مۆسیقامان کۆلّییەوە، ئەوا هەنووکە دەبێ لەو رێبازە بکۆلّینەوە کە مۆسیقا لەدوا شێوەیدا دەگەیەنێتە هزرمان، لەڕێبازی تایبەتی ئەقلّکردنی واتاکانی مۆسیقا بکۆلّینەوە، زۆر کەس وا راهاتوون کە شاعیرانە لە مۆسیقا تێبگەن؛ واتە وەختێ گوێ لە ئاوازێ دەگرن بەدوای چەمکی ئەدەبی و وێنەی حسیدا دەگەڕێن، هەندێ لە تیۆریستەکان بەوە پاساو بۆ ئەم دیاردەیە دێننەوە کە مۆسیقا دابەش دەکەن بەسەر دووجۆردا:

جۆرێکی خالّیسە یا موجەڕەد و جۆرێکی بابەتدار یا بەرنامەدار، جۆری یەکەم هیچ وێنەیەک لە هزرو بیردا چێ ناکات، بەلّکو کۆمەلّە نموونەیەکی دەنگی جوان و ناسکەو دەبێ بۆ خودی خۆی گوێی لێبگیردرێ و نموونەی ئەمەش لە مۆسیقای بیتهۆڤندا کوارتێستەکانە (الرباعيات)، بەلاّم جۆری دووەم بریتییە لەوێنەگرتنی بابەتێکی دیارکراو، نمونەی ئەمەش هەر لە مۆسیقای بیتهۆڤندا سەمفۆنیای شەشەمە، بەمجۆرە خاوەنانی ئەم دابەشکردنە هەنجەت و بیانوو بۆ ئەوانە دەدۆزنەوە کە هەرچیەکیان گوێ لێدەبێ پڕی دەکەن لە خەیالاّتی لەفزی یا تەسویری، بەلّکو هەندێ کەس وێنەی دیارکراو بۆ مۆسیقای خالّیسەو موجەڕەد دروست دەکەن کە ئەم وێنانەش لەخۆیانا وێنەی هەندەسی موجەڕەدن، وەکو ئەو هێلّە یەک لەدوای یەکانەی کە ولّت دیزنی لە فیلمە مۆسیقاییەکەدا (فانتازیا) پارچەی باخی (توکاتاوفیوج)بێ وێنە کێشان.

بەلاّم ئەم دابەشکردنە چ کێشەیەک چارەسەر ناکات؛ زۆر دانراوی مۆسیقا دەمێنێ کە نازانین دەچنە خانەی کام بەشیانەوە، بۆنموونە - هەر لە مۆسیقای بیتهۆڤندا - سەمفۆنیای نۆیەم، ئایا مۆسیقایەکی موجەڕەدە، ؟ مەحالّە بتوانین بلّێین ئەم مۆسیقایە تەنیا نموونەیەکی دەنگی جوان و ناسکەو چ هەست و واتاو بیرێکمان پێ نابەخشێت، ئەدی ئایا مۆسیقایەکی بابەتدارو بەرنامەداری دیار کراوە؟ ئەلهەقی ئەگەر بمانەوێ ئەم بابەتداری و بەرنامە دارییە دیار بکەین بەهیچ جۆرێ ناتوانین هێلّ.و سنوری ئاشکرای بەدەورا بکێشین سەیر دەکەین دەتوانین گەلێ لە لێکچوون و بیرەکان بگۆڕین بەلێکچوون و بیری دیکەی ئەوتۆ کە لەوانی پێشوو کەمتر نەبن لەڕووی تەتبیق بوونیانەوە بەسەر مۆسیقادا.

ئەوەی دەتوانین بەئەرخەیانییەوە پێی لەسەر دابگرین ئەوەیە کە جیاوازی بەینی مۆسیقای موجەڕەدو مۆسیقای بابەتدار تەنیا لەپلەدایە، دەتوانین بلّێین هەموو مۆسیقایەک بەشێوەیەک لەشێوەکان مۆسیقای بابەتدارە، لەو رووەوە کە بەرهەمێکی هونەری راستگۆیە، پەیوەستە بەژیانی دانەرەکەی و کۆمەلّەکەیەوەو هەر دەبێ گوزارشت لەواتا گەلێک بکا کە بتوانین پەیان پێ بەرین، هەلّبەتە ئەمە شتێک نیە کە بتوانین بەتێکڕایی لەسەری رێک بکەوین، چونکە وەکو پێشتر گوتمان مۆسیقا سنووری جزئیات دەبەزێنێ و دەچێتە مەیدانی کولیاتەوە. هەر بۆیە بۆمان هەیە بلّێین هەموو مۆسیقایەک - بەواتاو شێوەیەکی دی - مۆسیقایەکی موجەڕەدە مادامێکی لە تەفسیراتی جزئی تایبەتی

باڵاترە، کەواتە ئەم دوو سیفەتە، واتە مۆسیقا یا بابەتدارە یا موجەڕەدە، بناخە نین بۆ دابەشکردنی مۆسیقا بەڵکو رووی جیاوازی خودی گوزارشتی مۆسیقان، بەڵام ئەمەش نابێ بەکۆسپ لە رێگای ئەوددا کە دانراوی مۆسیقا بکەونە ئەم خانە یا ئەو خانەیانەود، کوارتستەکان ددکەونە ئەم خانەیەوە کە مانا تیایدا لەوپەڕی، سەمفۆنیای شەشیش دەکەوێتە خانەکەی دیکەوە، ئەو خانەیەی کە دانەر سنورێک بۆ دانراوەکەی دادەنێ تا لەچوارچێوەیدا لەپارچەکەی بگەن - بەهەرحاڵ مۆسیقای بابەتدارو ئاشکرا کەمن زۆربەی دانراوەکان هەردوو سیفەتەکە ددگرنەخۆ، واتە سیفەتی بابەتداری لەشێوەی واتای گشتیداو سیفەتی تەجرید کە دەگەڕێتەوە بۆ گشتێتی خودی ئەو مانایانە.

کە تەجرەبەی جوان کراوە بۆ زانینی رادەی تێگەیشتنی گوێگرانی جیاواز لەمۆسیقا (ماکس شون) لەکتێبی (کاریگەرییەکانی مۆسیقا)دا بڵاوی کردۆتەوە، چەند پارچە مۆسیقایەکی جیاواز پێشکەش بەجەماوەر کراوە، جەماوەرەکە کەسانێکی تێدا بووە

موزیشن بوون، کەسانێکی تێدا بووە موزیشن نەبوون بەڵام رۆشنبیریەکی هونەری باڵایان هەبووە. کەسانێکی تیا بووە هەروەکو گوێگرتن کەیفیان بەمۆسیقا هاتووە هەروەها کەسانێکی تێدا بووە بە هیچ جۆرێ زەوقیان لە مۆسیقا نەبووە. پاش بەراوردو هەڵسەنگاندن دەرکەوتووە کە ئەوانەی رۆشنبیری باڵایان هەبووە، ئەوانەی موزیشن نەبوون و پرانسیپەکانیان نەزانیود بۆ تێگەیشتنی مۆسیقا پەنایان بردۆتە بەر لێکچوون و ئەو پەیوەندییانەی یارمەتییان داوە بۆ تێگەیشتنی مۆسیقا. بەڵام موزیشن یا ئەوەی شارەزایی لە پرانسیپەکانی مۆسیقادا هەبووە لە کاتی گوێ گرتندا تەنیا وەکو مۆسیقا بیری لە مۆسیقا کردووتەوە و لەزەتێکی ئەستاتیکی دوور لەگشت وێنەیەکی خەیاڵی یا لێکچواندنێک لێ وەرگرتووە. لەئاکامی ئەم ئەزموونانەوە دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی کەتەجربەی زۆر وا لەمرۆڤ دەکا بە دروستی لە مۆسیقا تێ بگاو تێکەڵ بە مانا لاوەکییەکانی نەکا. ئەو مانا لاوەکییانەی مۆسیقا زۆریان هەڵدەگرێ، بەڵکو هەر لەو کەوشەنەدا بوەستێ کە لەزەت لەمۆسیقا وەربگرێ بێ ئەوەی پەنا بۆ خەیاڵی شیعری یا تەسویری بەرێ.

رەنگە مرۆڤ لێرەدا بپرسێت، باشە کەپارچە مۆسیقایەک لێکدانەوەی جیاوازو جۆراو جۆر هەڵبگرێ ئەمە بەو مانایەیە کە مۆسیقا هیچ شتێک ناگەیەنێ و هەرکەسەو چۆنی بوێ وا لێی تێبگا؟ تێگەیشتنەکەش لە هەموو حالەتێکدا بەتاڵە؟ راستی یەکەی ئەم ئەنجامگیریە زۆر دوورە لەوشتەوە کەئێمە مەبەستمانە. وەکو پێشتر دووپاتمان کردەوە مۆسیقا بەزەروردت مانای هەیە. بەڵام سروشتی مۆسیقا وایە کە ئەم واتایە باڵاتر بێ لەو لێکچوونە لاوەکیانەی کە خاوەن مزێجە شاعیری یا رۆمانتیکی یەکانی دەردوەی بازنەی پسپۆرانی مۆسیقا پەنای بۆ دەبەن. ئەوانەی تاکید دەکەن کە (بۆ وێنە) ئەم بزاڤەی سیمفۆنیای

پێنجەمی بیتهۆڤن ئیشارەتە بۆ لێدانەکانی قەدەر، ئەوەیان مانای تەسلیم بوونە بەقەدەر، ئەمەیان ململانێ لەگەڵ قەدەردا دەگەیەنێ و ئەمەی دواییان واتای سەرکەوتن بەسەر قەدەردا دەگەیەنێ، تا کۆتایی ئەم لێکچوونە ئەدەبیانەی کەپتر زیان لە لە زەت و وەرگرتنی ئەستاتیکایی دەدات تا یارمەتی بەدی هاتنی بدات. چونکە مۆسیقا ئەوپەرەکەی دەتوانێ بەجۆرێ ناخمان بورووژێنێ کە کۆمەڵەواتاو هەستێکی گشتیمان لەلا زیاد بکا واتە(جەوێکی)تایبەتی وامان لەلا دەخولقێنێ کە بتوانین شەپۆلە گشتییەکەی دەرک بکەین. بەڵام ناتوانین وردە شتە لاوەکییەکانی دیاری بکەین. خۆ ئەگەر توانیشمان چ سوودێک نابینین.

هەر هەموو ئەم بیرانەی لەمەڕ پەیوەندی مۆسیقا بەمەیدانی لێکچوونی شیعری و تەسویرییەوە وامان لێدەکات بەزەرورەت لە پەیوەندی مۆسیقاو وشەوە کە لە گۆرانیدا تەواو تێکەڵی بووە، بکولێنەوە. ئاخۆ تا چ رادەیەک وشە هاوپەیوەندیەکانی مۆسیقا سوود بەدیار کردنی واتاکانی مۆسیقا دەگەیەنێ؟ ئایا کە مۆسیقا لە رێگای گۆرانیەوە شەرح کرا ئیدی ماناکەی وردترو روونتر دەبێ؟

بۆ ئەوەی وەلامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، پێویستە بە دروستی لە پەیوەندی بەینی گۆرانی و مۆسیقا بگەین. گۆرانی شتێکی بێگانە نیە بە مۆسیقا، یا شتێک نیە کە پاشان خرابێتە سەر مۆسیقا، بگرە پەیوەندی نێوان ئەوددوە بە پێچەوانەوەیە، مۆسیقا لەگۆرانیەوە سەرچاوەی هەڵگرتووە. چونکە هونەری مۆسیقا وەختێ دەستی پێکرد کە هەندێ گۆرانی بێژ فێربوون چۆن شێوازی گۆرانی گوتن بە شێوەیەکی ریتمی ئاوازدار رێک بخەن، ئیدی هونەری نەواکان تە ماوەیەکی دوورو درێژ پەیوەست بوون بە گۆرانی گوتنەوە، کە ئامێری مۆسیقا پەیدا بووە پتر بۆ یارمەتی دانی دەنگی مرۆڤ یا بەهێزکردنی یا رازاندنەوەی بووە، پاش پەرەسەندنێکی زۆر، ئامێرەکان وردە وردە کەوتنە ئەوەی لەدەنگ جودا ببێتەوە، لەئاکامی دەوڵەمەندی مەیدانی گوزارشت بە ئامێرەکان، وردە وردە کەوتنە ئەوەی بەسەر دەنگدا زاڵ بێن و لە رۆژئاوادا هەرچەندە گۆرانی لەهەرەتی گەشەکردنیابوو، بێن بەبناخە.

بەمجۆرە پەرەسەندی پێوەندی مۆسیقای ئامێرەکان لەگەڵ گۆرانیدا بریتی بووە لەوەی کە مۆسیقا لەسەرەتادا بەتەواوی پشتی بەگۆرانی بەستووە، پاشان لێی جودا بۆتەوە، هەر ئەم جیابوونەوەیە کە حاڵی حازر سیفەتی مۆسیقای ئامێرەکان، خۆی لەخۆیدا بەڵگەی ئەوەیە کە نەوا خاڵیسەکان بێ پشتیوانی هیچ وشەیەک، هۆیەکی تەواوی گوزارشت و دەربڕینە، بەڵکو ئەمە بۆ خۆی سیفەتی هەلاوێردەی گوزارشتە لە مۆسیقا، کە ببێ بە شتێکی گشتی سەربەخۆ و جیا لەگشت هۆیەک بۆ دەست نیشان کردنی واتاکانی، خۆ ئەگەر یەکێک بڵێ لە مۆسیقای رۆژئاوادا لایەنێکی گرینگمان فەرامۆش کردووە کە ئەویش لایەنی هونەرە غینائیەکانە، وەکو ئۆپیرا، ئەوا دەڵێین ئەم لایەنەش لەم دەستوورە

بەدەر نیە، لە ئۆپێرادا دەنگە بەشەرییەکان مامەڵەی ئامێرە مۆسیقاییەکانی لەگەڵدا دەکرێ، کارتێکردن لەرێگای ئەواکانیەوەیە نەک لەرێگای وشەکانیەوە ئەو رۆڵەی وشە لە ئۆپێرادا دەیبینێ رۆڵێکی گەورە نیە، تەنها هۆیەکە بۆ دەرخستنی دەنگە بەشەرییەکە، تەنیا هاودەنگە بۆ دەنگە بەشەرییەکە، گوێگرانی ئۆپێرا لەبەر خاتری وشەکانی ئۆپێرا رووی تێ ناکەن، بەڵکو لەبەر خاتری مۆسیقاکەیەتی: مۆسیقا ئامێرەکان و مۆسیقا دەنگەکان پێکەوە.

کەواتە مۆسیقا بۆ خۆی توانای گوزارشت کردنی هەیە. چ پێویستیەکی بە کۆمەکی وشەی پەخشان یا شیعر نیە تا توانای گوزارشتی خۆی پێ بخەملێنێ، بەڵکو توانای مۆسیقا لە«خۆی بوونی»دایە. لەوەدایە کە قەوارەی تایبەتی هەیە بۆ نەقڵ کردنی واتا گشتی یەکان،خۆ ئەم گشتێتی یەش سەرچاوەی جوانی و رەسەنی ئەم هونەرەیە.

ریچارد فاگنەر تاقە مۆزیشێنە کە رای جیاوازی لەمەڕ پەیوەندی مۆسیقا بە وشە یا بەشیعرەوە هەیە. هەڵبەتە باسەکەمان، یانی باسی توانای گوزارشت کردن لە مۆسیقادا بەبێ موناقەشەکردنی رایەکەی ئەو بەناتەواوی دەمێنێتەوە.

فاگنەر پێی وایە- دیارە لەم بۆچوونەیدا هاورای ئەوقسانەی ئێمەیە کە لێرەدا گوتمان- گوزارشتی مۆسیقا تا رادەیەکی زۆر گوزارشتێکی گشتییە، واتاکانی لە چوارچێوەیەکی ئاشکرادا ناوەستێ کە هزر بەهۆشیارییەوە دەرکی بکا، بەڵکو واتاکانی ئاڵۆزن و گەلێک لێکدانەوە هەڵدەگرێ. بەرای ئەو گوزارشتی مۆسیقا تەواو پەیوەستە بە مەیدانی ناوەوەی دەرونی ئینسان. بەڵام وێنەیەکی ئاشکرای ئەم مەیدانە ناخاتە روو. لەلایەکی تریشەوە ئەوپێی وایە شیعر لەمەیدانی دەروون و ناخ دوور کەوتۆوەتەوەو پتر ئاوڕ لەگێڕانەوەی رووداوە دەرەکییەکان دەداتەوە، ئەو رووداوانەی بەقوڵایی دەروونا رۆناچن. فاگنەر پێی وایە هەوڵدانی نزیک خ... تنەوەی مۆسیقاو شیعر لە ئۆپێرای باودا، هەوڵ دانێکی رووکەشانەیەو هەر مۆسیقا تیایدا بە زاڵی دەمێنێتەوە. بۆیە فاگنەر بانگەوازی داهێنانی (درامای مۆسیقا) ی داوە کە لەم رێگەیەوە تێ دەکۆشێت تا ئەوپەڕی رادە لە شیعر نزیک ببێتەوە، شیعریش لەلای خۆیەوە هەوڵی تەواوکردنی مۆسیقا دەدا. چونکە وشە لە رێگای وروژاندنی واتای ئەقلی یەوە بەهۆی هزرو ئەقڵەوە رێگای ناخ و دەروون دەگرێتەبەر، رەنگە هەرلەبەر ئەوەش بێ کە دەتوانێ بەئاسانی ئەو مانایانە دیار بکا کە مەبەستێتی. ئەو سۆزو گۆدازانە دەستنیشان بکا کەبەرەو وروژاندنیان دەچێ. کەواتە بەپێی بۆچوونەکەی فاگنەر مۆسیقاو شیعر دوو رووی یەک پارچە دراون و لە درامادا تەواوکەری یەکترن. یەکەمیان راستەوخۆ دەچۆڕێتە ناو ناخی دەروونەوە، بەڵام بەجۆرێکی دیاری کراو ئاراستەی ناکا. بەڵکو شیعر ئەم ئەرکە دە ئەستۆ دەگرێ و وشەکانی سیمای ئەو وێنەیە روون دەکاتەوە کە مۆسیقا لە چوارچێوەیەکی تەمومژاویدا پێشکەشی کردووین.

لەبەر رۆشنایی گوتەکانی پێشوومانەدا دەتوانین بگەینە رەگەزو توخمی ئەو رەخنەیەی کە لەم رایەی فاگنەر دێتەگرتن. دیارە هەڵەی گەورە لەوەدلیە پێت وابێ گشتێتی گوزارشتی مۆسیقا سەرچاوەی کەموکوڕیەتی، چونکە ئەم گشتێتییە سروشتی ئەو گوزارشتەیە. مۆسیقا پێویستی بە چ هونەرێکی تەواوکەری دیکەی وەکو شیعر نیە تا ئەم بەناو کەموکوڕییەی پێ پڕ بکاتەوە. مرۆڤ بۆی هەیە گومان لە نرخی راستەقینەی ئەم کارە هونەرییە کۆکەرەوەیە بکا کە فاگنەر بانگەوازی بۆدا، ئەم کارەی کە شیعرو وێنە (لە دیمەنە شانۆییەکانا) لەگەڵ مۆسیقادا تێکەڵ دەبێ هەروەها هەندێ جار نواندن و سەماش لەگەڵ مۆسیقادا تێکەڵ دەبێ، چونکە سەرجەمی ئەم رەگەزە هونەرییانە لەزەتێکی لەوە باڵاتر نابەخشن کە مرۆڤ بۆ وێنە لەوەختی گوێگرتن بۆ سەمفۆنیاکانی بیتهۆڤن یا برامز هەستی پێ دەکا. بێگومان هاتوچۆکەرانی ئەو شانۆگەرییانەی کە دراماکانی فاگنەری تێدا پێشکەش دەکرێن لەبەر خاتری شیعرەکان یا نواندن و دیمەنە شانۆییە بەرزەکان هاتوچۆی ناکەن، بەڵکو تەنیا لەبەر خاتری مۆسیقاکەو ئەو گۆرانیانەیە کە هاوکات لەگەڵ مۆسیقاکەدا پێشکەش دەکرێن. فاگنەر ئەو شاعیرە چاکە نەبوو وەکو زۆرکەس وای بۆ چووبوون، بەڵکو ئەو مەیدانەی کە شۆرەتی دایێ تەنیا مەیدانی مۆسیقاکە بوو.

لە کۆتاییدا دەبێ باوەڕمان بەوە هەبێ کە مۆسیقا لەبواری تایبەتی خۆیدا توانایەکی تەواوی دەربڕینی هەیە، هونەرێکە بۆخۆی، گشتێتی واتاکانی سەرچاوەی هێزێتی، چونکە ئەو دانراوە مۆسیقاییانەی بابەتی روون و ئاشکرای ئەوتۆیان گرتۆتە خۆ کە لەیەکەم کەڕەتا بتوانین دەست نیشانیان بکەین عادەتەن کاریگەریان کەمترە لەوانەی کارێکی گشتیمان تێدەکەن و لەحەقیقەتا ئاڵۆزیشن، بەڵام دەنگدانەوەیان لەسۆزو گۆدازو هزرو بیرماندا یەکجار روون و ئاشکرایە.

## پەرەسەندنی مۆسیقا

دەتوانین ئەو رێگایانەی کە مۆسیقا لەرووی توانای دەربڕینیەوە، لەباری ئەرک و شێوازەکانیەوە پێیدا رۆییوەو پەرەی سەندووە لەیەک دەستەواژەدا پوخت بکەینەوە. ئەوەش ئەوەیە کە مۆسیقا. هێدی و هێدی و بەرە بەرە رێگایەکی دوورو درێژی تەیکردو لە هونەرێکی بەرتەسکەوە؛ چ لە رووی گوزارشت و چ لە رووی ئەرک و شێوازەوە، بوو بە هونەرێکی بەربڵاوی ئینسانی گشتی هاوپەیوەند لەگەڵ ژیان و کۆمەڵگای مەزنی ئینساندا.

لێرەدا پێویستیمان بە دووبارەکردنەوەی وتەکانی فەسڵی پێشوو نیە کە لەمەڕ پەرەسەندنی توانای گوزارشتی مۆسیقاو چۆن بەتەنیا ئەو توانایەی بەدەست هێنا کە گشت ماناکان بگەیەنێ بێ ئەوەی کۆمەک لە شیعر یا هەر هونەرێکی دی وەربگرێ: تا پتر ئەو مانایانە دیار بکا. حەز دەکەم لەم بوارەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ئەم پەرەسەندنە وێڕای ئەوەی خۆی بوونی (استقلال) مۆسیقای وەکو هونەرێکی سەربەخۆ سەلماند لەهەمان کاتا سیمای

هونەرێکی ئینسانی گشتی ئەو تۆشی دایێ کە دەکەوێتە سەرووی هەموو ئەو سنوورو کەوشەنانەی کە مرۆڤ لێکدی دادەبڕێ. چونکە ئەگەر مۆسیقا بەردەوام بوایە لەسەر خۆبەستنەوە بەشیعرەوە، ئەوا ئەو خۆبەستنەوەیە سیمایەکی ناوچەیی دەدایێ کە پەیوەستە بە زمانی ناوچەیی و تایبەتی شیعرەکەوە، پەیوەستە بەو رووداو و واتا جیاوازانەی ئەو شیعرەی گوزارشتی لێ دەکاو ئەنجام وەکو کاری هونەری تەنیا لە ناوچەی زێدی شیعرەکەدا دەناسرا. بێگومان ئەم کارە دەبووە مایەی خەفە کردنی ئەو شەقڵە شمولییەی کە مۆسیقا تاقە سوارچاکیتی، بەڵام خۆی بوونی مۆسیقا کردیە کارێ کە لە گشت هونەرەکان باو و بەربڵاوتربێ. ئەو کەوشەن و سنورە ناوچەییانە ببەزێنێ کە کۆمەڵە مرۆڤێک لە کۆمەڵە مرۆڤێکی دیکە جیا دەکەنەوە. ئەلهەقی چ هونەرێکی دیکە ناتوانێ لەم بارەیەوە بگاتە پلەوپایەی مۆسیقا. لە هەموو هونەرەکانی دیدا جۆرە گوزارشتێکی ناوچەیی کەنگرەت هەیە کە بێگومان - پەیوەستە بەهەندێ ئەزموونی تایبەتەوە کە هەندێ جار تەنیا لە ناوچەکەی خۆیدا لێی حاڵی دەبن، بەڵام مۆسیقا بە زەبری ئەو بەربڵاوی و شمولیەتەی کە هەیەتی بووە بە بەربڵاوترین زمانی هونەری. ئەگەر ئەم رایە تا رادەیەکی زۆر، ناڵێم تا رادەیەکی - تەواو - بەسەر ئەو (مانایانەدا) کە مۆسیقا گوزارشتی لێدەکا تەتبیق ببێ واتە فراوانیەکەی لەوە بەربڵاوترە کە لە چوارچێوەیەکی تەسک یا تایبەتیدا قەتیس بمێنێ، ئەوا بە جۆرێکی زۆر وردتر لەسەر «هۆیەکانی» گوزارشتی مۆسیقا تەتبیق دەبێ. مەبەستم دەنگەکان و تەفاعولاتی ئەو دەنگانەیە کە زمانێک دروست دەکەن خەڵک بەشێوەیەکی راستەوخۆ بێ ئەوەی پێویستیان بە چ هۆیەکی دی بێ گوێی لێ دەگرن.. *

بەهەرحاڵ کە هاتینە سەر باسکردنی مۆسیقاو شەقڵی نەتەوەیی ئەوا پتر لەم بابەتە دەکۆڵینەوەو بەڵگەی لایەنگرانی «ناوچەیی» و «نەتەوەیی» لە مۆسیقادا هەڵدەسەنگێنین.

ئاشکرایە پەرەسەندنی ئەرکەکانی مۆسیقاش بەهەمان رێبازدا تێپەڕی. واتە کردیە کاری مۆسیقا لە هونەرێکەوە کە خزمەتی هەندێ مەبەستی تایبەتی دەکرد ببێ بە هونەرێکی ئینسانی ئەوتۆ کە پێویستییەکانی هەموو مرۆڤایەتی دابین بکا - لە کۆنا مۆسیقا پەیوەندییەکی هەرە پتەوی بە سیحرەوە هەبوو. هەر ئەو تاقمە کەمە بەکاریان دەهێنا کە خەریکی سیحرکردن بوون - بێگومان ئەوە تەسکترین بواری مۆسیقا بوو بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی خۆی. ئەودەمە کارێکی نهێنی ئامێزو ئاڵۆز بوو بۆ وەدی هاتنی مەبەستی تاقمە خەڵکێکی یەکجار کەم بەکار دەهێنراو لە خەڵکانی دی حەرام دەکرا تەنیا لەبواری سیحردا نەبێ، چونکە سیحر لە گەلێک کۆمەڵگادا حەرام یا ناڕەوا بوو. خزمەتی ئەو مەبەستانەی کردووە کە کۆمەڵ پەسەندی نەکردووە. بۆیە دوور نیە هۆی سەرەکی حەرام کردنی مۆسیقا لە هەندێ باوەڕی ئاینیدا بگەڕێتەوە بۆ پێوەندی نێوان مۆسیقاو سیحر لە چاخە کۆنەکانا.

ئەرکی مۆسیق لە سەدەکانی ناوەڕاستا لە ئەورووپادا بوو بە خزمەتکردنی مەبەستەکانی کڵێسا، بوو بەیاریدەری ئەنجامدانی تقوسە ئاینیەکان، هەرچەند ئەم ئەرکە فراوانتر بوو لە ئەرکی پەیوەندی بە سیحرەوە، بەڵام هێشتا هەر بوارەکانی تەسک بوو، شەقڵی نهێنی ئامێزی و ئاڵۆزی هەر زاڵ بوو بەسەریا. زۆربەی مۆسیقا زانانی ئەو سەردەمە بەخیل بوون. نهێنیەکانی مۆسیقایان هەر بۆخۆ دەپاراست و بەجۆرێک بەکاریان دەهێنا کە خزمەتی مەبەستە تایبەتییەکانی خۆیان بکا، هەڵبەتە لە بارو دۆخێکی وەهادا مەحاڵە مۆسیقا ببێ بەهونەرێکی ئینسانی گشتیی.

لەسەرەتای سەدە تازەکانا لە ئەورووپادا پەرەسەندنێک رووی دا، بووە مایەی فراوان بوونی مەیدانی ئەرکی مۆسیقا. هەرچەندە هێشتاش هەر دوور بوو لە مەیدانە ئینسانیە گشتییەکەوە. مۆسیقا لە کڵێساکانەوە گوازرایەوە بۆ کۆشک و تەلاری میرو ئەشراف زادەو دەرەبەگەکان. دیارە ئەو گواستنەوەیەش ئاسایی بوو، چونکە مەڵبەندی دەسەڵات لە ئەورووپادا لە کڵێساوە گوازرایەوە بۆ حاکمە ناوچەییەکان، ئەمە جگە لەوەی گەلێک لە پیاوانی ئاینێ لە هەمان کاتدا دەرەبەگی گەورە بوو.. پاش ئەوەی مۆسیقا لە چوارچێوەی کڵێسا دەرچوو، هاتە ک... ئەوەو کەوتە خزمەتکردنی میرانەوە. ئیدی ئەرکی مۆسیق بوو بە شادکردنی میرو میوانەکانی لە ئاهەنگە تایبەتیەکانا. بێگومان بەشێکی زۆر لەم پارچە مۆسیقایانە سنوری ئەم مەیدانە تەسکەیان دەبەزاندو لەنێو کۆمەڵێکی زۆرترا بڵاو دەبوونەوە، بەڵام مەیدانە بنەڕەتیەکەی هەر ئەو تاقمە کەمە بوو کە میرو دەس و پێوەندەکەی پێکیان دەهێناو ئامانجی مۆسیقا تەنیا ئەوە بوو خۆشی و شادی بخاتە دڵیانەوە. دیارە ئاساییە لەو بابەتە مەیدانەدا مۆسیقا نەتوانێ گوزارشت لە کۆمەڵە چەمکێکی ئینسانی گشتی بکا. یا سۆزو هەڵچوونە راستەقینەکانی تێکرای ئینسان عەکس بکاتەوە، بەڵکو هەندێ پارچە مۆسیقای پێشکەش دەکرد کە شەقڵی سەمای سووکی پێوە دیاربوو. یا هەندێ پارچەی پێشکەش دەکرد کە پەردەی لەسەر تواناو بەهرەی مۆسیقا ژەنیی هەڵدەدایەوەو لەگەڵ تەبیعەتی ئەو جەماوەرەی کە مۆسیقاکەی پێشکەش دەکرا، دەگونجا.

بێ چەندو چۆن ئەگەر هەندێ هەوڵی کەمی تاکە کەسی لێ دەربکەین، مەحاڵ بوو مۆسیقا لەو سەردەمەدا بە رێبازێکی سەربەخۆدا بڕوات. لە کاتێکا کە هەموو بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکانی دی مل کەچی چەوساندنەوەو ستەمی چینی دەرەبەگ بوو. ئازادی راستەقینە لە مەیدانی مۆسیقادا ئەو وەختە دەستی پێکرد کە ئازادییەکی شان بەشانی ئەو لە مەیدانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیە گشتییەکاندا روویدا. لەو دیاردانەی کە نابێ هەروا بەبێ خشپە بەسەرمانا رەت ببێ ئەوەیە دوا مۆزیشنێ کە لە خزمەتی میراندا مایەوە موزارت بوو کە لەساڵی ١٧٩١ دا مرد، واتە لە هەرەتی شۆڕشی فەرەنسادا. پاش ئەم شۆڕشە کە هەموو بارودۆخە کۆمەڵایەتیەکانی بەجارێ ژێروژوور کردو پرانسیپی رێزگرتنی ئینسانی هێنایە ئاراوە بەیەکجاری دەسەڵاتی فیوداڵی بنبڕ کرد، تاقە یەک مۆزیشنێ دەرباری پەیدا نەبوو،

بەڵکو زەمینە بۆ ئەرکێکی نوێی مۆسیقا هەموار بوو کە بە گەشترین وێنەیەوە لەلای بیتهۆڤن سەری هەڵدا. ئەویش بریتی بوو لە ئەرکی گوزارشت کردن لەو هەستە ئینسانیانەی کە لە قووڵترین ئەزموونی واقیعی فەردەوە هەڵقولابوو. ئەگەر تازە کردنەوەی بیتهۆڤن بۆ ئەوانەی کە تەنیا سەیری مێژووی مۆسیقا دەکەن بەبازردقەیەکی مەزنی بێ هاوتا بێتە بەرچاو، ئەوا دەبێ ئەوە بزانین کە ئەگەر مێژووی مۆسیقا بە مێژووی گشتی کۆمەڵایەتییەوە گرێ بدەین، ئەوا کارەکەی بیتهۆڤن بە کارێکی ئاسایی دێتە بەرچاو. لەوکاتە بە دوواوە ئەم ئەرکە تازەیەی مۆسیقا چەسپی و بوو بەو تەوەرەی کە هەموو کارە مەزنەکانی ئەم هونەرە بەدەوریا بسوڕێنەوە.

بەڵام ناتوانین بڵێین کە ئیدی هونەرمەند بەتەواوی ئازاد بوو و نووکە دەتوانێ بێ چ کۆسپ و تەگەرەیەک گوزارشت لە ئەزموونە ئینسانیەکانی خۆی بکات.

چونکە پاش ئەوەی هونەرمەندی مۆسیقا لەسایەی دەسەڵاتی میرو فیۆداڵ دەرچوو، ناچار بوو بۆ دابین کردنی گوزەرانی خۆی کەوتە پەنا بردنە بەر بڵاوکەرەوەکان. خۆ ئەگەر چاوێک بەژیاننامەی موزیشنانی ناوداردا بگێڕین دەبینین پڕە لە نموونەی چەوساندنەوەیان لەلایەن بازرگانانی مۆسیقاوە. ئەم چەوساندنەوەیە لەسەدەی بیستەما بەجۆرێکی بێ هاوتا تەشەنەی کرد. فراوان بوونی تەتبیق کردنی دۆزینەوە زانستیەکان لە مەیدانی مۆسیقادا کردیە کارێ کە ژمارەی گوێگران هەزاران کەڕەت زۆرتر ببێ، بەڵکو کار گەییە شوێنێ کە گوێگرتن لە مۆسیقا لە ڕێگای رادیو و تۆمارکردنەوە بۆ هەموو کەسێک مەیسەر ببێ. دیارە ئاساییە ئەم کارە ببێتە هۆی ژیانەوەی ڕاپەڕینێکی مۆسیقایی یەکجار گەورە، بەڵام هەر ئەم کارەش بووە هۆی ئەوەی کار گێڕان و خاوەن کۆمپانیاکان ئەم فراوان بوونە بقۆزنەوەو بەجۆرێ بەکاری بێنن کە خودی موزیشنەکانی پێ بچەوسێننەوە.

موزیشنێکی هاوچەرخی ئەمریکایی لەم بارەیەوە رای وایە کە: هونەرمەند کەوتووەتە ژێر ئاردزووی بازاڕەوە. کەوتووەتە ژێر دەسەڵاتی ئەو قۆنتەراتچیەی کە کارە هونەرییەکانی بۆ ڕێک دەخاو بڵاوی دەکاتەوە. گوێ گریش بووە بەو (مستهلک)ەی کە دەبێ رازی بکرێ، واتە بە هەمان شێوەی ئالوێری بازاڕەکان. هەڵبەتە لە بارو دۆخێکا مۆزیشن کەوتبێتە ژێر فشاری پێداویستیەکانی بازاڕەوە ناتوانین بڵێین بەتەواوی ئازادە. ئەوەی لەم بابەتە کۆمەڵگایەدا ئازادی هونەرمەند تەسک دەکاتەوە هەمان شتە کە ئازادی هەر کەسێکی دی تەسک دەکاتەوە.

مەبەست لەو چەوساندنەوە بێ ڕەزایەیە کە کۆمپانیا گەورەکان لەمامەڵە کردنیاندا پەیڕەوی دەکەن. هیچ سەیریش نیە لەم بابەتە کۆمەڵگایانەدا ببینین کە هونەری مۆسیقای دروست دووچاری پاش کەوتنێکی گەورە بووبێ. کەواتە بۆمان هەیە بڵێین هونەرێکی وەکو مۆسیقا ئەگەر بیەوێ لەئەنجامدانی ئەرکی خۆیدا تەواو ئازاد بێ پێویستە لە چەوساندنەوەی بازرگانی رزگار بێ و ژیانێکی ئاسودەو ئارام بۆ هونەرمەندەکان دابین ببێ و تواناو بەهرە راستەقینەکان بەکۆششی تایبەتی خۆیان بەرز ببنەوەو دەربکەون و فاکتەرە دەستکردەکان چ دەستێکیان لە بەرزکردنەوەی پایەی هەندێکیان و نزم کردنەوەی هەندێکی تریاندا نەبێ. ئەویش لەبەر هەندێ هۆ کە بەزۆری پەیوەندی بەخودی هونەرەوە نیە. وێڕای ئەوەش دەتوانین بڵێین مۆسیقا سەرباری ئەو کۆت و زنجیرانەی کە هێشتا لە زۆر کۆمەڵگادا لە دەست و پێی ئاڵاوە بووە بە هونەرێکی ئینسانی بەرین و ئەرکەکانی مۆسیقا لەوە دەرچوون کە گوزارشت لە خواستی تاقمە خەڵکێکی کەم بکەن. ئێستا بە شێوەیەکی گشتی بەزمانی ئینسان دەدوێ و نزیکترین پەیوەندی بەکێشە راستەقینەکانی ئینسانەوە هەیە.

* * *

ئەگەر بێینە سەرباسی پەرەسەندنی شێواز یا ڕێبازی ئەدای مۆسیقا دەبینین ئەم پەرەسەندنە هەمیشە بەرەو وەدی هاتنی ئەو ئامانجە چووە کە پێشتر باسمان کرد.

هەموو ئەو دۆزینەوانەی مۆزیشنەکان کەشفیان کردووە هەر لەسەردەمی (باخ)ەوە تا ئەوڕۆکە هەوڵی ئەوەی داوە کە توانای گوزارشتی مۆسیقا زیاد بکاو مەیدانی زمانەکەی بەجۆرێ بەرین بکا کە پێداویستیەکانی ئەم هونەرە ئینسانیە ناسکە دابین بکا.

پەرەسەندن بەشێوەیەکی بێ وچان بەم ڕێگایەدا دێت؛ هەر هونەرمەندێک نوێکردنەوەی جوان دێنێتە ئاراوەو هەر زوو بەزوو ئەم نوێکردنەوەیە تێکەڵی کەلەپوری کۆنی مۆسیقا دەبێ تا پێکەوە ئاوێتەیەکی قوڵترو دەوڵەمەندتر لەجاران پێک بهێنن. ئەم پەرەسەندنە بەردبەرەیە کارێکی وای کرد کە خەڵکی لە هەموو تازەکردنەوەیەکی پڕبایەخ تێ بگەن و زوو بەپیریەوە بچن و ئەوجا بیخەنە سەر خەرمانی دەوڵەمەندی ئەو هەموو تازەکردنەوەیەی کە مێژووی تازەی مۆسیقای رازاندۆتەوە. هەمیشە تەبایی بەدەنگەوە چوون لەنێوان جەماوەری گوێگرو هونەرمەنداندا هەبووە - ئەگەر هەندێ حاڵەتی کەمی لێ دەربکەین - کە پاشان بووە بەستایشی تەواوی هونەرمەند ئەگەر بەرهەمەکانی شایستە بووبن.

کەچی مێژووی مۆسیقا لە ئاخرو ئۆخری سەدەی نۆزدەو یەکەم چارەگی سەدەی بیستەمدا تووشی بزوتنەوەیەکی لەنکاوی مۆسیقایی ئەوتۆ بوو کە دەیویست رابردوو لە رەگو ڕیشەوە هەڵکەنێ. تووشی کۆمەڵە کودەتایەک لە شێوازی مۆسیقادا بوو کە دەیویست نکوڵی لە هەموو پەرەسەندنەکانی رابردوو بکا، یا خۆی لەوە بەرزتر دەزانی لەگەڵ پەرەسەندنەکانی رابوردوودا تێکەڵاو ببێ. بۆ یەکەم جار لە مێژووی مۆسیقادا تازە کردنەوەیەک روو دەدا کە خودی داهێنەرانی ئەو تازەکردنەوەیە دان بەوەدا دەنێن کە قورسەو تێگەیشتنی ماندو بوونێکی زۆری دەوێ - وێڕای ئەوەش - سورن لەسەر ئەوەی کە تێنەگەیشتنیی لەلایەن خەڵکەوە لەپایەی کەم ناکاتەوەو بە ئەرخەیانیەوە دەڵێن ئەگەر

مۆسیقا بیەوێ لە بازنەی دووبارە بوونەوەی بێزارکەر دەربچێ دەبێ تەنیا ئەم رێبازە بگرێتەبەر ئابەوجۆرە داهێنانی زۆر لەگشت مەیدانەکانی مۆسیقادا پەیدا بوو؛ لەلای شونبرج بەتەواوی پەیژەی (سلم) رۆژئاوایی بە هەردوو لقەکەیەوە؛ گەورەو بچوکەوە لەبەین دەچێ. بایەخی مەودای نێوان دەنگەکان نامێنێ. هەر نیوە دەنگێک لەو دوانزە نیوە دەنگەی کە ئەو پەیژەیە پێک دەهێنن هەمان بایەخی ئەوی تری دەبێ.

دوا بەدوای ئەوە گۆڕانێکی بنەڕەتی لە هارمۆنی دەنگەکان روویدا. دەستورەکە لەوە دەرچوو کە هارمۆنی بخرێتە نێو ئەو دەنگانەوە کە سەر بە یەک پەیژەن و بەپێی رەوتی ئاوازەکە بڕوات. دەستورەکە بوو بە دروست کردنی هارمۆنی لە نێو تاقە دەنگێکا یا کۆمەڵە دەنگێکا کە هەر یەکەیان سەر بە پەیژەیەکی جیاوازە. هەروەها شان بەشانی ئەو گۆڕانانەی سەرەوە کۆمەڵە گۆڕانێک لە قاڵبی مۆسیقادا لەسەر دەستی ستراڤنسکی هاتە ئاراوە. هونەرمەند گوێی بە وێنەو فۆرمە تەقلیدیەکان نەدەدا، بەڵکو ئاوازەکە بوو بەشتێکی سەربەست و دوور لە هەر کێشەیەک. ئیدی لەو وەختە بەدواوە تازە کردنەوە یەک لەدوای یەک سەری کرایەوە. موزیشنەکان کەوتنە پێشبڕکێ لە بواری دۆزینەوەی دەستوری نوێدا. لەچوارچێوەی دەستورە باوەکان دەرچوون. ئیدی مۆسیقا گەییە زەمانێک وا هەست دەکرا کە فۆرم و چوارچێوە کۆنەکان بەتەواوی نەمان و رەوتە تازەکە تەواو گیر بوو. کەچی ئەم هەڵچوونە نوێ باوە کە لە یەکەم چارەگی سەدەی بیستدا گەییە پۆپە، وردە وردە خاو بووەوەو دامرکایەوەو هونەرمەندەکان کەوتنە ئەوەی بەچاوی رەخنەگرانەوە بڕواننە داهێنانەکان، کەوتنە ئەوەی تەتەڵەی بکەن و تەنیا ئەو شتانەی لێ هەڵبژێرن کە بەراستی پێیان وایە شتێکی تازە دەخاتە سەرخەرمانی هونەری مۆسیقا، شتێکی تازەی گونجاو لەگەڵ ئەو شتانەدا کە هونەرمەندانی پێشین هێنابوویانە ئاراوە. دەتوانین بڵێین ئەو ناوانەی ئەمڕۆکە لە ئاسمانی دنیای مۆسیقادا دەدرەوشێنەوە بەشی هەرە زۆریان ئەو هونەرمەندانەن کە توانیان بەجوانی سود لە دۆزینەوە تازەکان وەر بگرن و خۆیان بەجۆرێکی ئەوتۆ نەدایە دەم تەوژمی تازەوە کە وا لە مۆسیقاکەیان بکات ببێ بەکۆمەڵە دەنگێکی نامۆی نا ئاشنا بەگوێ - لەو ناوانە سیبلیوس، رتشارد شتراوس رفمانینۆف، خاتشاتوریان، شوستاکو فتش و پروکروفیف.

ئەو هۆیانە چی بوون کە بوونە مایەی وازهێنان لە کودەتای مۆسیقایی و گەڕانەوە بۆ تازە کردنەوەی بەرەبەرەو رێک وپێک؟ بێگومان تێگەیشتنی دروست و راستەقینە لە ئەرکی هونەری مۆسیقاریی بە مۆزیشنەکان دا کە رێگای دروست لە شێوازەکانیانا بگرنەبەر. مۆسیقا پاش ئەوەی بوو بە هونەرێکی ئینسانی باو و پاش ئەوەی کەوتە گوزارشت کردن لەو مانایانەی کە پەیوەستن بەژیانی راستەقینەی خەڵکەوە، ئیدی مەحاڵ بووجارێکی دی بۆ دواوە بگەڕێتەوەو بەزمانێکی ئاڵۆزی ئەوتۆ بدوێ کە کەس لێی تێنەگا. بەڵێ ئەو دەنگانەی دەڵێن مۆسیقای تازە بۆیە ناچێتە دڵەوە چونکە گوێچکە پێی رانەهاتووەو ئەگەر لەسەری رابێ بەچاکی تێی دەگاو زەوقی لێ وەردەگرێ و جوانیە پەنامەکیەکانی دەدۆزێتەوە - کۆمەڵە دەنگێکی نامۆو نارەسەنن چونکە گوێچکە چۆن لەگەڵیا رابێ هەر (جوانیە) باوەکەی تێدا نابینێ. شیکردنەوەی ژیرانەی ئەم مۆسیقایە هەندێ ئەزمونی دەنگ کەشف دەکا کە پێشتر نەزانراون، بەڵام رەگەزی جوانی لە بنەوە تێدا نیە، بگرە هەندێ (مقطوعات) لەوانەی پەڕگیری دەکەن لە تەتبیق کردنی رەگەزە تازەکاندا تەنیا بریتیە لە کۆمەڵە دەنگێکی گڕ کە راهاتنیش ناتوانێ نامۆییەکەی کەوی بکاتەوە. خۆ هەندێ کەس وەختێ لافی لەزەت وەرگرتن لەم مۆسیقایە لێدەدەن تەنیا بۆ خۆنواندنەو هیچی دی. مرۆڤ ئەوپەڕەکەی جۆرە لەزەتێکی ئەقڵی لێ وەردەگرێ. لەزەتێک کە لە ئەنجامی هەست کردن بە چوونە ناو دنیایەکی نادیاری دەنگەوە هەڵقوڵاوە.

دیارە خەڵکێکی کەم هەن کە شارەزای شیکردنەوەی زانستیانەی ئەم دۆزینەوانە بن. خۆ ئەگەر ئەو خەڵکە کەمە بخەینە لاوە ئەوا دەبینین بەشی هەرە زۆری جەماوەر کە عادەتەن مۆسیقا بۆ ئەوانە، کەم وزۆر پەیوەندییان بەم ئەزموونی دەنگانەوە نیە، بۆیە سەرەڕای نەبوونی رەگەزی جوانی لەم مۆسیقایەدا - هۆی تەواویش بەدەستەوەن بۆ سەرنەکەوتنی ئەو هەوڵە پەڕگیرییە نوێگەرییانە، چونکە مۆسیقا بەرێگایەکدا هاتووە کە خەڵکی بە چەمکێک دەدوێنێ لێی تێدەگەن و دەنگدانەوەی سۆزی راستەقینەی ژیانی خۆیانی تێدا دەبینن، چونکە مۆسیقا ئەو ئەرکەی دە ئەستۆ گرتووە کە یارمەتی پێشکەوتنی ئینسان بدا. بۆیە بەم پێودانگە دەبێ رێگای خۆی بۆناو زەینی هەموو خەڵکی بکاتەوە. خۆ ئەگەر سیستەمێکی مۆسیقایی سەر بەتاقمەپسپۆڕێک پەیدا ببێ ئەوا ئەم سیستەمە هەر لەسەرەتاوە بەشی سەرنەکەوتن دەبێ. ئیدی لەوساتەوە کە مۆسیقا بووە بەهونەرێکی ئینسانی وای خواستووە شێوازەکانی شان بەشانی ئەم خەسڵەتانەی بڕوات و ئەلهەقی ئەمە ئەو شەقڵەیە کە لە جوانترین کاری مۆسیقایی ئەو سەردەمانەدا بەدی دەکرێ - مەبەستم لەوکارانەیە کە ژیان و بڵاوبوونەوەو شۆرەتیان سەندووە نەک ئەوکارانەی بۆ چەند ساتێک خەڵکی سەرسام کردو پاشان لە شەوەزەنگی بیرچوونەوەدا ئاوا بوون!

## گوزارشت لەمۆسیقای رۆژهەلاتدا

### کێشەی مۆسیقای رۆژهەلاتی

لە رۆژهەلاتدا هونەرێکی مۆسیقایی پڕ بەپێستی مانای دروستی هونەرمان نیە. ئەمە ئەو حوکمەیە کە ئەم بەشەی ئەم کتێبە بۆ سەلماندنی تەرخان کراوە. بێگومان ئەمە حوکمێکی قورسەو رەنگە زۆرکەس بە غەدری بزانن لە هونەری مۆسیقای ولاتانی رۆژهەلات، بەلام من بۆ روون کردنەوەی رایەکەی خۆم وەکو ئەو کەسانە ناکەم کە بۆ سەلماندنی رای خۆیان تەنیا پشت بە

هەندێ وشەی قەبەو بەسۆزو فاکتەرە زەوقییەکان دەبەستن و، بەس، چونکە ئەوانە - سەرەڕای ئەوەی زۆرجار مەزەندەکانیان ڕاستگۆیانەو قسەکانیان دڵسۆزانەیە - دەکرێ بە ڕایەکی پێچەوانە بەرپەرچ بدرێنەوە. ئیدی ئەوکاتە جیاوازییەکە مادامێکی دەکەوێتە سایەی فاکتەرە زەوقییەکانەوە بێ ئەوەی بگاتە ئەنجامێکی بنج بڕ لە نێوان هەردوو ڕایەکەدا دێت و دەچێت. بۆیە حەزم کرد کۆمەڵێک بەڵگەی ئەقڵانی تەواوی ئەوتۆ کەشان بەشانی فاکتەرد زەوقیەکانی بوەستێ و تاییدی بکات، بۆ پشتیوانی ڕایەکەی خۆم بێنمەوە. وام بە چاک زانی پەنا بەرمە بەر شیکردنەوەیەکی لۆجیکی هێدی تا موناقەشەی ئەم بابەتە گرنگە تەنیا لە مەیدانە زانستییەکەیدا وەمێنێ.

حەزدەکەم بەرلەوەی بچمە ناو درێژەی باسەکەوە ئاماژە بۆ مەسەلەیەکی گرنگ بکەم کە ئەویش مەسەلەی پەیوەندی نێوان هەردوو مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییە.

لەبواری ئەم شیکردنەوەیەدا خوێنەر گەلێک بەراوردی نێوان مۆسیقای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەبینێ یا وەکو خۆم - حەز دەکەم نێوی بنەم - بەراوردی نێوان مۆسیقای ناوچەییمان و مۆسیقای جیهانی دەبینێ. ڕەنگە هەندێ کەس ئەم بەراوردە بەناڕەوا بزانن، چونکە لەنێوان دوو سیستەمدا دەکرێ کە هەریەکەیان بۆخۆی سروشت و دەستوورو ژینگەی تایبەتی خۆی هەیە. ئەوا لێرەدا دەست پێشکەری دەکەم و هەر لەسەرەتاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەم کە - بەلای ئێمەوە - ئەم ڕایە ڕایەکی یەکجار نادروستە، چونکە جیاوازی نێوان مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی جیاوازی جۆرەکانیان نیە، بەڵکو تەنیا جیاوازی پلەیەو بەس. مەبەستم ئەوەیە کە بەراوردکردن لە نێوان هەردوو سیستەمە مۆسیقاکەدا ڕەوایە، چونکە بەراوردە لە نێوان دوو سیستەما کە یەکەمیان هەنگاوی زۆری لە ڕێگای پێشکەوتنا ناوەو دووەمیان هێشتا لەیەکەم قۆناغەکانی ڕێگادایە. هەر هەموو دوورییەکەی نێوانیشیان دەگەڕێتەوە بۆ قوڵی و دەوڵەمەندی ئەزموونی ڕۆژئاواییەکان لەم بوارەدا کە پاش هەوڵ و کۆشش و ماندووبوونی زۆر بەدەستیان هێناوە، بەڵام بارکردنی ئەم مەیدانە بە مەسەلەی «نەتەوەیی» ئەمەیان کارێکی بێ بنەمایەو لەم بەشەی باسەکەماندا لە بنج و بنەوانەوە هەڵی دەوەشێنینەوە.

با لە گەورەترین دەرگاوە بچینە ناو بابەتەکە. بێگومان یەکێک لە نیشانەکانی پێشکەوتنی هەر هونەرێک ئەوەیە کە بەهەوڵ و کۆششی تایبەتی خۆی، خۆی بسەپێنێ و پێویستی بە کۆمەکی چ هونەرێکی دی نەبێ تا ببێ بە تەواوکەری گوزارشت کردن لە ماناکانی سەیر دەکەین مۆسیقای ڕۆژئاوایی لەمێژە لە شیعرو گۆرانی جیابۆتەوەو توانیویەتی پاش پەرەسەندنێکی زۆر بێ ئەوەی پێویستی بە کۆمەکی هونەرێکی دیکە هەبێ گوزارشت لە ئەرکی خۆی بکا. وای لێ هاتووە شیعر یا سەما بۆنەوە ناخرێنە سەر مۆسیقا تا بۆشاییەکی تێدا پڕ بکەنەوە، بەڵکو بۆ دروست کردنی شتێکی تازەیە لە هونەری مۆسیقای شیعری یا مۆسیقای سەما.

مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی چ هەنگاوێکی لەمەیدانی خۆی بووندا ناوە؟ ئاشکرایە ئەم مۆسیقایە تەواو دەستەوسانە لە گوزارشت کردن لە هەرماناو بسۆزێک. مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی بە تەنیا چ توانایەکی گوزارشت کردنی نیە. لەوەزع و حاڵێکداین کە ئەزموونی مۆسیقاییمان هەر هەمووی لە چوارچێوەی ستراندا قەتیس ماوە. ئەگەر بۆ مۆسیقایەکی خالیسە بگەڕێی تەنیا هەندێ هەوڵی سەرەتایی و نەفەس کورتی سووک دەبینی کە گوزارشت لە چ شتێک ناکاو بەبێ گۆرانی چ کارێک لە جەماوەر ناکا، واتە بەبێ کەلیماتی گۆرانیەکە تەواو دەستەوسانە. ئێمە تا دوێنێ و پێرێ بە مۆسیقای خالیسەمان دەگوت (مۆسیقای بێدەنگ) وەکو ئەوەی مۆسیقا بە تەبیعەت دەبێ بەقسەوەبێ، وەک بڵێی مۆسیقا بەتەنیا هونەرێکی (لاڵ) بێ و ئەگەر کەلیماتی گۆرانی لەگەڵدا نەبێ، هەموو دەنگەکانی (کپ) بن!!!

بێ چەندوچوون پشت بەستنی مۆسیقا هەر بە گۆرانی، دیارترین دیاردەی پاشکەوتنیەتی، چونکە گۆرانی بە تەبیعەت بوارەکەی بەرتەسکەو - زۆرجار - کەلیماتەکانی بەسە بۆ کارکردن لەگەڵی گۆهداران با هەر مۆسیقاکەشی سادەو ساکار بێ. ئەلهەقی گەلێک سترانمان هەن هەر بەهۆی ئەوەوە کە گوهدار دڵبەندی وشەو واتاکانین بڵاو دەبنەوە، لە حاڵێکا ئاوازەکانیان زۆر سادەو بێ تامن.

کەواتە وەختێ دێینە سەرباسی هونەری مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی دەبێ هەمیشە ئەوە بڵێین کە ئەم هونەرە هێشتا نەگەییوەتە پلەی خۆبژێوی (الاکتفاء الذاتی) وتا ئێستا هونەرێکە بۆ گۆرانی، وەکو چۆن بەر لەنزیکەی چوارسەد ساڵێک ئەمە حاڵی مۆسیقای ڕۆژئاواییش بوو! مادامێکی مۆسیقا خالیسەمان - گەر هەبێ - چ مانایەکی نیە ئێمە هەمیشە بۆ زەوق وەرگرتن لە مۆسیقاو لێکدانەوەی ماناکانی پەنا دەبەینە بەر وشە. بگرە یەکێتی ئامانج لەنیوان مۆسیقاو وشەی یەک گۆرانی هەر نیە، ئاوازی گۆرانیەکە بۆ هەر گۆرانیەکی دی دەست دەدا ئەگەر شیعرەکەیان هاوکێش بێ. لەوانەیە مۆسیقای گۆرانیەکی خەمناک بخرێتە شوێن مۆسیقای گۆرانیەکی شاد بێ ئەوەی هەست بە هیچ ناتەباییەکی نێوان وشەکان و ئاوازەکان بکرێ.

لێرەدا چونکە مەبەستەکەمان باسی مۆسیقایە، دەرفەتی ئەوەمان نیە حوکم لەسەر وشەی گۆرانی ڕۆژهەڵاتی بدەین. نابەجێ نیە لێرەدا بەخێرایی ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە واتای ئەم گۆرانیانە چەند ڕۆمانسی و سادەن، چۆن زیاد لەپێویست بایەخ بەکێشەی دڵداری دەدەن کە خۆی لە خۆیدا دەربڕینی ئەو ئاڵۆزیە سێکسییەیە کە وەچەکانی ئێستای ڕۆژهەڵاتمان پێوەی دەتلێنەوە، ئەویش لە قاڵبێکی خەمناک و نائومێدی ئەوتۆدا کە ئامانجی ژیان دەشێوێنێ. تەنانەت پێشەوەرانی مۆسیقا لەلای ئێمە وایان لێ هاتووە پێشبڕکێی حەسرەت و گریان و وورووژاندنی گوێگر دەکەن، وای لێ هاتووە پێوەری پایەی هەر یەکێکیان بووە بەوەی کە

دەتوانێ چەند فرمێسک بە گوێگر هەڵڕێژێ.

کەواتە دنیای مۆسیقامان لەچوارچێوەی هەرە تەسکی گۆرانیدا قەتیس ماوەو مۆسیقا تەنانەت لەم چوارچێوە تەسکەشدا ئەرکی دروستی خۆی ئەنجام نادات. دەبا تاوێک لە ئاستی ئەم سەرنجە درشتەدا بوەستین و چاوێک بە خەوشەکانی ئاوازدانان لە مۆسیقای رۆژهەڵاتیدا بگێڕین. لەم شیکردنەوەیەماندا پەنا دەبەینە بەر ئەو دابەشکردنەی پێشتر لەمەڕ رەگەزەکانی زمانی مۆسیقا باسمان کرد کە بریتیە لە: ئاواز، ریتم، هارمۆنی دەنگ و قاڵب یا فۆرم.

ئاواز لە مۆسیقای رۆژهەڵاتیدا شەقڵێکی تایبەتی هەیە کە پێویستە هەوڵ بدەین بەروونی بیخەینە بەرچاو تا ئەگەر لەگەڵ ئاوازی مۆسیقای رۆژئاواییدا بەراورد کرا بەتەواوی پەی بە کەموکوڕییەکانی بەرین. گەلێک لەو کەسانەی لە مەیدانی مۆسیقادا کار دەکەن چ لەمەیدانی تیۆرێکی داو چ لەمەیدانی پراتیکی دا وای بۆ دەچن کە مۆسیقای رۆژهەڵاتی خەسڵەتێکی هەیە کە لەمۆسیقای رۆژئاواییدا نیە.

ئەویش ژمارەی پەیژەکانە. مۆسیقای رۆژهەڵاتی پەیژەی زۆرە، بەڵام مۆسیقای رۆژئاوایی تەنیا پشت بە دووپەیژەی سەرەکی دەبەستێت. گەورەو بچووک. بەرای ئێمە ئەم مەسەلەیە بەهیچ کلۆجێ مانای شانازی نیە، چونکە پەیژەی مۆسیقایی تەنیا ئەو پیتانەیە کە وشەو رستەکانی زمانی مۆسیقای پێ دادەڕێژێ، هەڵبەتە زۆری ژمارەی ئەم پیتانەو نووسینەوەیان بە خەتێکی چاک و جوان بەهیچ جۆرێ ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو پارچەیەی پێی داڕێژراوە پارچەیەکی یەکجار نایابە. هونەر لەو مۆسیقایەدایە کە پێی دانراوە نەک لە زۆری ئەو پەیژانەی لە دانانیا بەکار هێنراوە. بەوتەیەکی دی حوکم دان لەسەر سیستەمێکی مۆسیقایی بەوەی کە بەهۆی پەیژەکانەوە شەقڵی تایبەتی وەرگرتووە. حوکمێکی بەتاڵە، چونکە پەیژەکان تەنیا پیتە ئەبجەدییەکانی ئاوازە، بۆیە دەبێ هەمیشە خودی ئاوازەکە ببێ بەبناغەی حوکم لەسەردان. ئەو قسەیە دەق وەکو ئەوەیە بوترێ زمانی چینی چونکە هەزاران پیتی ئەبجەدی هەیە دەبێ ئەدەبیاتێ بێنێتە ئاراوە کە لە ئەدەبیاتی هەموو زمانەکانی دی باڵاتربێ! بۆیە دەبێ ئەوە بزانین کە لەم کێشەیەدا پیتەکان بەتەنێ چ مانایەک ناگەیەنن و ئەوەی گرنگە ئەو دوا بیردیە کە ئەم پیتانە وەکو ئامێری گواستنەوە بەکار دێنێ.

خۆ ئەگەر بێینە سەر موناقەشەی هەموو لایەنەکانی ئەم کێشەیە، ئەوا دەبینین هەندێ جار زۆری پەیژەکان دەبن بەکەم و کوڕییەک کە دەبێ چارەسەر بکرێ. وەختێ گوێ بۆ دەنگی رۆیشتنی گالیسکەیێکی تریشقە هەڵدەخەین سەیر دەکەین هەزاران پەیژەی تێدایە، بەڵام ئاشکرایە کە چ جوانیەکیان تێدا نیە! ئەرکی مۆسیقا بریتییە لە خەستکردنەوەو رێکخستنی ئەم دەنگە زۆرانە لەقاڵبی کۆمەڵە دەنگێکی کەمی گونجاو و تەبای ئەوتۆدا کە ئاوازێکی نایاب و پڕبایەخ بەدەستەوە بدات. دەتوانین بڵێین پەرەسەندنی دوورو درێژی مۆسیقا لە رۆژئاوادا کردیە کارێ کە ئەم پەیژە زۆرانە لە دوو چەشنی سەرەکیدا کۆبکاتەوە: گەورەو بچووک. ئەم پرۆسەیە رێک وەکو پرۆسەی کەم کردنەوەی پیتە هیجاییەکانی زمانێکە لەکۆمەڵە پیتێکی کەمی ئەوتۆدا کە بتوانێ وەکو ئامێری گواستنەوە گشت وشەو ماناکەی ئەو زمانە دەربڕێ، زۆری ژمارە بەگشتی نابەجێیە تەنیا ئەو وەختانە نەبێ کە ئامێرەکان دەرەقەتی گوزارشت و دەربڕین نەیەن، بەڵام کوا دەرەقەت نەهاتن، ئەم دوو پەیژە رۆژئاواییە گوزارشتیان لە شاکاری جیهانی ئەوتۆ کردووە کەتا ئەمڕۆش زەمان نەیتوانیوە کاریگەرییان کەم بکاتەوە؟

سەردەمێ بەسەر مۆسیقای رۆژئاواییدا هات هونەرمەندەکانیان کەوتنە گێژاوی ئەو هەڵەیەوە کە زۆری ژمارەی پەیژە مۆسیقاییەکان کارێکی چاکە. ئەوەبوو کۆمەڵە سیستەمێکی میلۆدیکیان داهێنا کە لەچوارچێوەی پەیژە باوەکان دەرچوو، نەک هەر دەرچوو بگرە لەخانەی هیچ پەیژەیەکیشا خۆی نەدەگرتەوە نمونەی دیاری ئەمەش مۆسیقای شونبرج، بەڵام زۆری پێ نەچوو پەرگیری توندڕەوی ئەم شۆڕشەهونەرییە بەدیارکەوت و هونەرمەندەکان وێرای سوود وەرگرتنیان لە سیستەمە تازەکان بەرەبەرە گەڕانەوە بۆ سیستەمە کۆنەکان. مۆسیقا زاناکان پاش دامرکانەوەی ئەم ئەزموونە هەڵچووە بۆیان دەرکەوت کە قاڵبە دەنگییەکان ئیمکاناتی لەبن نەهاتووی تێدایە ئەگەر لەگەڵ تازەکردنەوەی فۆرم و ریتم و هارمۆنی دەنگدا تێکەڵ بکرێ – ئەمە رای باوی مۆسیقا زانە گەورەکانی وەچەی ئەمڕۆی ئێمەشە! کەواتە زۆری ژمارەی پەیژە مۆسیقاییەکانی رۆژهەڵات ئەو شتە نیە کە شانازی پێوەبکرێ.

بەڵکو هونەر لەوەدایە کە تا چ رادەیەک سوود لەم پەیژانە وەربگیرێ با ژمارەشیان کەم بێ.

بابچینە سەر رادەی سوود وەرگرتنی مۆسیقازانە رۆژهەڵاتییەکان لەم هەموو پەیژانە. ئایا ئاواز لە مۆسیقای رۆژهەڵاتا پڕ مانایە، پڕ گوزارشتە؟ لایەنگرانی مۆسیقای رۆژهەڵاتی ئەگەر رەخنەی ئەوەیان لێ بگیرێ کە مۆسیقاکانیان خاڵیە لە هارمۆنی، بەوە وەڵام دەدەنەوە کە مۆسیقاکانیان لەبنەڕەتا میلودیکەو سامکانێکی ئەوەندە دەوڵەمەندی ئاوازی تێدایە کە لە مۆسیقای رۆژئاوادا نیە. با ئەم بۆ چوونە بجەربێنین و بایەخی راستەقینەی ئاواز لەمۆسیقای رۆژهەڵاتیدا شی بکەینەوە.

بەڕای ئێمە ئەم زۆری پەیژانەی کە ئاوازی مۆسیقای رۆژهەڵاتی جیا دەکاتەوە لەبەر دوو فاکتەر بایەخی خۆی دەدۆڕێنێ ئەویش فاکتەری (تلاصق) و (تماثل)ن.

جا بۆ ئەوەی نمونە بۆ ئەم دوو فاکتەرە بێنمەوە، هەر لەکاتی نووسینی ئەم چەند دێرەدا یەکەم برگە مۆسیقام کە گوێم لێ بوو تۆمار کرد. مادامێکی هەر لەسەرەتاوە هەست بە شەقڵە رۆژهەڵاتییەکەی دەکرێ ئیدی زانینی ناوی دانەرەکەی یا ناوی برگەکە ئەوەندە گرنگ نیە.

نۆتەی مۆسیقا

١- فاکتەری هاوچەسپی (تلاصق): ئەوەیە کە هەموو دەنگێکی ناو ئاواز بریتییە لە دەنگی دواتری دەنگەکەی پێش خۆی جا چ بەبەرزی چ بەنزمی بێ. واتە ئاوازی رۆژهەڵاتی بریتیە لە زنجیرە دەنگێکی پێکەوە گرێ دراو لە چوارچێوەی هاوچەسپیدا (تلاصق) بەرزو نزم دەبێتەوە. ناتوانم بڵێم کە ئەمە دەستورێکی گشتییەو تاقە یەک ئاواز لێی لانادات، بەڵام دەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم کە بەشی هەرە زۆری ئاوازە رۆژهەڵاتییەکان لەسەر ئەم دەستورە دەڕۆن. هەروەها ئاوازە رۆژهەڵاتییە کۆنەکان وەکو بشارف، هەر هەموویان لەسەر ئەم دەستورە دەڕۆن و لادانیان بۆ نیە، باشە ئەمە چ عەیبێکی تێدایە؟ بێگومان ئەو ئاوازەی بەشێوەی دەنگی هاوچەسپ دەڕوات زۆر ئاسانترە لەو ئاوازەی کە دەنگەکان تێیدا لێک دوورن. هەڵبەتە سادەیی و ئاسانی بۆخۆی خەوش نیە، بەڵام لەم حاڵەتەدا دەبێتە هۆی هەست نەکردن بە تازەیی لە ئاوازە داهێنراوەکان و دەبێتە مایەی لێکچوونی هەموو ئاوازەکان و رەگەزی هەمە جۆری تێدا دەکوژێ. هەڵبەتە بە هیچ جۆرێ قورس نیە پیشەوەری مۆسیقا (محترف الموسیقی) بە بەرزی و بە نزمی بەسەر پەیژەی مۆسیقادا بڕوات و هەنگاوی بەرە بەرەو پێکەوە چەسپاو بنێ لەگەڵ ئاڵو گۆڕکردنێکی کەمدا لە زەمانی هەر دەنگێک. بەڵکو قورسی لەوەدایە ئاوازێ دابنێ بریتی بێ لەو بازرەقە دەنگیە شازایانەی کە ئاوازی مۆسیقای رۆژئاوایی لێیان پێک دێ. ئالێرەدا توانا دەردەکەوێ، هەموو ئاوازێک تازە دێتە بەرچاو و جیاوازە لە ئاوازێکی دی. جا با نمونەیەک لە تاقە یەک موزیشنی رۆژئاوایی وەر بگرین و بزانین چۆن جیاوازی پێکهاتنی ئاواز لە مۆسیقای رۆژئاواو لە مۆسیقای رۆژهەڵاتدا دەردەخا. با ئەم موزیشنە بیتهۆڤن بێ.

نمونەی یەکەم: سەرەتای بزاڤی سەمفۆنیای سێیەمێتی (ئیرویکا) کە لە هەمان کاتدا بابەتی سەرەکیەتی.



نمونەی دووەم: بابەتی سەرەکی دوا بزاڤی سەمفۆنیایی شەشەمێتی (پاستورال).





نمونەی سێیەم: سەرەتای یەکەم بزاڤی سەمفۆنیای نۆیەمە کە ئەویش بابەتی سەرەکیەتی.



لەم نمونانەوە - کە هەر هەموویان ئاوازی سەرەکین لە مۆسیقای بیتهۆڤنداو لەسەمفۆنیاکاندا بزاڤی مۆسیقایی تەواویان لەسەر بینا دەنێ - دەتوانین هەست بە رادەی ئازادی بزاڤ لە ئاوازی رۆژئاواییدا بکەین. دانەر بەهیچ جۆرێ پەنا ناباتە بەر هاوچەسپی ئاسانی دەنگ، بەڵکو مێشکی دەخاتە کار بۆ داهێنانی ئاوازێک کە دەنگەکانی لێکدییەوە دووربن و هەر لە هەوڵی را رەسەنایەتیەکەی دەکەوێتە روو.

دەتوانم بڵێم سیفەتی هاوچەسپی دەنگ لە ئاوازی رۆژهەڵاتیدا بۆتە هۆی خەفەکردنی رەگەزێکی هەرە گرینگی رەگەزەکانی زمانی مۆسیقا کە ئەویش هارمۆنی دەنگە.

چونکە ئەو ئاوازانەی کە دەنگەکانیان بە ئازادییەکی ئەوتۆ دەجولێن کە پتر لەیەک پلەی دەنگ لێکدیان جیا بکاتەوە، دەبێتە مایەی کەشف بوونی کۆمەڵێک پەیوەندی سەرەکی لە نێوان کۆمەڵێک دەنگی دیاریکراو لەیەک پەیژەی مۆسیقادا. ئەگەر دیقەتی نمونەکانی سەرەوە بدەین دەبینین دوو ئاوازیان راستەوخۆ لەسەر بناغەی هارمۆنی بینا نراون:

نمونەی یەکەم: سەرەتای سەمفۆنی سێیەم بریتیە لە سێ دەنگی هارمۆنی بینراو لەسەر پەیژەی (می بیمول) کە دەکاتە. می. سول. سی. هەروەها نمونەی دووەم کە بابەتی سەرەکییە لەدوا بزاڤی سەمفۆنیای شەشەم، لەسەر دەنگە هارمۆنیەکانی پیژەی پارچەکە بینا نراوە. واتە پەیژەی فاکە دەکاتە. فا - لا - دو - کە ئەو دەنگانەیە بە ئاشکرا لەناو یەکەم سێ لەمپەرێ (حاجز) ئەم نمونەیەدا دیارە.

ئەم چەشنە دەنگانە گەر پێکەوە لەهەر حاڵەتێکا لێ بدرێن، ئەوا هارمۆنی سێیانەی ئەو پەیژە پێک دێنن کە پارچەکەی پێ دانراوەو کە ئەمە بەشێوەیەکی گشتی بناغەی زانستی هارمۆنی دەنگە. پێم وایە ئەم نمونانە بەسن بۆ پشتیوانی ئەو گریانەیەی لێرەدا خستە روو کە رەوتی پێکەوە چەسپاوی ئاوازی رۆژهەڵاتی بووەتە مایەی غافڵ بوون لە پێوەندی بنەڕەتی نێوان قەراری پەیژەو هەندێ دەنگی تایبەتی، بۆ نمونە وەکو دەنگی سێیەم و پێنجەم لەناو هەمان پەیژەدا کە ئەم پەیوەندییە بناغەی هارمۆنی دەنگ بەگشتی پێک دێنێ و ئەم پەیوەندیانە تەنیا لە ئاوازێکدا بەدیار دەکەوێ کە چوارچێوەی هاوچەسپی ببەزێنێ. لەوەیە هەندێک پێیان وابێ کە پەیوەندی نێوان و ئاوازو هارمۆنی دەنگ پەیوەندییەکی پێچەوانەیە، واتە هەست کردن بەبوونی هارمۆنی لەنێوان کۆمەڵە دەنگێکی دیار کراوا کارێ دەکا کە ئاواز برێ جاران دوای دەنگە هارمۆنیەکان بکەوێ. ئێمەش ئەوە دەسەلمێنین و بێگومان ئەمە کاتێ روویدا کە دەستورەکانی هارمۆنی دەنگ

هاتنه کەشف کردن، بەڵام ئەوەش بەڵگە نەویستە کە ئاواز لە پێشەوەدیەو هەندێ پێوەندی تایبەت لەنێوان دەنگە یەک لەدوا یەکەکانی ئاوازدا هەیە. کە پێکەوە لێ بدرێن ئیحای هارمۆنی دەدەن. بەهەرحاڵ پەیوەندیەکی کۆک لەنێوان رەوتی تایبەتی ئاوازو دەستورەکانی هارمۆنیدا هەیە. ئەم پەیوەندیە لەمۆسیقای رۆژهەلاتیدا هەر نیە، چونکە دەنگەکانی ئاواز پێکەوە چەسپیون و ئەنجام بۆتە هۆی سڕینەوەی هارمۆنی دەنگ لە مۆسیقای رۆژهەلاتیدا.

٢- بەڵام فاکتەری هاوشێوەیی (تماثل) پێویستمان بەوە نیە زۆری لەسەر بڕۆین، چونکە روونەو پێویستی بەشەرحی دوورو درێژ نیە - هەڵبەتە هونەری دروست و رەسەن دەبێ ئەوەندەی داهێنانی بەردەوام تێدا بێ کە زەوقی لێ وەربگیرێ، بۆیە ئەگەر هاوشێوەیی زۆر دووبارە ببێتەوەو ببێ بە بەشێکی سەرەکی کاری هونەری لەرووی ئیستاتیکاوە ناخۆشەو دەسوێ. دەتوانین لێرەدا نمونەیەک بۆ هاوشێوەیی بێنینەوە ئەگەر داوات لێ بکرێ بەرەسم شێوەیەکی لەم بابەتە تەواو بکەیت.



ئەوا ئاسانترین رێگا ئەوەیە لەبەرانبەریەوە یا لەدیوەکەی تریەوە شێوەیەکی وەکو خۆی دروست بکەیت و لە ئەنجاما شێوەکە وای لێ دێت.



بەڵام ئەگەر ئەم تەواو کردنە هاوشێوەییە بوو بەدەستورێکی گشتی لە رەسمدا بێگومان لەنرخی دادەگرێ، چونکە ئەم تەواو کردنە پێویستی بە کۆششێکی داهێنەرانەی کەمترە وەک لەوەی دارشتنی شێوەکە بەتەواوی دەیەوێ - هەر بۆیە رەسمە زەخرەفییە هاوشێوەکان لە روانگەی هونەرییەوە ئەو بایەخەیان نیە، هەر بۆیەش سەیر دەکەین قوتابخانە قوڵە هاوچەرخەکانی رەسم دان بەدەستوری هاوشێوەیی دانانەن تەنانەت ئەگەر سروشتیش هاوشێوەبێ، وەکو ئەوەی لە دەموچاو یابەدەنی ئینساندا هەیە.

ئەگەر ئەم سەرنجە لە مەیدانی مۆسیقادا بەکار بێنین سەیر دەکەین زۆربەی ئاوازە رۆژهەلاتیەکان تا رادەیەکی زۆر پشت بە هاوشێوەیی دەبەستن، ئەگەر لەو نمونەیەی پێشو ئاوازی رۆژهەلات ورد ببینەوە بەراوردێک لەبەینی بەشی أ و بەشی ب تەواو وەکو أ وایە، هەموو جیاوازیەکە ئەوەیە کە ب لەپەیژەدا پلەیەک نزمترە - تەواو وەکو ئەو وێنەیەی لە رەسمەکەدا دیتمان کە هەر نیوەیەکی لە نیوەکەی تر دەچێ و تاقە جیاوازیان ئەوەیە کە یەکێکیان لەسەرەوەیەو ئەوی دیکەیان لە خوارەوەیە - ئاواز دانەری رۆژهەلاتی کە پشت بە فاکتەری هاوشێوەیی دەبەستێ دیارە پەنا دەباتە بەر ئاسانترین رێگا، بەڵام کەم بایەخ ترین رێگایە لەباری هونەرییەوە. خۆ ئەگەر سەرنجی مۆسیقای رۆژئاوایی بدەین دەبینین ئەم فاکتەری هاوشێوەییە تەنیا لە مۆسیقا سووکەکاندا بەرچاو دەکەوێ کە ئەویش ئەوەندە بایەخی نادرێتێ و بەهیچ جۆرێ سەرچاوەی قودتی مۆسیقای رۆژئاوایی نیە.

خولاسە ئێمە ئەگەر مۆسیقای رۆژهەلاتی لەبەر رۆشنایی رەگەزی یەکەم، واتە رەگەزی زمانی مۆسیقا کە بریتیە لە ئاواز؛ هەڵسەنگێنین سەیر دەکەین وێڕای ئەوەی لەبنەڕەتدا میلودێکە، لەئاوازەکانیا پەنا دەباتە بەر شێواز گەلێک کە قورسایی و ناسکی کارە هونەرینەکە کەم دەکاتەوە وشەقڵێکی وای پێ دەبەخشێت کە گوێگری وریا بێزار دەکا. وەنەبێ ئەم حوکمەی ئێمە حوکمدانێکی زەوقی و رووت بێ، بەڵکو حوکمدانێکی پشت بەستووە بەشیکردنەوەی بابەتیانەی تەبیعەتی ئاواز لە مۆسیقای رۆژهەلاتیدا کە لە رێگای ئەو شیکردنەوەیەوە خەوشە سەرەکییەکانی کەوتنە روو.

رەگەزی دووەمی زمانی مۆسیقا بریتییە لە ریتم (الایقاع). ئیعتراف بۆ گەلێ خوێنەران دەکەم کە بیرکردنەوە لەم رەگەزە کاتێکی لەوە پتری لێگرتم کە پێشبینیم دەکرد، چونکە بە ئاشکرا هەستم دەکرد کە جیاوازییەکی گەورە لەنێوان ریتمی مۆسیقای رۆژهەلاتی و ریتمی مۆسیقای باڵای رۆژئاواییدا (نەک مۆسیقای سووک و وروژێنەر) هەیە، بەڵام کە هەوڵمدا دەربڕینێکی هوشیارانە بۆ ئەم جیاوازیایە پەیدا بکەم زۆرم زەحمەت دیت.

لەسەرەتادا وام هاتە بەرچاو کە خاوی ریتمی رۆژهەلاتی و خێرایی و راچەنیوی ریتمی رۆژئاوایی جیاوازی هەرە گەورەی نێوانیانە. هەر بە راستیش بۆم دەرکەوت کە پیاو بەدەگمەن ریتمی خێرا لە مۆسیقای رۆژهەلاتیدا دەبینێ، بۆیە مرۆڤ کە گوێی لێ دەگرێ هەست بە جۆرە خاوبوونەوەیەک دەکا. هەروەها بۆیە ناتوانێ چەشنە سەمایەکی زیندووی ئەوتۆ پێک بێنێ کە هەموو بەدەنی ئینسان بخاتە بزاڤێکی خورت و پێکەوە گرێ دراو. سەرەڕای ئەوەش هەستم کرد یەکەم: ئەم دەستورە هەرچەند دەربارەی زۆربەی دانراوە مۆسیقاییەکانی رۆژهەلات دروستە، بەڵام هێشتا هەر گشتی نیە، دووەم: هەندێ لە دانراوە مۆسیقاییەکانی رۆژئاوا ریتمیان خاوە، لە ناوەڕاستی دوا بزاڤی سەمفۆنیای سێیەمی بیتهۆڤندا هونەرمەند بابەتی سەرەکی بزاڤەکە دووبارە دەکاتەوە، بەڵام بەریتمێکی خاوتر - لەگەڵ ئەوەشدا ئەوشتە بەهیچ جۆرێ لە جوانی بابەتەکەی کەم نەکردۆتەوە پاش ئەوەی خێرایی ریتمەکەی خاوتر بووەتەوە.

پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر گەییمە ئەم ئەنجامەی کە ریتمی رۆژهەلاتی خەسڵەتێکی دی تێدایە کە بەتەواوی لە ریتمی رۆژئاوایی جیای دەکاتەوە. یەکەمیان: واتە رۆژهەلاتی، دیارو

ئاشکرایه. دووەمیان: واته رۆژئاوایی، نادیارو پەنامەکییه. جا با بەدرێژی ئەم دوو خەسڵەته شەرح بکەین. مەبەست لە ریتمی رۆژهەلاتیی کە دیارو ئاشکرایه ئەوەیه کە قەواردیەکی سەربەخۆی هەیەو لەگەڵ خودی ئاوازەکەدا دەڕوا بێ ئەوەی ئاوێتەی ببێ. لەمۆسیقای رۆژهەلاتیدا ئامێرە ریتمیەکان رۆڵێکی ئاشکرا دەبینن کە بەئاشکرا هەستی پێدەکرێ. راستە لێدانەکانیان لەگەڵ ئاوازەکەدا دەڕواو رێکی دەخا، بەڵام تا رادەیەکی زۆر جیان لە ئاوازەکە، چونکە شەپۆلێک پێک دێنێ کە گوێچکە بە ئاشکرا لەسەرەتای ئاوازەکەوە تا کۆتایی ئاوازەکە جیای دەکاتەوە، بەڵام ریتمی رۆژئاوایی - لێرەدا دووبارەی دەکەمەوە کە مەبەستمان لە مۆسیقای باڵای رۆژئاوایە - تا رادەیەکی زۆر ئاوێتەی شەپۆلی ئاوازەکەو هارمۆنیەکە بووە، مەبەستم ئەوەیە کە ئاوازو هارمۆنی لە رەوتی خۆیاندا ریتمەکە دەنوێنن بێ ئەوەی مۆزیشن پێویستی بەوەبێ بەتایبەتی ئاماژەی بۆبکا. بۆیە ریتمی رۆژئاوایی پێویستی بەلێدانی تایبەتی نیه، تەنیا لەهەندێ حاڵەتی زۆر کەمدا نەبێ. زۆربەی لێدانەکانی ریتم بە رادەیەک نزمن کە گوێچکە ناتوانێ بەئاسانی جێگای بکاتەوە، بەڵکو خودی ئاوازەکە لە رەوتی خۆیدا پەردە لەسەر کێشی ریتمەکە لادەبات.

بەڵام ئەگەر ریتمی رۆژهەلاتی ئاشکراو دیاربێ و ریتمی رۆژئاوایی پەنامەکی و شاراوە بێ، بۆچی خەسڵەتی ئاشکرایی لە ریتمی رۆژهەلاتیدا بەدیاردەیەک لە دیاردەکانی نوقستانی بژمێردرێ؟ چونکە ئەگەر سەیری پەرەسەندنی خودی مۆسیقا بکەین دەبینین بەردبەرد رووەو (ئاوێتە کردنی) ریتم دەچێ نەک دەرخستنی. ریتم دیارترین و زەق ترین رەگەزی مۆسیقای سەرەتاییه، بگرە هەندێ لەم مۆسیقایانە، واته مۆسیقای سەرەتایی یەک پارچە ریتمی رووتە. تا ئێستاش ئاسەواری ئەم خەسڵەته لە گوندەکانی میسردا دیاردو (تەپڵ) ئامێری هەرە سەرەکیانە. ئەگەر ئاواز لەم چەشنە مۆسیقایەدا دەربکەوێ ئەوا ریتم بواری نادات، بەڵکو بەزەقی دەردەکەوێ و شان بەشانی بزاڤی ئاوازەکە دەڕوات و بەشێوازی تایبەتی خۆی دەیسەلمێنێ و سەرنج دانێکی پەرەسەندنی مۆسیقا ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ کە رێبازی بەرەبەرە (ئاوێتە کردنی) ریتم لەگەڵ هەموو رەگەزەکانی دیکە مۆسیقادا زاڵ بووەو ریتمی ئاوازەکە - لەباڵاترین قۆناغی پەرەسەندنی مۆسیقادا - لەبواری رەوتی ئاوازو هارمۆنیەکەدا دەردەکەوێ و چ پێویست ناکا ئاماژەی تایبەتی بۆ بکرێ. هەڵبەتە ئەمە مانای ئەوە نیه کە ریتم لەم حاڵەتەدا رۆڵی کەم دەبێتەوەو دەبێ بە رەگەزێکی فەرامۆش کراوی رەگەزەکانی زمانی مۆسیقا، بەڵکو بەپێچەوانەوە. لە مۆسیقای برامزادا - کە بەڕای من مامۆستای هەرە گەورەی ریتمە - ریتم بەتەواوی ئاوێتەی ئاواز دەبێ و لەگەڵ ئەوەشدا دەگاتە پۆپەی کاریگەری. لە مۆسیقای بیتهۆڤندا ئاواز بەتەنیاو بێ ئەوەی پێویست بەوە بێ ئاماژەی تایبەتی بۆ ئامێری ریتم بکرێ، بزاڤێکی ریتمی ئەوتۆ دروست دەکات کە دەگاتە لوتکەی جۆش و خرۆش وەکو لە شێوازی پێکەوە گرێداندا بەدی دەکرێ (دەتوانین بەم شێوەیە ماناکەی نەقڵ بکەین: رێبازی لێدانی تەئجیل کراو) ئەمە ئەو رێبازەیه کە بیتهۆڤن لە دانراوە مۆسیقاییەکانی خۆیدا پەرەی پێداو بەشێوەیەکی فراوان بەکاری هێنا.

کەواتە پەرەسەندنی مۆسیقا بەخۆی ئەوە دەسەلمێنێ کە ریتمی ئاوێتە بوو وپەنامەکی لەرووی کاریگەری هونەرییەوە گەلێک باڵاترە لە ریتمی ئاشکراودیار. ئەمەش وەکو ئەو ماناو رستانەیە کە گوێگر یا خوێنەر سەرپشک دەکا بۆ تێگەیشتن لە بایەخەکەی نەک وتار بێژ یا نووسەر ناوبەناو ئەم بایەخە دەربخاو بڵێ هوشیارین: قسەیەکی گرنگ دەکەم!... کەواتە رەگەزی ریتم بەوجۆرەی لەسەرێرا هاتە باسکردن نیشانەیەکی تری پاشکەوتووی مۆسیقای رۆژهەلاتییه.

بەڵام رەگەزی سێیەمی زمانی مۆسیقا کە بریتیه لە هارمۆنی دەنگ ئەوا تەواو بێگانەو نامۆیە لە مۆسیقای رۆژهەلاتی. پێش تر لە باسکردنی رەگەزی یەکەمدا، واته ئاواز، باسی ئەو هۆیە سەرەکیەم کرد کە بەڕای من بووەتە مایەی کزی ولاوازی و نەبوونی ئەم رەگەزە سەرەکییە لە مۆسیقای رۆژهەلاتیدا. لە ئەنجامی ئەمەوە مۆسیقای رۆژهەلاتی لە شێوەی شەپۆلە ئاوازێکی پێکەوە گرێدراوی سەرسەریدا (سطحی) دەڕوا، چونکە هارمۆنی دەنگ سەرچاوەی دەوڵەمەندی و قوڵی مۆسیقای رۆژئاواییە. هەر بەهۆی ئەمەوە مۆسیقا لەلای گۆهدار کۆمەڵە تازەییەکی بەردەوام وەردەگرێ و مرۆڤ دەتوانێ - تا پتر گوێی لێ بگرێ - مانای تازەتری لێ وەدۆزێ و پەی بەوە ببات کە دانەر بە چ لێهاتوییەکەوە توانیویەتی هەر هەموو ئەو شەپۆلانە لەیەکەیەکی خەملیودا کۆ بکاتەوە، بەڵام مۆسیقای رۆژهەلاتی چونکە لەسەر یەک شەپۆل دەڕوا - کە خۆی لە خۆیدا تا رادەیەکی زۆر سادەیە - زۆر گوێ لێگرتنی دەبێتە مایەی وەڕزی و بێزاری، هەربۆیە کلاسیکیاتی رۆژهەلاتیمان نەبووە. مەبەستمان لەو پارچە مۆسیقایانەیە کە بەدرێژایی رۆژگار بایەخی خۆیان پاراستووە. وەکو مۆسیقای باخ و موزارت کە پتر لە دوو سەدەیان بەسەرا تێ پەڕیوەو تا ئەمڕۆش بایەخی خۆیان لەدەست نەداوە - بەڵکو هەندێ لە مێژوونووسانی مۆسیقا رایان وایە کە خەڵکی رۆژ بەرۆژ پتر پێشوازییان لێ دەکەن! کەچی مۆسیقای رۆژهەلاتیمان بەپێچەوانەوە، مۆسیقایەکی (وەرزانەیە) زۆربەی هەرەزۆری پارچەکانی لە وەرزێک پتر ناژین، ئەوجا بێ وەی چ کەسێک داخیان بۆ بخوا ون دەبن، چونکە مەبەستەکانی تەواوبوون و بە ئەندازەی ئەو کۆششە ژیا کە لەپێناویدا درابوو!

دوا رەگەز کە بریتیه لە قاڵب یا فۆرم، ئەمیش هەر ئەوەتا هەیەو نیه. گۆرانی تەقلیدی رۆژهەلاتی تەنیا یەک فۆرم دەزانێ: ئەویش دەست پێکردنە بە لیالی پاشان موال - هەندێ دابەشکردنی ئامێری مۆسیقایی کەم پێش ئەمە دەکەوێ، بەڵام راستت دەوێ ناکرێ ئەمە بەهەموو مانای دروستی فۆرم بە فۆرم بزانرێ، بەڵکو شێوەیەکی تەقلیدییەو پێویستی بە چ لێکۆڵینەوەیەک نیه - مۆسیقاش ئەو دەمانە پێویستی بەشتی

لەوە قوڵتر نەبووە.

نەبوونی لێکۆڵینەوە لە فۆرمی مۆسیقا بە ئاشکرا لە مۆسیقای هاوچەرخی ڕۆژهەڵاتدا دیارە. مەبەستم لەو مۆسیقایەیە کە دەیەوێ هەندێ ئاواز یا شێوازی ئاوازدانانی ڕۆژئاوایی وەربگرێ و لەهەمان کاتدا گەلێک لە ئاوازە تەقلیدیەکانی ڕۆژهەڵات بهێڵێتەوە. لەم مۆسیقا (دوو ڕەگەدا) دەبینین کوت و پڕ ئاوازی ڕۆژهەڵاتی بەدوای ئاوازی ڕۆژئاواییدا دێت. مەقامی ڕۆژهەڵاتی کە (چارەکە دەنگی تیایە) ڕاستەوخۆ شان بەشانی پەیژەی ڕۆژئاوایی دەڕوات بێ ئەوەی هەوڵ بدرێت گواستنەوەی نێوانیان هەموار بکرێ، بگرە بێ ئەوەی لەوە بکۆڵدرێتەوە کە داخوا تێکەڵاوکردنیان دەشێت یان نا. ئەلهەقی گوێچکەی شارەزا زۆرجار ئەم گوێزانەوە کتوپڕەی پێ قەبوڵ ناکرێ، چونکە ئەم گوێزانەوەیە دەکرێ بێ ئەوەی چ هەوڵێک بدرێ بۆ لێکۆڵینەوەی فۆرمی مۆسیقاو ئەو کێشانەی لە ئەنجامی تێکەڵکردنی دوو سیستمی جیاواز لەیەک پارچە مۆسیقادا، دێنە ئاراوە.

مۆسیقای تەقلیدی ڕۆژهەڵاتی خەسڵەتێکی دی هەیە کە دەلالەتێکی سایکۆلۆژی گەورەی هەیە، ئەم خەسڵەتەش دەچێتە خانەی فۆرمی مۆسیقاوە. ئەو خەسڵەتەش بریتیە (لەگەڕانەوەی بەردەوام بۆ قەرار) هەڵبەتە هەر پەیژە مۆسیقایەک - یان مەقامێک - قەرارێکی هەیە کە بریتیە لەو نەوایەی پەیژەکەی بەناوەوە نێو دەنرێ. یەکێک لەخەسڵەتەکانی قەرار ئەوەیە هەستی تێر بوون دروست دەکا. بۆیە مۆسیقای ڕۆژئاوایی تاکید لەسەر ئەوە دەکا کە تەنیا لە کۆتایی پارچەدا لەلای قەرارو دەنگە هارمۆنیەکان بوەستێ. یا لەکۆتایی بەشێکی هەرەگرنگی پارچەدا لەلای قەرار بوەستێ - هەر لەکۆنەوە ئەمە لە فۆرمی مۆسیقای ڕۆژئاواییدا پەیڕەوکراوە. بەڵام مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی بەتایبەتی لەشێوە تەقلیدییەکەیدا لەهەر فەقەرەیەکی کورتیا دەگەڕێتەوە بۆ قەرار. خوێنەر ئەگەر ئەوە بیری خۆی بێنێتەوە کە چ شتێک لە گۆرانی لیالی و مەوالی تەقلیدیدا ڕوو دەدا، دەتوانی تەسەوری ئەوە بکات کە مەبەست لە گەڕانەوەی بەردەوام بۆ قەرار چی یە، دوای هەر فەقەرەیەک گوێهدار هەست بە ئاسوودەیی و تێربوون دەکا، ئەگەر سترانبێژ بە (قەفلێکی) دروست کۆتایی پێ بێنێ. ئەوسا گوێهدار لە دوایەوە وشەی (ئاه) دووبارە دەکاتەوە (ئەگەر دەرفەت بێ!) ئەم دووبارە کردنەوەیە عادەتەن بەهەمان تەبەقە دەبێ کە گۆرانی بێژ فەقەرە گۆرانیەکەی پێ قەفڵ دەدا - ئەم تەبەقەیەش بۆخۆی قەرارە، نموونەیەکی تری ئەم خەسڵەتە لەو دابەشکردنانەدایە کە دەگەڕێتەوە بۆ قەراری مەقام کاتێ یەکێ لە فەقەرەکانی تەواو ببێ. ئەم خەسڵەتە بەشێوەیەکی ئاشکراتر لە مۆسیقای (ارغول دا) کە مۆسیقایەکی لادێیی میسرە. دەردەکەوێ. ارغول بریتیە لە دوو لوولە، یەکێکیان یەک دەنگی بەردەوام لێدەدا کە قەرارە، ئەوی تریان ئەو ئاوازە لێدەدا کە بەرزو نزم دەبێتەوە. بەڵام دەبێ پێوەندییەکی تەواوی بە دەنگی لوولەکەی دیکەوە هەبێ و ناوبەناو بگەڕێتەوە پاڵی تاوەکو نیشانەی تەواوبوونی فەقەرە مۆسیقایەک پێکەوە قەرار لێ بدەن.

ئەو قالب و فۆرمەی ئەم بابەتە مۆسیقا تەقلیدیانە لە ڕۆژهەڵاتدا پەیڕەوی دەکەن ئەوەیە کە ئاواز لە کۆمەڵە مەوالێکی کورتی قەفڵ دراو پێک بێت کە هەر یەکێکیان لەگەڵ قەراری مەقامەدا تێکەڵ بێن، بەڵام مۆسیقای ڕۆژئاوا قالبی بزاڤێکی بەردەوام وەردەگرێ و ڕێگای ئامانجێک دەگرێتەبەر کە تەنیا لە کۆتاییدا پێی دەگاو پاشان پارچە مۆسیقاکە تەواو دەبێت. واتە حاڵەتە سایکۆلۆژییەکە لە مۆسیقای ڕۆژئاوادا بریتیە لە حاڵەتی چاوەڕوانی بەردەوام و موتابەعەکردنی مۆسیقاکە تا لەکۆتاییدا هەموو لایەنەکانی تیپە مۆسیقاکە یەک دەگرنەوە بۆ ئەوەی بەشداری لە دوا ئەنجامی پارچەکە بکەن و پارچەکە دەگاتە پۆپە، بەڵام حاڵەتی سایکۆلۆژی لە مۆسیقای ڕۆژهەڵاتیدا حاڵەتی پێشبینی کردنی تەواوبوونە لە هەموو ساتێکا. ئیدی گۆرانی بێژ یا عازف بەدەوری ئەوای قەرارەکەدا دەسوڕێتەوەو زوو بەزوو ئارەزووی گوێهدار بەدی دێنێ و ئەوسا گوێگر دەنگی ڕەزامەندی هەڵدەبڕێ و هەمان ئەوای (ئاها) دووبارە دەکاتەوەو ئیدی ئەم مەوالانە بەدرێژایی ئاوازەکە دووبارە دەبنەوە، بێگومان ئەم حاڵەتەی گوێگر نیشانەی جۆرە کەم سەبر[illegible] نیشانەی ئارەزووی لەزەت وەرگرتنی خێراو ئاسانە. [illegible] پاش ئەم شیکردنەوە بابەتیانەی کە خەسڵەتەکانی مۆسیقای ڕۆژهەڵاتیم پێ ڕوون کردنەوە، بچمە ناو هەندێ لێکدانەوەو شەرحی زاتی ڕووتەوە، بەڵام هێشتاش ئەم شیکردنەوەو ئەم شەرحە بەرۆکی هزر بەرنادات کە: وەختێ عازف یا سترانبێژ بەردەوام قەراری ئاوازەکە بیری گوێگر دەخاتەوەو گوێگر بەتاسەوەیە کە بیگاتێ تا ڕەزامەندی خۆی دەربڕێ هەر هەموو ئەمانە نیشانەی بێ توانایییە لە موتابەعە کردنی مۆسیقا وەکو یەکەیەکی یەکگرتوو.

هەڵبەتە ئەم خەسڵەتانە ئاکامێکی زۆر گرنگی هەیە کە ئەویش تەسککردنەوەی تەبیعەتی گوێگری ڕۆژهەڵاتییە. گوێگری ڕۆژهەڵاتی هەمیشە بەدوای لەزەتی خێرادا دەگەڕێ، هەڵچوونی بەردەوامی لە ئاوازەکان دەوێ. بەهیچ جۆرێ خۆی ماندوو ناکا تا تێی بگا یا تیایا قووڵ بێتەوە: هەرچیەکی گوێ لێدەبێ سادەو ساکارو سەرسەریە، ئەوەی پێشکەشی دەکرێ سادەو نەرمە قووتە. ئەو هونەرمەندەی کە شادی پێ دەبەخشێ لەهەموو ساتێکا شتێکی پێشکەش دەکا کە دڵی پێی دابکەوێ. هونەرمەند ناچاری ناکا یا داوای لێ ناکا تا کۆتایی موتابەعەی ئاوازێکی درێژ بکا، بەڵکو ئاوازەکەی لەشێوەی بەش بەشی کورتا پێشکەش دەکا کە هەر بەشێکی بۆ خۆی یەکەیەکی تەواوەو کۆتایی تایبەتی خۆی هەیەو گوێگر هەر هێندەی لەسەرە چاوەڕێی ئەم کۆتاییە بکا کە زوو خۆی بە دەستەوە دەداو دڵی گوێگر ڕازی دەکا، بەڵام هەر هەموو ئەمە لەسەر حیسابی لەزەت وەرگرتنی هونەریی دروستە، ئالێرەوە ئەو شەقڵە تایبەتیەی گوێگری ڕۆژهەڵاتی سەرچاوە هەڵدەگرێ: گوێگری ڕۆژهەڵاتی توانای گوێگرتنی هوشیارو وردیی نیەو هەر پێویستی پێی نیە. بێ قەیدو شەرت و بە ئارەزووی خۆی هەرکاتێ بیەوێ ڕەزامەندی خۆی دەردەبڕێ و دەتوانێ چۆنی پێ خۆش بێ هاواری ڕەزامەندی بکا، چونکە ئەو گوێگرە هێمن و

قورسە نیە کە رێزی مۆسیقا بگرێ و بەگشت هەستەکانی تا کۆتایی موتابەعەی بکا. بۆیە بە ئارەزووی خۆی رەزامەندی دەردەبڕێ. گوێگرێکی قەرەباڵغەو هێمنی نازانێت. باشترین نمونە بۆ ئەمە، ئەو ئاهەنگە گۆرانیە درێژانەیە کە گوێگر تیایدا بەردەوام هاوار دەکاو هورا دەکێشێت و بە ئارەزووی خۆی رەزامەندی دەردەبڕێ. لە راستیا ئەو جەوە قەرەباڵغیە جوێنە بەهونەری مۆسیقای راستەقینە ئەگەر ئەو جەوە بۆ کۆڕی زیکرو دەروێشی دەست بدا ئەوا هەر یەکجار دوورە لە دنیای مۆسیقاوە، لە دنیای ئەو هونەرە ناسکەی کە تەزووی ئارامی و حەوانەوە بەگیان و ناخ دەداو بچوکترین غەڵبە غەڵب و قەرەباڵغی دەیشێوێنێ.

نامەوێ بەمە تەنیا لۆمەی گەلی گۆهدار بکەم، چونکە راستیت دەوێ تەبیعەتی ئەو ئاوازانەی پێشکەش دەکرێ تا ئەندازەیەکی زۆر بەرپرسە لە شێوەی گوێگرتنیان بۆی. هەروەها فۆرمی ئاوازەکان کە دەیەوێ گوێگر بەشێوەیەکی بازاڕی و جەلەبی و خێرا رازی بکا. بۆتە مایەی کوشتنی گوێگرتنی هێدی و قووڵ لەلای گەلی گۆهداری مۆسیقای رۆژهەلاتی.

بەم جۆرە بۆمان دەرکەوت کە چوار رەگەزەکەی مۆسیقا لە مۆسیقای رۆژهەلاتیدا یەکجار لاوازو پڕە لە خەوش و بگرە هەندێ لەو رەگەزانەی هەر تێدا نیە. لەوەیە خوێنەر هەندێ رەقی لەم رەخنەیەدا ببینێ، بەڵام تا هونەرێکی گەورەی وەکو مۆسیقا بەم دواکەوتوویەو بگرە سەردتاییەوە وەمێنێ، جگە لە رەقی چ چارێکی دیکە نیە، بەڵام ئەوکەسەی هەندێک دەست داگرتن و غەدر لەم نووسینەدا دەبینێ، من چم لێی ناوێ تەنیا ئەوە نەبێ کە بەشێوەیەکی زانستیانەی بابەتی و دوور لە هەموو هەڵچونێکی زاتی بیر لەم لێکۆڵینەوانە بکاتەوە، لەوەیە ئەوساکە بەخۆی پەی بەم کەمو کوڕیانە بباو لەلای خۆیەوە هەوڵێک بۆ نەهێشتنیان بدات.

### کێشەی مۆسیقا لە میسردا

بێ چەندو چون ئەوڕۆکە لە میسردا هەستێکی ناڕەزایی لەمەڕ کەمو کوڕیەکانی مۆسیقاو ئاسۆ تەسکەکانی هەیە. ئەم هەستی نارەزاییە بەردەوام روو لە زیادییەو ئەم زیادییە بە ئاشکرا لەو موناقەشە گەرمانەی سەر لاپەڕەکانی ئەمڕۆماندا دیارە – موناقەشەکان رای جۆراو جۆریان گرتووەتە خۆ. هەندێ کەس رایان وایە روو بکرێتە تازە کردنەوەی تەواوەتی وهەندێکی دی رایان وایە رووبکرێتە رابردوو؛ ئەو رابوردووەی کە بەلای خاوەنانی ئەم رایەوە شتێکی (نەمرە).

ئەم ناڕەزاییە بەشێوەیەکی تەواو لە شەقڵی مۆسیقای میسری ئەوڕۆکەدا رەنگی داوەتەوە. دەتوانین بڵێین رێبازە تەقلیدییەکانی ئاوازدانانی رۆژهەڵات بەرەو نەمان دەچێ و ئەوەی رای گرتووەو ئایەڵێ بەتەواوی لەبەین بچێ، شۆرەتی ئەو گۆرانی بێژانەیە کە ناویان بەم چەشنە ئاواز دانانەوە بەستراوە. خۆ ئەگەر ئەوانە لەسەر شانۆی هونەر نەمێنن ئەوا – بەمەعلومی – زەمانی گۆرانی رۆژهەلاتی بەسەر دەچێ.

بەڵام هەنووکە چ شتێک جێی گۆرانی رۆژهەلاتی دەگرێتەوە؟ ئەو رێبازەی کە ئەمڕۆکە بەگەرمی و بەتایبەتی لەلایەن جەماوەرەوە پێشوازی لێ دەکرێ رێبازی (تێکەڵ کردنە)واتە تێکەڵکردنی مۆسیقای رۆژهەلاتی لەگەڵ هەندێ رەگەزی مۆسیقای رۆژئاواییدا. تێکەڵ کردن خۆی لە خۆیدا کارێکی بەجێیە، چونکە ئێمە بەخۆمان رژدین لەسەر دەرچوون لە کەوشەنی رۆژهەلاتی تەقلیدی و سوود وەرگرتن لەو ئەزمونە قوڵانەی کە رۆژئاوا لە مەیدانی مۆسیقادا! پێیدا رۆییوە، بەڵام ئایا ئەو رێبازەی کە ئێستاکێ لە مۆسیقای رۆژهەلاتیدا باوە ئەو چارەسەرەیە کە دەمانەوێ؟

ئەلهەقی ئەم چارەسەرە بەڕای ئێمە کلۆڵانەترین چارەسەرە. بە راستی قۆناغی ئێستای مێژووی مۆسیقا قۆناغێکی کلۆڵە، چونکە پێشەوەرانی ئەم هونەرە وەختێ کە هەستیان بەبێ برشتی رێبازی رووتی رۆژهەلاتی کرد، روویان کردە بێ تام ترین و بێ مانا ترین جۆری مۆسیقای رۆژئاوایی تا ئاوازەکانی خۆیانی لێوە هەڵێنجێنن. ئەنجام تێکەڵیەکی ناسازی نێوان ئاوازی رۆژهەلاتی و غەڵبە غەڵبی مۆسیقای سەما خانەکانی رۆژئاوا دروست بوو – تێکەڵیەکی بێ رەنگ و بێ تامی ئەوتۆ کە چ جۆرە کۆششێکی تازە کردنەوەو بەرزکردنەوەی ئاستی مۆسیقای رۆژهەلاتی تێدا نەبووە، بەڵکو لە بنەڕەتدا تێکەڵکردنێکی رووکەشانەی کۆمەڵە رەگەزێکی ناتەبایەو بەس.

ئەو هەڵە گەورەیەی کە بە پێویستی دەزانین لەم کتێبەدا ئاماژەی بۆ بکەین ئەو باوەڕەیە کە پێی وایە چاک کردنی مۆسیقای رۆژهەلاتی بەوە ئەنجام دەدرێ کە (ئاوازی) رۆژئاوایی یا هەندێ جۆری تایبەتی میلودیکی رۆژئاوایی بۆ نەقڵ بکرێ – دیارە یەکەمجار خودی داواکارانی (وەرگرتن) دەکەونە ئەم هەڵەیەوە؛ ئەوانەی یەک پارچەی تەواوی مۆسیقای رۆژئاوایی وەردەگرن و بەتۆپزی دەیرێژنە ناو ئاوازە رۆژهەلاتییەکانی خۆیانەوە، دیارە بەم کارەیان هەم شکۆی کارە لێ وەرگیراوەکە دەشێوێنن و هەم چ سوودێک بەکارە نەقڵ بۆکراوەکە ناگەیەنن – ئەمە جگە لەوەی ئەم (وەرگرتنە) لە هەموو سەردەمێکا دوور بووە لە ئەمانەتی هونەریی بەرزەوە. تاقمی دووەم کە دەکەونە ئەم هەڵە گەورەیەوە، ئەوکەسانەی کە لاسایی ئاوازە رۆژئاواییەکان دەکەنەوە (هەڵبەتە ئەم تاقمە لە تاقمی پێشوو نزیکترن لە ئەمانەتی هونەرییەوە) و هەندێ جار ئاوازەکانیان دەدەن بەهەندێ کەسی شارەزا تا (دابەش کردنی مۆسیقایی تێدا بکاو شەقڵێکی نزیک لە شەقڵی مۆسیقای رۆژئاوایی بداتێ).

پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆئەوە بکەین کە ئەم بیرۆکەی (دابەشکردنی مۆسیقا)یە - کارێکە شایانی گاڵتە پێکردن – و هەر لە مۆسیقای ئێمەی میسریدا هەیە، چونکە بناغەی مۆسیقا ئەوەیە کە بیرەکەی بەشێوەیەکی تەواو بەهزری هونەرمەندا دێت، هونەرمەند بەتەنیا تەسەوری ئاوازەکەی ناکا، بەڵکو جۆری فۆرمەکەی و ئەو ئامێرەش کە پێی لێدەدرێ تەسەورو بەرجەستە دەکا، چونکە دابەشکردنی مۆسیقایی بەشێکی لە جیابوونەوە

نەهاتووی ئەرکی خودی هونەرمەندە. خۆ ئەگەر هەندێ پارچەی ڕۆژئاوایی پاشتر دابەش بکرێ بەسەر هەندێ ئامێری جیا لەو ئامێرانەی کە لە بنەڕەتا بۆی دانراون، لەم حاڵەتەدا دەبێ بەکارێکی سەربەخۆو لەپێناوی جۆراو جۆری ئانقەست دا دەخرێتە سەرکاری دانەرە ئەسڵییەکەو ئەوساکە ناوی دابەشکەر یا ڕێکخەری ئاوازەکە لە پاڵ ناوی دانەرە ئەسڵییەکەدا دادەنرێ، چونکە ئاوازەکە لەو دەمەدا دەبێ بە شتێکی نیمچە نوێ، بەڵام ئەو دابەشکردنەی لە ئاوازە میسریەکاندا دەکرێ بریتییە لە جیاکردنەوەیەکی ناڕەوای یەکێتیی داهێنانی هونەری.

لەهەر هەموو ئەم حاڵەتانەدا موزیشنەکان دەکەونە ئەم هەڵەیەوە کە: سوود وەرگرتن لە مۆسیقای ڕۆژئاوایی بەوە دەبێ کە ئاوازەکان وەرگیرێ یا لاساییان بکرێتەوە.

هەر ئەم هەڵەیە سەرچاوەی ئەو داتەپینەی ئێستای مۆسیقامانە. چارەسەری دروست ئەوەیە کە (شێوازی) دانان لە ڕۆژئاواوە وەربگرین نەک خودی دانان (تالیف). مەبەستم ئەوەیە کە دەبێ سوود لە ئەزموونی دەوڵەمەندی مۆسیقای ئەوان وەر بگرین، ئەو ئەزمونەی نزیکەی چوار سەدە لە پێش ئێمەوەیە. تا لە لێکۆڵینەوەی ڕەگەزەکانی زمانی مۆسیقایی قووڵ ببینەوەو سوود لە ئەزمونی دەوڵەمەندی وان لە بواری دانان و ئەدادا وەر بگرین.

پێویستە شێوازی داناغان (هارمۆنی دەنگ) بگرێتە خۆ. تا مۆسیقامان قووڵ ببێ و ئەوساکە مۆسیقا دەتوانێ بە ڕاستی گوزارشت بکات. خۆئەگەر توانای گوزارشتی پەیدا کرد ئەوا دەتوانێ لەژێر ڕکێفی گۆرانی دەربچێ و ببێ بە هونەرێکی سەربەخۆی تەواو. ئەداش پێویستە زۆر وردتربێ، بەداخەوە دەنگی گۆرانی بێژەکانی ئێمە یەکجار کەم مەودایەو چ هەوڵدانێکی ڕاستی نیە بۆ مەشق دان و ڕاهێنان و بەرین کردنی چوارچێوەی توانای ئەدا کە خۆی لەخۆیدا زانستێکی تەواوە. خۆ گۆرانی بێژی ئێمە لە پێناوی کاسبی و گوزەراندا لەسەر گۆرانی بەردەوام دەبێ بێ ئەوەی ئعتیراف بە تەئسیری زەمان لەسەر دەنگی بکا. تەنانەت هەندێکیان دەبینین لەنێو پارچەی گۆرانیەکاندا دەنگی لێ هەڵدەبڕێ و بە ئاشکرا هەناسەبڕکێی پێوە دیارەو ئەوجاش دان بە فەوتانی دەنگی خۆیدا نانێ - ئەمەش دیاردەیەکی خەمناکی بێ هاوتایە لە دنیای گۆرانیدا ... خۆ بەنیسبەت عەزف کردنەوە دەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم کە دووری بەینی گەوردترین کەمانچەژەنی ئێمەو کەمانچەژەنە ناودارەکانی ڕۆژئاوا هەزاران هەزار ساڵە!

کەواتە هونەری مۆسیقا لە مەینەت دایەو تاقە ڕێگای ڕزگارکردنی ئەوەیە کە ئەزمونی دوورو درێژی ڕۆژئاواو شێوازی ڕۆژئاوا لە دانان و ئەدای مۆسیقاییدا وەربگرین. هەڵبەتە دەبێ هەوڵی فەرهادانە لەم بوارەدا بدەین تا بتوانین تۆڵەی ئەو دواکەوتنە بێ ڕەزایەمان لەم مەیدانەدا بکەینەوە. خۆ ئەگەر کێشەکە هەروەکو ئێستا بمێنێتەوە ئەوا ڕۆژ بەڕۆژ مەودای نێوان ئێمەو ئەوان زۆرتر دەبێ.

بەڵام ئەم ڕایەمان کە سوود وەرگرتن لە ئەزمونی پڕو شێوازی دەوڵەمەندی مۆسیقای ڕۆژئاوا کارێکی پێویستە. لە دوو لایەنی ناکۆکەوە دژایەتی دەکرێ.. لایەنێکی موحافەزەکاری ڕاست ڕەو کە لایەنگری قەومیەتن. لایەنێکی چەپڕەوی پێشکەوتوخواز کە لایەنگری شەعبیەتن. بەپێویستی دەزانم موناقەشەی ئەم دوو بۆچوونە ناکۆکە بکەم تا سنوری بانگەوازەکەم بە ئاشکرا دەربکەوێ.

لایەنە ڕاست ڕەوە موحافەزەکارەکە کە جاڕی قەومیەت دەدەن ڕایەکەیان زادەی کۆمەڵێک تێگەیشتنی خراپ و بەهەڵەدا چوونە. خراپ تێگەیشتنەکە لەوەدایە کە پێیان وایە. ئەوەی ئێمە داوای دەکەین ئەوەیە کە ئاوازی وەکو ئاوازی ڕۆژئاواییان دا بنەین. هەڵبەتە ئەم بۆچوونە یەکجار دوورە لە داواکەی ئێمەوە. ئێمە لامان عەیانە کە هونەری مۆسیقا پەیوەستە بە ژیانی هەر میللەتێکەوە. ژیانی ڕۆژهەڵاتیانەی ئێمە هەندێ ئاواز دەخوازێ کە جیابێ لە ئاوازە ڕۆژئاواییەکان. ئەمانە هەموو دروستن، بەڵام داواکەی ئێمە خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی شێوازو دانان و ئەدای مۆسیقای ڕۆژئاواییە نەک خودی ئاکامە مۆسیقاییەکانی ڕۆژئاوا. بۆ پتر ڕوونکردنەوەی جیاوازی ئەم دوو بانگەوازە دەتوانین نمونەیەک بێنینەوە... گەلی چین ئەمڕۆکە هەوڵ دەدەن زمانەکەیان ئاسان بکەن، پیتە زۆرەکانی بگۆڕن بەژمارە پیتێکی سادەو کەم تا ببێ بە بناخەی نووسین.لەوەیە بۆ ئەم مەبەستە پەنا بەرنە بەر پیتی لاتینی. ئایا بەوەرگرتنی ئەم پیتانە ناوەڕۆکی زمانەکەیان دەگۆڕێ؟ ئایا نووسین بەپیتی لاتینی ئەوە دەگەیەنێ کە زانست و ئەدەبیاتی ئەو نەتەوانەیان وەرگرتووە کە بەپیتی لاتینی دەنووسن؟ بێگومان مەسەلەی زمانە مۆسیقاییەکەی ئێمەش تا ڕادەیەکی یەکجار زۆر لەم حاڵەتە دەچێ. ئێمە داوای دەست پێداهێنانی ڕەگەزەکانی زمانی مۆسیقا دەکەین. داوای سوود وەرگرتن لەو ئەزمونە پڕە دەکەین کە بۆ خەڵکانی غەیری ئێمە لەم بوارەدا ڕەخساوە، هەرگیز داوامان نەکردووە کە ئاوازەکانیان وەکو خۆی وەربگرین. ئەگینا ئەمە دەبێ بەبانگەوازی وێرانکردنی هونەر نەک بوژاندنەوەی.

هەڵەکردنەکەش لەو بیرە پوچەڵەدا خۆی دەبینێ کە دەڵێ شێوازی ڕۆژئاوایی لە مۆسیقادا بەگوێی ڕۆژهەڵاتیمان نامۆو نائاشنایە. ئەو بیرەی تا ئەمڕۆکەش ئەوانەی دەسەڵاتیان بەسەر چارەنووسی مۆسیقادا گرتووە دووبارەی دەکەنەوە، گەورەترین زیانی لە هونەری مۆسیقاو زەوقی گوێگرانمان داوە، بۆیە بە دوورو درێژی بەرپەرچی دەدەمەوە.

هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێم کە ڕواڵەتی کارەکان تا ڕادەیەک لە بۆچوونەکانی وان نزیکە: مەبەستم ئەوەیە کە زۆربەی گوێگرانی میسری و ڕۆژهەڵاتیان بەگشتی زەوق لە مۆسیقای ڕۆژئاوایی وەرناگرن و بگرە بەهیچ جۆرێ مەیلی ناکەن. بالاترین سەمفۆنیایان بە (غەڵبە غەڵب) لەقەڵەم دەدەن و جوانترین گۆرانیان بە (هات و هاوار) دەزانن. ئەمە ڕاستەو بەشێوەیەکی گشتی دیاردەیەکی باوە لە ڕۆژهەڵاتدا، بەڵام ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو مۆسیقا

ڕۆژئاواییە هەر تەواو بێگانەیە بەگوێی گوێگری ڕۆژهەڵاتی، زمانێکە تەنیا خاوەنەکەی تێی دەگاو چ کەسێکی دیکە نادوێنێ و چ کارێکیان تێناکا؟ هەرچەندە زۆربەی ڕۆژهەڵاتیان تام و چێژ لە مۆسیقای ڕۆژئاوایی وەرناگرن، بەڵام بێگومان ئەمە بیرکردنەوەیەکی پوچە.

بەرلەوەی پوچەڵی ئەم بیرکردنەوەیە روون بکەمەوە - حەزدەکەم هەر بۆ زەمینە خۆشکردن باسی دیاردەیەکی تری واقیعی ڕۆژهەڵاتیانەی خۆمان بکەم. هەمان ئەو واقیعەی کە مۆسیقای باڵای ڕۆژئاوایی پێ قووت ناچێت، توانیویەتی زەوق لە مۆسیقایەکی ڕۆژئاوایی رووت وەربگرێ، ئەویش مۆسیقای راقصە. ئەوەی گوێی لەو گۆرانیە باوانەی ئەمڕۆی وڵاتەکەمان بگرێ: ئەو گۆرانیانەی رەواجی زۆریان لەنێو گوێگرانا بەگشتی و لە نێو وەچەی نوێدا بەتایبەتی هەیە، دەبینێ کە شەقڵی مۆسیقای شادی (راقص) ڕۆژئاوایی بەسەردا زاڵە. راستە ئەم مۆسیقایە زۆر جیاوازە لە مۆسیقای کلاسیکی ڕۆژئاوایی، بەڵام لەهەمان کاتیشدا یەکجار دوورو جیاوازە لە شێوە تەقلیدییەکانی مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی. هەر قەبووڵ کردن و بەپیرەوەچوونی ئەم مۆسیقایە لەلایەن جەماوەری ڕۆژهەڵاتییەوە، خۆی لە خۆیدا بەڵگەیەکی زیندوی ئەوەیە کە زمانی مۆسیقا وێڕای شەقڵی ناسیونالیستی دەتوانێ سنورو کەوشەنی قەومیەت ببەزێنێ و کار لە هەموان بکات. بەم پێودانگە دوور نیە ڕۆژێ بێت جەماوەری ڕۆژهەڵاتی لە مۆسیقای کلاسیکی ڕۆژئاوایی تێ بگاو بەتەواوی زەوقی لێوەربگرێ.

کەواتە هۆی راستەقینە ناگەڕێتەوە بۆ شەقڵی نەتەوەیی، ئەگینا مۆسیقا لە سنورە کۆنەکەی خۆیدا دەمایەوەو دەرنەدەچوو، بەڵکو نەبوونی ئەزموون هۆی راستەقینەیە. با نمونەیەک بۆ ئەمە بێنینەوە: دیارە کۆڵکە ڕۆشنبیران لەزەتێکی یەکجار زۆر لە ڕۆمانە پۆلیسییە سەرسەرییەکان وەردەگرن و بەهیچ جۆرێ ناتوانن زەوق لە دانراو یا لێکۆڵینەوە ئەدەبییە قووڵەکان وەربگرن، بەڵام ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەم لێکۆڵینەوانە سەر بەجیهانێکی غەیرەز جیهانی ئەوانن و هەتا هەتایە لێیان بێگانە دەبێ؟ بێگومان ئەمە هەڵەیەکی زەقە چونکە هەموو کەسێک هەموو کەسێکی نیمچە ڕۆشنبیر توانای تێگەیشتنی قووڵترین لێکۆڵینەوەی دەبێ ئەگەر پەنا بەرێتە بەر سادەترین چارەسەر کە ئەویش پتر خۆ ڕۆشنبیر کردنە. ئەوساکە لەزەتێکی زۆر لە نووسراوی قووڵ وەردەگرێ و پەی بە بەرتەسکی مەودای ئەزموونە کۆنەکانی خۆی دەبات. هەمان شت دەربارەی مۆسیقاش دروستە: کێشەی ئێمە سەبارەت بەباڵاترین جۆری مۆسیقای ڕۆژئاوایی کێشەی شەقڵی نەتەوەیی نیە، بەڵکو کێشەی کەمی و هەژاری ئەزموونە. خۆ ئەگەر ئەم مەرجە دەستەبەر بێ ئەوا دەتوانین گوێ لە هەموو چەشنە مۆسیقایەک بگرین بێ ئەوەی وابەستەیی نەتەوەیی بێ بەکۆسپ بەڵام ئەوانەی دەڵێن ڕۆژهەڵات ڕۆژهەڵاتەو ڕۆژئاوا ڕۆژئاوایەو ڕێبازی دانانی ئەوان هەتا هەتا بۆ ئێمە بێگانەو نامۆ دەبێ وەکو ئەو باوکەن.کە دەبینێ منداڵەکانی لەسەر خوێندنەوەی سەرسەری ڕاهاتوون کەچی هەوڵ نادا ئامۆژگارییان بکا تا خۆیان ڕۆشنبیرتر بکەن، بەڵکو وازیان لێ دێنێ و دەڵێ ئەوە جۆری ئەو ڕۆشنبیرییەیە کە لەگەڵ سروشتیان دەگونجێ. دیارە ئەمە چارەسەرێکی کۆنەپەرستانەی کێشەکەیە. بۆیە داواکارانی قەومیەت بەکۆنەپەرست و موحافەزەکار لەقەڵەم دراون. کەواتە مۆسیقا زمانێکە کە سنوری قەومیەت دەبەزێنێ. دیارە هیچ دژایەتییەک نیە لە نێوان ئەم قسەیەو ئەو قسەیەی دیدا کە دەڵێ مۆسیقای هەر نەتەوەو کۆمەڵێک شەقڵی تایبەتی خۆی هەیە، چونکە مۆسیقاش پەیوەستە بەو واقیعەوە کە ئینسان تێیدا دەژی واتە پەیوەستە بە بارودۆخی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیەوە، بۆیە بەرهەمی هونەری شەقڵی ژینگەی کۆمەڵایەتی وەردەگرێ. هەڵبەتە ئەمە بەو مانایە نیە کە کاریگەری ئەم بەرهەمە تەنیا لە سنوری ئەم ژینگەیەدا دەمێنێتەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەگەر هونەرێکی ئەمین و رەسەن و دڵسۆز بێ چوارچێوەی نەتەوەیی دەبەزێنێ و کاریگەرییەکەی پەلوپۆ بۆ شوێنانی دی دەهاوێ. دەیان شاکاری ئەدەبی هەن وێڕای شەقڵی ناوچەییان و وێڕای رەنگدانەوەی بارودۆخی تایبەتی ئەو کۆمەڵەی نووسەرەکەی تێدا دەژی، ناوبانگ دەردەکەن و دەبن بە ئەدەبی جیهانی و کارێکی زۆر لە خەڵکانی سەر بەنەتەوەو ژینگەی جیاواز دەکەن. کەواتە شەقڵی نەتەوەیی و ناوچەیی، مۆسیقا ناکا بەزمانێکی گۆشەگیر. هەموو ئینسانێکیش کە بگاتە ئاستێکی ڕۆشنبیری چاک دەتوانێ بەئاسانی لێی تێبگا.

بەڵام رایەکەی دی کەپێی دەچێ لەگەڵ رایەکەی ئێمەدا ناکۆک بێ؛ واتە وەرگرتنی شێوازە ڕۆژئاواییەکان، کۆمەڵەزانایەکی پێشکەوتووخواز جاڕی بۆدەدەن و رایەکە - یان بەرواڵەت لە رایەکەی پێشو دەچێ، بەڵام لە کرۆک و کاکڵدا لێی جیاوازە - ئەویش بانگەوازی گەڕانەوەیە بۆ هونەری میللی. کە دەڵێین ئەم بانگەوازە لە رواڵەتیا لە بانگەوازی موحافەزەکەرەکان دەچێ مەبەست لە باری خۆبەستنەوەیە بە قاڵبی کۆنی ڕۆژهەڵاتی بەو حیسابەی کە ئەوە قاڵبی (نەتەوەییە). هونەری میللی (الفن الشعبي) هونەرێکە شەقڵی ناوچەیی پێوەیەو لەبارودۆخی کۆمەڵگایەکی تایبەتییەوە هەڵقوڵاوە، بەڵام کرۆکی بانگەوازی خۆبەستنەوە بەهونەری میللیەوە ناکۆکە لەگەڵ بیری نەتەوەییدا، چونکە بانگەوازەکە لەسەر بناغەی ئەوباوەڕە بینا نانرێ کە بەرهەمی گەلێکی تایبەتی تەنیا لەوناوچەیەدا تێی دەگەن کە تیایدا لەدایک بووە، بەڵکو لەسەر ئەو باوەڕە بینا دەنرێ کە هەر هونەرێکی میللی هەرچەندە شەقڵی ناوچەیی پێوەبێ، دەکرێ لە دنیایەکی فراوانتر لەزێدی خۆی تێی بگەن. هونەر ئەگەر ناوچەیی و میللیش بێ لەراستیا هەر کارێکی جیهانی یا ئینسانیە: ئەو هونەرەی گەلێکی دیاریکراو دەیخولقێنێ وشەقڵی خۆی دەداتێ، دەتوانێ کار لە هەموو گەلانی دی بکا. بێ چەندوچون ئەم بۆچوونە دەرهەق بە هونەری میللی گەلێک دروست ترە لە بۆچوونی موحافەزەکەرەکان کە زیاد لە پێویست پێ لەسەر بایەخی (شەقڵی نەتەوەیی) دادەگرن.

ئەلهەقی ناتەبایی بانگەوازەکەی ئێمە: لێکۆڵینەوەی شێوازە ڕۆژئاواییەکان لەگەڵ بانگەوازی داواکارانی گەڕانەوە بۆ هونەری میللی ناتەباییەکی توند نیە. ئەوەی ئێمە بۆی تێدەکۆشێن لە ڕاستیا هەوڵدانە بۆ ڕاست کردنەوەی واتای گەڕانەوە بۆ هونەری نەتەوەیی لە بواری مۆسیقادا، چونکە سوور بوونی داواکارانی بیری هونەری میللی واتە نەتەوەیی، لەسەر داواکەیان وایان لێ دەکا هەندێ جار بەهەڵە لە خودی بیرەکە بگەن. هونەری میللی هەمیشە ڕەنگدانەوەی ئەو ڕووداوانەیە کە میللەت پێیدا ڕۆییووە، دەبێ بە تۆمارێکی ڕاستگۆ و مێژوویی ئەو گەلە بەهەڵچوون و داچوونەکانیەوە وێنە دەگرێ. بێگومان مێژووی دوورو درێژی میللیمان لە زۆربەی قۆناغەکانیدا مێژووی زوڵم و زۆرو چەوساندنەوە بووە کە گەلەکەمان تا ئەم نزیکانەش هەر پێوەی دەینالاند. بەڕاستی خەباتی دژ بەم چەوسانەوەیە بەردەوام بوو، بەڵام دیاردەی لێکدا لێکدای دیکتاتۆریەت دەرفەتی گەلی نەداوە تامی ئازادی بچێژێ و لە هونەرەکانی خۆیدا، بە ئازادیدا هەڵبڵێ. ئەم حاڵ و وەزعە لە مۆسیقای میللیماندا بە ئاشکرا ڕەنگی داوەتەوەو پڕە لەواتای کڵۆڵی و مل کەچی، ماناکان لە ئاوازەکانیشدا ڕەنگیان داوەتەوەو سەیر دەکەین یەکپارچە خەم و گریانە، ئەوەندەی بۆ بەدبەختی خۆی دەکوڕوزێتەوە، ئەوەندە ڕوو ناکاتە ژیان.

مەبەستم ئەوە نیە ڕەخنە لە هونەری میللیمان بگرم، چونکە ئەم هونەرە ئەمین و ڕاستگۆ بووە لە وێنەگرتنی ئەو بارو دۆخانەدا کە میللەتەکەمان بە درێژایی مێژوو پێیدا تێ پەڕیوە، بەڵام من هەر ئەوەم بەلاوە مەبەستە کە ڕوانینمان بۆ هونەری میللی – لە مەیدانی مۆسیقادا – ڕوانینێکی ڕەخنەگرانەی بنیات نەربێ.

ئەم پرسیارانەی خوارەوە لەو برادەرانە دەکەم کە باوەڕیان وایە دەربازبوونی مۆسیقای میسری ئەورۆ لەو ئاستەنگەی کە تێی کەوتووە، تەنیا بە گەڕانەوە بۆ ئاوازە میللییەکان دێتەدی، هیوادارم بەوپەڕی ڕاشکاوی و ئەمینیەوە وەڵامیان بدەنەوە: ئایا هونەری میللی – هەمیشە – تۆماری ئەو ڕووداوانە نەبووە کە بەسەر گەلدا هاتوون؟ ئایا ئەو ڕووداوانەی گەلەکەمان پێیاندا ڕەت بووە زنجیرە چەوساندنەوەیەکی پێکەوە گرێدراو نەبووە کە زۆردارانی داگیرکەری بێگانە یا فیوداڵ و چەوسێنەران بەکاریان هێناوە؟ کەواتە پێویست بووە ئەم حاڵ و وەزعانە لە هونەری میللیماندا بەگشتی و لە مۆسیقای میللیماندا بەتایبەتی ڕەنگ بدەنەوە، ئیدی ئاوازی ئەم مۆسیقایە بووە بەشیودن و گریان تەنانەت لەوحاڵەتانەشا کە پێویست بەم خەمە نیە.

ئەلهەقی ئەم چەوساندنەوە دوورو درێژەی کە پێیدا ڕەت بووین – کە دەبێ بە ڕاشکاوی دانی پێدا بنێین – وامان لێدەکات کە هەر کاتێ بگەڕێینەوە بۆ هونەری میللیمان یەکجار سڵ بکەینەوە. لە مۆسیقای میللیدا – هی دەشت و هی شار – بە ئاشکرا هەڵخڵەتاندنی چەوساوان و زۆر لێکراوان ڕەنگی داوەتەوە ئەو ئامانجە ڕاستەقینانەی کە دەبوایە گەل هەوڵی بۆیدانایە بەئاشکرا شێوێندران، گریان و شیوەن جێی هاندان و خبیتینی گرتۆوەتەوە. وادێتە بەرچاو کە کێشەی هەرە گەورەی هاوڵاتی میسری کە نانی نەبووە بیخوا، هەر دڵداری و دووری لە دەزگیران و دلبەر بووە! فەلسەفەی پشت بەستن بەقەدەرو بەخت و چارەنووس زاڵە. گیانی هاندان و خەبات دژ بەزاڵمان دامرکێنراوەتەوە. ئیدی بەوجۆرە هونەری مۆسیقای میللی گشت فاکتەرەکانی ئەو زوڵم و زۆرەی بەسەر گەلەکەماندا سەپێنراوە، عەکس دەکاتەوە. لە ڕاستیا کەڵکەڵەی بەرگری دانەمرکاوەتەوە، هەندێ کاری هونەری ئەم شەقڵی بەرگری و تێکۆشانەیان پێوە دیارە، بەڵام ئەمە لەچاو لایەنە سەلبییەکەدا یەکجار کەمە.

کەواتە لەسەرمانە بەرلەوەی بکەوینە لایەنگرتنی بانگەوازی گەڕانەوە بۆ هونەری میللی لە مۆسیقادا لەخۆمان بپرسین: ئەو وەزع و حاڵانە چی بوون کە ئەم هونەرە عەکسی دەکردنەوە؟ ئەوساکە تێدەگەین کە پێویستە زۆر سڵ بین لەگەڕانەوە – مان بۆ ئەم هونەرە، ولەوەیە بارودۆخی وڵاتی ئێمە جیاواز بێ لەبارودۆخی ئەو وڵاتانەی کە توانیان لە ڕێگای گەڕانەوە بۆ مۆسیقای میللی ڕاپەڕینێکی مۆسیقایی بەرپا بکەن. هەروەها پەی بەوە دەبەین کە ئینسانی پاشەڕۆژ بێگومان ئامانجێکی دروست تر بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ کە زۆر جیاوازە لەوەی کە بەشی هەرە زۆری ئاوازە میللیەکان لەسەردەمی زوڵم و چەوسانەوەی ڕابردوودا گۆرانیان پێدا هەڵگوتووە.

بەڵام مانای ئەوە نیە کە پەیوەندی لەگەڵ ڕابوردوودا بپچڕین و هونەرێکی بێ بنج و بناوان دروست بکەین، چونکە هەر چۆنێ بێ شەقڵی میللی خۆ بەخۆ لە هونەرمەندا دەردەکەوێ ئەگەر هونەرمەندێکی ڕاستگۆبێ. ئەوەی شارەزاییەکی قووڵ و بەرینی لە شێوازە دروستەکانی مۆسیقادا هەبێ، ناچێ ئاوازە ڕۆژئاواییەکان دووبارە بکاتەوە، بەڵکو دەکەوێتە ژێر کاریگەری شەقڵی ناوچەیی ئەو ژینگەیەوە کە دەوری داوە. ئیدی ئاوازەکانی لە قاڵبێکدا دادەڕێژێ کە هەموو کەسێک تێی بگاو زەوقی لێ وەربگرێ. خۆ ئەگەر هونەرمەند بیەوێ لە ئاوازە میللییەکان بکۆڵێتەوە بێگومان ئەم لێکۆڵینەوەیە سوودی زۆری پێدەگەیەنێ، بەمەرجێ – وەکو گوتمان – وریابێ لە هەڵبژاردنی ئەو کەرەستەیەی ئەم ئاوازانە بۆی کەلالە دەکەن، هەروەها سروشتی ئەو وەزع و حاڵە بزانێ کە ئەو ئاوازانەی خوڵقاندووەو لە ڕوانگەیەکی ڕەخنە گرییەوە لێیان بکۆڵێتەوە.

پاش ئەم ڕوون کردنەوانە، بەم چەشنەی خوارەوە هێڵە گشتییەکان ئەو هەنگاوانەی کە پێویستە لە پێناوی بوژانەوەی هونەرێکی دروستی مۆسیقا لە وڵاتەکەماندا بنرێن دەست نیشان دەکەم و ئەو بەرنامەیە دەخەمە ڕوو کە پێم وایە پەیڕەوکردنی دەبێتە هۆی ئەوەی پایەیەکمان لەنێو میللەتانی دەوڵەمەندی ئەم بوارەدا بۆ دابین بکا.

یەکەم: پێویستە بەو چاوەوە بڕوانینە مۆسیقا کە هونەرێکە لەسەر بناخەی زانستێکی ئەوتۆ بینا دەنرێ کە پێویستی بە

لێکۆڵینەوەی دوورو درێژو بێوچان هەیە. هەرچەندە ئەو زەمانە بەسەرچوو کەوا دەزانرا هونەر داهێنانێکی خۆبەخۆیيە، بەلام ئێمە تا ئەمرۆش لەمەیدانی مۆسیقادا دانمان بەم حەقیقەتەدا نەناوە، هێشتاش جڵەوی ئەم هونەرە لەدەستی کەسانێکە کە تا رادەیەکی زۆر شارەزاییان لەمەیدانی مۆسیقادا شارەزاییەکی خۆبەخۆیيە.

دووەم: ئەگەر بەو بۆچوونە گشتییەی سەرەوە قایل بین، ئەوا لەسەرمانا ئەو بناغانە دابرێژین

کە مەرجی زانستی و لێکۆڵینەوە دابین دەکەن، دەبێ ئەوە بڵێین کە وەچەی مۆسیقایی ئێستامان ئومێدی هیچی لێ ناکرێ و دەبێ روو بکرێتە پێگەیاندنی وەچەیەکی نوێ کە پشت بە بناغە دروستە زانستییەکان ببەستێ، پشت بە مەشق کردن و راهێنان ببەستێ، پشت بە لێکۆڵینەوەو کۆشش ببەستێ نەک پشت بەخۆیی وکۆششی تاکەکەسی ببەستێ جا بۆ پەروەردەکردن و پێگەیاندنی وەچەیەکی لەم بابەتە پێویستە کە: ئەنیستیتۆی گەورە بێتە دامەزراندن، خاوەن بەهرەکان هەر لە قۆناغی یەکەمی تەمەنیانەوە وەربگرێ و بەرەبەرە پێیان بگەیەنێ و پەروەردەیان بکا تا تەواو ئامادە دەکرێن. هەڵبەتە دەبێ مامۆستای بێگانە بۆ دەرس وتنەوە لەم بابەتە ئەنیستیتویانەدا، بهێنرێ، چونکە تا هەنووکە لە ولاتی خۆماندا کەسانی وانین چ لەمەیدانی دانان و چ لە مەیدانی ئەدادا بە کەڵکی ئەوەبێن موزیشنێکی وا پەروەردە بکەن کە لەئاستی جیهانیدا بێ. هەڵبەتە هانا بردنە بەر ئەزمونی بێگانەو دان نان بەوەیا کە لەم مەیدانەدا لە ئێمە پێشکەوتوترن چ شەرمێکی تێدا نیە: ئێمە لە بواری ئەتۆمدا پسپۆڕانی بێگانان دێنین یا هاو ولاتی خۆ دەنێرینە هەندەران بۆ فێربوونی نهێنیەکانی ئەتۆم - کەچی لە مەیدانی مۆسیقادا زۆر پاشکەوتووترین وەک لە بواری زانستە ئەتۆمیەکاندا! هەقی نیە ئەگەر پەنامان بردە بەر بێگانان لەوە بترسین کە مۆسیقاکەمان شەقڵی ناوچەیی یا نەتەوەیی خۆی لەدەست دەدا، چونکە ئەو بێگانانە چ شتێکمان فێرناکەن جگە لەو کەرەستەو ئامێرانەی کە لەدانانەدا (تالیف) بەکاریان دەهێنن، جگە لەو زمانەی کە هەریەرێکمان بوێ پێی داڕێژین. بێگومان وابەستەیی هونەرمەند بەژینگەیەکی دیاری کراوەوە کە هەست و شادی و خەمەکانی هونەرمەندی پێوە بەسترابێ، لەبەرهەمە هونەریەکەیدا رەنگ دەداتەوە.

سێیەم: هەرئەوەندە بەس نیە دانەری مۆسیقایی و عازف و گۆرانی بێژ بەشێوەیەکی

زانستییانەی دروست پەروەردە بکەین، بەڵکو دەبێ گوێگریش پەروەردە بکەین تا ئەم هونەرە دروستە پەسەند بکاو هانی بدا. هەڵبەتە بۆ ئەم کارەش گەلێک هۆ هەن پێویستە مۆسیقا لە رێگای رادیۆ و دەستەبەرکردنی ریکۆردەر بۆ هەموو کەسێک، بچێتە هەموو ماڵێکەوە. خۆ سەبارەت بە رادیۆ؛ بێ دوودڵی دەڵێم لەم مەیدانەدا درێغی کردووەو هەوڵی نەداوە ئاستی زەوقی گۆهداران بەرز بکاتەوە، ئیدی جارێ بە بیانووی بیرۆکەی شەقڵی نەتەوەییەوەو - کە پێشتر پوچەڵیەکەیان روون کردەوە - جارێک

بە بیانووی ئەوەی کە ئاستی رۆشنبیری بەشی هەرەزۆری گوێگران رێیان نادا زەوق لەم مۆسیقایە وەربگرن، وەکو ئەوەی ئەرکو پەیامی سەرەکی رادیۆ ئەوە نەبێ کە ئاستی رۆشنبیری گوێگران لە رێگای پێشکەشکردنی بەرنامەی زانستانەی وردەوە - بەرز بکاتەوە! خۆ مەسەلەی دەستەبەرکردنی ریکۆردەر بۆ هەمووان، بەداخەوە بەهۆی زۆری گومرگەوە وای لێهاتووە کە تەنیا دەوڵەمەندان دەستیان دەکەوێ. ئیدی ریکۆردەر بووە بە یەکێک لە ئامێرەکانی سەرگەرمیوحاڵبوون لە حەقیقەتا یەکێکە لە پێویستیەکانی ئەو رۆشنبیریەی دەبێ هەوڵ بدەین لەنێو گەلدا بلاو ببێتەوە، رێک وەکو هەوڵدان بۆ بلاو بوونەوەی کتێبان. هیچ شتێک بە ئەندازەی ئەو تاقمەی کە پێی وایە کتێبخانەی مۆسیقایی بۆ سەرگەرمییەو دەبێ تایبەت بێ بە دەوڵەمەندانەوە، زیانی لە مۆسیقا نەداوە. ئەگەر ئەم لەمبەرانەی دەبنە هۆی زەوق وەرنەگرتنی جەماوەری گەل لەم هونەرە ناسکە لابەرین ئەوساکە دەرگای دنیایەکی تازەمان لەبەردەم دەکرێتەوە و دەچینە ناو ئەزمونێکی هونەری ئەوتۆوە کە پێشتر هەرگیز نەمان ناسیوە، هەست و بیری وامان لەلا دەوروژێ کە پێشتر هیچ هونەرێک لەلای نەوروژاندووین.

بەلام بەرای من هەر هەموو ئەم هۆیانە بنج بڕ نین، بەڵکو هۆیەکی دی هەیە بۆ بوژاندنەوەو پێشخستنی ئەم هونەرەو گشت هونەرێکی دی کە بەبێ ئەو هۆیە نە لێکۆڵینەوە، نەزانست، نەشارەزایی و، نە ئەزموون داد نادەن.

مۆسیقا وەکوو هەر هونەرێکی دی پەیوەندیەکی یەکجار پتەوی بەژیانی واقیعی خەڵکەوە هەیە تا ئەم ژیانە پڕ بێ لەستی، نائومێدی و هەست کردن بە زوڵم، چاوەڕوانی پێشکەوتن و بوژانەوەی راستەقینە لە بواری هونەردا کارێکی بێهودەیە. ئەگەر خەڵکی لە ژیانیاندا ئامانجێکیان نەبێ، هیوایان بەپاشەڕۆژی پرشنگدار نەبێ ئەوا هونەری دروست لە ناویاندا سەر هەڵنادا، چونکە ئەو شتە لە ئارادا نابێ تا ئەم هونەرە گوزارشتی لێ بکا. بۆیە راپەڕین و پێشکەوتنی مۆسیقاییمان بەندە بە راپەڕین و پێشکەوتنی کۆمەلایەتیمانەوە. لە رۆژێکا کە هەموو کەسێک هەست بە بوونی خۆی بکا هەست بەوە بکات کە ژیان پێشوازی لێ دەکا، هەست بەوە بکا کە لەم ژیانەدا ئامانجێکی هەیەو هاوکار لەگەڵ کەسانی دیدا هەوڵ بۆ وەدیهاتنی دەدا - تەنیا لەو رۆژەدا (کە هەموو نیشانەکان مژدەی نزیکی ئەو رۆژە دەدەن) بۆمان هەیە چاوەنۆڕی راپەڕین و پێشکەوتنی مۆسیقایی و هونەری دروست بکەین. ئەوساکە ئەم نەخشەیە یا پرۆژەیەی کە هێڵە گشتیەکانیمان روون کردەوە قازانجی خۆی دەگەیەنێ، ئەو ئامێرو وەسیلەکانمان بۆ دابین دەکات، هەستە ئینسانیەکانیشمان جوانترین و سازگارترین واتاو بیرمان لەلا گەلالە دەکات.

**سەرچاوە**

التعبير الموسيقي/د.فؤاد زكريا

# پاشبەند

ئا/ گۆڤاری کروان

## نیگار حەسیب قەرەداغی... پیرۆزە



رۆژی سێ شەممە ١٠ / ٧ / ٢٠٠٠ لە هۆڵی ئاهەنگ لەزانکۆی ڤیەننای پایتەختی نەمسادا بڕوانامەی ماستەر لەشانۆدا بەخشرا بەخاتوو نیگار حەسیب قەرەداغی: بابەتی ماستەر نامەکەی خاتوو نیگار بەناونیشانی «جەستەی ئامادە لە پانتایی زەمەندا تێڕوانینێکی نا ئەوروپیانە بۆکاری پێتر فۆر» بوو.

جێگای باسە خاتوو نیگار لەگەڵ هونەرمەند شەماڵ عومەری هاوسەری لەوڵاتی نەمسا دەژی و ئێستا گەڕاوەتەوە کوردستان.

پیرۆزبایی لەخاتوو نیگار دەکەین و بەهیوای بەخششی زیاتر.

## هونەری هاوچەرخ





لەلایەن ئەکادیمیەی هونەرە جوانەکانی میسرەوە ژمارە -١- ی گۆڤاری هونەری هاوچەرخ کە تایبەتە بەبابەتی وەرگێڕدراو لەبوارەکانی هونەری هاوچەرخ و ڕوناکبیری کەوتە کتێبخانەکانەوە.

ئەم گۆڤارە ئارازیە لەحەوت بەش پێکهاتووە لەمانە بەشی شانۆ کە بابەتێکی بەناونیشانی «ئامانجەکانی تازە بوونە لەشانۆ»ی تێدایە، ئەم بابەتە سۆزان ملروز نووسیویەتی.

لەبەشی مۆسیقادا بەشێک لەکتێبی «ئۆپێرا... مێژوویەکی کورت» ی نووسینی لیسلی ئۆرێ بڵاوکراوەتەوە، لەبەشی سینەمادا دوو بابەتی گرنگ بەرچاو دەکەون

یەکەمیان «دەنگ لەسینەمادا» لە نووسینی بیر ئەنتوان کرتون و دووەمیان «هونەری ڤیدیۆو نمایش هونەری» لەنووسینی یۆهانس بیزنگەر.

جگە لەم بەشانە چەندان بابەتی هەمە جۆر دەربارەی تازەگەری و زەمانەوانی لەم ژمارەیەی گۆڤاری هونەری هاوچەرخدا بەرچاو دەکەون.

## برگسۆن فەیلەسووفی سەردەمەکەمانە



لە ژمارە -٣٨٦- ی گۆڤاری ئەدەبی فەرەنسی دۆسیەیەکی تایبەت بە فەیلەسووفی گومناو «هێنری برگسۆن» بڵاوکراوەتەوە، لە یەکێک لە وتارەکان فریدریک فۆرمس دەڵێت: برگسۆن کاریگەری بەسەر هەموو ڕێبازە فەلسەفیەکانی سەدەی بیستەمەوە هەیەو تەنانەت کاری لە ڕۆمان نووسێکی گەورەی وەک مارسیل پرووست کردووە.

برگسۆن لە ١٨ی ئۆکتۆبەری ١٨٥٩ هاتۆتە دنیاوە، دوای ئەوەی بەپلەی ئیمتیاز بڕوانامەی بەکالۆریا بەدەستی دێنێ ئینجا روو لەبەشی ئەدەبی خانەی مامۆستایان دەکات، لەم ماوەیەدا بەقوڵی دەکەوێتە خوێندنەوەی کانت و سپنسەر.

مەسەلەی زەمەن لەبیری ئەو فەیلەسوفەدا پانتاییەکی زۆری داگیر کردبوو بۆیە باشترین کتێبی لەم بارەیەوە بەناونیشانی «دەستکەوتە ڕاستەوخۆکانی هۆشیاری» نووسی، سالی ١٨٩٦ دووەم کتێبی فەلسەفی بەناونیشانی «ماددەو یادەوەری» بڵاوکردەوە، ساڵی ١٩٠٣ کتێبی «پێشەکیەک بۆ میتافیزیکا»ی بڵاوکردەوە کە لە نێوەندە فەلسەفیەکان سەدایەکی گەورەی دایەوە.

دیارترین کتێبی برگسۆن کتێبی «پەرەسەندنی داهێنەر»ەکە تەرجەمەی چەندان زمانی بیانی کراوەو تەنانەت ئەلیۆت و ماچادۆ لەبەر ڕۆشنایی بۆچونەکانی دا کردویانەتە پەیڕەو بۆکاری داهێنەرانە.

ساڵی ١٩٢٧ خەڵاتی نۆبلی وەرگرت، لەساڵی ١٩٤١ کۆچی دوایی کرد، بەر لەمردنی ئەم چەند وشەیەی وت «سەعات پێنجە، دەرسەکە کۆتایی هات».

## دەنگە زیوینەکان

کریستۆڤەر مدلیتون یەکێکە لەو وەرگێڕە کارامانەی دەقی شیعری کە گیانێکی تر وەبەر دەقەکەدا دەکات و خۆیشی شاعیر نییە. دوا کتێبی کریستۆڤەر لەم بارەیەوە کتێبێکە بەناونیشانی «دەنگە زیوینەکان» کە ١٢٠ دەقی بەخۆوە گرتووە.



مەدنیون جگە لەزمانی ئینگلیزی زمانەکانی ئەڵمانی، فەرەنسی، سویدی، ئیسپانی، تورکی» دەزانێت.

لەم کتێبەدا دەقی ٦٠ شاعیری جیهانی وەرگێردراونەتە سەر زمانی ئینگلیزی لەمانە رامبۆ، هۆلدرلن، یلکە، ئەپولینیر جگە لەچەند شاعیرێکی ئەندەلوسی عەرەب لەمانە: ئیبن قەزمان، تەرتوشی، ئیبن خەروف.

## ماکبێت ژەنەراڵێکی هاوچەرخە



لەوەتەی ماکبێتی شکسپیر لەسەر شانۆ نمایش دەکرێ تا ئێستا چەندان بیروڕاو بۆچوون دەربارەی ئەم کەسایەتیە خراونەتە روو، ئاخۆ نوێنەرانی شەڕێکی رەهادەکا؟ یاخود دایەلۆگە لەنێوان کردەی شەڕو ئازادی ویژدان.

لەم وەرزەدا تیپی شاهانەی شکسپیر لەسەر شانۆی یۆنگ فیک- نمایشێکی تازەی ماکبێتیان کرد کە بەڕای بینەرانی شاری لەندەن لە هەموو نمایشەکانی لەمەوبەر گرنگتر بوو.

گریگۆری دۆنگ کە دەرهێنەری شانۆگەریەکە بوونەمجارە کەسایەتی ژەنەراڵێکی هاوچەخی لەبەر ماکبێت کردبوو وەکو بڵێی تازە لەشەڕی ڤیێتنام یا کۆسۆڤۆ گەڕابێتەوە.

بەلای دەرهێنەرەوە ماکبێت بۆ هەموو دەورو زەمانێک دەشێت و ئەشقی دەسەلات و پایەش کوشتن و توندوتیژی بەدواوەیە.

## کۆندێرا لەرۆمان دەدوێت

لەلایەن دەزگای ئەینەوا لەدیمەشق کتێبی «خیانة الوصایة» بلاوکرایەوە کە لونەی عەبدول ئیلاە وەریگێراوەتە سەرزمانی عەرەبی.

کۆندێرا لەم کتێبەدا بەبۆچونێکی رەخنەگرانە باسی هونەری رۆمان دەکات بەتایبەتی پەیوەندییەکانی ئەم هونەرە بەفەلسەفەو



مۆسیقاو رەسمەوە، لەبەشێکی کتێبەکەدا باس لە وەسیەتەکەی کافکا سەبارەت بەسوتاندنی بەرهەمەکانییەوە دەکات و هۆیەکانی ئەم وەسیەتە شیدەکاتەوە.

لەبەشێکی دیکەدا باس لەمێژووی رۆمان و مێژووی بەشەری دەکات و لەوباوەڕەدایە مێژوو لەدەرەوە وەکو هێزێکی بیانی ژیانی مرۆڤایەتی ئابلۆقە دەدات.

بەبێ ئەوەی مرۆڤ بەهێز بکات بەڵام مێژووی رۆمان بەرهەمی سەربەستی مرۆڤ و داهێنانەکەیەتی.

لەم کتێبەدا کۆندێرا لەگۆشەنیگایەکی دەگمەن و تایبەتەوە دەڕوانێتە ڕۆمان.

## جەواهیری گەورە

لەتەموزی ئەمساڵ سێ ساڵ بەسەر کۆچی دوایی شاعیری گەورە محەمەد مەهدی جەواهیری تێپەڕی، بەم بۆنەیەوە دکتۆرە خەیاڵ جەواهیری کیژە گەورەی شاعیر چەند بەشێک لەیاداشتی خۆی لەگەڵ باوکی بەناونیشانی «ژنان لەگەڵ جەواهیری قسە دەکەن» بلاوکردەوە.

دکتۆرە خەیاڵ دەڵێت:

* لە جەواهیریم پرسی قەسیدەی «علموها» بۆ چ بۆنەیەک وتراوە؟

لەوڵامدا وتی:

– ساڵی ١٩٢٩ دانیشتوانی نەجەف لەڕووی هۆشیارییەوە زۆر دواکەوتوو بوون، ئەم قەسیدەیەم بۆ پاڵپشتی کردنی ئافرەتێک داناوە کە کۆت و پێوەندی کۆمەلایەتی رێگای خوێندن و چوونەدەرەوەیان لێگرتبوو.

دکتۆرە خەیاڵ دەڵێت:

– هەرچەندە باوکم زۆر بێ تاقەت بوو بەڵام چەند برگەیەکی لەو قەسیدە ناودارە بۆ خوێندمەوە:

علموها قد کفاکم شنارا
وکفاها ان تحسب العلم عارا
وکفانا من التقهقر انا
لم نعالج حتی الامور الصغارا
هذه حالنا علی حین کادت

# بزاڤی رۆشنبیری ٤٨٧

ئامادەکردنی : ئەحمەد حەیران
بەدوواداچوون : کەیفی سابیر

## یەکەمین پێشانگەی تایبەتی هونەرمەندی شێوەکار هێمن حەمید



سەر لەبەیانی رۆژی یەکشەممە رێکەوتی ٢٠٠٠/٧/٣٠ بەڕێوەبەرایەتی هونەری شێوەکاری سەر بە وەزارتی رۆشنبیری، لە ژێر چاودێری وەزیری رۆشنبیری رێزدار فەلەکەدین کاکەیی و ئامادەبوونی بەرێز بارزان مەلا خالید بریکاری وەزارەت یەکەمین پێشانگەی شێوەکاری بۆ هونەرمەندی لاو (هێمن حەمید) لەگەلەری میدیا کردەوە. لەم پێشانگایەدا ٢١ تابلۆی شێوەکاری پیشاندرا بوو.

هونەرمەند تەعبیریانە لەناخی خۆی و دەوروبەرەکەی دوابوو گوزارشتی مەینەتی و هەلچوونەکانی ناوەوەی کردبوو، لەکارەکانیدا سێ جۆرە کەرستەی بەکار هێنابوو: (گواش، پاستیل، کۆلاژ) هەریەکە لەو کەرستانەش جۆرە شێوازێک پیشان دەدات، بۆ نموونە ئەو تابلۆیانەی کە گواشی تێدا بەکارهاتبوو رەنگ بالا دەستە.

لێرەدا هونەرمەند زۆر یاسای تەشکیلی تێک شکاندبوو بۆ نموونە روانگە و ئەناتۆن، ئەو شتە تێک شکاوانەشی بەرەنگ چارەسەر کردبوو، لەزۆربەی فیگەرەکانیش ئافرەت بە زۆری بەکار هاتبوو ئەمەش راستگۆیی هونەرمەند پیشان دەدات. بەرێز بارزان مەلا خالید بریکاری وەزارەتی رۆشنبیری بەم چەند پەیڤە کارەکانی هونەرمەندی نرخاندبوو (پێشانگەکەی کاک هێمن حەمید شتێکی تازە بوو هونەرمەند هەم وەک لاوێک ئەزموونێکی تازەی خستبووە روو لەلایەکی دیشەوە تابلۆکان بە هەق کاریان لە مرۆڤ دەکرد، تابلۆکان بەگشتی گوزارشتیان لە ئارەزووەکانی مرۆڤ و ئازارە خەفەکراوەکانی دەکرد. هونەرمەند پتر هەولی داوە جوانی ئافرەت، لەش و لاری لە تابلۆکانی بەشێوەیەکی جوان بەرجەستە بکات لایەکی دیشەوە خەریکی بە دیارخستنی جوانی سروشت و نهێنیەکانی بووە کە لەوەشدا سەرکەوتووە). کاک کریم دەشتی شاعیر بەم شێوەیە لە تابلۆکانی هونەرمەند دوابوو (کاک هێمن هەول دەدا پارسەنگی بابەتی لەمیانی ئازار و رەنگ دا بکات و خۆی لە ئاوێنەی ئەو پارسەنگەدا بەبینەر پیشان بدات رەنگەکانی کاک هێمن زۆر شەفاف و دلگیرن تەنها لە دوو تابلۆدا نەبێ کە کارێکی کۆلاژ ئامێزی بەکار هێناوە، لەیەکێ لە تابلۆکانیدا لە رێگەی ئەو پێلاوە زنجیردارەی کە لە پێی ئافرەتەکە دایە یاد و بیروەری(عەبدوللا رەسول)ی بیرهێنامەوە.

(هێمن حەمید) لە سالی ١٩٧٣ لە شاری هەولێر لەدایک بووەو پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی هەولێری تەواو کردووەو ئێستا لە کۆلیژی هونەری زانکۆی سلێمانی دەخوێنێ.

## پێشانگەیەک بۆ بزاڤی رۆژنامەگەری لە هەندەران



هاوکات لەگەل یادی (١٦)ی ئابی پیرۆز رۆژی ٢٠٠٠/٨/١٥ لە ژێر چاودێری رێزدار فەلەکەدین کاکەیی وەزیری رۆشنبیری، بەرێز بارزان مەلا خالید بریکاری وەزارەتی رۆشنبیری پێشانگای براڤی رۆژنامەگەری لە هەندەران، لەماوەی ئەم ٧٠ سالەی دواییدا بۆ هونەرمەندی دوورە ولات فەخردین تاهیر لەگەلەری میدیا کردەوە... لەم پێشانگایەدا هونەرمەند ١٨٠ رۆژنامە و گۆڤار و چاپەمەنی و بلاوکراوەو بەرگی ٤٧ کتێبی پیشاندابوو، چاپەمەنییەکان لە سالی

١٩٣٠ دەستیان پێدەکرد تا دەگاتە ئەمڕۆ، ئەو چاپەمەنییانەی کە بەزمانی کوردی نووسراون لە (٢٨) دەوڵەت دەرچووە، وەک (ئەورووپا، ئوستراڵیا، کەنەدا، ئەمریکا، پاکستان، سوریا، تورکیا، لوبنان، کازاخستان، ئەرمینا، روسیا) ئەمە جگە لەو چاپەمەنییانەی بە عەرەبی و تورکی و فارسی نوسراون. بە زمانەکانی ئەورووپیش بەزمانی (فەرەنسی و ئینگلیزی و ئەڵمانی و نەرویجی و سویدی) دەرچوون.. زۆربەی رۆژنامەکان مانگانەیە و گۆڤارەکانیش وەرزین و جۆراوجۆرن لەوانە (سیاسی، کەلتووری، لاوان، ئافرەتان) هەندێکیش لەوانە گرووپی سیاسی دەری دەکەن.. ئەمەش چەند نموونەیەکە لەو رۆژنامە و گۆڤار و چاپەمەنییە کوردییانەی کە بەزمانی جۆراوجۆر لە وڵاتە جیاجیاکان دەرچوون:

١- ریا تازە لە ساڵی (١٩٣٠)دوە لە ئەرمینیا بە بەردەوامی دەردەچێ و ٥٠٠ ژمارەی لێ دەرچووە).

٢- کوردستان لە کازاخستان بە زمانی روسی

٣- کوردستان بە سۆرانی لە باکۆ

٤- برایەتی، خەبات چاپی دەرەوە/ لەندەن

٥- ژیان گۆڤارێکی پزیشکییە، ئەڵمانیا

٦- گۆڤاری مامۆستای کورد/ سوید

٧- گۆڤاری (روناکبیری، خەرمانە، بەربانگ) بەسێ زمان دەرچوو

٨- گۆڤاری دەنگ/ بە تورکی، رۆژا تازە بە تورکی و کرمانجی

٩- دەنگی کوردستان لە ئەڵمانیا، کوردستان بە ئینگلیزی و سۆرانی

١٠- هێڤیا وڵات لە ١٩٦٣ تا ١٩٦٥ سێ ژمارەی لێدەرچووە.

١١- گۆڤاری چیا لە ١٩٦٨ بە لاتینی لە ئەڵمانیا (٨) ژمارەی لێ دەرچووە.

بنکەی چاپخانەی رۆژانو لە سوید (٥١) کتابی کوردییان لە چاپداوە بەکرمانجی لاتینی کەبەشی زۆریان بریتین لە(ئەدەبیاتی کوردی، مێژوو، زمانەوانی...تاد) هونەرمەند فەخرەددین نموونەی(٤٧) بەرگی کتێبی لەم کتێبانە لە پێشانگەکەدا خستبووە روو.. وەکو پرۆژەی داهاتوو هونەرمەند دوای گەڕان و ماندووبونێکی زۆر لە چاپخانە کوردییەکان و نوسەران و کتێبخانەکانی سوید سەرژمێری (٦٥٠) کتابی دی کردووەو لای خۆی ناونووسی کردووە.

دەربارەی پێشانگەکەی هونەرمەند فەخرەددین تاهیر بەڕێز بریکاری وەزارەتی رۆشنبیری بارزان مەلا خالید دەڵێ: (پێشانگەکە بە زەحمەتییەکی زۆر کراودتەوە چونکە هونەرمەند ئازارێکی زۆری دیوە لێرە و لەوێ تاکو ئەو کۆمەڵە رۆژنامە و گۆڤار و هەفتەنامە و کتێبانەی کۆکردۆتەوەو گەیاندوویەتییە شاری هەولێر ئەوە خۆی لە خۆیدا کارێکی گرنگە و خزمەتێکی یەکجار مەزن بە رۆشنبیری کوردی دەکات.. ئەم بەڵگەنامانە شایەدی ئەوە دەدەن کە رۆڵەکانی کوردستان لەسەرتاسەری دنیادا لە هەموو پارچەکانی کوردستان بەردەوام بوونە لە خزمەتی زمان و وشەی کوردی. بەڕاستی کاک فەخرەددین خزمەتێکی گەورەی پێشکەش بە وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان و رۆشنبیرانی کورد کردووە.)

دەربارەی ئەم پرۆژەی بە ئەرشیفکردنە هونەرمەند فەخرەددین گوتی: (ئەوە هەوڵ و ماندبوونی(١٧) ساڵمە لە هەندەران جگە لەو هەموو مجازەفەو ماندوو بوونی گواستنەوەیان کە ئەمەش کارێکی زۆر زەحمەت بوو و ئاسان نەبوو. جاری وا هەبووە بۆ چاپەمەنیەک یا گۆڤارێک لە سویدەوە چوومەتە مۆسکۆ پرۆژەی داهاتووشم بریتییە لەبە چاپ گەیاندنی دوو کتێب

١- بزاڤی رۆژنامەگەری کوردی لە هەندەران

٢- رۆژنامەگەری کوردی بە زمانی سویدی.

فەخرەددین تاهیر لە ساڵی ١٩٥٥ لەدایک بووەو لە ١٩٧٩ لەهەولێر دەرچووەو چووەتە شاخ لە ساڵی ١٩٨٢ چووەتە سوید ساڵێک لە مۆسکۆ مێژووی خوێندووەو دبلۆمی لە کۆلیژی ئاداب/ لە بەشی رۆژنامەنووسی لە لینینگراد وەرگرتووە ساڵ و نیوێک لە ماجستێر خوێندوویەتی، بەڵام دوای ئەمە تەمەن رێگای نەداوە تەواوی بکات.

## لە یادی (١٦)ی ئاب
## پێشانگای تایبەتی هونەرمەند واحید مەجان



لە چوارچێوەی ئاهەنگی(١٦)ی ئابی پیرۆزدا، بەبۆنەی ٥٤ ساڵەی دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان، دەمژمێر(١٠)ی سەرلەبەیانی رۆژی ١٦/٨/٢٠٠٠ لە گەلەری

میدیا بە ئامادەبوونی بەڕێز فەرەنسۆ هەریری بەرپرسی لقی دووی پارتی دیموکراتی کوردستان و ژمارەیەکی زۆر لە هونەرمەندان و ڕۆشنبیران و بەرپرسان، پێشانگای تایبەتی هونەرمەند واحید مەجان لە ژێر ناونیشانی(کەلتور لە باوەش دەگرم) کرایەوە. پێشانگایەکە (٣٧) کەڤاڵی هەمەجۆری شێوەکاری لەخۆگرتبوو، لە میانی کارە هونەرییەکاندا، هونەرمەند کەرەسە فۆلکلۆرییەکانی ئاوێتەی تابلۆ هونەرییەکان کردبوو، بە شێوەیەکی گونجاو هارمۆنیای ڕەنگەکان لەگەڵ کارەکاندا بەرجەستە کرابوون. هونەرمەند واحید مەرجان لە بواری سود وەرگرتن لە فۆلکلۆر بە تایبەتی کارە میللییەکان دەستێکی باڵای هەیە، زۆربەی سیمای کارە هونەرییەکانی لەم لایەنە دەخولێتەوە. بە کارامەیی وەک هونەرمەندێکی شارەزا کەلەپوور تێکەڵاوی بەرهەمەکانی دەکات، بۆیە تابلۆکانی وەک پێناسەیەکی نەتەوایەتی لە زۆر شوێن یاخود لەسەر بەرگی گۆڤار و لاپەڕەی ڕۆژنامەکان دەخرێتەڕوو.

### شاندێک لە ڕۆشنبیرانی عەرەب سەر لە کوردستان دەدەن

بۆ بەشداریکردن لە بیرەوەری سەد ساڵەی لە دایکبوونی شاعیری گەورەی عەرەب محەمەد مەهدی جەواهیری و بەمەبەستی ئاشنا بوون لە بارودۆخی کوردستان و چۆنیەتی پیادەکردنی ئەزموونی دیموکراسیمان ڕۆژی ٢/٨/٢٠٠٠ شاندێک لە ڕۆشنبیرانی عەرەب گەیشتە خاکی کوردستان. شاندەکە پێک هاتبوو لە بەڕێزان. (کەریم مەروە، نەبیل زەکی، سەعدوللا ئیبراهیم ئەلحوسێن، فەواز تەرابلسی، لەیلا غانم، لەیلا عوسمان، کامل شیاع، ئینتشال ئەلتمیمی، فەخری کەریم زەنگەنە)، لەڕۆژی ٦/٨/٢٠٠٠ شاندەکە لە شەقڵاوە لەلایەن بەرپرسان و ڕۆشنبیران و نووسەران و هونەرمەندان بە گەرمی پێشوازی کران، دواتر چاویان بە بەڕێز سەرۆک مەسعود بارزانی کەوت، شاندی ڕۆشنبیرانی عەرەب سەردانی هەولێری پایتەختیان کرد، لەمیانی دیدار و چاوپێکەوتنەکان پشتگیری خۆیان بۆ کێشەی کورد و ئەزموونی دیموکراسیمان دەربڕی جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە پشتگیری کورد و مافەرەواکانی بکەن.

### فەخرەددین تاهیر لە ئێوارە کۆڕێکدا

سەر لە ئێوارەی ڕۆژی پێنج شەممە ڕێکەوتی ١٧/٨/٢٠٠٠ بەڕێوەبەرایەتی سینەما و شانۆ سەر بە وەزارەتی ڕۆشنبیری و بە ئامادەبوونی ژمارەیەک لە ڕۆشنبیران و هونەرمەندانی شاری هەولێر ئێوارە کۆڕێکی بۆ هونەرمەندی دوورە وڵات بەڕێز فەخرەددین تاهیر لە باخچەی سینەما و شانۆ سازکرد. کۆڕەکە تایبەت بوو بە بزاڤی هونەری کوردی لە ئەوروپا و تیپی شانۆی ئارارات لە سوید. سەرەتا بەڕێز(هیوا سوعاد) بەخێرهاتنی ئامادەبووانی کرد و پاشان بەڕێز مەحمود زامدار کۆڕەکەی بەڕێوەبرد... دوا بەدوای ئەمە هونەرمەند فەخرەددین هاتە سەر پێشکەشکردنی بابەتەکەی، گوتی: (دەسپێکی کۆچی کوردان بۆ ئەوروپا لەخانەوادەی بەدرخانییەکانەوە لە سەدەی نۆزدەم دەستی پێکردووە و دەربارەی کۆچی کوردان بۆ سوید بە گوێرەی ئەو بەڵگەنامانەی لە سوید ماون لە شەستەکانەوە دەستی پێکردووە، قۆناغی دووەم ساڵانی (١٩٧٠-١٩٧١) دەگرێتەوە کە ژمارەیەکی زۆری کورد بۆ کرێکاری ڕوویان لەم وڵاتە کردووە، بەڵام لە دوای نسکۆی ١٩٧٥ کوردی عێراق بە ژمارەیەکی زۆر ڕووی لە سوید کردووە، هەروەها لەکاتی جەنگی عێراق و ئێرانیشدا کۆچی کوردان بۆ سوید لە زیادبووندا بووەو کوردی هەر چوار پارچەکەی کوردستان بە لێشاو ڕویان لە سوید کردووە... دوای ئەوەی دەستەیەک لە هونەرمەندانی کورد گەیشتنە سوید بیرمان لەوە کردەوە کە چەترێک بۆ هونەرمەندانی کورد دروست بکەین ئەوە بوو کۆمەڵی هونەری کوردیان لە سوید دروست کرد، لەگەڵ پێشکەشکردنی یەکەم بەرهەمی هونەری بەناوی (گێژەن) کە لەساڵی ١٩٨٧ نووسەری پۆلۆنی (سلاڤۆمیر مرۆژێک) نووسیویەتی، دکتۆر فازیل جاف ئامادەی کردووەو دەری هێناوە، ئەم شانۆ نامەیەش هەرایەکی سیاسی گەورەی لە ئەوروپا نایەوە، هەر لەگەڵ پێشکەش کردنی ئەم شانۆگەرییە دامەزراندنی تیپی ئاراراتمان ڕاگەیاند، چەندان کتابمان چاپکرد بە هەموو جۆرەکانییەوە دوا بەدوای ئەوە تیپەکە بە تیپێکی سەرکەوتوو لە هەموو سوید ناسراو... دەیان نامەی پیرۆزباییمان بۆهات کە دان بەوەدا دەنێن کە ئەم تیپە یەکەم تیپی کوردییە کە وا بە دڵسۆزییەوە کار بکات سەرباری ئەو هەموو کۆسپ و ئاستەنگانەش کە دێتە ڕێمان) دوابەدوای تەواوبوونی کۆڕەکە وتوێژێکی چڕو تێروتەسەل لەمەڕ بابەتەکە لەلایەن ئامادەبووانەوە کرا.

### پێشانگەیەکی کاریکاتێری

سەر لەبەیانی ڕۆژی ٤/٨/٢٠٠٠ لە حەفتەمین ساڵیادی دامەزراندنی ڕادیۆی هەرێم ریزدار مەحمود کاوە حەفید زادە وەزیری ڕۆشنبیری بە وەکالەت و بە ئامادەبوونی بەڕێزان محەمەد کاکەیی بەڕێوەبەری گشتی ڕاگەیاندن و حاکم شاکر بەڕێوەبەری گشتی چاپخانەی ڕۆشنبیری و ژمارەیەک لە نووسەر و هونەرمەندان و ڕۆشنبیران پێشانگەی کاریکاتێری بۆ هونەرمەند مەسعود گەلالی لە هۆڵی ڕاگەیاندن کردەوە.

پێشانگەکە لە سێ بەش پێکهاتبوو بەشێکیان تایبەت بوو بە بەرنامەکانی ڕادیۆی هەرێم بەشی دووەمیش بریتی بوو لە کەلوەکان لە بەشی سێیەمیش هونەرمەند کاریکاتێریانە



دیاردەی گیروگرفتەکانی کۆمەڵایەتی پێکابوو...

بیرتیژی و قووڵی خەیاڵی هونەرمەندانەی هونەرمەند کە لەوێنەکاندا بە ئاشکرا بەدی دەکرا هەستی بینەری دەجوڵاند و مرۆڤی دەخستە جیهانێکی پڕ رامان و جورئەتەوە.

## چالاکییەکانی لقی هەولێری یەکێتی نووسەرانی کورد





لەچوارچێوەی چالاکییە رۆشنبیرییەکانی وەرزی سێیەمی خۆیدا یەکێتی نووسەرانی کورد لقی هەولێر ئەم کۆڕانەی ساز کرد.

-بەبۆنەی گەڕانەوەی پرۆفیسۆر د.ئەحمەد فەرهادی بۆ زێدی باپیرانی هەولێری دێرین تەوەرێکی تایبەتی لە دوو ئێوارە کۆڕدا بۆ بەڕێزیانی ساز کرد. کۆڕی یەکەم وەڵام و روونکردنەوەی پرسیار و سەرنجی ئامادەبووانی لە خۆ گرتبوو دەربارەی خوێندن و رەوشی زانکۆ و بوارەکانی دی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. کۆڕەکە دەمژمێر(٦.٣٠)ی ئێوارەی رۆژی ٢٠٠٠/٧/٣١ لە باخچەی کۆشکی ئازە بەڕێوە چوو، کە تیایدا ژمارەیەکی زۆر لە نووسەران و رۆشنبیران ئامادەبوون. کۆڕی دووەم تەرخان بوو بە زانستی زمان. سەر لە ئێوارەی رۆژی ٢٠٠٠/٨/٧ لە هەمان شوێن سازکرا.

-دەمژمێر(٦.٣٠)ی ئێوارەی رۆژی ٢٠٠٠/٨/١٤ کۆڕێک لەیادی کۆچی دوایی نووسەر و مێژوو نووس تاهیر ئەحمەد حەوێزی لە باخچەی کۆشکی تازە بە ئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە رۆشنبیران و کەسایەتی و بنەماڵەی خوالێخۆشبوو سازکرا، سەرەتا بەڕێز کەمال غەمبار بەخێر هاتنی ئامادەبووانی کردو ئاماژەی بە هەندێ لایەنی ژیانی خوالێخۆشبوو کرد، دواتر بەڕێز مامۆستا کەریم شارەزا بابەتێکی تێروتەسەلی لەسەر بەرهەمەکانی و لایەنی خۆشی و ناخۆشی ژیانی پێشکەش کرد. گوتی: زیاتر لە (٥٠) ساڵە ئاگاداری ژیانیم بۆیە دەتوانم هێڵە باریکەکانی ژیانی باس بکەم ئینجا هاتە سەر باسی بنەماڵە و باوک و باپیرانی لەگەڵ بەرهەمە چاپکراوو دەستنووسەکانی، لەساغ کردنەوەی ناوی کۆیە زۆر نموونەی لە بۆچوونەکانی خوالێخۆشبوو هێنایەوە، دوای خوێندنەوەی بابەتەکە دەرگای گفتوگۆ کرایەوە بەڕێزان پرۆفیسۆر د.مارف خەزنەدار، مەجید ئاسنگەر، د. عومەر پەتی، بەهزاد حەوێزی، جەوهەر حەوێزی.

هەر یەکەیان بەجۆرێک باسیان لە لایەنەکانی ژیانی کرد، بیرەوەریی و سەرنج و بۆچوونەکانیان لە میانی چەند تەوەرو لایەنێک خستە روو بەڕێز پرۆفیسۆر د.مارف خەزنەدار باسی سێ تەوەری کرد، وەک(مامۆستای پەروەردەکار،بایەخدەر بە ئەدەبی میللی، مێژوو نووس).

مامۆستا مەجید ئاسنگەر گوتی دوای رێکەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ ئێمە (٥) ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کورد بووین لە کۆیە مامۆستا تاهیر ئەحمەد حەوێزی یەکێک بوو لەوانە، لەم سەردەمەدا دوو ئاهەنگمان بەبۆنەوەی یادی حاجی قادر و پەردە لادان لەسەر پەیکەری حاجی قادر گێڕا. خوالێخۆشبوو رۆڵی کاریگەری لەم ئاهەنگانە هەبوو، بەڕێز د. عومەر پەتی نامەیەکی خوێندەوە، بەهزاد حەوێزی بابەتێکی پەخشان ئامێز لەسەر گرنگیەتی مێژوو خوێندەوە گوتی خوالێخۆشبوو چاوی لە چاپکردنی بەرهەمەکانی بوو، ئاوڕێکی ئەمەکدارانە لەم بەرهەمانە بدەنەوە. مامۆستا جەوهەر حەوێزیش هۆنراوەیەکی خوالێخۆشبووی خوێندنەوە کەوا کاتی خۆی لەوەڵامی خزمێکی خۆی نووسیویەتی و بەناوی بنەماڵەکەیانەوە سوپاسی ئامادەبووانی کرد.




# بزاڤی پێشکەوتن.. لەهەنداو کاری وەرگێڕاندا...؟!



جەوهەر کەریم

هەر لەگەڵ دەسپێکی ژیان لەسەر ئەم هەسارەیەی ئێمەدا مرۆڤ هەوڵیداوە لەبچووکترین جوولەو نزمترین دەنگی بەرامبەرەکەی بگات، هەرکاتێکیش لەزمانی بەرامبەرەکەی نەگەیشتبێ، ئەوا پەنای وەبەر هێماو ئیشارەت بردووە، کە ئەمەش بەسەرەتای دەستپێکی وەرگێڕان-دەژمێردرێ...

پاشان لەئەنجامی پەیدابوونی ئاڵووێری کەرەستەی پێویست کە لەنێو گەلاندا فێربوونی زمان و وشەو دەستەواژەکان ئەوەندەی دیکە هاتۆتە پێشەوە.. چونکە زمان تاکە ئامرازی لێکگەیشتنی مرۆڤ بووە...!

دوای بەرپابوونی شۆڕشی پیشەسازی و پێشکەوتنی کشتوکاڵ و بازرگانی تێکەڵاوی و هامووشۆی نێو نەتەوە جیاجیاکان بەشێوەیەکی بەرفراوان پەرەی سەندووە، بزاڤی وەرگێڕانیش پێشکەوتنێکی گرنگی بەخۆیەوە بینیوە.

بەڵام سەردەمی ئێستای جیهانگەرایی و شۆڕشی تەکنۆلۆژی تەکانێکی ئێجگار مەزنی بەهونەری وەرگێڕانداوە، بەجۆرێک کە بۆتە پێویستیەکی ژیاری سەردەم و کەلتوری و فەرهەنگی و زانستی گەلانی دونیای بەیەکدی ئاشناکردووە..

بۆیە وتراوە - قۆناغی پێش هۆشیاربوونەوەی (رێنیسانس)ی هەر گەلێک لەدوای بزوتنەوەیەکی سەرتاسەری وەرگێڕانەوە دەستی پێکردووە.

ئێمەی کوردیش.. وەنەبێ لەهەنداو گرنگی ئەم هونەرە شارستانیە ریز پەڕ وەستابێ! بەڵکو چەندان هەوڵی تاکەکەسی و هەندێ جار دەستە جەمعی دراوەو چەندین شاکاری ئەدەبی بەهیمەتی دڵسۆزان کراونەتە کوردی و جێ پەنجەی ئەوانە لەخزمەتی ئەو کاروانە پڕشکۆیە بەزیندوویی دەمێنێتەوە، بەڵام بەبەراورد لەگەڵ گەلانی دەرودراوسێدا، کە دەراوی رۆشنبیری ئێمەی کورد بووە لەزۆربەی کاتدا هێشتا زۆرمان ماوە..!

ئەم هونەرە لای نەتەوەکانی فارس و تورک و عەرەب بەشێوەیەک گرنگی پێدراوە کە هەرچی کلتورو فەرهەنگی گەلانی دونیای پێشکەوتووە خستوویانەتە سەر زمانی زگماکی خۆیان - هەر لەکتێب و لێکۆڵینەوەی زانستییەوە بگرە تادەگاتە دۆبلاژکردنی فیلمی سینەمایی و شانۆگەری جیهانی و فیلمی کارتۆنی منداڵان - دەزگای سەربەخۆ، کۆلیجی سەربەخۆ، ئامرازو پێویستیە زانستیەکان - بەئەوپەڕی دڵسۆزی لەخزمەت ئەو کارەمەزنەدان.

بۆ نموونە، لای عەرەبەکان لەسەردەمێکی کۆنی حوکمی عەباسیەکان - خەلیفە مەئموون بەجۆرێک گرنگی ئەم بابەتەی نرخاندووە - کە لەپاداشت هەر دەق و کتێبێکی وەرگێڕاو بۆ سەرزمانی عەرەبی بەکێشانەی سەربەسەر (زێڕی) کردۆتە خەڵاتی (حنین کوڕی ئیسحاق)ی وەرگێڕ لەو سەردەمەدا....!

لای ئێمەش دامەزراندنی (کۆمەڵەی وەرگێڕانی کوردستان) لەدوای ساڵی ۱۹۹۲ و دەرچوونی گۆڤاری (پەیامی وەرگێڕ) دەسپێکێکی مژدە بەخش بوو! بەڵام بەداخەوە، ئەویش وەکو زۆربەی هەوڵەکانی دیکە.. تێر تەمەن نەبوو..!؟ بۆیە لەبەر گرنگی کاری وەرگێڕان لەبزاڤی پێشکەوتندا مافی خۆیەتی هەڵوەستەو ئاوڕێکی دیرۆکی قووڵی لێ بدرێتەوەو هەنگاوی بەپەلەو کۆنکرێتی بۆ بهاوێژرێ ئەویش.... بە:

* برەودان بەکاری وەرگێڕان و خستنە نێو بەرنامەکانی خوێندنی زانکۆو پەیمانگەکانی کوردستان، ئەمەش بەکردنەوەی بەشی سەربەخۆو تایبەت بەوەرگێڕان جێبەجێ دەکرێ.

* دامەزراندنی دەزگایەکی باڵای هونەری وەرگێڕان و چاپ و بڵاوکردنەوەی بەرهەم و شاکاری وەرگێڕدراوی ناودارانی جیهانی لەئەستۆی خۆی بگرێ و رێنمایی و پشتگیری لەوەرگێڕە تازە پێگەیشتووەکاندا بکات.

* خۆ ئەگەر بڵێین جارێ بۆ مەیسەربوونی ئەم خاڵانەی سەرەوە ماویەتی! ئەوا دەکرێ بڵێین وەکو بەدیلێکی ناوەستاو، پشتگیری لەژیاندنەوەی کۆمەڵەی وەرگێڕانی کوردستان بکرێت و وەکو ناوەندێک بۆ پەیامی پیرۆزی وەرگێڕان بکەوێتەوە کارکردن.

چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری / هەولێر

